# ئەو دیوی کوێستان

## گیای نەمر

یاشار کەمال

و: ڕەسووڵ سوڵتانی

بەرگی سێیەم





وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

**● ئەو دیوی کوێستان (گیای ئەمر)**

● نووسینی: یاشار کەمال

● وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ فارسی: رەزا سەید حوسێنی و جەلال خوسرەوشاهی

● وەرگێڕانی لە فارسییەوە: رەسووڵ سوڵتانی

● نەخشەسازی ناوەوە: (باران)

● بەرگ: جێگر عەبدولجەبار

● چاپی یەکەم: ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠

● نرخ: سێ بەرگ ١٥٠٠٠

● چاپخانە: وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

● لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٩٩٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٦٠٦)**

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

ئـەو کاتــەی مــەمی دیــك ڕۆژ بــە ڕۆژ لــە
تووڕەییـان وەك شێتی لێ دێ و خۆی پێ ناگیرێ.

# ١

مــەمی دیــك گــورج خەنجەرەکـەی لـە کـالان دەرکێـشا. دەمـی خەنجەرەکـەی لـە بـن تریفـەی مانگەشەوەکەدا بریـسکایەوە. جـوغزێکی گـەورەی بـە ژوور سـەرییەوە کێشا. مـەمی دیـك، وەك هەڵۆی ڕەوەزان کە چۆن ئامادەی گرتنی نێچیرەکەیەتی، ئاوا گیانی لە بەر یەك کـشایەوە. لـە جێـی خۆی دەرپەڕی و هەر بە ماسولکەی لەبەریەك کشاوە و بە لاقە لەرزۆکەکانییەوە جوولـەی لـێ بـڕا. هەموو گیانی وەك تۆپەڵێك قورقوشم قورس ببوو.

مانگەشــەوێکی خــۆش بــوو. دارەکــان و گــژ و گیــا و بــەرزی و نزمییــەکانی زەوی و گردۆڵکەکان، وەك زیو دەدرەوشانەوە و دەتگوت زیاتر لە بەر یەك دەکشێنەوە و هەراوتر دەبنەوە. تاریکییەکـەی سـەر شیو و دۆڵ و ڕەوەزەکـان ڕەنگـی شـیری هـەبوو و سـێبەری ڕەوەزەکانی ئاناوەرزای دەخستە سەر ڕووبارەکەی جەیحان. ڕووباری جەیحانیش هـێمن و لـە سـەرخۆ وەك زیـوی تـواوە بەسـەر دەشـتە کـاکی بـە کاکییەکـەدا، لـە سـێبەری ڕەوەزە بێجووڵەکاندا ساتێك لە چاو ون دەبوو و دوای تێپەڕین بە نێو ڕەوەزەکاندا، دیسان پـێچ و گەوەکانی خۆی دەگرتەوە بەر و دەخوشی.

خشپەی پێیەك وردە چەوەکانی دەبزواند و لە شیوە تاریکەکـەوە دەهاتـە سـەر و وردە وردە نزیکتر دەبۆوە، مەمی دیك سات بە سات دڵەخورپەکەی پتر دەبوو. دەنگی خشکان و بـزووتنی بێ بڕانەوەی چەوەکان ماوەیەك هەر وا بیسترا و لە بن تریفەی مانگەکەدا دەنگی دایـەوە. ئـەو دەنگانە ساتێك دەتگوت لە دوورەوە و لـە قووڵاییـەکانـەوە دێـن و سـاتێك دەتگـوت هـەر لـەو نزیکانە و لە پەنا گوێی خۆیەوە دەبیسرێن.

دەنگی پێیەکە تاوێك لە شیوەکەدا بڕایەوە. بێدەنگییەك باڵی بەسەر دەوروبەردا کێشا، بە جۆرێك کاتیٚ شوانخەڵەتێنەیەك لە چلێکەوە فڕی و چووە سەر وشکەڵێك، دەنگی فڕەی باڵی هات. لە نەکاو تارمایی پیاوێکی زل و چوارشانە لە لای شیوەکەوە دەرکەوت. مەمی دیك، گورج، خۆی گەیاندە پشت گردێکی نزیك ئەویٚ. تارمایییەکە وردە وردە دەهاتە پێشەوە. تا پتر دەهاتە پێش، کەڵەگەتتر و نێوشان پانتر و بەسامتر دەبوو. وەك پەلامار بدات، کۆ دەبۆوە و قەڵەمبازی دەدا و دەکەوت و هەڵدەستایەوە و دیسانەکە بەرز دەبۆوە و یەك بە مەیدان لەسەر عەرزەکە رادەکشا و لە نەکاو دەردەپەڕی و وەك تۆفانێك لە مەمی دیك نزیك دەبۆوە. تارمایییەکە چەندی نزیکتر دەبۆوە، ماسوولکەکانی مەمی دیك خاوتر دەبوونەوە و گیانی سڕ و بێهێزتر دەبوو.

ترس وەك ئاوێکی وردە وردە هەڵبچیٚ، نوقمی دەکرد. تینی لە دەست و پێیدا نەما. ئەو خەنجەرەی لە ئێوارەوە توند توند بە دەستییەوە گرتبوو، لێی بەربۆوە. دەستەکانی سڕ بوون و تەزوویان پێدا دەهات. داهاتەوە و بە دەستەکوتە لە نێو گەڵا و خەزەڵە وشکەکاندا خەنجەرەکەی دۆزییەوە. دمی خەنجەرەکەی لە بەر تریفەی مانگەکە ساتێك درەوشایەوە و ترووسکایی لیٚ بڕا. دەستەکانی مەمی دیك زۆر بە توندی دەلەرزین و وردە وردە ئەو لەرزینە هەموو گیانی ئەوی تەنییەوە. تارمایییەکە هەر وا بەرەوڕووی دەهات. هات و بە بەردەمیدا تێپەڕی و ساتێك تەنیا لاقە دەرێژەکانی لەویٚ مانەوە کە هەنگاوی بەرزیان داویشت. لینگە رەش و بەرزەکان دەڕۆیشتن و دەهاتن و شەپۆلیان دەدا. لقەکان هاتنە پێشترەوە و وەك دیوارێکی رەش پێش چاویان گرت. مەمی دیك ئیتر لە سەر پێی خۆی رانەگرت. لاقەکانی ئەویان پیٚ رانەگیرا. بەسپایی لە بن پنچکەکە و لە سەر عەرزەکە کەوت. بەخۆی گوت:"نەحلەت لە دایی و بابت هەی خەنجەرەکە... نەحلەت لە دایی و بابت خەنجەرەکە... نەحلەت لە دایی و بابت هەی ترس. ئەمجارەش سەری نەگرت."

تارمایییەکە لە مێژ بوو دوور کەوتبۆوە کە مەمی دیك وەخۆی هاتەوە. هەمیشە هەر وا بوو. دەست و پێی مەمی دیك بیٚ هێز دەبوون و بەگوێی ئەویان نەدەکرد، بۆیە مەمی دیك سەفەری پیٚ نەدەکوژرا.

رۆژێکی بە بەفر و بۆرانی زستانێی وەبیر هاتەوە. سەفەر تازە لە راویٚ گەڕابۆوە و مەمی دیك لە بن دارە تووەکەی بەر دەرگای ماڵی سەفەر چاوەڕێی بوو کە لە ماڵیٚ بێتە دەریٚ. زۆر لەویٚ چاوەڕێی بوو، لەپی دەستەکانی دەزوورانەوە و ماسولکەکانی شێتانە لەبەر یەك دەکشانەوە. بەڵام

هەر ئەوەندەی سەفەر لە ماڵەکەی هاتە دەرێ، ئەو لە نەکاو قەڵەمی دەست و پێیانی شکان و دیسان هەموو گیانی شەلاڵی ئارەقە بوو.

لە پشت پنچکەکەوە کرووشمەی کردبوو و هێشتاش وەك مێژۆکە دەلەرزی. دەلەرزی و مشتووی خەنجەرەکەی بە هەموو تین و توانای خۆی لە مستیدا دەگوشی:"ئەمشەو هەر دەبێ بیکوژم. هەر ئەم شەو، ئەمشەو ئاخر شەوە ... ئەگەر ئەم کابرایە نەمرێ، ئەمن نەجاتم نابێ."

بریسکەیەك لە بەری پێیەوە هات و بە ئەژنۆیدا گەیشتە گونەکانی. رێك لەو کاتەدا دڵی تێکەڵ هات. چیی وای نەمابوو برشێتەوە.

قەت نەیدەتوانی ئەو تێهەڵدانەی خواردبووی، لەبیر خۆی بەرێتەوە. هەرگیز... هەرگیز... ئەو دارەی لە سەر تاشباشی وەلی خواردبووی کە حەوت گلۆڵە نوور، هێندەی سپیدارێك بە دواوەی بوون و شەویان وەك رۆژ رووناك دەکردەوە، هەر ئەو کەسەی روخساری لە ئاو زوڵاڵتر بوو، هەر ئەو کەسەی چوو بوو کەوتبووە گەڵ چل سوارەی غەیبی. ئەو تێهەڵدانەی عومەر، پیاوە زەبەلاحەکەی سەفەر لەوی دابوو. دوای ئەوە، سێ مانگ لە جێدا کەوتبوو و خوێن دەمیزت. چما دەکرێ ئاوا بە قەستی کوشتنێ لە یەکێك بدەی؟ تەنانەت ئەو عومەرە وەحشییەش ئەوەندە بێ بەزە نەبوو، سەفەر، ئەو دوژمنە بەخوێن تینووەی تاشباش عومەری ناچار کردبوو. دەر و دراوسێ لە دەوری جێوبانەکەی کۆ ببوونەوە و گوتبوویان:"مەمی دیك بەو دەردە دەچێ، پێی دەمرێ، تف لە رووی ئەو سەفەرە کافرە." دایکەکەی بەس دەگریا.

مەمی دیك نەمرد، بەڵام رزگاریشی نەبوو. کە هەستایەوە، نەچووە نێو ئاوەدانی. سەیری چاوی هیچ کەسیشی نەکرد. هەموو کاتەکانی ژیانی بە چۆڵ و چیاوە بوو. شانسی خۆی راوچی بوو و لە چیاو چۆڵان بە تەنیایی راوی دەکرد و هیچ پێویستیی بەوە نەبوو بچێتە نێو خەڵکی. لە شەرمان، رووی نەبوو سەیری دایکیشی بکات:

"هەتا سەفەر نەمرێ ئەو دەردە بەرم نادا. دەبێ بیکوژم بۆ ئەوەی بتوانم بچمە نێو خەڵکی و سەر هەڵێنم."

گەلێ رۆژان خەنجەرەکەی تیژ کردەوە. خەنجەر وای لێ هاتبوو مووی دەکرد. لە شەوە بەفراوییەکانی زستانێدا هەتا کەرەی بەیانی لە پشت دەرگاکەی سەفەر هەر چاوەڕێ بوو. خوێنی لە بەری دەستانی زا و دەستی بە خەنجەرە مشتوو سەدەفییەکەیەوە رەق هەڵات. لە شەوە بە بەفر و بۆرانەکاندا گەلێ جاران سەفەری بۆ هەڵکەوت. لەرزی و بوورایەوە و

خەنجەرەکەی لە دەستی بەربۆوە و کەوتە سەر بەفرەکان و هیچی لە دەست نەهات. تووڕەییەکەی دیسان بەگڕتر بوو.

ئاخرییەکەی گوتی:" لەو سەرمای زستانەدا و لە نێو ئەو بەفر و بۆرانەدا پیاو تاقەتی نامێنێ هێندە چاوەڕێ بێ و ئاوا هیچی پێ ناکرێ. یەکەم ڕۆژ کە بەرەو چوکووراوا دادەگەڕێین، شەرت بێ لە سەر خاکەکەی چوکووراوا لە خوێنی بگەوزێنم."

کە بەرەو چوکووراوا داگەڕان، بڕوای بەوە هێنابوو، کە ئیتر دەست و پێی بێهێز نابن، بەڵام دیسان تین و هێزیان لێ بڕایەوە.

مەمی دیك ئاخرییەکەی لە بەردەم دیوارێکی ڕەش و بێ بڕانەوەدا مایەوە. لە تەشقی بێهیواییدا بوو. بەخۆی گوت:"دەبێ خۆم بکوژم و دەشیکوژم."

ئەی ئەگەر کاتی خۆکوشتنێش دەست و پێی شل بووبانەوە چی؟ بەرەو لای تارماییەکە کەوتبووە ڕێ. دووسەد سێ سەد شەقاوێك ڕۆیشتبوو، گەیبووە دڕکەڵانەکەوە. دڕك و پێکۆڵ بن پێیانیان داڕووشاند و دەلینگی شەلوارەکەیان بڕێك هەڵتلیشاند. بۆنی گەڵای بابادەم بە وڵاتێ وەربېبوو و لە لایەکیشەوە بۆنی نەعنا و زەلکاو تێکەڵاو ببوون. بۆنی گەنمی دروێنەکراو و گوڵی کلکەڕێوی شەوەکەیان ئاخنیبوو. بۆن و بەرامەکان و مانگەشەوەکەش تەڕ بوون.

مووچڕکێکی وەك شۆکی کارەبا لە گیانی مەمی دیکدا هات و تێپەڕی. بۆ ساتێك لە شوێنەکەی خۆی کرووشمەی کرد و ڕاوەستا. وەڕێ کەوتەوە. چەندی دەچووە پێشتر، و چەندی پتر بۆنی کڵۆش (لاسکە گەنم)ـی هەڵدەمشت، وردە وردە وەخۆ دەهاتەوە و ماسوولکەکانی دیسان دەبووژانەوە.

کە گەیشتە نزیکی دارە تووەکان، تەواو وەخۆ هاتبۆوە و ماسوولکەکانی تەواو توند ببوونەوە. لە کوێرە ڕێیەکەوە بەرەو نێومالّی چۆمەکە ڕۆیشت و پەڕییەوە و لە گردێك وەسەر کەوت. ئەو بەری گردەکە کۆنە گۆڕستانێکی لێ بوو. چاوەکانی نووقاند و لەوێ دوور کەوتەوە. کە سەری هەڵێنا سەیری کرد دیسان گەڕاوەتەوە نێومالّی چۆمەکە، کە ڕێك و بەرین و پڕ لە چەوی سپی سپییە. هیچ پێی سەیر نەبوو. ئاوەکەی ئەوێ هەر دەگەیشتە گوێزینگان. ڕەوە ماسیی ڕەنگاوڕەنگ بە زگە بریقەدارەکانیانەوە دەهاتنە سەر ئاوەکە و دەتگوت دەیانەوێ لە ئاوەکە بێنە دەرێ.

تارماییەکە لە دەم چەمەکە، لەسەر بەردێك دانیشتبوو و لاقەکانی خستبووە نێو ئاوەکەوە. پشتی لە مەمی دیك بوو. شانە پانەکانی لە شانی بنیادەمێکی زەبەلاح دەچوون. مەمی دیك

بەخۆی گوت:"خۆ کوێخا سەفەر هێندە زل نییە. بەڵام دەڵێن بنیادەم لە بەر تیشکی مانگەشەو، گەورەتر دێنە پێش چاو. لە تاریکیدا بنیادەمەکان چوار پێنج هێندەی خۆیان دێنە پێش چاوان. ئێستا لەوانەیە ئەمنیش دە ئەوەندەی قەڵافەتی خۆم دیار بم."

ئەوەی چەند جاران لە بەر خۆیەوە دووبارە کردەوە و متمانەی بەخۆی کرد.

لە پشت سەری تارماییەکەوە، دارێکی نارەوەنی لێ بوو کە نێوەڕاستەکەی هولۆڵ ببوو. بە سەر پەنجەی پێیان خۆی گەیاندە پشت دارەکە. مشتووی خەنجەرەکەی لە دەستیدا گوشی و ڕێك لەو کاتەدا کە دەیویست خۆ بە تارماییەکەدا بدات، دیسان شل بۆوە و داهێزرا. دەتگوت "تا" و نۆبەتێی لێ هاتووە، دانیشت.

ماسییەکی گەورە لە بەردەم تارماییەکەوە سێ جاران لە ئاوەکەدا خۆی هەڵاویشت و بەر زگە سپی و زیوینەکەی لە بەر تریفەی مانگەکە درەوشایەوە. تارماییەکە سەری هەڵێنا و سەیری ماسییەکەی کرد. ئیتر خیسکەبەردێکی هاویشتە ئەو شوێنەی وا ماسییەکە خۆی لێ هەڵاویشتبوو.

مەمی دیك جار بە جار تووڕەتر دەبوو و تف و نەحلەتی لە خۆی دەکرد. خۆزگە دەست و پێی تین و توانای ئەوەیان تێدا بوایە و ئاوا هەڵنەلەرزیبایە. خۆزگە توانیبای بچێتە پێشێ و خەنجەرەکەی هەتا مشتووەکەی لە پشتی ڕۆکردبایە، ڕێك لە راستی دڵییەوە... ئەو کات خوێنەکەی بە ئاوەکەدا شۆلاوگەی دەبەست. ئاوەکە سوور هەڵدەگەڕا.

رەشاییەکە هیچ نەدەجوولا.... خۆزگە توانیبای بە نووکی پەنجەکانی... بەبێ دەنگی... ئەو کاتە تارماییەکە هاواری دەکرد:"ئاخ، ئاگرم تێبەربوو". دوای ئەوە دەتگوت لە شوێنێکی ئەوێوە دەنگی هاواری "ئاخ، ئاگرم تێبەربووی گوێ لێ بوو.

مەمی دیك لە پشت دارەکەوە لەخۆی نووسا، بەڵام نەیتوانی هەستێ. بە گاگۆلکێ و چنگەکرە بەرەو ئاوەکە خوشی. هەولّی دا یەك دوو لوێچ ئاو بخواتەوە، بەڵام دەستەکانی وا دەلەرزین ئاوەکە لە نێوان پەنجەکانییەوە رژایە نێو کراسەکەیەوە و بەو ئاوەی لە لەپی دەستی کردبوو، نەیتوانی تەنانەت لێوەکانیشی تەڕ بکاتەوە.

هەتا ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد کابرای دەم ئاوەکە رۆیشتووە. لە چاوترووکانێکا ون ببوو. باشە یانی ئەو کابرایە خێو بوو؟ شەیتان بوو؟

کە بزربوونەکەی کابرای دیت، دەسبەجێ وەخۆ هاتەوە. لەرزینەکەشی رەوییەوە. دەرپەڕی و دەستی کرد بە راکردن. ئەگەر لەو ساتەدا سەفەری وەدەست کەوتبایە، ئەو لەشە چەپەڵ و

گەمارەی بە خەنجەران دادەپێژت. وەك بێژنگی لێ دەکرد. بە دەم رووبارەکەدا رایدەکرد و چەوەکان لە بن پێیانییەوە دەردەپەڕین، بەڵام کەسی نەدۆزییەوە.

"ئاخ، ئەگەر ئێستا دەستم بکەوتایە... ئێستا... هەر ئێستا..." ئیتر نە دەستی دەلەرزین و نە گیانیشی شل دەبۆوە.

پاژنێی رقەکانی ژانیان دەکرد و بنی پێی دەبرژایەوە. کە سەفەر لێی دابوو و لە هۆش خۆی چوبوو، سەفەر بە ئاگری چەرخەکەی پەنجەگەورەی لاقەکانی سووتاندبوو. هەر چەندە بێهۆشیش بوو، بەڵام کە پەنجەگەورەی سووتابوو، لە نەکاو دەرپەڕیبوو... وا راچڵەکیبوو، وەخت بوو سەری وە میچی تەویلەکە بکەوێ.

بیری کردەوە:" ئەوە لە ساڵ تێپەڕیوە... لەو رۆژەی وا سەفەر منی کوشت." ئەوجار بە دەنگێکی بەرز لە سەر بیرکردنەوەکەی رۆیشت:"سەفەر ساڵێك و سێ مانگ لەوە پێش کوشتمی... رێك ساڵێك و سێ مانگ لەوە پێش... ئەمنی کوشت... کوشتمی."

ژان و ئازارێك هەموو گیانی برژاندەوە. رێك وەك ئەوێ رۆژەکە... ئەو رۆژەی ئەوەندەی لێ درابوو لە مردنێ گەڕابووەوە... هەر کاتێك بیری لەو رۆژە دەکردەوە، ئاوای لێ دەهاتەوە. لە جێی خۆی وشك دەبوو و جینگڵی دەدا. هەر دوو هێلکەی گونەکانی دەگرتن و خۆی گرمۆڵە دەکرد. ماوەیەك هەر وا لەرزی و مووچڕکەی پێدا هات.

کە وەخۆی هاتەوە، شنە بایەکی نەرم هەڵیکردبوو و مانگ چووبووە بن هەورانەوە. لە گۆشەیەکەوە دەنگی خشەخشی قامیشەڵانەکە هاتە گوێ. هەستایە سەر پێ، بەو رێگەیەدا کە هاتبوو گەڕایەوە.

"سەفەر کوشتمی... ئەمنیش دەیکوژمەوە... ئەمنیش ئەو...."

گەیشتە دراوی ئاوەکە. لە نەکاو لە سەر جێی خۆی وشك بوو. تارماییەکە هەر لەو شوێنە لاقی خستبووە نێو ئاوەکەوە کە پێشتر لێی دانیشتبوو. هەر وا پەنجا هەنگاوێك لێیەوە دوور بوو. بەخۆی گوت:"وەختیەتی.... سەفەر هۆشی لە شوێنێکی دیکەیە. هەلە و هەڵکەوتووە..."

بەڵام لەگەڵ گوتنی ئەو قسانەدا دیسان گیانی شل بۆوە و لە سەر عەرزەکە دانیشت. سەفەر هیچ ئاوڕی نەدایەوە کە سەیرێکی بکا.

سەفەر هەستا، باوێشکێکی دا و باسکەکانی لێك کردنەوە. قرچەی ئیسقانەکانی هات. هات و بە بەردەمی مەمی دیکدا رەت بوو. رێك لەو ساتەدا مەمی دیك زۆری هەوڵ دا

هەستێ و خەنجەرەکەی لە پشتی ڕۆ بکا، بەڵام چیی زۆریی لەخۆی کرد، نەیتوانی لە جێی خۆی بجووڵێ. سەفەر هات و رابورد و لەو دیو گژ و گیاکانەوە لە چاوان ون بوو.

مەمی دیك هەرای کرد:"جەستەی من... جەستەی من... ئەوە بۆچی وات لێ هاتووە... هەی زۆڵی... چۆن شتی وا دەبێ؟ هەرچییەکت پێ خۆشە بیکە... هەر چۆنی پێت خۆشە شل بەوە... ئەمن سەفەر هەر دەکوژم..."

لەو جەنگەیەدا سەفەر گەڕایەوە و جارێکی دیکەش لە جێیەکەی خۆی دانیشتەوە و ئەو ماسییانەی دایەوە بەر بەردان کە لە ئاوەکەدا خۆیان هەڵداویشت. مەمی دیك چیی سەیری دەکرد، تارماییەکە لە بەر چاوانی گەورەتر و گەورەتر دەبۆوە و بەو رادەیەش ترسەکەی ناخی چڕتر دەبۆوە.

"نهێنییەك هەیە لەو سەفەرەدا، کەراماتێك هەیە. چ بکەم؟ لە کیسم دەچێ وەك ئاو... وەك شەیتان... وەك جنۆکە... ئەمن ناتوانم بیکوژم. باشە، ئەی چ بکەم؟ بۆم ناکوژرێ...."

"هەر بە راستی کێ دیوێتی کەسێك بکوژێت بەو تاوانەی ئەو ئێسکی گیانتی شکاندووە؟ کوشتن بە تۆڵەی تێهەڵدان؟... زۆر نییە؟...."

"بەڵام ئەمن لای کەس سەرم هەڵنایە. کە خەڵکی سەیرم دەکەن، وەختە ببمە تنۆکێك ئاو و بە عەرزیدا بچمە خوارێ. نەك ناتوانم بچمە لای زولەیخا و بیدوێنم، لای ئەو هەر سەریشم هەڵنایە.... بەڵام چار چییە؟ لە دەستم نایە. تین و هێزم نییە. خوایە ئیتر ئەوە چ کارێکە... خەریکە تێدا دەچم... ئەوە چ ترسێکە؟"

وەك گوێی بزرینگێتەوە:"ترس نییە... ترس نییە" گوێی هەڵخست. دەنگەکە بڕایەوە.

رووبەڕووی یەکتری راوەستابوون. مەودای نێوانیان نەما و لووتیان بە لووتی یەکتریدا تەقییەوە. گوێی دایە شوڕەشوڕی ئاوەکە. دەنگی تەراکتۆرێك کە لە دوورەوە هەڵکرا، شەوەکەی داگرت. ترۆمبێلێك رابورد و تیشکی چراکانی لە رەوەزەکانی دا و رووناکی کردنەوە:"ئاناوەرزا"ی لستەوە. ساتێك لەو رووناکاییەدا مانەوە و چاوەکانیان بە شەوارە کەوتن و نەیانتوانی یەکتری و ئاوەکە و قامیشەڵان و دارە چنارەکان ببینن.

پۆلێك باڵندە بە نێو رووناکییەکەدا وەك هەورێکی رەش بە سەر سەریاندا تێپەڕین. مەمی دیك دیسان گیانی کەوتبۆوە لەرزین. لەرزینەکەی سات بە سات توندتر دەبوو. ئەو لەرزینە گیانی شەکەت کرد.

مانگ خەریك بوو ئاوا دەبوو و خاك دەتگوت هەناسە دەکێشێ، بە تووڕەییەوە لەرزی و لە بەر یەك کشایەوە و راچڵەکی و مەمی دیکی گڕ دا.

سەفەر کە لە تاریکاییەکەدا دیسان زلتر ببووەوە، لە جێی خۆی هەستا. باوێشکێکی دا و قرچەی ئیسقانەکانی هات. لەگەڵ باوێشکەکەیدا باسکەکانی وەك باڵی هەڵۆیەکی گەورە، لە تاریکایی شەوەکەدا لەبەر یەك ڕەوینەوە. کە باڵەکانی هێنانەوە خوارێ، هەنگاوێکی بەرزی بەرەو مەمی دیك نا. مەمی دیك نەدەجوولا. نەیتوانی ڕا بکا و پێیەکانی شل بوونەوە و برستیان لێ برا.

لك و پۆی دار چنارەکە هێندەی تاریکایی شەوەکەی لێ هاتبوو و بە ژوور سەری مەمی دیکەوە ئاسمانی داپۆشیبوو. ماسییەکە سێ جار لە ئاوەکەدا خۆی هەڵاویشت. سێ جار وەك برووسکە بەرەو ئاسمان چوو.

سەفەر بە سەر سەری مەمی دیکەوە ڕاوەستابوو و وردە وردە گەورەتر دەبۆوە. دوای ئەوە لەوێ دوور کەوتەوە.

لە دوورەوە دەنگێکی بیست:

"وس وس وس، مەمی دیك، برالە بێدەنگ، وس وس ئەوە تۆی؟ ئەوە لەوێ چ دەکەی؟ قسەم لەگەڵ بکە. کەس نامدوێنێ... لانیکەم تۆ بمدوێنە... تاشباش ئۆغلو ڕایسپاردووە کەس قسەم لەگەڵ نەکا. هیچ مەخلووقێك نەمدوێنێ، تەنانەت جانەوەر و دەعبای کێوییش. باشە تاشباش کەی وەلی بووە؟ ئەگەر وەلی بوایە چما لە بەفر و بۆرانێدا ڕەق هەڵدەهات و دەمرد؟ تاشباش ئۆغلو مردووە... مردووە..."

هەر لەو ساتەدا، لەرزی لێ برا. لە نەکاو وەك بەردێکی لە قۆچەقانی دەرچووبێ، لە جێی خۆی دەرپەڕی. مشتووی خەنجەرەکەی لە دەستیدا ڕێك گوشی. خوێن لە دەستەکانی گەڕا. بە هەموو تینی خۆیەوە هاواری کرد:"تاشباش ئۆغلو نەمردووە. خەیاڵ نییە، ڕاستییە. خەیاڵ نییە، خەیاڵ نییە... نەمردووە... ئەمن دیتم. دیتم دەڕۆیشت و حەوت تۆپەڵە نووری گەورە وەك حەوت کێو بە دوویدا دەخشان. ئەوم دیت کە پێدەکەنی و نوورەکانی پشت سەری شەپۆلیان دەدا."

سەفەر بە دەنگێکی نەرم و هێدی، نەرم و نیان و پڕ لە میهرەبانی و لاواندنەوە گوتی:"ئەو مردووە، ڕۆڵە گیان، ئەو مردووە و نوور و تیشکەکانیش مردوون و تاشباش ئۆغلو... ئەتۆ بڕوا بە قسەی من بکە و قسەم لەگەڵ بکە. مرد... نوورەکانیش مردن. خاکیش دەمرێ، ئاوەکانیش... وەلییەکانیش دەمرن."

لە نەکاو تارماییە گەورەکە، تەنانەت گەورەتر لە سەفەریش هات و وەك دیوارێك لە بەردەمی ڕاوەستا و باوێشکی دا. دەستەکانی وەك باڵی هەڵۆیەکی گەورە شەوەکەیان داگرت.

باڵی هەڵۆکە ئاسمانی داپۆشی. شەو، باڵ، لك و پۆی دار، تیشکەکان و تارمایی.... هەر هەمووی چوون بە یەکدا و تێکەڵ بوون.

مەمی دیك ئیتر نەیتوانی بگەڕێتەوە یان بێهێز و شل بێتەوە. خەنجەرەکەی دەستی بەرەو پێش خۆی هاویشت و بریسکایەوە و لە تاریکاییەکەدا جوغزێکی سووری باریکتر لە شەوە تارەکەدا کێشا کە لە هەموو بلێسەیەك باریکتر بوو. خەنجەرەکە لە گۆشتی نەرمی ئەو جەستەیەدا کە بەبێ دەنگی لەسەر عەرزەکە درێژ ببوو، رۆچوو و هاتە دەرەوە و دڵۆپ دڵۆپ خوێن لە دەستەکانی مەمی دیکەوە چۆڕانەوە سەر لم و خۆڵەکە. خۆڵ و لمەکە خوێنەکەی هەڵمشت.

**سـەرگەردانبوونی مـام خـەلیل لـە کێڵگـەکانی لۆکـەدا بـە شـوێن خـەڵکی گوندەکەی خۆیدا.**

## ٢

خەڵکەکەی گوندی ئینجەجیك کاتێ وەڕێ کەوتن بۆ لۆکەڕنینەوە، مـام خـەلیلیان سـواری ئەسپێك کرد. ئەسپەکە پیر و لەڕ بوو، بەڵام هەر چۆنێك بێ مام خەلیلی دەگەیاندە چوکووراوا. زینێکی چەرکەزیانەشیان لەسەر پشتی دانابوو. زینەکەی کۆنە بوو. چـەرمەکەی تلّـیش تلّـیش ببوو و ڕەنگ و گوڵی پێوە نەمابوو. بەڵام دیسانیش هەر نەرم بوو.

مـام خـەلیل قیـت و قـنج لەسـەر پـشتی ئەسـپەکە دانیـشتبوو و لـە پـێش کاروانەکـەوە دەڕۆیشت. کۆنە قەمچییەکیشی بە دەسـتی چەپییەوە بـوو. ئـەو دەسـتەی قەمـچییەکەی پـێ گرتبوو، وەك سوارچاکە ناودارەکانی جـاران، لـە سـەر ئـەژنۆی چـەپی خـۆی دانـابوو. سـینگی دەردەپەڕاند و دڵی کەیلی خۆشی و شادی بوو:"ئا بەوانە دەڵـێن پیـاو، جـوامێر ئەوانـەن، ئـەو گوندییانەی ئینجەجیك. کوڕە خۆ لەو گوندە کاولەدا کەوتبوومە دەست بنیادەمی وا کـە هـیچ قەدریان نەدەزانیم. کەوتبوومە بەر دەستی ئەو مریٙمۆکە قەحپەیە. قەحپەی حەوت عەشیرەتان. دەست ئەو سەفەرە هیچ و پووچە چڵمنە و ئەو تاشباشە گەمژەیـە. تۆبـە، تۆبـە تـازە پـێ لـەو گوندە نانێمەوە. تۆبە دەکەم و تازە سەیری ئەو سەگانە ناکەمەوە... تۆبە... تۆبە..."

ئێستا، لە سەر پشتی ئەو ئەسپە و لە پێشەوەی ئـەو کاروانـەوە حـەزی لـێ بـوو لانیکـەم مریٙمـۆك ئـاوای ببـینێ. خۆزگـە کـە دەگەیـشتنە چـوکوور، لـە سـەر دوو ڕێیانەکـە، تووشـی گوندییـەکانی یـالاك بوایـەن، چ خـۆش دەبـوو. مریٙمـۆك ئەوەنـدەی پـێ سـەیر دەبـوو، چـاوی

دەردەپەڕین. لەوانەش بوو تووشیان بن. لە خۆشیی ئەو هیوایەی کەوتبووە دڵییەوە قەمچییەکی لە ئەسپە سپییەکەی دا.

بەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش هیوای مام خەلیك بڕێتەوە و بەبێ ئەوەی تووشی ئەو گوندیانەش بن، گەیشتنە چوکوور. سواربوون لە ئەسپی سپی بە زینی چەرکەزییانەوە و قەمچی و قیت و قنج و دانیشتنەکەی لە سەر پشتی ئەسپەکە هەر هەمووی بۆوە خەون و خەیاڵ...

لە دەوروبەری کۆسرەلی، لە کێڵگەیەکی گەورەی یەکێك لە ئاغاکاندا دابەزین. یەکەم جار بوو گوندییەکانی ئینجەجیك لەوێ لۆکەیان دەڕنییەوە. لە ساڵەکانی پێشوودا لە لای یورەیر لۆکەیان دەڕنییەوە. لۆکەجاڕەکان بە پیت و بەروبوو بوون. قۆزاخە هەر یەکی هێندەی لەپی دەستێك کرابوونەوە. هەموو دەشتەکە سپی دەچۆوە، دەتگوت بەفر باریوە. مام خەلیل سەیری دەشتە سپییەکەی کرد و گوتی:

ـ ئای لەو دنیایە براله، ئای لەو دنیایە جەبار، ئەو دەمی ئێمە گەنج بووین، بەخوای مەزرای ئاوامان بۆ هەڵکەوتبایە و لۆکە ئاوا پشکووتبایەن و چوکووراوا ئاوا سپی هەڵگەڕابایە، ڕۆژێ سەد کیلۆ لۆکەمان کۆ دەکردەوە.

جەبار گوتی:

ـ دنیا زۆر پێش کەوتووە. خەڵکی ئێستای چوکوور تەنانەت کەڵەگەتریش بوون. ساڵی ساڵان هەموو بستەباڵا بوون. وا نەبوو؟

مام خەلیل بە خۆشییەوە گوتی:

ـ کوڕە بەو حاڵەی ئێستاشمەوە، بیست کیلۆ هەر کۆ دەکەمەوە.

جەبار:

ـ ئەمنیش...

مام خەلیل کە لە گوندەکەی خۆیان رایکردبوو و پانای بردبووە بەر گوندی "ئوزوون دەڕە"، وەختێك سەر هەڵدێنێ گەیشتووەتە ئاوایی ئینجەجیك. خۆیشی نەیدەزانی و لە بیری نەمابوو کە چۆن بە ئوزون دەڕەدا تێپەڕیوە و ڕەق هەڵنەهاتووە و چۆن لەو تاریکە شەوەدا کە بەفر و بۆران وەك دەواری شڕ دەیسووڕاندەوە، گوندی ئینجەجیکی دۆزیبۆوە؟ جگە لەوەش چۆن توانیبووی خۆی بگەیێنێتە ماڵی جەباری برادەری؟... هەر ئەوەندەی لە بیر بوو کە چاو هەڵدێنێ، سەیر دەکا جەبار ئەوە پێدەکەنێ و بەسەریدا نووشتاوەتەوە و کووپێك چای گەرمی بە دەستەوەیە و هەڵمی لێ هەڵدەستێ:

ـ جەبار، ئەمن چیم بەسەر هاتووە؟

ـ چیت بەسەر هاتووە خەلیل؟...

ـ ئەوە چەند رۆژە لێرەم؟
ـ پازدە رۆژێك دەبێ....
هەر ئەو رۆژە لە نوێن و جێ هاتە دەرێ و هەر ئەو رۆژە هەموو خەڵكی ئینجەجیك لە دەوری كۆ بوونەوە و مام خەلیل دەستی كرد بە قسەكردن:
ـ ئەوان شێت بوون. هەر لە بچووك و گەورەوە، لە حەوت ساڵان هەستا حەفتا ساڵان هەر هەموو شێت بوون. تاشباشیش شێت بووە، كوێخا سەفەریش. ئەو مریەمۆكەش یەكسەر تێك چووە. هەر ئەم رۆژانە دەیبیستنەوە كە خەڵكی ئەو گوندە یەكتریان كوشتووە و یەكتریان خواردووە. ئەوە دەیبینی، خەبەرەكەی دەبیستنەوە كە ئەو گوندە جووقەواری لێ براوە و چۆڵ و هۆڵ بووە. ئەگەر بیستتانەوە هیچ پێتان سەیر نەبێ.
هەموو رۆژێ حەقایەتێكی پێكەنیناویی بۆ خەڵكی ئەو گوندە هەڵدەبەست و بۆ خەڵكی گوندەكەی دەیگێڕایەوە و خەڵكەكە ئەوەندە پێدەكەنین دەبوورانەوە. بەڵام چەندی بە گاڵتەوە مەسەلەكەی پێكەنیناوی دەكرد، رۆژ بە رۆژ لە خەڵكی یالاك پتر بە قینندا دەچوو. هەموو جارێكیش قسەكەی خۆی ئاوا تەواو دەكرد:"چۆنی تاشباش گوتوویەتی هەر وا دەبێ. ئەو گوندە ماری بەسەردا دەبارێ و خەڵكی ئەو گوندە هەر یەكە و مارێك هەڵیدەلووشێ. مریەمۆكیش و تاشباشیش...." خەڵكی ئینجەجیك چەند پتر پرسیاریان لێ دەكرد، بۆیان روون نەدەبۆوە كە ئەو كابرایە بۆچی ئەوەندەی رق لە خەڵكی گوندی یالاكە. دەیانگوت:
ـ خوا بۆخۆی دەزانێ ئەو خەڵكە هیچ و پووچەی یالاك چییان بەسەر ئەو پیرە پیاوە هێناوە كە ئاوا لەو بەفر و بۆرانەدا ملی رێیەی گرتووە و بە پێر مەرگەوە چووە. هەر خودا دەزانێ.
مام خەلیل لە دەم ئاگردانەكە پاڵی لێ دایەوە. لەماڵێ وەدەر نەدەكەوت. جار و بارەش بە ترسەوە سەیرێكی دەرەوەی دەكرد و لە جێی خۆی دەردەپەڕی و دەیگوت:"دەمكوژن. ئەو هیچ و پووچانە دەمكوژن، ئەو فیرعەونانەی یالاك دەمكوژن."
دەیگوت و لە ترسان جینگڵی دەدا. لەو ئاخرییانەدا خەویشی لێ نەدەكەوت. لانیكەم حەوتووی جارێك و داواشی لە هەموو خەڵكی ئینجەجیك دەكرد گەردنی ئازاد بكەن. دەیگوت:
ـ ئەمن پەنام هێنایە گوندەكەی ئێوە. گوندێك كە شیر و ماست و هەنگوینەكەی بەپێی فیلانە*، بەو دارە سنەوبەرانەیەوە، بەو سەوڵە كێوییانەیەوە، بەو خەڵكە باشەیەوە كە دڵی كەس

---

* بە پێی فیلانە: واتە زۆر و زەوەندە.

ناشکێنن. بە حاڵی سەگ گیانی نیوەزیندووی خۆمم گەیاندە ئینجەجیك و لای خەڵکەکەی. بەڵام دیسان رزگارم نەبوو. جەبار بۆ من لە برا نزیکترە، خوێن و دڵمە، کەس لە ئەسپ دزینێ ناتوانێ بڵێ جەبارم. تەنانەت ئەمنیش. ئێستاش ئەوە هاتووم و پەنام هێناوەتە ماڵەکەی ئەو، دیسانیش رزگارم نەبوو. دیسانیش نەمتوانی گیانی شیرینم لە دەستی خەڵکی یالاك رزگار بکەم. وەرن گەردنم ئازاد بکەن. ئەمڕۆش نەمکوژن سبەی هەر دەمکوژن.

"ئەنگۆ ئەو زاڵمانە ناناسن... هەر نایانناسن. ئەمن بوومە هۆی ئەوەی ئەوان درەنگ بچنە لۆکە رنینێ. ئەوانیش ئەسپیان نەدامێ. ئەمنی پیر و پەککەوتە بەو قوونە خاوێنەمەوە، چۆن دەمتوانی هەتا چوکوور بە پێیان لەگەڵیان بڕۆم؟ ناچار بووم درەنگ بیانبەمە چوکوور. کە گەیشتنێ، خەڵکی دێهاتەکانی دیکە، کێڵگە بە پیتەکانیان گرتبۆوە و بەسەرخۆیاندا دابەشیبوون و خەڵکەکەی ئێمەش دەست لە گونان درێژتر، تەنانەت کیلۆیەکیشیان بۆ خڕ نەبووەوە و سەریان لە دوو نام کە لەتوپەتم بکەن. ئەمنیش رام کرد و چوومەوە ئاوەدانی. لە کادێنەکەماندا خۆم شاردەوە. ئەو حاجییە چڵمنە ئەوە بە ملی شکاوی کوڕمە، هات و لەوێ دۆزیمییەوە و دەسبەجێ چوو بە هەموو خەڵکەکەی گوت ئەوەتا بابم لە کادێنەکەدا خۆی شاردووەتەوە. خەڵکی گوندەکە بە پانەوە، بە ژن و منداڵ و گەورە و بچووکەوە، هورووژمیان بۆ هێنام و جلوبەرگیان لەبەرمدا تیتۆڵ تیتۆڵ کرد. لە نەکاو سەیرم کرد ئەوە ئاگرێکی گەورەی هێندەی جێ خەرمانێکیان لە نێوەندی ئاوایی کردووەتەوە و دەیانەوێ رووت و قووتم بکەنەوە و بمخەنە سەر کڵەکەی. گوتم "ئەی خوایەگیان فریام کەوە" و رامکرد و بۆی دەرچووم. چیی خەڵکی یالاك بوو و مرێمۆکیش لە پێش هەمووانەوە، ئەو قەحپەیەی میللەتان، سەریان لە دوو نام و نەیانگرتمەوە. راستەڕێ رۆیشتم و لە ئەشکەوتەکەمدا خۆم شاردەوە و دواییش هاتمە ئێرە. پەنام بدەن... داڵدەم بدەن."

بەو جۆرە زستان تێپەڕێ. ترسەکەی مام خەلیل خەڵکی ئینجەجیکیشی گرتەوە. ئەوانیش ئەو گومانە دایگرتن و پێیان وابوو هەموو شەوێ بە هەزاران کەس پەلاماری گوندەکە دەدەن و لە پێشدا مام خەلیل و دوای ئەو هەموو ئەوان سەردەبڕن. هاوین هات و تێپەڕی. هێشتاش هەر دەترسان و بە درێژایی هاوینێش ترسەکەیان پتر بوو. زۆربەی ئەوان گاڵتەیان بە ترسەکەی خۆیان و مام خەلیلیش دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا نەیاندەتوانی لەبیری بکەن.

حەوتووەك پێش پشکووتنی قۆزاخە بەرەو چوکوور داگەڕان. کە گەیشتنە چوکووراوا، دەشتەکە یەکسەر سپیی داگەڕابوو و یەك پەڵەشی نەمابوو. تەمێکی سپی و یەك دەست بەسەر چوکوور کشابوو.

ئەو شەوەی گەیشتنە چوکوور، مام خەلیل لەوانەیە دوای سالێك، ئەوە یەکەم جاری بوو بە خەیالێکی ئاسوودەوە دەنووست. کە لە خەو هەستا، رووناکی کردبۆوە و خۆر لە کەل دەرکەوتبوو.

گوندییەکان لە لایەکی مەزراکەوە دەستیان کردبوو بە لۆکەڕنینەوە و دەستەکانیان وەك مەکینە کاری دەکرد. مام خەلیل لە جێی خۆی هەستا. هەرچەندە حەزی لێ بوو بچێت و لە نێو دارە گەزەکاندا دابنیشێ و بە دەم جووتنی گەلا بۆنخۆشەکانی دارگەزەوە کارەکەشی بکات. هەر جارێکی دەگەیشتە چوکوور، هەر وای دەکرد. بۆ یەکەم جار نەریتی خۆی شکاند و بەبێ ئەوەی دەست و دەموچاوی خۆی بشوات و خۆی سووك بکاتەوە، چووە نێو لۆکەڕنەکانەوە. دەستەکانی ئەو هەر وەك شارەزای کردنەوەی گرێپووچکەی ڕیشمەی ئەسپەکان و بەنەکان بوو، ئاواش شارەزای لۆکەڕنینەوە بوو. لە نێو ئەو کۆگا لۆکانەدا کە هەتا نیوەڕۆ کۆیان کردبوونەوە، کۆگای مام خەلیل لە هیی هەموویان گەورەتر بوو. هەمووان سەیری ئەو کۆگایانەیان دەکرد و سەریان لە دەستوبردی مام خەلیل سووڕ مابوو:

ـ ئەو تەمەنە و ئەو دەستوبردە!!!!

ـ دووکەڵ لە کۆتەرەدار هەڵدەستێ...

مام خەلیل سێ ڕۆژی ڕەبەق بەبێ ڕاوەستان، بەبێ ئەوەی بە خەیالێکی ئاسوودە لە سەر خاکەکەی چوکووراوا خۆی بەتاڵ بکاتەوە و دەستێك بە ئاوێ بگەیێنێ، شەوی سێهەم ڕۆژ، لەو شیوەدا کە نووستبوو، بە هێمنی لە نێو دار گەزەکانەوە خزییە دەرەوە و هاتە لای کۆگا لۆکەکان. ماوەیەك لە سەر عەرزەکە درێژ بوو و چاوەڕێ ما و ئەوجار هەستا و ئەو کۆگا لۆکەیەی کۆی کردبۆوە، خستییە سەر کۆگای جەباری برادەری. ماوەیەك ڕاوەستا، کۆگای جەبار دوو هێندەی لێ هاتبۆوە، سەیری کرد و گەڕایەوە و کەوتە ڕێ. پێی نایە ڕێیەکی پڕ لە خۆڵەوە. لاقەکانی هەتا گوێزینگان لە خۆڵە نەرم و فێنکەکەدا ڕۆچوون.

گۆرانییەکی خەمینی وەبیر هاتەوە. لە ناخیدا جۆرە تەنیایی و بێکەسی و بۆشاییەکی هەست پێ کرد. کە خۆر دەرکەوت، گریانێك ئەوکی گرت. چەند دلۆپە فرمێسکێك لە چاوەکانی هەڵوەرین و دوای ئەوەش تەواو بوو. پێکەنی و بەخۆی گوت:

ـ کوڕە مام خەلیل لە ژنت خراپتر بەسەر هاتووە... لە ژن خراپتر.

لە کێڵگەکەی تەنیشتیانەوە، گوندییەکان کە لە جلوبەرگەکانیانەوە دیار بوو خەڵکی تۆرووسن، لۆکەیان کۆ دەکردەوە. چووە لایان. شەلاڵی ئارەقە بوو. پاڵەی لۆکەش هەموو

شـەلاڵی ئارەقـە بـوون. گەرماکـەی بـە تـەوژم بـوو. سـڵاوی لـێ کـردن. هـەر هـەموو کرێکارەکان قیت بوونـەوە و سـەیریان کـرد و دیـسان داهاتنـەوە و لـە سـەر کارەکـەیان بەردەوام بوونەوە.

مام خەلیل کە لە نێویاندا بە تەنێ مایەوە، لە پیرەپیاوێك چووە پێشێ و پرسیی:

ـ براله، پرسیارێکم لێت هەیە.

پیرە دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و گوتی:

ـ پرسیارەکەت بکە با بزانم چییە برا.

مام خەلیل بزەیەکی هاتێ و دەمودەست بزەکەی سەر لێوانی رەوییەوە. نێوچاوانی تێك نـا، بەڵام ساتێك دواتر دیسانیش بزەکەی لە لێوی گەڕایەوە و گوتی:

ـ ئەتۆ ناوی گوندی یالاکت بیستووە؟ ئەمن خەڵکی ئەوێمە. مام خەلیلم پـێ دەڵـێن. خـەریکم بـە شوێن گوندییەکانی خۆماندا دەگەڕێم. ئەتۆ دەزانی لە کوێ خەریکی لۆکە رنینەوەن؟

پیرە پیاوەکە بە سەر سووڕماوییەوە پرسیی:

ـ ئەتۆ مام خەلیلی؟ ئەو مام خەلیلەی گرێپووچکەی کۆت و بەندان دەکاتەوە و کـام دەرگـا قایمە دەیشکێنێ و تەنانەت ئەسپی پادشا و کوێرئۆغڵووش دەدزێ و دەیبا ئەتۆی؟

مام خەلیل کە دیتی پیرە ئاوا دەیناسێ، زۆری پێ سـەیر بـوو. گریانێـك لـە ئـەوکی گـیرا. شەپۆلی گریانێك هات و گیانی لەرزاند و هەر ئەوەندەی پێ گوترا بڵێ:

ـ ئەمنم.

هەر قسەیەکی دیکەی کردبایە، زۆرِ زۆرِ دەگریا. پشتی لە پیرە پیاوەکە کرد و خێـرا لـەوێ دوور کەوتوە. پیرە و پاڵە هـەموو پـشتیان قیـت کـردەوە و راوەسـتان و سـەیریان کـرد کـە بـە خێرایی دوور دەکەوتەوە. مام خەلیل لە مەزراکان چووبووە دەرەوە و گەیشتبووە سـەر رێگەکـە و غاری دەدا. هەم غاری دەدا و هەم دەشگریا.

"مام خەلیل هەڵۆی کوێستان، چۆن دەبوو تووشی بەو رۆژە رەشە بێ؟ تف لە تۆ هەی دنیا. کاولی بی دنیا.

لەو حاڵەدا کە بە خێرایی دەڕۆیشت، تووشی گەنجێکی چوارشانە بوو کە هەموو قۆپچەکانی کراسـەکەی کرابوونـەوە و تووکـە رەشـەکانی سـینگی دیـار بـوون. ردێـنی رەش و گلوگلـوو و چاوەکانیشی درشت و پڕ لە تووڕەیی بوون. مام خەلیل لێی دڕدۆنگ بوو. گەنجەکە وا دەڕۆیشت تەپوتۆزی لە عەرزەکە هەڵدەستاند و دەتگوت دەیکێڵێ.

"هەی ی ی ، مام خەلیل، ئەتۆش بە گەنجی ناوا بووی. وەك باز. ئێستاش کەس سەیریشت ناکا. تەنانەت کەسیش نایەوێت بتکوژێ... ئاگری دەدەم. ئەو گوندە گڕ دەدەم و دەیسووتێنم. با بزانم دیسان بە پیاوم دانانێن."

ڕێبوارەکە نزیك بۆو. مام خەلیل لایدایە قەراغ ڕێگەکە. کە بەلایدا تێپەڕی، بە دەنگێکی خۆمانەوە گوتی: ڕاوەستە برالە." ڕێبوارەکە ڕاوەستا. کەڵەگەت بوو. متمانەبەخۆیی لە ڕوخسارییەوە دیار بوو. سەری سمێڵی لای ڕاستی لە لای چەپەی درێژتر بوو و شۆڕ ببۆوە بەلای چەناگەیدا. مام خەلیل هەستی پێ کرد. تیسکێ لە کاکۆڵە ڕەشەکەی کەوتبووە سەر تەوێڵی و لوول ببوو. کاکۆڵە ڕەشەکەی ئەو ڕوخسارە پیاوانە و تووڕە و لەخۆباییەی بڕێك منداڵانە نیشان دەدا.

مام خەلیل دڵی زۆر بە توندی لێی دەدا. بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و گوتی:

ـ هەر بژی برالە. کاری چاکت کرد ڕاوەستای.

ڕێبوارەکە بڕێك گەشایەوە. شەلاڵی ئارەقە بوو و هانکەهانکی بوو.

ـ خەڵکی یالاك لە کام کێڵگەن؟ ئەمن مام خەلیلی گوندی یالاکم.

گەنجەکە نێوچاوانی تێك نایەوە و وەك پێشووی لێ هاتەوە:

ـ کوڕە ئەمن هەر ناوی ئەو گوندەشم نەبیستووە تا بزانم خەڵکەکەی لە کوێ لۆکە خڕ دەکەنەوە. و دەستی وا ڕاوەشاند دەتگوت مێش هەڵدەفڕێنێ.

ـ ئەتۆ ناوی مام خەلیلت هەر نەبیستووە کە ئەسپی شا و پادشا و شاباز و ئاغاکان و تەنانەت ئەسپی کوێر ئۆغڵووشی دەدزی و دەرگای لە شکاننەهاتووی بە ئاسانی دەکردەوە و زنجیری قایمی دپساند و گرێپووچکەی دەکردنەوە؟

ڕێبوارەکەی ساتێك سەری سووڕ ما، بەڵام دەسبەجێ وەخۆ هاتەوە و بزەیەکی هاتێ. بزەیەکی میهرەبانانە کە هەموو ڕوخساری داگرت و گوتی:

ـ هەر نەشمبیستووە. ئەمن لە ژیانما ئەسپ دزم نەدیتووە. گرێپووچکەی کۆت و پاوانیش هەر نازانم بە چییش دەڵێن.

دیسان وەك پێشوو کە دەتگوت مێش لەخۆر دەردەکا، باسکی ڕاوەشاندەوە و کەوتەوە ڕێ.

دەستی لە ڕۆندا ڕەش ببوو، مام خەلیل ئەوەشی لێ نەشاردرایەوە. بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ کوڕە سەیری ئەوە، سەیری ئەوە، سەیری ئەو مل شکاوە درۆزنە بکە. چاو چاو، ئەو دەستە پیس چەورانەی. نە گوندی یالاك دەناسێ و نە ناوی مام خەلیلی بیستووە. کۆت و

سندمیشی نەدیتووە. سەیری بکە. ئای لەو کەرە. ئەتۆ بەو ئەقڵەتەوە لەم دنیایەدا چ دەکەی؟ سەگی سەگباب هەر وا بەرەڵڵا بەرەڵڵا دەخولێیتەوە و بەو دەست و سەر و دەموچاوە رۆناوییەوە.. بەو ئەقڵەتەوە دیارە هەر وا بەرەڵڵا و سەرگەردان دەبی. تف،... گوندی یالاك ناناسیٚ. ناوی مام خەلیلیشی نەبیستووە. کوڕە ئەتۆ یان ئەقڵت نییە، یان زۆر زۆر کەری، بۆیە ئاوا سەرگەردانی. لە پێدەشتەکەی چوکووراوادا بە سەر و دەموچاوی چەورەوە...

هەتا کابرا لە چاوان نەدیو بوو، مام خەلیل هەر وا جنێوی پیٚ دا و ئەوەندەی گرماند هەتا لێوارەکانی زاری کەفیان کرد. لەو جەنگەیەدا عارەبانەیەك لەو لایەوە دەرکەوت کە کابرا بەرەو ئەویٚ رۆیشتبوو. گەنجێکی نزیك بە شانزە ساڵانەی تێدا دانیشتبوو و هێشووە ترێیەکی پیٚ بوو کە دەنك دەنك دەیخوارد. کە چاوی بە مام خەلیل کەوت گوتی:

ـ سوار بە مامە گیان.

ئیتر مام خەلیل وەك گەنجێکی گورج و گۆڵ خۆی خستە سەر عارەبانەکە و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەسپێکیانی سپییە و یەکیان کوێت. ئەو جووتە پێکەوە لە عارەبانە بکرێن، خێری پێوەیە.

ئەوجار بە خۆی گوت:

"بەڵام ئەتۆش درۆزنێکی سەیری ها خەلیل... دووریش نییە. لەوانەیە هەر بە راستی خێریشی پێوە بیٚ. ئێمە چووزانین ئەو دنیایە بەری بە کوێوەیە. چ شتێك بەفەڕە و چ شتێك بیٚ فەڕە."

گەنجەکە هێشووە ترێیەکەی بۆ راداشت و فەرمووی کرد. مام خەلیل ترێیەکەی لیٚ وەرگرت و سەیرێکی کرد. گەنجەکە چرکەیەك دەستی رادەگرت و سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکرد و ئەوجار دەنکە ترێیەکی دەخستە زارییەوە. مام خەلیلیش وەك ئەو دەستی پیٚ کرد. گەنجەکە پرسی:"مامە گیان، ئەوە لە کوێوە بۆ کویٚ."

مام خەلیل نەیتوانی بڵیٚ ئەمن مام خەلیلم و بە دوای خەڵکی یالاکدا دەگەڕێم. خەلیل زۆر کەیفی بەو گەنجە هاتبوو و نەیدەویست نێوانیان تێك بچیٚ. گەنجەکە نیگایەکی شاد و گەشی هەبوو، چاوەکانی درشت و درەوشاوە بوون. نەرم و نیانی لە روخسارییەوە دەباری. سەر و گوێلاکی نوقمی خۆڵ و خاك بوون. چەپکیٚ لە کاکۆڵی کەوتبووە سەر نێوچاوانی و لە بن تیشکی خۆرەکەدا خورمایی ببوو. وردە وردە تووڕەییەك گیانی مام خەلیلی دەتەنییەوە. خۆ

ئەگەر ئەو گوندە بە قورگیراوە تاقە گەنجێکی ئاوای تێدا بوایە، مام خەلیل لە چنگی مەرگ نەجاتی دەبوو. وەلأمی دایەوە:

ـ خەریکم را دەکەم. دەیانەوێ بمکوژن رۆڵە گیان، دەیانەوێ خوێنم بخۆنەوە و کەولم بکەن. دوژمن زۆر زالمە رۆڵە گیان، وەزعم زۆر شڕ و شپرزەیە کورم.

ئەوجار بۆی گێڕایەوە کە چۆن گوندییەکان رووتیان کردووەتەوە و ویستوویانە بیخەنە نێو ئاگرەوە و گوتیشی چۆن پەنای بردووەتە بەر گوندی ئینجەجیك. جا ئەو جارە باسی خەڵکەکەی ئینجەجیکی بۆ کرد.

ـ سەیرم کرد نیوە شەوە... پێنج کەسی ملهوڕ ئەوە بە دوومدا دەگەڕێن. پێنج تارمایی وا بەرەو لام دەهاتن هەر مەپرسە. یەکێکیان دەیگوت:"کوڕە لێی گەڕێن ئەو پیرە لێقەوماوە. هانای هێناوەتە بەر ئەو گوندە." ئەویتر وەلأمی دەدایەوە:"ئێمە خەڵکەکەی یالاك بەڵێنمان داوە، جا چونکە ساغ بووینەتەوە دەبێ ئەو پیرەپیاوە بکوژین." ئەمن دەسبەجێ لە پشت پۆلە گەزێك خۆم مات کرد. هاتن و سەیریان کرد کەسی لێ نییە. ئەمن هەتا بەیانی هەر وا لە بن پنچکێکەوە خۆم خزاندە سەر پنچکێکی دیکە هەتا خۆم گەیاندە رێگەکە و خەریك بوو دەڕۆیشتم کە ئەتۆ بە عارەبانەکەتەوە گەیشتیت و سوارت کردم. کوڕە بنیادەمی باشی وەك تۆ هیچ کات چاو لە دەست و جەوجێیان بە کەس نابێ. حەزرەتی خدۆ هەمیشە یار و پشت و پەنای خەڵکی باشە. کە حەزرەتی خدر بیەوێ دەستی یەکێك بگرێ، ئیتر خەمت نەبێ. دڵنیا بە یارمەتیی تۆش دەکات. خۆ دیاریشە لەبەر چی. یەکەم لە بەر ئەوەی ئەسپێکت کوێتە و ئەویترت سپی.. ئەوەش بەخت و شانسی پێوەیە.

گەنجەکە پرسی:

ـ باشە مامە گیان، ئێستا ئەتۆ دەتەوێ بچیتە کوێ؟

مام خەلیل تاوێك راوەستا و خەیاڵ هەڵیگرت. ئەوجار پێکەنی و گوتی:

ـ لە شوێنێك دەگەڕێم مەرگی لێ نەبێ و مەرگ نەتوانێ بگاتە ئەوێ.

دەسبەجێ حاڵەتی روخساری گۆڕا. جۆرە خەم وپەژارەیەکی تاڵ لە روخساریدا دەرکەوت. دەست و لێوەکانی دەلەرزین. گەنجەکە دووپاتەی کردەوە:

ـ شوێنێك دەستی مەرگ نەیگاتێ؟ جا ئەوە کوێیە دەستی مەرگی ناگاتێ؟ پاشگەز بۆوە لەو قسەیە چونکە هیچی لێ تێنەگەیبوو. دیسان روخساری مام خەلیل گەش بۆوە و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ خۆ ئەگەر بزانم، هەر چرکەساتێکیش چییە ڕاناوەستم و دەچم.

هەر دووکیان هێشووە ترێیەکانیان خوارد و تەواویان کردن.

مام خەلیل دڵەڕاوکێی بوو. ئاخۆ دەکرا جێی خەڵکەکەی یالاك لەو گەنجە بپرسێ؟ لەو گومان و دوودڵییانەدا بوو کە لە دوورەوە پۆلێك پاڵەی لۆکە ڕنینەوەی دیت. دەسبەجێ خۆی لە عارەبانەکە فڕێدایە خوارەوە و گوتی:

ـ ئەمن دەچمە لای ئەو گوندییانە. لەوانەیە مەرگ دەستی بە لای ئەوان ڕانەگا.

گەنجەکە هێشووە ترێیەکی گەورەی دیکەشی لە زەنبیلەکەی پەنا دەستی هەڵگرت و داییێ و گوتی:

ـ ها مامە. ئەتۆ زۆر لەڕ و لاواز بووی. بێت و ئاوا بڕۆی، مەرگ زۆر زوو دەستی دەتگاتێ.

مام خەلیل هێشووە ترێیەکەی وەرگرت و گوتی:

ـ بەخێر چی کوڕم. یاخوا بەردی سارد و گەرمت نەیەتە سەر ڕێ. چاوەکانت ماچ دەکەم.
ئەوجار بە خێرایی بەرەو کێڵگەی لۆکەکە وەڕێ کەوت.

خــــەڵكی یــــالاك دەگەنــــە

چوكووراوا.

# ٣

ئیزگیلەكان وەك بڵێسەی گڕ گەیشتبوونێ و مەودای نێوان خانووەكانیان پڕ كردبوو. گوندی یالاك جموجۆڵی كۆچكردن بەرەو چوكووراوای تێ كەوتبوو. گوندی، لە منداڵی حەوت ساڵانەوە هەتا پیری حەفتا ساڵانە ئۆقرەیان نەبوو. هاتوچۆ و قریوە و دەنگەدەنگ... گوندەكە قیامەتێك بوو. هەموو ساڵی كاتی كۆچكردن بەرەو چوكووراوا گوندەكان ئاوا دەبوونە قیامەت.

تەنیا یەك نەفەر بەشداری ئەو هەڵلا و هەنگەمەیە نییە و هەر لە دوورەوە دەڕوانێ و ئەویش "عەلی"یە درێژە. دەست لە ڕەش و سپی نادا و هیچ هەوڵێكی نییە. وەك ئەوانەی بە دەم خەوەوە دەخولێنەوە، بە گوندەكەدا دەخولێتەوە و كەس ئاوڕێكی لێ ناداتەوە. هەر كەسە و سەری بە كاری خۆیەوە قاڵە و كەس كاتی وەی نییە بیر لە ئەوانیتر بكاتەوە...

پێش هەمووان ئۆككەش داغ قۆردوو بوو كە ئاوای دیت و بیسمیللایەكی كرد و گوتی:

ـ ئەوە بۆ وای، عەلی؟ بەیانی بەر لەوەی خۆر دەركەوێ گوند وەڕێ دەكەوێ. كەچی ئەتۆ دەستەوستان دانیشتووی و ناجوولێی. نەكا ئەمساڵ بڕیارت دابێ نەچیتە چوكوور؟ عادیل پیاو كەوڵ دەكا و چاوی دەردێنێ و دەڕپێی لەبەر دادەكەنێ و كراسەكەشی هەر وا. عادیل گوندەكەمان بەسەردا وێران دەكا.

دوای ئەوە هەواڵەكە بە دێ وەربوو كە عەلییە درێژ ئەمساڵ ناچێتە چوكوور. لە یەكتریان دەپرسی باشە بۆ؟ دەیانخستە سەر زیرەكی و فێڵبازییەكەی. دیارە شتێكی لە بن سەری دابوو و

نهێنییەك لە گۆڕێ بوو. دیارە ئەگەر لە گوندی مابایەتەوە داهاتەكەی لە لۆكە رینینەوە پتر دەبوو. بەڵام لە كوێوە؟ لە چ رێیەكەوە؟ گەڕان و گەڕان كەچی هیچیان نەدۆزییەوە كە داهاتی بۆ عەلی تێدابێ.

یەكێكیان بیرێكی نوێی بە مێشكیدا هات:

- "عەلی"یە درێژ و تاشباش یەكتریان زۆر خۆش دەویست و موویان لەبەرەوە نەدەچوو. دیارە عەلی ئەمساڵ لە گوندە چۆڵەكەدا دەمێنێتەوە و چاوەڕێی تاشباش ئەفەنییەكەمان دەبێ.

- تاشباشی سەروەرمان قەرار وایە ئەو كاتەی هەموو دەچنە چوكوور، بێتەوە ئاوایی و دیاری بۆ عەلی بێنێ.

عەلی چاوەڕێی ئەوە. بۆچی چاوەڕێ نەبێ، برایەكی هەیە وەلییە... تاشباشی مەزنمان ئامادەیە دایك و ژن و منداڵەكەی لە بیر بكات، بەڵام "عەلی"یە درێژ هەرگیز لەبیر ناكا.

- وەفاداربوون بە دۆست و برادەر شیاوی وەلییەكانە.

- لێی گەڕێن با چاوەڕێ بێ هەتا تاشباش بێ و بەرەكەت لەگەڵ خۆی بێنێ، سلامەتی بێنێ. جارێ لێگەڕێن با سەروەرەكەمان بێتەوە...

ئیتر هیچ كەسێك قسەی لەگەڵ عەلی نەكرد و كەسیش هیچی لە عەلی نەپرسی.

هێشتا رووناكی نەكردبۆوە كە قریوە و دەنگە دەنگ و هات و چۆ لە ئاواییەكەدا دەستی پێ كرد. هەڵڵا و قریوەیەك بەرپا ببوو كە هەموو دەشتەكەی داگرتبوو و زەوییەكەی دەلەرزاندەوە. ئەو قریوە و هەڵڵایە بێ بڕانەوە هەر بەردەوام بوو و ئەوجار لە نەكاو بڕایەوە. ئێستا ئیتر لە شیوەكەی خوارەوە تەنیا دەنگی وێككەوتنی تەنەكە دەبیسترا و دوور دەكەوتەوە. عەلی ئەوەندەی گوێ هەڵخست هەتا دوایین دەنگی تەنەكە لە دوورەوە كپ بوو. ئەوجار بێدەنگییەكی خەست هەموو وڵاتی داگرت.

لە جێوبانەكەی هاتە دەرێ و چووە دەرێ. مانگەشەوێكی خۆش و ساماڵ هەموو وڵاتی رووناك كردبۆوە. كەلێنی نێوان خانووەكان پڕ ببوو لە ئیزگیلی سوور و بریقەدار. شنە بای بەیانی بە سەر یەكتریدا دەدان.

سەیری كوێرە رێیەكەی كرد كە لە بن تریفەی مانگەكەدا وەك شریتێكی باریك كشابوو و وەك رووبارێك هەتا سەر گردەكە دەچوو. گردە نووك تیژەكە سێبەری كەوتبووە سەر باریكەڕێیەكە. لەوێ ئەو تۆز و خۆڵەی بەهۆی تێپەڕینی كاروانەكە هەستابوو، خەریك بوو وردە وردە دەنیشتەوە.

شنەی بەیانی نەرم باڵی بەسەر روخساریدا هێنا. برێك وەخۆ هاتەوە. لە سەر بەردێك دانیشت و سەری لە نێوان دەستەكانی خۆی نا. هەتا خۆر كەوتنان هەر وا مایەوە.

ئەلیف لە جێیەكەیدا جووڵەی نەكردبوو و هەتا تاو هەڵات، ددانەكانی لە سەر یەك داگرتبوون و گوێی دابووە ناڵەناڵ و بڵمەبڵمی مرێمۆك.

كە هاتە دەرێ، سەیری كرد مێردەكەی لە سەر بەردێك هەڵكورماوە و دانیشتووە و هەر وا ماوەتەوە. نقورچێكی تێ كوتا:

ـ عەلی، عەلی، هەستە دەی.

عەلی دەستەكانی لە نێوچاوانی كردەوە و ئاوڕی لە لای ژنەكەی دایەوە و پرسیی:

ـ دەڵێی چی ئەلیف؟

هیچ شتێك لە دەنگەكەیدا نەبوو. دەنگە بەتاڵەكەی ئەو لە بێدەنگییەكەدا دەنگی دایەوە. ئەلیف گوتی:

ـ دایكت هەتا بەیانی ناڵاندوویەتی. گوێم لێ بوو. یەك پشوو دەیگوت:"كوڕە داماوەكەم، لە بەر من نەیتوانی قەرز و قۆڵەی بداتەوە. لای خەڵكی حەیای چوو. ئەمساڵیش لە بەر من ناتوانێ بچێتە لۆكە رنینەوە و منداڵەكانی رووت و قووت دەبن. وا باشترە خۆم بكوژم و رزگاری بكەم." دایكت زۆر بەغیرەتە. هەر بە راستی لەوانەیە خۆی بكوژێ. دەڵێی چی عەلی؟

ـ نازانم.

ـ ئەگەر نەچینە چوكوور، دایكت خۆی دەكوژێ.

تاوێك دواتر مرێمۆك لە حاڵێكدا خۆی دابووە سەر تێلاكەی، لە ماڵێ هاتە دەرێ. قسەكانیان بە نیوەچڵی مانەوە. مرێمۆك وەك گوڵێكی گەش پشكوتبوو و گەنجتر ببۆوە. وەك بیست و پێنج ساڵ لەوە پێشی لێ هاتبوو. شادیی لێ دەباری. پشتە كۆماوەكەشی قیت ببۆوە. هەر دەتگوت بە پێی عادەت و لە خۆوە دارەكەی بە دەستییەوە گرتووە. هات و بەرانبەر عەلی راوەستا و گوتی:

ـ عەلی گیان، یاخوا بە قوربانت بم. كوڕم. سەیر بكە رۆڵە، سەیری من بكە بزانە چۆنم؟ گورج و گۆڵ. وەك مامز. دایكی خۆت دەبینی؟

عەلی راچڵەكیبوو. ئەو ژنە بە كەیفەی دەڵێی نوێ بووكە، هەر بە راستی دایكی ئەو بوو؟ بڕوای نەدەكرد. چاوەكانی هەڵگلۆفین و روانیی. لە خۆشیان نەیدەزانی چ بكا. تاوێك زمانی لە گۆ چوو. ویستی شتێك بڵێ زمانی نەگەڕا. ئەوجار بە پەلە پەل گوتی:

ـ هەر دەڵێی مامزی، وەك مامز... پێم سەیر بوو. چما ناوی ژیانت خواردووەتەوە دایە؟ ئەو ئەسپە سپیەکەی کوێر ئۆغڵو، وەك مامزت لێ هاتووە دایە وەك مامز. قیت و قۆز و بە کەیف.

مریەمۆك لە حەوشەکەدا بەو لاو ئەولادا دەڕۆیشت، جاری واش بوو غاری دەدا، قەڵەمبازی داویشت و هەڵدەبەزی:

ـ عەلی گیان، کوڕم، ئەتۆ دایکی خۆتت پێ چییە؟ دایکی تۆ ئاوایە. ئەمن هەتا چوکوور و تەنانەت هەتا دەریای سپییش ئاوا دەڕۆم. ئەتۆ لە بەر من لێرە مەمێنەوە. ئەمن ئیتر هەرگیز نابمە باری سەر شان و بەڵای گیانی تۆ. ساڵی رابردوو لە بیر بکە. چۆن دەکرێ هەموو خەڵکی ئاوایی چووبنە چوکووراوا و یەکێك بە تاقی تەنێ لێرە بمێنێتەوە. چما دەکرێ؟ سەیر کە، سەیری دایکی خۆت بکە.

دارەکەی فڕێ دا و بە غاردان بە حەوشەکەدا رای دەکرد:

ـ دەی بڵێن ماشەڵڵا... ماشەڵڵا... ئەمن وەك پۆڵا پتەوم. هەی لە دەوری سەرتان گەڕێم منداڵە خۆشەویستەکانی خۆم. سەیرم بکەن، ها ها سەیر بکەن.

پشووی سوار دەبوو و چیی وای نەمابوو وەعەرز بکەوێ، بەڵام دانی بە جەرگی خۆیدا دەگرت و بە سەر پیری و کەنفتیدا زاڵ دەبوو. بۆ ئەوەی وا نەنوێنێ بێ تاقەتە، هەموو هێزی خۆی کۆ کردبۆوە:

ـ دیتان؟ دیتان؟ ئەمن ئاوام... ئاوا... وەك ئەسپی خۆشبەز دەگەمە چوکووراوا. کوڕی خۆم، ساڵی رابردوو بوومە بەڵای گیانت، خەتای پیرییەکەم نەبوو، لە داخی ئەو پیرە نەحلەتییە بوو. چما دەکرێ ئەمساڵیش باری ئەستۆی تۆ بم؟

بەبەلادا هات. پشووی لەبەردا نەما. چیی نەمابوو وەعەرزی بکەوێ... سینگی وەك دەفە لێی دەدا:

ـ بۆ تۆ.... بار... باری.... سەیر کە... ئەسپی خۆشبەز.... چوکوور...ااوا....

یەك دوو هەنگاوی نا. ئەژنۆکانی تینیان تێدا نەما و نووشتانەوە. مریەمۆك لەو کاتەدا کە بەلادا دەهات هەر دوو دەستی خۆی لە سەر عەرزەکە دانا و هەستایە سەر پێ. بەرەو ماڵەکەی رۆیشت و خۆی خستە ژوورەوە و نیوەبێهۆش لە سەر قەرەوێڵەکەی لێی تخێڵ بوو.

عەلی خۆی پێ نەگیرا. هەرای کرد:

ـ دایە... دایە... ئەوەندە خۆت مەخۆوە. مانەوەم لێرە لە بەر تۆ نییە. سوێندت بۆ دەخۆم. بە گیانی منداڵەکانم لە بەر تۆ نییە.

بە سەر دایکیدا نووشتایەوە و دەتگوت نهێنییەکی زۆر گرنگی پێ دەڵێ، بە سرتەیەك پێی گوت:
- دایە گیان، بڕێك سەبرت بێ، ئەو کارە حیکمەتێکی تێ دایە. ئەتۆ بڕێك سەبرت بێ.
ئەوجار عەلی سەیری دەوروبەری خۆی کرد و زاری بردە بن گوێی مرێمۆك و گوتی:
- باشە، جوان گوێت لێ بێ بزانە دەڵێم چی. ئەو نهێنییە لای کەس نەدرکێنی ها. تەنانەت بە مێروولە و مەل و دەعبای کێوییشی نەڵێی....
مرێمۆك پشووی بڕێك هێمنتر بوونەوە و دڵەڕاوکێیەکەی دامرکایەوە. لۆچەکانی دەموچاوی ڕەوینەوە. چاوە خەفەتبار و تارەکانی بریسکانەوە. تۆزە سوورایيەك لە کوڵمەکانی گەڕا. مرێمۆك قوت بوو. عەلی گوتی:
- ئەمن چاوەڕێی تاشباشم. لێرە دانیشتووم و چاوەڕێی تاشباشە مەزنەکەمانم. لەوانەیە سەرێك لێرە هەڵێنێتەوە وئەو ژیانە شڕ و شپرزەی ئێمە ببینێت و بەزەییەکی پێماندا بێتەوەو بە هانامانەوە بێ... هەروەها چاوەڕێی ئەحە شێتۆکەیشم.
مرێمۆك خۆی دایە سەر دەستەکانی و بڕێك هەستا و چاوی لە چاوەکانی "عەلی"یە درێژ بڕی و ماوەیەك بە قینەوە سەیری چاوەکانی کرد و گرماندی:
- جوان جوان سەیرم بکە بزانم.... ئەوە تۆ بە شێتم دەزانی... ها؟.... ئەوجار بێدەنگ مایەوە و بە بێهێزییەوە خۆی خستە سەر قەرەوێڵەکەی. دوای ئەوەی چەند پشوویەکی قووڵی بە دوای یەکدا کێشا گوتی:
- ئاخ... ئاخ... تاشباش ئۆغڵوش بنیادەمێکە وەك من و تۆ. بەڵام، ئەحە شێتۆکەی بەستەزمان، ئەو کوڕە ئازیزەی من لە کوێیە؟
- چاوەڕێی ئەوم دایە.... چاوەڕێی ئەو...
مرێمۆك بزەیەکی تەوساویی هاتە سەر لێوی. عەلی ئەو بزەیەی دیت. خەم و پەژارە و شەرمەزارییەکی لە رادەبەدەر ناخی داگرت. ئیتر نەیتوانی سەیری دایکی بکاتەوە.
مرێمۆك بڕوای بە هیچ کام لە قسەکانی ئەو نەکردبوو. عەلی ناچار بوو، پەنا بەرێتە بەر فێڵێکی دیکە. هەستایە سەر پێ، تۆزێك لە ماڵەکەیدا هات و چوو. ئەوجار دەستی لە کەلەکەی نا و قاقایەکی کێشا، مرێمۆك سەیری ئەو حاڵەتە منداڵانەیەی دەکرد. عەلی دەستی بەرز کردەوە و گوتی:
- دایە... ها... ها، ها... دەزانی ئەمن بۆچی ناچمە چوکوور؟ دەزانی بۆچی ناچم و لێرە دەمێنمەوە؟ دەی بزانم دەزانی بۆچی؟

بێدەنگ مایەوە و چەند هەنگاوێکی دیکەشی هەڵگرت و دیسان دووپاتەی کردەوە:

- دەی بزانم دەزانی، یائەڵڵا. دەی بیڵێ... بزانم دەزانی.

چووە دەرێ و هاتەوە ژوورێ.

- دەی بزانم دەزانی...

راووەستا و وەك نهێنییەکی زۆر گرنگی لا بێ، چاوەکانی بـە خۆشـییەوە لـە چـاوی دایکـی بڕی. ئەوجار دەنگی بەرزتر کردەوە:

- ئەمـسـاڵ لۆکـەی چـوکوور شـین نەبۆتـەوە. چـپی لۆکەیـە کرمـۆڵ بـووە. لـە چـوکووراوا وشکەساڵی بووە. چپی ئاوە وشکی کردووە. بۆ دەرمانیش گەڵایەکی سەوز دەست ناکەوێ. ئەو شتە ئـەمن دەیـزانم، گوندییـەکانیش دەیـزانن. دەزانـن کەچـی هـەر دەشـچن. دەی بڵـێ بـزانم، دیسانیش هەر دەبێ بچین؟ بچین و وەك ئەو گوندییە کەر و گەوجانە سەرمان لێ بشێوێ؟ ئـەوە دەشیبینی ئەو حەفتەیەش نەبێ، حەفتەکەی دیکە هەموو گوندییەکان دەگەڕێنەوە. دەست لـە گونان درێژتر. دەی دەڵێی دیسانیش هەر بچین؟ بچین و بە دەستی بەتاڵ و بـە شـێواوی و لاق و لەتەری بلۆق کردووەوە بگەڕێینەوە؟ها؟

مرێمۆك دیسان خۆی دایەوە سەر ئانیشکی.

- با بڕۆین کورم.... بەڵێ، ئێمە دەبێ بچین. چپی دەبێ با ببێ. ئەگەر لۆکەش نەبێ، ئەگەر تاقە یەك چرۆشی دەرنەکردبێ، ئەگەر هـەموو کانییـەکانیش وشـکیان کردبـێ و زەوییـەکـە لـە تینوێتیـان هـەڵبزرکێ و بـسووتێ، دیـسانیش چـوکووراوا هـەر چـوکووراوایە. دیـسانیش هـەر بەرەکەتی تێدایە. بۆیە نابێ تۆزێکی دیکەش راوەستین. دەبـێ بـچینە چـوکووراوا. کـوڕم نـابێ کات بە فیڕۆ بدەین.

عەلی بە هەموو هێزی خۆیەوە گۆڕاندی:

- ناچم. ئەمن وەك ئەو خەڵکە گەوج و کەرە شێت نیم. نیم... شێتی نیم. ئەمـساڵ خـاکی چوکووراوا خۆڵەمێشە. وشك و بێ بەرهەم، سووتاو. دەی باشـە ئەگـەر هـەر مەبەسـت دیـتنی خاکێکی سووتاوە، خۆ لێرەش زۆرە.

مرێمۆك دیسان لە سەر گازەرای پشت لێی کەوتەوە و بە ناڵینەوە گوتی:

- دەبێ بچین. نابێ نەریتەکە بشکێنرێ. خۆڵەمێشیش بێ هەر دەبێ بچین. ئەگەر مەرگیش چاوەڕێمان بێ هەر دەبێ بچین. چوونەکە خێر و بەرەکەتی پێوەیە. هەر دەبێ بچین.

عەلی دەستی بەولاولایدا شۆڕ بوونەوە. گوتی:

ـ ئاخ، ئاخ دایە، ئاخ.

بە غاردان لە ماڵێ هاتە دەرێ و بەرەو گردە خۆڵەمێشییەکان وەرێ کەوت. لاقەکانی تێک دەئاڵان. بە غاردان لە تەپۆلکەکە ئاوەژوو بۆوە. پۆلە باڵندەیەك بە جیکەجیك بە سەریدا تێپەڕین. راوەستا و سەیری کردن کە وەك شەپۆل بەولا و ئەولادا دەڕۆیشتن. سەیری کردن تا نەدیو بوون. لەو دیو گردەکەوە شوێنێکی چۆڵ و دووره دەستی لێ بوو. کانییەکی بچووك لە داوێنی گردەکەوە هەڵدەقوڵی. لە دەم کانییەکەوە دارێکی رووت و بێ گەڵای لێ بوو. ئەو دارە لەوەتەی هەبووە، هەر وا بێ گەڵا بووە. عەلی گەڕایەوە و بەرەو کانییەکە چوو. باڵندەیەکی قاوەیی بەوێدا تێپەڕی و لەسەرخۆڵە رەشەکەی شیوەکە نیشتەوە. دوای ئەوەی لە رەوەزە نووك تیژەکان وەسەر کەوت گەیشتە کانییەکە. پاڵی دا بە دارێکی باریکەوە و دانیشت و چاوی لێك نان. دنیا، بە هەموو گوڵ و ئیزگیل و باڵندە و هەورەکانییەوە بە سەر سەرییەوە دەسووڕانەوە. دنیا لە خەڵوەتەکەی ئەو دا دەنگی دەدایەوە. حەزی لێ بوو بەبێ ئەوەی ئاوڕێ لە دواوەی بداتەوە، خۆی لە هەموو شتێك بدزێتەوە و را بکا، لە ماڵ و خێزان و لە مرێمۆك و ژن و منداڵ و لە مەل و کانیلە کەفچڕێنەکان، لەو دەشتە پڕ لە زایەڵەیە بە ئیزگلیە سوورەکانی و بە گورگەکانییەوە....

بە ترشەوە چاوی کردەوە. بریسکەیەکی وا بە گیانیدا هات وەك چەقۆیەکی لێ درابێ، لە جێی خۆی دەرپەڕی. چاوەکانی هەڵگلۆفین، تۆزێك چاوەکانی بە تیشك کەوتن و هیچ کوێی نەدی. ئەوجار بەرەو لای گردەکە رای کردەوە و لێی وەسەر کەوت. لە خوار گردەکەوە رێچکەیەکی سپی هەبوو کە بە پێچ و گەوە بەرەو چوکووراوا دەچوو و بە خۆڵ داپۆشرابوو. کەوتەوە بیر ئەو رۆژەی کە بۆ یەکەمجار دەریای دیتبوو. دەریا وەك شێتان کەفی هەڵدەخڕاند. گەورە و بە سام بوو. بۆنی خوێ تێکەڵی خاکە رەشەکە دەبوو. خاکی دەشتەکەش وەك دەریایەکە هەناسەی قووڵی دەکێشا. خاکی دەشتەکەش وەك دەریا سوێرە. خاکی دەشت دەڵێی دەریایە.

هەتا لای ئێوارێ لەسەر گردەکە راوەستا. بەبێ ئەوەی جووڵە بکات، چاوەکانی لێك نابوون. لە بەر پێیانی ئیزگیلە سوورە رەنگ ئاگرینەکان، خۆرەتاو، رێگە و خاکە رەشەکە و ئەو بەردانەی بۆنی نەعنەیان لێ دەهات... تۆزێك دواتر وەك بڵێی لە خەو هەستێ، بە لارە لار چیی وای نەمابوو وەعەرزی بکەوێ، وەخۆ هاتەوە. دانیشت. راستی و خەیاڵ لە ناخیدا تێکەڵاو بوون: چوکووراوا لەگەڵ دەریا و بۆنی خوێ و لۆکە و شەلتووك و تەراکتۆرە چەورەکان و هەزاران هەزار پاڵەی لۆکە بەپێخاوسی، کە وەك کۆگایەکی پەڕۆکۆن بە سەر رێیەکاندا بڵاو ببوونەوە، لەگەڵ تۆز و خۆڵ و ترۆمبیلە بریقەدارەکان، بە بەر چاویدا تێپەڕین. بۆ تاوێك ئەو

خەمەی فەرامۆش کرد کە وەك برینی چەقۆ و ژەهرێکی سەوز لە ناخیدا رەگی داکوتابوو. لە خۆشییان و بەهیواوە هەموو گیانی لەرزی. دەستی راستەی لە سەر گلێکە داگرت. تەپوتۆز بۆ ساتێکیش لەو رێیە نەدەبڕایەوە کە دەچووە چوکووراوا. ئەو بایەی بەرەو چوکووراوا هەڵی کردبوو، ئەو تۆز و خۆڵەی تێك دەکردەوە و دەیکردە باهۆز و گێژەڵووکە و کۆڵەکەی پێ دەکرد و بەرەو دارستانەکەی دەبرد. کۆڵەکەی تەپوتۆز لەوێ تێکەڵاوی لێڕەوارە سەوز و شین و تارەکە دەبوو. و ئەوجار کێڵگەکانی لۆکە و چوکووراوا... چوکووراوای نوقمی تەپوتۆ....

بە بزەیەکی شیرینەوە کە تۆزە سوورایییەکەی خزاندبووە روخسارە زەردهەڵگەڕاو و تێکسمڕاو و ریشنەکەی ئەو، بەرەو خوارێ ئاوەژوو بۆوە. کە گەیشتەوەماڵەوە خۆی پێ نەدەگیرا. بەرەو لای ژوورێ هەرای کرد:

ـ ئەلیف، ئەلیف وەرە دەرێ...

ئەلیف بە پەلە پەل هاتە دەرێ، کە روخساری مێردەکەی دی، مووچرکێکی پێدا هات بەڵام وەسەر خۆی نەهێنا. عەلی دەستی گرت و بردییە لای دیواری ماڵی جیرانەکەیان:

ـ دەبێ بچینە چوکووراوا. چارەیەکی دیکەمان نییە.

ـ دەی باشە، ئەی نەنە مرێمۆك چ لێ بکەین؟ ئەگەر بیبەین خۆ هەنگاوێکیش چییە ناتوانێ بە پێی خۆی بڕوات. ئەتۆش وەك ساڵی رابردوو ناتوانی لە کۆڵتی بکەی.

عەلی مۆرەی پشتی لەرزی و ئێسقانەکانی زریکاندیان:

ـ ئەمن چارەیەکی دیکەم دۆزیوەتەوە. بەڵام...

ژنەکەی لە خۆشیان چاوەکانی زق کردنەوە و گوتی:

ـ چ چارەیەك عەلی؟

عەلی دەستی لە سەر زاری ئەلیف دانا و گوتی:

ـ بێدەنگ، هاوار مەکە. هێواشتر...

ئەوجار دەستی لە سەر زاری ئەلیف هەڵگرت و بە سپایی و بە سرتەوە پێی گوت:

ـ گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی؟ دەست و پێت تێکەڵ نەیەن. جوان بیری لێ بکەوە. دایکم هەر لێرە لە گوندی بەجێ دێڵین تا دەگەڕێینەوە...

ئەلیف:

ـ بەتاقی تەنێ؟ بەتاقی تەنێ لەو گوندە چۆڵەدا؟ بەو پیری و کەنفتییە، لە نێو، ئەو هەمووە دڕندە و دەعبا کێوییەدا؟

ئێمە تا دەگەڕێینەوە ئێسك و پرووسكیشی لێ نامێنێتەوە.

عەلی بە خەم و خەفەتەوە سەری لەقاند:

ـ وایە، بەڵام تین و تاقەتی لەبەردا نییە. دەی باشە، ئەوەش نەبوو... نەبوو. بەخوای مابینەوە لێرە. لێگەڕێ با عادیل ئەفەنی بێ و گیانم لێ بستێنێ.

ئەلیف:

ـ ئەگەر بەجێی بێڵین و وەشوێنمان بکەوێ لە ڕێگا تێدا دەچێ. ئەگەر لێرەش بەجێی بێڵین، مەحاڵە لەو گوندە چۆڵەدا ڕاوەستێ. هەر چۆنێك بێ دەکەوێتە شوێنمان.

عەلی:

ـ وەڵڵاهی ئیتر گێژ بوومە.

ئەلیف:

ـ ئەمنیش هەر وا. هەتا گوندی دەگەڕێینەوە، لێرە شێت دەبین.

عەلی:

ـ لە خەفەتان. گوندی چۆڵ دەڵێی گۆڕستانە.

گوندەکە چۆڵ و بێدەنگ بوو. بێدەنگیی مەرگ... گوێت لە دەنگی باڵی مێش دەبوو. تەنیا سەگ و پشیلەکان تۆزە گیانێکیان وەبەر دێیەکە دەهێنا. ئەوانیش زۆری نەدەبرد سەری خۆیان هەڵدەگرت و دەڕۆیشتن. سەربانە گڵەکەی ماڵەکان کە مەترێك بەرز بوون بەو دووکەڵکێشانەیانەوە لە پاشماوە دارستانێك دەچوون کە دارەکانیان بڕیبێتەوە. گوندەکە وەك گردێکی خۆڵ، سپی دەچۆوە. ئیزگیلی سووری بریقەدار کەلێنی نێوان ماڵەکانی پڕ کردبوو. گوندەکە هەر دەتگوت هیچ کات زیندەوەری تێدا نەژیاوە. دەتگوت قوژبنێکی سرووشتە و شەقڵی نەشکاوە. وەك دەشتێکی چۆڵ و بێدەنگ و وەك لووتکەیەکی باگر وا بوو. بوونی ئەو سەگ و پشیلانەش وەزعەکەیان هیچ نەگۆڕیبوو، بەڵکو حاڵەتی خەفەتبارییەکەی گوندەکەیان توندتر دەکرد. باوێشکەکانیان، پشت کووڕکردنەوە و قرژبوونەوەی مووی لەشیان هەر هەمووی نیشانەی ئەو کەش و هەوایە بوونز ئەو گوندە لەمەودوا ببوە ژینگەی سەگ و پشیلان. هەر دەتگوت لە سەرەتای دنیاوە، ئەو گوندە شوێنی پشیلە و سەگ بووە. جێی خۆیان وا خۆش کردبوو، هەر دەتگوت ئەوان خاوەنی گوندەکەن.

عەلی سێ ڕۆژان، بەبێ ئەوەی دەم لە نان و ئاو بدات، هەر بە تەنیایی پیاسەی کرد و بیری کردەوە.

**مـام خـەلیل لـە کێڵگەیـەکی**
**لۆکـەدا دادەنیـشێ و چـاوەڕێی**
**هاتنی گوندییەکان دەبێ.**

## ٤

پێش هەمووان مەمی دیك بینیی. پێی وابوو جەواڵێکی پڕ لە کایە کە پاڵەی لۆکەڕنینەوەی پار بـەجێیان هێـشتووە. لێـی چـووە پێـشەوە. کـە نـزیکتر بـۆوە، جووتێـك چـاوی زەقـی دیـت کـە دەبریسکێنەوە. راچڵەکی و راوەستا. دڵی داخورپا. کۆمەڵێك تارمایی سەیر و سەمەرە و نوورانی بە بەرچاویدا تێپەڕین. بـۆ ساتێك نـەیزانی ئـەو تارمایییـە سـەیر و سـەمەرەیە چییە کـە دوو کـونی نوورانییشی تێدایە.. بەڵام کە بڕێکی دیکەشی لێ نزیك بۆوە، سەیری کـرد بنیادەمـە. بنیـادەم بـوو بەڵام نەدەجووڵا. تەنانەت چاویشی نەدەترووکاند. مەمی دیك تۆقی و پاشـە و پـاش گەڕایـەوە و بـە خێرایی بەرەو کەپرەکان رای کرد. گوندی کەپرەکانیان لە تەنیشت کێڵگەی لۆکەکەوە دروست کردبوو و خەریکی رێکوپێککردنی کەلوپەلەکانیان بوون. بەرەبەری ئێوارە بوو.

بە هانکەهانك گوتی:

ـ دیتم. هەر دوو چاوم کوێر بێ دیتم. بەو چـاوانەی خـۆم دیـتم. لـەوێ.... لـە نێوەڕاسـتی مەزراکە. تارماییەکی رەشی گرمۆڵەبوو، لە نێوەڕاستی ئەو تۆپەڵـە رەشـە تـەنیا جـووتێ چـاو دەبریسکانەوە. هۆ لەوێیە. وەك بەرد لەوێ کەوتووە. زۆر ترسام زراوم چوو.

مەزراکە وا سپی داگەڕابوو کە دەتگوت بەفری لێ نیشتووە، سپیایی بەفرەکـە گەیـشتبووە لێڕەوارەکەی کەناری رووباری جەیحان و لە قەراغ لێڕەوارەکەوە کە لە گردێك دەچوو، دەبڕایەوە.

گوندییەکان لە پێشدا تۆزێك راوەستـان و بیریـان کـردەوە، دوایـی گۆملیکـسیز ئۆغڵـو هەستا و گوتی:

ـ هەتیو، نەکا دیسان خەون و خەیاڵ هەڵیگرتووی. ئەو تارماییەش حەوت تۆپەڵە نووری گەورەی بە دواوە بوو؟

مەمی دیك گوتی:

ـ نوورەکانم نەدی. بەڵام چاوەکانی دەبریسکانەوە.

گۆملیکسیز ئۆغڵو دەستی لە کەلەکەی نا و ماوەیەك بە سەر مەزراکەدا لە دووری روانی. گوندییەکانیش لاساییان کردەوە. ئەوجار پشتەملی مەمی دیکی گرت و گوتی:

ـ وە پێش کەوە بزانم هەتیوە کەرە. هەرچی گێچەڵ و کێشەیە لە بن سەری تۆ دایە. ئەو بەیت و باوەکەی تاشباش ئۆغڵو و بەسەرهاتی نوورانی بوونی تفەنگەکەی مەلا تفەنگ شین و گوڵکردنی لە زستان و هاویندا کە هەر لقێکی حەوت جۆرە گوڵی دەکرد هەر یەکەی لە رەنگێك، هەر هەمووی لە بن سەری تۆ دایە. هەر هەموویت لە خۆوە هەڵبەستووە. وەرێ کەوە... وەرێکەوە هەتیو...

گۆملیکسیز بە خێرایی هەتا نێوەراستی مەزراکە رۆیشتە پێشەوە. دەستێکیشی هەر وا بە پشتەملی مەمی دیکەوە بوو. وەك چۆن پشت ملی بێچووە کەروێشکێکی گرتبێ. پەنجەکانی وا لە ملی توند کردبوو کە روخساری مەمی دیك چەپ و چیر دەبۆوە و وێك دەهات و لەبەر یەك دەکشایەوە وای لێ هاتبوو نەتدەناسییەوە. گوندییەکانی دیکەش بە پیر و گەنجەوە، وازیان لە کارەکانیان هێنا و کەوتنە شوێن گۆملیکسیز ئۆغڵو.

کوێخا سەفەر پاڵی بە دارێکەوە دابوو و سەری داخستبوو و بیری دەکردەوە. کە دیتی هەموو گوندی کەوتوونە رێ، ئەویش دەرپەری و وەشوێنیان کەوت.

گۆملیکسیز ئۆغڵو کە لە دوورەوە رەشاییەکەی دی، هەنگاوی شل کردنەوە. بڕێکیش ترسا. گوندییەکانیش هەموو چاویان لە تارماییەکە بڕی. ئێستا بە ئەسپایی و بە پارێزەوە دەچوونە پێشەوە.

لە نەکاو گۆملیکسیز ئۆغڵو راوەستا و گوندییەکانیش دڵیان داخورپا و راوەستان. گۆملیکسیز ئۆغڵو بە دەنگە گڕەکەی خۆی هەرای کرد:

ـ کوڕە کێی؟ هەستە مردووی یان زیندوو؟ مردووی یان زیندوو؟ جنۆکەی یان پەریی؟ شەیتانی یان فریشتە؟ هەر شتێك هەی هەستە...

رەشاییەکە هیچ نەجوولا. گوندی و رەشایی ماوەیەك بەرەوڕووی یەکتری راوەستان بێ جووڵە. گۆملیکسیز ئۆغڵو جار و بارە هەنگاوێکی بەرەو تارماییەکە دەنا و هەرای دەکرد:

- دەی یانەڵلا، هەستە لە جێی خۆت. هەستە و وەرە پێشەوە.
و ئەوجار رووی دەکردە مەمی دیك و دەیگوت:
- کورِە مەمی دیك، برالە، ئەتۆ سەرۆکی هەموو راوچییەکانی، شەوگەڕی چیا و چۆڵانی. هاودەمی شەو و رەشاییت. ئەو رەشاییە چ شتێکە؟ بچۆ پێشەوە. دەی بڕۆ برالە دەی. پاڵی پێوە نا بەرەو لای تارماییەکە.
مەمی دیك زۆر ترسابوو. ناخی دەکوڵی. چیی بیری دەکردەوە، ئەو رەشاییە بڵێی چ شتێك بێ، ئەقڵی نەیدەبڕی. جار و بارەش دەکەوتەوە بیر تاشباش و بەخۆی دەگوت:" ئەو چاوە بریسکەدارانە کە وەك ئاگر بڵێسە دەدەن، تەنیا و تەنیا دەبێ چاوەکانی تاشباشە مەزنەکەمان بن."
ترسی گۆملیکسیز و مەمی دیك و گوندییەکان هەر دەهات و پەرەی دەگرت و ئەو تارماییانەی لە خەیاڵیاندا بوون جار بە جار زیاتر دەبوون و تارماییەکە لە تاشباشەوە بۆ مەلا تفەنگ شین و لە هەژدیهاکەی چوکووراواوە تا جنۆکە و پەری و شەیتان و رەوە تارمایی، هەر جارەی لە بەر چاویان دەبووە شتێك.
هەوا خەریك بوو تاریك دادەهات و تارماییەکەش وردە وردە لە پێش چاویان گەورەتر و زەبەلاحتر دەبۆوە.
گۆملیکسیز ئۆغلۆ گوتی:
ـ مەمی دیك، رۆڵە، ئەتۆش بنیادەمێکی زۆر ترسنۆکی ها. ئەتۆ بەو غیرەت و ئازایەتییەتەوە دەچیتە لووتکەی چیاکان؟ دەی بچۆ پێشێ و ببینە بزانم دەی. راوچییەکی وەك تۆ چ گوێی لە تارماییەکی ئاوا بچووکە. ئیتر بە هەموو هێزی خۆی لە پشتەوەڕا پاڵی بە مەمی دیکەوە نا. مەمی دیك هەر بەو خێراییە لێی چووە پێشێ، هەر وا پەنجا مەترێکی مابوو بیگاتێ، تارماییەکە بەحاڵ جوولا. مەمی دیك بە هاوار و قیژاندن گەڕایەوە و رای کرد.
گۆملیکسیز ئۆغلۆ بە تووڕەییەوە پەلاماری دا:
- ترسنۆك، سەی ترسنۆك. ئەتۆ کە گیانی خۆتت هێندە خۆش دەوێ ئەی بۆچی بەخۆت دەڵێی راوچی و بە دەشت و کێواندا دەگەڕێی و ئەو هەواڵە سەیر و سەمەرانە بۆ گوندییەکان دێنیتەوە؟
گوندی پشوویان لە سینگی خۆیاندا قەتیس کردبوو.
گۆملیکسیز ئۆغلۆ بە دەنگێکی گڕ و بە قیژە قیژ هێندێ شتی بە تارماییەکە دەگوت، هەڕەشەی لێ دەکرد و هەوڵی دەدا. بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی لە سەری نەبوو. جاری وابوو لە تارماییەکە رادەسا، بەڵام دەتگوت لاقیان بەستووەتەوە و ناتوانێ هەنگاوێك بچێتە پێشەوە.

ئاخرییەکەیماندوو بوو. دەنگی نووسا. رووی کردە گوندییەکان و بەسپایی گوتی:

ـ ئەو چوکووراوایە جێیەکی سەیرە. کوڕە هەر مێشێکی جنۆکەیەکە، هەر زەردەواڵەیەکی شەیتانێك و هەر مارێکی هەژدیهایەکە. نابێ کارمان بە سەر کاروباری چوکووراواوە بێ... بە هیچ شێوەیەك.... هیچ... خوا دەزانێ ئەو رەشاییە، کەلاکی چ مەخلووقێکە. ئەوجار ئەنگۆ لەوەتی هەن، چاوتان دیتووە ئاوا ببریسکێتەوە؟ ئەو چاوانە هەر دەکرێ چاوی پادشای جنۆکان بن. یائەڵڵا، با بڕۆین برادەرینە... کارتان بەسەر ئەو تارماییەوە نەبێ. بەیانی کە هاتینەوە دەبینین نەماوە. شای جنۆکان نایانەوێ تیشکی خۆریان وێ کەوێ. هەر رووناکایی ببینن ون دەبن. ئەوان لە بچووکترین نوور دەترسن. شای جنۆکان، پادشای تاریکاییەکانیشن. وەرێ کەون با بڕۆینەوە لای کەپرەکانمان...

گەڕانەوە کەپرەکانیان. ئاگرەکان کرانەوە. لە دەوری ئاگر دانیشتبوون و سەریان بەردابۆوە. چێشت لێنرا. هەموو خەریکی خواردنێ بوون. بەبێ دەنگی شیوەکەیان خوارد. لە دوورەوە دەنگی تەراکتۆر دەهاتن و جاری واش بوو تیشکی چراکانیان کە خەریکی زەوی کێڵانێ بوون، شەوەکەی ئەستێرەباران دەکرد. تاوێك هەمووان گوێیان لە ترپەترپی ماتۆڕی ئەو تەراکتۆرە راگرت کە لە هەمووان نزیکتر بوو.

هەمووان بەردەوام بیریان لە چاوە بریسکەدارەکانی ئەو رەشاییەی نێوەڕاستی مەزراکە دەکردەوە. چوکووراوا شوێنێکی سەیر بوو. خۆ ئەو رەشاییەش نەبوایە، کاتێ دەهاتنە چوکووراوا بەردەوام ترسێك لە دڵیاندا هێلانەی دەکرد. دڵە خورپەیان دەبوو. بەڵام دوایی وردە وردە خوویان بەو شوێنەوە دەگرت. دیارە دەکرا بڵێی خوویان پێوە گرتووە بەڵام نەیاندەتوانی بە تەواوەتی ئەو ترس و دڵەخورپەیە لە دڵیاندا بنەبڕ بکەن و بیسڕنەوە.

هەر بە راستی دەبێ چ بێ؟ ئاخۆ لەگەڵ تاوهەڵاتنا ئەو تارماییە نەدەما، یان لەوانەشە بنیادەم بێ. ئەگەر بنیادەم بوو، ئەی بۆچی نەدەجوولا و چاوەکانیشی وەك بڵێسە دەردرەوشانەوە؟ هەر کەسە و لای خۆی ئەفسانەیەکی لەو تارماییەی نێوەڕاستی مەزراکە هەڵدەبەست و شاخ و باڵی وێ دەخست. ئەو شەوە، هیچ کەسێك، جگە لە منداڵەکان بە جوانی نەخەوت. لە مێشکی یەك بە یەکیاندا چاوە درەوشاوەکان، جارێ لە خەودا و جارێ لە خەیاڵدا دەکووژانەوە و دیسان دەبریسکانەوە.

چوکووراوا جێیەکی سەیرە. دەشتێکی کاکی بە کاکییە و پڕە لە زۆنگاو و لێڕەوار و ئاو و دەریاچەی گەورە و هەزارەزیلەیەك تەپۆ و مێشوولە کە وەك هەور دێن... چوکووراوا

سپیاییەکی بێ سنوورە، بە کۆمەڵێك گێژەڵووکە و خاك و بە هەزاران ڕەنگەوە کە وەك دێوەزمەی زەبەلاح هەڵدەستن و ڕووە و ئاسمان دەسووڕێنەوە. چوکووراوا گەرمای زەردە، تۆفان و خۆڵ و خاکە، وڵاتی پڕ لە بەڵا و سووتێنەر و بێ دار و گیایە. چوکووراوا نۆبەتێیە، پەتایە، ژانە ئێسکە، ئارەقە ڕشتنە، ترۆمبیلە، تراکتۆر و دەڕاسەیە. کەڵە پیاوێکی بێدەنگ و کڕە کە لە کاتی نافەرمانیدا تەنیا دەگۆڕێنێ. دەستێك لە لۆکە و جەستەیەك لە حەریر و سەر و قژێك لە هەوریشمە. کڵاوێکی حەسیری و جلوبەرگێکی سپی و جووتێ چاوی ڕەشە. چوکووراوا جێیەکەی سەیرە.... هەژدیهایەکی سەوزە کە وەك هەور بە گرم و هۆڕ لە ئاسمانەوە دێ. گوندییەکانی تۆرووس هەتا لە چوکووراوا نەگەڕێنەوە دڵیان ناحەسێتەوە. بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی ڕۆژێکن کارەکەیان تەواو بێ و ڕۆژێك زووتر بگەڕێنەوە پێدەشت و چیاکانی خۆیان. دوو ڕۆژ نییە هاتوونەتە چوکووراوا کە غەریبیی دەشتە و چیاکانی خۆیان دەکەن و کزەیان لە جەرگی دێ.

ئەو شەوە مەمی دیك خەوی لێ نەکەوت و هەتا بەیانی هەر لە دەور و بەری تارماییەکە خولایەوە. هەر لەو کاتەشدا زۆر دەترسا و لە دوورەوە چاوی بەسەر تارماییەکەوە بوو، بەڵام کۆنجکۆڵییەکەی وای لێکردبوو زۆر نەترسێ. هەر دەتگوت پەتێکیان لە لاقی کردووە، نەیدەتوانی لەوێ دوور بکەوێتەوە، کەچی نەشیدەوێرا لە تارماییەکە نزیك بێتەوە.

کە تاو هەڵات، گوندییەکان هەستان بۆ لۆکە ڕنینەوە. شنەبایە بەیانی هەڵیکردبوو و کزەیەکی ساردی لە دەموچاوی منداڵەکان دەدا. کەس نەیدەوێرا سەر هەڵێنێ و سەیری نێوەڕاستی مەزراکە بکا. تەنانەت منداڵەکانیش... خۆر خەریك بوو لە ئاسۆ بێتە دەرێ کە مەمی دیك بە غاردان هاتەوە. وا هەژابوو پشووی دەرنەدەهات:

ـ بنیادەمە... بنیادەمە... نە جنۆکەیە و نە پەری. بنیادەمە...

گەڕایەوە و دیسان بەرەو تارماییەکە ڕای کردەوە. گوندییەکانیش، منداڵەکان لە پێشەوە و کچەکان و کوڕەکان و پیرەپیاو و پیرەژنەکانیش بە دوایاندا.. هەر کەس دەگەیشتێ، تاوێك رادەما و دەستی لە سەر دەستی دادەنا و بە ڕیزەوە ڕادەوەستا. ڕەشاییەکە جار بە جار پتر وێك دەهات و بچووکتر دەبۆوە و دەلەرزی. چاوەکانی هەر وا دەبریسکانەوە و نیگاکانی دەبڕییە هەر کەسێکی تازە دەگەیشتێ و لەوەوە دەچووە سەر یەکێکی دی. دوو نیگای درەوشاوە و پڕشنگدار وەك چۆن ئاسنێك دەبریسکێتەوە، ڕاست و بێ جووڵە...

بەو جۆرە هەموو گوندییەکان هاتن و لە دەوری کۆزیلەکەیان بەست. ماوەیەك هەتا خۆرەکە تەواو بەرز بۆوە، هەر وا بێدەنگ راوەستان و چاوەڕێ مانەوە. یەکەم کەسێکی وەخۆ هاتەوە گۆملیکسیز ئۆغلو بوو. گوتی:

ـ خوایە زۆر شوکر، خوایە هەزاران جار شوکر... مام خەلیل نەمردووە...

ئەوجار بەرەو لای ئەو رۆیشت و دەستی خستە بن پیلی مام خەلیل کە وەك گلۆلە بەنێك وێك هاتبوو، هەڵیستاند و بەرەو کەپرەکانی برد:

ـ هەر بە راستی مام خەلیل ئەتۆ بنیادەمێکی زۆر سەیر و سەمەرەی. کوڕە زراوت بردین. گوندی ئەمشەو هەتا بەیانی چاویان نەچووەتە خەو. خوایە گیان زۆر شوکر نەمردووی. بەڵام گوندییەکانت تۆقاند. ئەوە چ چاوێکن تۆ هەتن. هەر دەڵێی چاوی پیرەگورگن.

گوندییەکان وردە وردە لە دواوەیانەوە دەهاتن. ئەوجار وردە وردە کەوتنە قسەکردن لەگەڵ یەکتری. لە نەکاو هەڵڵا و هەنگەمەیەکی گەورە دەشتەکەی داگرت.

## لــه خـــەودا و بـــە تـــەنیا
## مانەوەی مریمۆك لە گوندەکەدا

## ٥

ئۆمەخان و حەسەن دەرگا نەما نەیکەنەوە و سەرێکی پێدا نەکەن. تاقە دەرگایەکی نەدەکرایەوە، دەرگای مالّەکەی کۆستوشۆغلۆ بوو. حەسەن زۆری هەولّ دا بەلاّم هیچی لەگەلّی پێ نەکرا. ناخرییەکەی پاشگەز بوونەوە لەوەی بچێتە ناو مالّەکەی کۆستۆ ئۆغلۆوە. بەلاّم حەسەن زۆر کونجکۆلّ ببوو. چما ئەو مالّە چ بوو؟ بۆچی کۆستونۆغلۆ ئاوا دەرگاکەی داخستبوو؟ هێلانە پەڕەسێلکەکانی هەموو مالّەکانیان دیت و لە مالّەکەی تاشباشدا شازدە هێلانە پەڕەسێلکەیان نەژمارد.

ئۆمەخان گوتیپ:

ـ هەموو مالّەکان تەنیا هێلانە پەڕەسێلکەیان تێدا بوو، کەچی مالّی تاشباشی سەروەرمان، شازدە هێلانەی تێدا بوو. دیارە پەڕەسێلکەکانیش زانیویانە ئەو وەلییە.

حەسەن جار نەبوو بەربەرچی هەموو قسەکانی ئۆمەخان نەداتەوە، ئەمجارەشیان ویستی بلّێ نەخێر وا نییە، بەلاّم ئەمجارەیان تاشباش ئۆغلۆ لە گۆڕێ بوو. حەسەن تاشباش ئۆغلووی خۆش دەویست، جا چ وەلی بوایە نا نەبوایە. ئێستاش زۆر زۆر غەریبیی کردبوو. گوتی:

ـ خۆزگە تاشباش ئۆغلۆ قەت نەبوایەتە وەلی. وەلی نەبوایە و لە گوندەکەش نەڕۆیشتبایە. هەر مەپرسە چەندەم غەریبیی کردووە. ئەم وەلیایەتییە چ سوودێکی بۆ ئەو هەبوو؟ هیچ... ئیتر چاومان پێی ناکەوێتەوە. دەلّێن چووەتە گەلّ چل سوارەی غەیبی و لە ئەشکەوتەکەی ئەوانە...

ئۆمەخان:

ـ جا دەلّێن ئەو چل سوارە هەر هەموویان عابای کەسکی بریقەداریان لەبەر دایە... دەست و لاق و قژیشیان کەسك کەسکە.

حەسەن گوڕاندی:

- بێدەنگ بە. کەسکبوونی ئەوان بە تۆ چی! ئەمن زۆر غەریبیی مامە تاشباشم کردووە... ئەگەر ئەو نەڕۆیشتایە و نەچووبایەتە گەڵ چل سوارەی غەیبی و جلوبەرگی کەسکی نەپۆشیبایە، ئێمە ئاوا لەو گوندەدا تەنیا و بێکەس نەدەکەوتینەوە. ئەویش لەگەڵمان دەمایەوە.

ئۆمەخان بە متمانەوە گوتی:

- هەموو شەوێ حەوت تۆپەڵە نوور لە سەر لوتکەی تەکەچ دەدرەوشێنەوە، سێ هێندەی ئەو سپیدارە... کەسك کەسك... ئەدی، دایە گەورەم گوتی.

حەسەن پاڵێکی پێوە نا:

- هەی درۆزن، درۆزن، درۆزنی فێڵباز. چما دایە گەورە سوێندی نەخواردووە تەنانەت مێروویەکی ئەو گوندەش نەدوێنێ؟ چما دێ سوێندەکەی دەشکێنێ و قسە لەگەڵ تۆ دەکا؟

ئۆمەخان دیسانەکە هەر بەو متمانەبەخۆییەوە گوتی:

- دایە گەورەم هەموو شەوێ قسەم لەگەڵ دەکا. لە جێدا بە سرتەی قسەم لەگەڵ دەکا و هەموو شتێکم بۆ دەگێڕێتەوە. نەنکم گوتی ئەمن سوێندم خواردووە لە گوندیدا کەس نەدوێنم. بەڵام لە جێوبانی خۆمدا دەکرێ هەتا بەیانی لەگەڵ نەوەکەی خۆم قسان بکەم... ها! ئەتۆ دەڵێی چی؟ چما هەر ماوەیەك لەوە پێش نەبوو کە لەگەڵ باپیرەشم قسەی کرد؟ تۆ سەیری ئەوە بکە، دەڵێ نەنکم تەنانەت مێروولەش نادوێنێ.

حەسەن تووڕە بوو و گوتی:

- برۆ جەحەندەم پڕ کە، کچەتیوە رشکنە، بەر نەحلەتی خوای کەوی، ئەو نەنکەشت وەك خۆت بووە بەڵای گیانی ئێمە.

ئۆمەخان ملی بەلارەوە نا و بە لەبزێکی گریاناوییەوە گوتی:

- ئەدی... ئەدی... بووینەتە بەڵای گیانتان. لە بەر ئێمە ناتوانن بچنە چوکووراوا. ئەو زستانە لە برسان دەمرن. عادیلیش دێ و هەرچی هەمانە و نیمانە دەیبا. ئەو زستانە بەبێ پێخۆر و تفاق... و رووت و قووت. هەر لە بەر ئێمەیە لە برسان دەمرن. خۆزگە ئێمە دەمردین و لە کۆڵتان دەبووینەوە. ئەمن و نەنکم پێمانخۆش نییە بمرین، بەڵام... مردن زۆر ناخۆشە. ئەگەر ئێمە بمرین ئەنگۆ دەتوانن بچنە چوکووراوا.

ئەو لەبزەی ئۆمەخان کاری لە حەسەن کرد. چیی وای نەمابوو بگری. گوتی:

ـ خۆ لە بەر نەنکم نییە کە لێرە ماوینەتەوە. بابم چاوەڕێی تاشباشی برایەتی. مامە تاشباش هەتا گوندی لێرە بن کەس نایبینێ. بابم چاوەڕێی تاشباشی مەزنمانە. بە نەنکم بڵێ خەفەت نەخوا. باشە؟

ئۆمەخان دڵی خۆش بوو. گوتی:

ـ باشە، هەر ئێستا دەچمەوە و بە نەنکم دەڵێم. ئەویش ئیتر خەفەتی لێ ناخوا... چون نەنکیشم حەزرەتی تاشباشی خۆش دەوێ. حەسەن، دەتەوێ شتێکت پێ بڵێم؟...

حەسەن دەمودەست وەڵامی دایەوە:

ـ یاڵڵا دەی بیلێ.

ئۆمەخان:

ـ ئەتۆ خەریکە تووشی گوناح دەبی.

حەسەن سپی هەڵگەڕا:

ـ گوناحی چی؟

ئۆمەخان سەری هێنایە بن گوێی وەك بڵێ راز و نهێنییەکی گەورەی لەگەڵ باس بکا و گوتی:

ـ حەسەن گیان، برای خۆم، چما دەکرێ پیاو بە وەلی بڵێ مامە؟ بە وەلییەکان دەڵێن "حەزرەت"، "سەروەرمان". سەروەرمان تاشباش پێشتر مامی تۆ بوو، ئێستا سەروەرمانە.

حەسەن گوتی:

ـ راست دەکەی ئۆمەخان. بەڵام زمانم وا راهاتووە و، هێشتا زمانم بەو باریدا ناگەڕێ کە بڵێم "سەروەرمان". دەزانم دەبێ بە مامە تاشباش بڵێم: "سەروەرمان تاشباش".

ئەوجار رۆیشتە بەر دەرگاکەی تاشباش و لە تەنیشت دیوارەکەوە دانیشتن.

ئۆمەخان:

ـ ژنەکەی تاشباشی سەروەرمان چاوەڕێی نەمایەوە و چوو بۆ چوکووراوا. ئێستا ئەگەر سەروەرمان بێتەوە سەر و سۆراغی ناکا؟

حەسەن ویستی بڵێ:"زەعیفە دین و ئیمانیان نییە" بەڵام بۆ ئەوەی ئۆمەخان تووڕە نەکا قسەکەی گێڕایەوە.

ـ تاشباشی سەروەرمان ئێمەی خۆش دەوێ. هەموو شتێکمان بۆ دەکا. ئەوانەی چوونەتە نێو چل سوارەوە، هەتا قیامەتێ نامرن.

حەسەن مووچڕکێکی بە مووغەرەی پشتیدا هات و بەخۆی گوت" خۆزگە ئەمنیش چووبامە ریزی چل سوارەوە. بۆ ئەوەی بچیتە ریزی چل سوارەی غەیبییەوە، سەرت بچێ نابێ نوێژت بچێ. دەبێ یارمەتیی دەستکورت و هەژاران بکەی. ئەمن کە گەورە بووم، زۆر نوێژان دەکەم، سەرم بچێ نابێ نوێژ و رۆژووم بچێ و چەندی بۆم بکرێ یارمەتیی هەژار و دەستکورتان...."

ئیتر ئاوڕی دایەوە و لە ئۆمەخانی پرسی:

ـ هەر بە راستی تاشباشی سەروەرمان پێش ئەوەی ببێتە وەلی، زۆری نوێژ دەکرد؟

ئۆمەخان وەڵامی دایەوە:

ـ بێدەنگ بە.... خۆت لە تیخی گوناح مەدە. نەنکم دەڵێ نابێ کارتان بەسەر کاری وەلییەکانەوە بێ.

هەتا ئێوارێ لە بەر دەرگاکەی تاشباش هەر خەیاڵ پڵاویان کرد، تاشباش چەند جاران هاتووەتەوە ئاوایی و تاریکاییەکان وەك رۆژ رووناك بوونەتەوە، سفرەکان پڕ بوون لە خواردنی چەور و خۆش و... ژوورێکی پڕ لە پێڵاو... ژوورێك پڕ لە جلوبەرگ... ژوورێك پڕ لە لك و پۆپی داری گێلاس.... و ژوورێك پڕ لە شقارتە...

ئۆمەخان ملی بادا:

ـ داری گێلاست بۆ چییە؟... چما هەر شقارتەی پێ ناکڕی؟ دەی باشە، خۆ ژوورێك پڕە لە شقارتە.

حەسەن گوتی:

ـ دەی باشە، بەڵام ئەمن شووڵی گێلاسم زۆر خۆش دەوێ. کە دەیدەم بە شقارتە، خەریکە گیانم دەردەچێ، بەڵام چ بکەم شقارتەم خۆشتر دەوێ ئێستاش کە تاشباشی سەروەرمان ژوورێکی پڕ لە شووڵی گێلاسم هەر دەداتێ، لێی وەردەگرم.

ئۆمەخان گوتی:

ـ دەی باشە باشە، وەریگرە، شووڵی گێلاس زۆر جوانە.

ئەمجارەیان هاتنەوەی تاشباش بۆ ئاوایی شێوەیەکی دیکەی گرتبووە خۆی. لە پشتییەوە هەزار، دوو هەزار، سەد هەزار باڵندەی باران دەهاتن. ئاسمان رەنگێکی شینی کاڵی دایگرتبوو، رەنگی باڵی باڵندەی باران:

ـ یەك و دووان نین. وەك هەور، هەموو ئاسمانیان داگرتووە. لە دواوەی تاشباشی سەروەرمانەوە، وەك هەور بە شوێنیدا دەخوشێن. تاشباشی سەروەرمان دەبێ ئاوەها بێتەوە.

ئۆمەخان:

- دەی باشە، خوا بکا بێتەوە، جا چۆنی دێ بەخێر بێتەوە.

حەسەن گوتی:

- چۆنی حەزی لێیە با وا بێتەوە.

داهاتەوە و بەر دەرگاکەی تاشباشی ماچ کرد و گوتی:

- ئەتۆش ماچی بکە ئۆمەخان.

ئۆمەخانیش داهاتەوە و بەر دەرگاکەی ماچ کرد.

- زۆرم غەریبیی مامە تاشباشم کردووە.... خۆزگە نەبوایە بە وەلی و نەچوایەتە نێو چل سوارەکان. ئەو لە بابیشم باشترە....

ئۆمەخان گوتی:

- بێدەنگ بە، گوناحت دەگاتێ. بە سەروەرمان دەڵێی مامە.

- ئێستا ئەگەر نەڵێین "سەروەر" چ دەبێ؟ ئەو مامی منە. لێی گەڕێ با واز لە وەلییایەتی بێنێ و بێتەوە. ئەو مامی منە. لێگەڕێ با زلرم خوار بێ و دەست و پێم وشك بن، چاوم کوێر بێ، ئەمن هەر پێی دەڵێم مامە و دەشڵێم تاشباش. یاڵڵا، چیی پێخۆشە با بیکا.

ئۆمەخان وەك هەموو شتێك بزانێ، بزەی هاتێ و گوتی:

- دەزانی تۆی زۆر خۆش دەوێ، بۆیە چیت پێ خۆشە بیڵێ. کاری بەسەر تۆوە نییە. ئەتۆ باش دەزانی... بەڵام متمانەی پێ مەکە، وەلییەکان کەس نازانێ چ دەکەن.

حەسەن بەسپایی گوتی:

- دەی باشە، با غەززەبم لێ بگرێ.

و لەو کاتەدا روخساری گەش و میهرەبان و لەبەردڵانی تاشباشی هاتە پێش چاوی. ئەو روخسارە لە نێو تۆپەڵی نووردا دەدرەوشایەوە. لە سەری رۆیشت:

- ئەتۆ هیچ خەم مەخۆ ئۆمەخان، راستە کەس نازانێ وەلییەکان چ دەکەن، بەڵام تاشباشی سەروەرمان ئەمنی وەك خۆی خۆش دەوێ.

نوقی چێژ و خۆشیی دنیای ئەفسانەکان بوون. سەرخۆش ببوون. لە دنیای پڕ لە باڵندە و گوڵ و خۆشی و خۆشەویستیی تاشباشدا بوون.

وەك سەرخۆشان بەلارە لار و پێکەنین و شادی، بەرەو ماڵەوە هاتنەوە و لە نەکاو وەك ئاوێکی ساردت بەسەردا کردبێن. مرێمۆك لە جێوبانەکەیدا وەك بنیادەمی نیوەگیانی دەمی

مەرگ دەینالاند. ئەلیف یەك پشوو بە دەوریدا دەخولایەوە و عەلی‌یە دریژ لە دەرەوەی ماڵەوە پاڵی وەدیوارەکەوە دابوو و سەری بەردابۆوە دەتگوت مردوویەکە و ناجووڵێ. ئیزگیلەکان تا ئەژنۆی هاتبوون، بەڵام ئەو هیچی نەدەدی.

لە نەکاو حەسەن حەزی کرد را بکا. ئەگەر تاوێکی دیکە راوەستابایە، دەخنکا. گوتی:

ـ یاڵلا ئۆمەخان با برۆین. هەتا تاشباشی سەروەرمان نەیەتەوە با نەچینەوە ماڵێ.

ئۆمەخان ئەوەی لە خودا دەویست. ئەویش لە حەسەن خراپتر بوو. گوتی:

ـ با نەگەڕێینەوە.

ـ بەسپایی بەرەو پشتەوەی ماڵەوەیان خوشین.

ئەلیف کەڕەی بەیانی لە خەوێ هەستا. ئەو شەوە خەوی لێ نەکەوتبوو. لە ماڵێ هاتە دەرێ. هیچ ماڵێك دووکەڵی لێ بەرز نەدەبووەوە. لە نەکاو وەبیری هاتەوە کە هەر ئەوان لە گوندەکەدا ماونەتەوە. تالآیی بێدەنگییەکە قورسایی خستە سەر سینگی. هەر لەو کاتەشدا عەلییش لە خەو هەستا و هاتە دەرێ و چوو لە بەر دەرگاکەی حەسەنە کوێر باوەشێك پووشکەی هەڵگرت و هێنای و لە ئاگردانەکەی خست. باوەشێك ئیزگیلیشی هێنا و ئاگری دا. ساجەکەی لە سەر ئاگردانەکە دانا. ئەلیفیش نیوە جەواڵێکی ئارد هێنا و لە تەشتەکەی کرد و لە سەر ئاگردانەکەی دانیشت و دەستی کرد بە هەویر شێلان. هەویرەکەی لە تەشتەکەی دەرهێنا و نیوە ئاردەکەی دیکەشی تێ کرد و شێلای. مرێمۆك راوەستابوو و سەیری دەکرد. هیچ نەدەجوولا. کە ئەلیف دەستی کردەوە بە هەویر شێلان، هات و لە دەم ئاگردانەکە دانیشت. وەردێنەکەی هەڵگرت و بە نووکەکەی ئەو نانەی ئەلیف لەسەر ساجەکە پانی کردبۆوە، وەرگێڕ و داگێڕی کرد.

بۆنی خۆش و حەزبزوێنی نانی تازە هەستا. حەسەن خۆی پێ نەگیرا. سێهەمین نانی لە سەر سێڵەکە رفاند، ئەو پیوازەی بە دەستییەوە بوو، لەگەڵ برێك پەنیر، لە نانەکەی پێچا و کردییە بابۆڵە.

ئەلیف:

ـ ئۆمەخان، ئەتۆش پەنیر و پیواز بێنە و وەرە. عەلی ئەتۆش. تۆزێکیش رۆنی کەرە بۆ دایکت بێنە.

هەر کەسە و بابۆڵەیەکی بە دەستەوە و بە چێژەوە دەیخوارد. مرێمۆك یەك دوو جاران خۆشەویستانە سەیری بووکەکەی کرد. دەسبەجێ پەژیوان بۆوە و چاوی لێ وەرگێڕا.

کە هەویرەکە هەمووی کرایە نان، خۆر لە ئاوابوون بوو. مریەمۆك و ئەلیف شەلاڵی ئارەقە بوون. هەر دووکیان، جلوبەرگەکانیان تەکاند و هەستان. مریەمۆك تێگەیشتبوو. بۆیە هیچی لە بووکەکەی نەپرسی و نەیگوت ئەو هەمووە نانەتان بۆ چییە؟

حەسەن هات و لە پەنا تەبەکە نانەکەوە راوەستا و بەسەرسووڕماوییەوە هاواری کرد:" تەح، لە منیش بەرزترە."

ئەوەی کوڕەکەی و بووکەکەی دەیانکرد، دوور بوو لە پیاوەتی و جوامێری، بەڵام غرووری مریەمۆك ئیزنی پێ نەدەدا تەنانەت قسەیەکیشیان لەگەڵ بکا. هەر ئەوەندە بوو دەیویست بزانێ چۆن ئەو کارە دەکەن. نانەکانیان لە سەوەتەیەك نا و بە نێوەڕاستی میچەکەوە هەڵیانواسی. مریەمۆك بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ، سەیری کردن.

هەتا کاتی خەوتنێ کە متەقی لێوە نەهات. تەنانەت منداڵەکانیش سریوەیان لێوە نەهات. بە ترس و خەمەوە لە گۆشەیەکەوە هەڵکورمابوون. دەیانزانی شتێکی ناخۆش بەڕێوەیە، بەڵام نەیاندەزانی چییە.

ئەلیف جێوبانەکانی راخست. مریەمۆك پێش هەمووان چوو بنوێ و بە دوای ئەودا ئۆمەخان و دوای ئەویش حەسەن. ئەوان هەمیشە پێکەوە دەنووستن.

عەلی و ئەلیف ماوەیەك رووبەڕووی یەکتری دانیشتن بەبێ ئەوەی جووڵەیان بێ. دوایی کاتێ کەڵەبابەکەی ئۆککەش داغ قۆردوو، کە لە کاروانێ دەرپەڕیبوو و گەڕابۆوە ئاوایی، خوێندی، هەر دووکیان هەستان. عەلی هات و گوێی لە هەناسەکانی دایکی هەڵخست و بە سرتە بە ئەلیفی گوت:

- دایکم نووستووە ئەلیف.

مریەمۆك گوێی لەوە بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی:" ئەتۆ هەر پێت وابێ نووستووم. عەلییە درێژ بە ملی شکاوت، دەزانم دەتەوێ چ گوویەکی بخۆی. با بزانین خوا چیی دەوێ.

عەلی و ئەلیف دەستیان کرد بە پێچانەوەی ئەو کەلوپەل و پێداویستییەی دەیانویست بیبەن بۆ چوکووراوا. مریەمۆك سەری لە لێفەکە دەرێنابوو و سەیری دەکردن.

هەتا بەیانی کاریان کرد و باروبنەیان تێکەوە پێچا. عەلی کۆڵەکەی بەکۆڵی خۆی دادا و وەدەر کەوت. کەڵەبابە راکردووەکەی ئۆککەش داغ قۆردوو جارێکی دیکەش خوێندی.

ئەیف لە جێوبانەکەی مریەمۆك چووە پێش و بە هێمنی گوتی:

- دایە، دایە، دایە.

مرێمۆك وەڵامی نەدایەوە هیچ، پرخە پرخیشی دەهات.
ـ عەلی، دایکە نووستووە. منداڵەکانی بەسپایی لە باوەشی دەربێنە، زۆر بەسپایی...
مرێمۆك لە دڵی خۆیدا گوتی:"ها! بەسپایی! هەی بووکی نانەجیم! بەسپایی! کەوابوو روون بۆوە دەتانەوێ لەو تاریکییەدا و لەو گوندە چۆڵ و هۆڵەدا بەجێم بێڵن و برۆن و ئەمنیش لێرە گورگی بیابان بمخۆن. باشە، برۆن، پێتان وایە بە دووتاندا نایەم؟ چما لە پێش ئێوەدا، بەلابرە رێیەدا ناگەمێ؟ و لە هەمووشتان پتر لۆکەی نارنمەوە؟
عەلی بە سپایی حەسەنی لە باوەشی مرێمۆك کێشایە دەرێ و بردییە دەرەوە و لە بن دارە تووەکە داینا و دوای ئەو ئۆمەخانیشی هەر بەو شێوەیە کێشایە دەرێ و بردی.
"عەلی، "عەلی"یە درێژ، منداڵەکانیشت لە باوەشی من بکێشە دەرێ و بیانبە."
بە رۆیشتنی منداڵەکان بۆشاییەکی سەیری لە ناخیدا هەست پێ کرد.
عەلی بارەکەی بە کۆڵی دادا و مرێمۆك لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئێستا کۆڵەکەی هەڵگرتووە. ئەوە نەلیفیش بزنەکانی لە دانگەی هێنایە دەرێ و وەپێش منداڵەکانی دان. منداڵەکان لە تاریکاییدا، گێژ و ور و خەواڵوو بە رێیەدا دەرۆن. "عەلی"یە درێژی کافر! ئەو منداڵە خەواڵووانە چۆن دەتوانن ئاگایان لە بزنان بێ؟"
دەنگی پێیەکان دوور کەوتەوە. گەیشتنە بەر دەرگاکەی کوێخا سەفەر. مرێمۆك لە جێوبانەکەی دەرپەرییە دەرەوە. ماوەیەك چاوی لە تارماییەکەیان کرد کە لە تاریك و روونی بەیانیدا دەرۆیشتن. بە دەنگێکی بەرز گوتی:
ـ برۆن، بەغدا نیوەێ رێیەتان بێ.
منداڵەکان هێشتا نەیاندەزانی چ بایە و لە تاریکاییەکەدا گێژ و ور و خەواڵوو، دەرۆیشتن. هێشتا زۆری مابوو رووناکی بکاتەوە. گەیشتنە داوێنی گردە گەورەکە. گردەکە نوقمی تاریکایی بوو. عەلی جار بە جار خەمبارتر دەبوو. لە تاریکاییەکەدا بە لارە لار دەرۆیشت و لاقەکانی تێك دەئالان و دەتگوت دەیەوێ بگەرێتەوە. دڵی ئەو لای دایکی بوو. لەوە دەترسا لە نەکاو هەموو شتێك بەجێ بێڵێ و بگەرێتەوە.
لە خۆی نووسا و غاری دا. کۆڵەکەی بە پشتییەوە هەڵبەز و دابەزی دەکرد. ئەلیفیش غاری دەدا. منداڵەکانیش بزنەکانیان رادەدا و بە غاردان بە شوێنیانەوە بوون. عەلی هەم رای دەکرد و هەمیش ئاوڕی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەکرد.
بەو جۆرە لە گردە گەورەکە تێپەرین. گەیشتنە خڕ و لێرەوارەکە. ئیتر عەلی برستی لێ برا. هەر هەمووان هانکەهانکیان بوو.

ـ هەڵنەستا، هەڵنەستا. تا ئێستا نەمدیبوو ئاوا خەوی قورس بێ. لەوانەشە بە ئانقەست خۆی لە خەو کردبێ.

عەلی کزەی لە جەرگی هات:

ـ پێم وایە دەیزانی و بە تایبەتی ویستی ئێمە نەزانین کە دەزانێ. ڕۆحە بەرزەکەی ئیزنی نەدایێ.

ئەلیف ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ لەوانەشە. ئەوە دە ساڵیش دەبێ نەمدیبوو ئاوا بە قورسی بنوێ.

ئۆمەخان گوێی هەڵخستبوو و قسەکانی دەبیستن. هەوڵی دەدا شتێك لە قسەکانیان هەڵکڕێنێ و بۆی ڕوون بێتەوە. ئەو جار دەیزانی دڵی بۆ چی توندە. گوتی:

ـ دایە، مەبەستت نەنکمە؟

ئەلیف نەیزانی چ بکا و توند زاری کچەکەی گرت.

حەسەن لە پێشەوە بزنەکانی لێ دەخوڕی. ئەلیف دیتی. بە هەڵەداوان گوتی:

ـ بێدەنگ بە، با حەسەن گوێی لێ نەبێ.

ئۆمەخان بە ترسەوە بێدەنگ بوو.

بەیان ئەنگووت. ڕووناکایی بەسەر لووتکەی چیاکاندا پڕژا. لە نێوان دوو چیاوە تۆپەڵەی نوور وەدەرکەوتن و بە دوای ئەوەدا گوێچکەیەکی خۆرەکە دەرکەوت و هەموو وڵات نوقمی ڕووناکایی بوو. سێبەرەکانی عەلی و ئەلیف و منداڵ و بزنەکان، لەگەڵ دەرکەوتنی خۆرەکەدا بە شێوەیەکی سەیر و سەمەرە بەسەر خۆڵ و خاکەکەدا پان بوونەوە. خەمەکەی عەلی تەنانەت بە سێبەرەکەشییەوە دیار بوو. ئەو سێبەرە بەرز و گەورەیە کە لە بەردێکەوە دەکەوتە سەر بەردێکی دیکە، دەتگوت لەخۆی دەناڵێ و جینگڵ دەدا.

حەسەنیش تێگەییشت. ئاوڕێکی لە لای ئاوەدانییەکە دایەوە و سەیری کرد و بە دەنگێکی گریاناوییەوە پرسی:

ـ دایە، ئەوە کوا نەنکم؟ بۆچی لەگەڵمان نەهات؟

دایکی بە شێواوییەوە تانە و تەشەرێکی لێ دا:

ـ بێ دەنگ بە با بابت نەبیستێ.

حەسەن سەیرێکی بابی کرد. بابی زۆر شێوا بوو. بێدەنگ بوو.

مرێمۆك جارێکی دیکەش گوتی:

ـ جەحەندەمتان لێ پڕ بێ و بەغدا نیوەی ڕێیەتان بێ هەی بێدین و بێ ئیمانینە، هەی کافرینە، لەوەتەی دنیا دنیایە، هیچ کوڕێك ئەوەی لەگەڵ دایکی خۆی نەکردووە. کامە کوڕ دایکێکی بێ دەست و پێ بە تاقی تەنێ لە گوندێکی چۆڵ و هۆڵدا بەجێ دێڵێ بۆ ئەوەی گورگ و چەقەڵ بیخۆن؟

گەڕایەوە نێو گوندەکە. کەوا پینەکراوەکەی لەبەر کرد. پڕێسکەی وردە کەلوپەل و عەنتیکەکانی لە سندووقەکە دەرێنا و بە غاردان وەڕێ کەوت. هەم غاری دەدا و هەمیش دەیبۆلاند:

ـ ڕۆڵە گیان، منداڵە شیرنەکانم، ئەو کافرە بێ دایی و بابە ئەمنی دایە دەستی مەرگ و ڕۆیشت. ئەی ئەنگۆ بۆچی بەجێتان هێشتم؟ ئەنگۆ بۆچی لە نەنکی خۆتان هەڵبڕان؟ باشە ئەنگۆ بۆ؟

وای لێهات بە دوایاندا بانگیان بکات، بەڵام پاشگەز بۆوە هەتا گەیشتە نزیك گردە گەورەکە بەبێ ئەوەی پشووی سوار بێ زۆر بە خێرایی ڕۆیشت، بەڵام لەوێوە لە داوێنی گردە گەورەکەدا ئەژنۆکانی تین و هێزی ئەوەیان تێدا نەما بڕۆن و کەوت. دەموچاوی خۆڵاوی و نوقمی ئازار بوو:

ـ "عەلی"یەکەی من! ئەوە بوو جوابی زەحمەتەکانی من؟ بێشکەم ڕاژاندی و شیرم دایتێ، کەچی ئەتۆ ئاوام لێ دەکەی عەلی؟

هەتا نیوەڕۆ چەندی لە خۆی نووسا نەیتوانی هەستێ. دەستی هەڵگرت و لە سەر تاشەبەردێك دانیشت. دوای ئەوەی ماوەیەك دانیشت و ماندووی حەسایەوە، هەستا و بەرەو چوکووراوا، وردە وردە کەوتە ڕێ.

ـ ئەمنیش بەرەو چوکووراوا ملی ڕێیە دەگرم، با گورگ بمخۆن. لە ڕێیە دەمرم و تێدا دەچم. ئەو کات خەڵك چیت پێ دەڵێ عەلییەکەی من؟ ناڵێن دایکی دا بە گورگ و چەقەڵ؟ ناڵێن دایکەکەی کوشت و کەلاکەکەی خستە پێش سەگەل؟ خەڵك تف و نەحلەتت ناکەن؟ ئەمنیش ئەوە بەرەو چوکوور دەڕۆم و لە ڕێیە دەمرم. کە گوند لە چوکوور دەگەڕێنەوە، بە ئێسك و پرووسکم نامناسنەوە؟ ئەی "عەلی"یە کەرە؟ خۆڵت وەسەر، ئەتۆ ئاوا بێ ئەقڵ بیت چۆن تووشی نەهامەتی نابی؟ ڕۆڵە، هەر بە دارە دەستەکەمەوە دەمناسنەوە.

بە قەستی مەرگ دیسان هەنگاوەکانی خۆشتر کردن.

لە نەکاو لە گوندی یالاکەوە کە زۆر دوور کەوتبووە، هەموو سەگەلی ئاوایی کەس نازانێ بۆچی دەستیان کردە وەڕین.

- بوەرِن، سەگەلی گوندی یالاك. ئەمنیش ئەوە بەتەنێ بەرەو چوكوور دەڕۆم. لە یەكەمین گوندی سەر ڕێم نانێ وەردەگرم. ئەلیف كە بمبینێ پێی سەیر دەبێ، لێی گەڕێ با پێی سەیر بێ ئەو قەحپەیە.

دەنگی سەوەڕ كە لە ئاواییەوە دەهات، وردە وردە كزتر دەبوو و ئیتر وای لێ هات بڕایەوە. هەموو وڵات بە بێدەنگییەكی خەستدا ڕۆچوو. دەتگوت گیانلەبەرێك لە دنیادا نەماوە. شنەبا، ئەستێرەی ڕاخوشیو، گەواڵە هەور و خشەخشی دارستانەكە، هەر هیچی نەمابوو. دەتگوت دنیا یەكسەر چۆڵ بووە. تاریكییەكە وەك ڕووبارێك لووزەوی بەستبوو. بەبێ وچان دەخوشی. ئەستێرە ڕەشەكان وەك ڕووبار دەڕۆیشتن.

هەتاوی سەر گردەكە سوور سوور بوو.هەورەكانی دەوروبەریشی سوور سوور. شتێكی وای نەمابوو خۆر ئاوا بێ. مرێمۆك سەرمای بوو، گوتی:

- ڕۆژ ئاوا بوو.

لەو كاتەدا برسێتیش هێرشی بۆ هێنابوو. نەیتوانی بڕوات. ئەژنۆی دەلەرزین. دانیشت. ماوەیەك بە گاگۆڵكێ بەرەو چوكووراوا خزی گاگۆڵكێیەكەی پێ خۆش بوو.

- ئاخ، خۆزگە گوندی بگەڕێنەوە... بگەڕێنەوە و ئاوا بمبینن و ئابڕوو و حەیای ئەو عەلی و ئەلیفە بەرن و وایان لێ بكەن تا دنیا دنیایە ڕووڕەش و ڕیسوای عالەمێ بن...

ڕۆژ ئاوا بوو. هەوا ساردی كرد. ئەستێرە درشتەكان ئاسمانیان داپۆشی. ئەو هەر وا بە خشكەخشك بەو خۆڵ و خاكەی ڕێیەكەدا بەرەو چوكووراوا دەڕۆیشت. چەقەڵەكان لە ڕاست و چەپی لێڕەوارەكەی ڕووبەڕوویەوە دەیانلووراند.

مرێمۆك هەموو گیان دەلەرزی:

- چەقەڵ لەتوپەتم دەكەن... ناگەڕێمەوە ئەو گوندە چۆڵە... ناگەڕێمەوە...

دەست و پێی لە نێو خۆڵ و خاكەكەی سەر ڕێیەدا... خۆڵەكە فێنك بووەتەوە. پشووی لێ بڕابوو. ئیتر دەستەكانیشی برستیان لێ بڕابوو و جەستە قورسەكەی ئەویان نەدەتوانی. ڕاوەستا. خۆی خستە سەر دەستەكانی و ویستی هەستێ، زۆری هەوڵ دا نەیتوانی لە سەر پێ ڕاوەستێ. لە نێو خۆڵ و خاكەكەدا دانیشت. خۆی كۆ كردەوە و كرووشمەی كرد و خۆی گرمۆڵە كرد.

## که مەمی دیك، هەر جارەی
## مردووەکە دەباتە شوێنێك

# ٦

تەرمەکە، بە زاری داپچڕاوەوە، لە سەر خاکەکە کەوتبوو و دەست و پێیەکانی تەواو لێك ڕەویببوونەوە. لە سەر ئەو لمەی کە خوێنەکەی هەڵمشتبوو، توێژکاڵێك خوێنی وشك بەجێ مابوو. کراسە خەتییەکەی ئەو لە نێوشانی ڕاستییەوە هەتا سەر نێوکی دادڕابوو و برینێکی قووڵ لە سەر جەستە تووکنە ئەسمەرەکەی زاری لێك کردبۆوە و وەك برینێکی بەناسۆر و چڵك کردوو، لە بەر تاوەکە وشك دەبۆوە. لای چەپی کراسەکەی خوێناوی بوو و ڕەنگەکەی نەدەبینرا. خوێنەکە وشك ببۆوە و کراسەکەی وەك تەڵاشە دارێك ڕەق کردبوو. مێش و مەگەزی ورد سەر و دەموچاوی مردووەکەیان داپۆشیبوو و تەنانەت نێو چاوەکانیشیان پڕ کردبوو. چەند مێشی گەورەی کەسکیش بە باڵە روون و پانەکانیانەوە خێرا خێرا بە سەر تەرمەکەدا دەخولانەوە. جار و بارە تیشکی خۆرەکەیان لێ دادەبڕی و دەبریسکانەوە.

خۆر وردە وردە بەرز دەبۆوە و گەرم دەبوو. دەستە زلەکانی کابراکە، کە بە هەر دوولای جەستەکەیدا شۆڕ ببوونەوە، تەڕ بوون. وردکە بەرد، گەڵا خۆڵاوییەکان دارە بی و گەڵای گەز و چنار و نارەوەنیش هەموو تەڕ بوون. نیوەی سەر و گوێچکەی ڕاستەی لە ناوەکەدا بوو، سەری لە سەر بەردێکی پان بوو. وردە ماسییەکان پۆل پۆل دەهاتن و دەسبەجێ بلاو دەبوون. دیسان دەهاتنەوە و بە گوێچکەکەیەوە دەنووسان. دیسان لە چاوتروکانێکا... ئاوەکە مەند بوو. خۆرەکە لە بنی ئاوەکەی دابوو. بەردەکانی ڕووبارەکە وەك سەروملی ماسییەکان دەبریسکانەوە و قەوزەیان گرتبوو.

چەندی خۆرەکەی پتر هەڵدەکشا، هەواکەی گەمتر دەبوو. بۆنە تاڵەکەی داری "بابادەم" و گەرماکە لە هەموو لایەکەوە لە سەر ئاو و گەڵا دار و گژ و گیاکان خەستتر دەبۆوە.

مێشێکی درشتی کەسك، کە لە سەر مردووەکەوە هەڵفڕیبوو، هات و توند خۆی بە شەویلکەی مەمی دیکدا دا. مەمی دیك خۆی خزاندبووە نێو پنچکە گیایەکەوە و خۆی

شاردبۆوە و بەبێ ئەوەی چاوی بترووکێنێ، سەیری ئەو جەستەیەی دەکرد کە لە دەم ئاوەکەوە کەوتبووە سەر وردکە بەردەکانەوە. هەموو شتێکی بە وردی دەبینی. روخساری ئەو مردووە سات بە سات دەگۆڕدرا. لای راستی لێوی کە حاڵەتێکی تەوساوی خەواڵوویی پێوە بوو، وردە وردە ئەستوورتر دەبوو و دادەچۆڕا. تاڵە تیرۆژێك کەوتە سەر لووتی. سێ مێش پێکەوە هاتنەوە و لەو شوێنە نیشتنەوە کە تاوەکەی کەوتبووە سەری و دەسبەجێ هەڵفڕینەوە و بەسەر لك و پۆپە شلکەکانی دارە چنارەکەدا بەرەو لك و پۆ چڕەکانی دارە تووەکە رۆیشتن.

تویژکاڵە تەم و مژێك بە سەر ئاوەکەدا لە هەڵکشان و داکشاندا بوو. ئەو مژە روونە لە بری ئەوەی بە گەرماکە بڕەوێتەوە، خەستتر دەبوو و لەگەڵ رەوینەوەی مژەکەدا، رەنگی جلوبەرگەکان و پێڵاوەکان و دەست و روخساری مردووەکەش دەگۆڕدرا.

تەرمەکە لە گەرمای بەربەیانیدا مژاوی بووە.

چاوەکانی مەمی دیك وەك چاوی گورگێکی دڕندە دەرپەڕیون و سەری مردووەکە دەکەن و هەموو شتێك دەبینن. قەیتانی پێڵاوەی پێی راستی کراوەتەوە. چەند خەنجەری وێ کەوتووە؟ چەند کوتی لە پشتی بووە؟ پێنج هێڵی خوێن بە لەکەدا رۆچووە و رێچکەی باریکی بەرەو چەمەکە کردووەتەوە. کەواتە پێنج برینی هەڵگرتووە.

تەرمەکە لە گەرماکەی بەربەیانیدا کەوتووە.

پەپوولەیەکی درشتی نارنجی بە سەرە رەشەکەی و باڵە پڕ لە نەخش و نیگارەکانییەوە لە سەر دەستی چەپەی، نیشتەوە. باڵەکانی وەك دوو باوەشێن کۆ کردەوە و لە سەر باسکەکەی خەوت.

لووتی پەپوولەکە لەرزییەوە. دەتگوت خەون دەبینێ. باڵەکانی لێك کردەوە و سێبەرە رەشەکەی باڵەکانی کەوتە سەر خوێنەکە. چاوەکانی مردووەکە بەقووڵدا چووبوون و قووڵکەکانیان پڕ بوون لە وردە مێش. دەتگوت دەستی مردووەکە جوولا. پەپوولەکە هەڵفڕی بەڵام زۆر دوور نەچوو و هەر لەوێ لە سەر گوڵە رەشەکەی چڵە نەعنایەکی کێوی نیشتەوە. چڵی نەعناکە لە بن بارستایی پەپوولەکەدا لەرییەوە.

گەرماکە هەر دەهات و بە تەوژمتر دەبوو. هەموو شتێك، تەرم، گژ و گیا و دارەکان و ئاوەکە لە مژە خەستەکەی هەتاوەکەدا نوقم دەبوون.

مەمی دیك گیانی وەلەرزین کەوت. بۆقێك توند خۆی فڕێ دایە نێو خەرەندەکەوە. بە دەنگی بۆقەکە، ئەو کیسەڵانەی کە لە دەم ئاوەکە خۆیان دابووە بەر خۆرەکە و قاوغەکەیان وشك ببۆوە، خۆی خستە نێو ئاوەکەوە.

مەمی دیك دڵی داخورپا. ماسیگرەیەك بە لاقە باریك و مەیلەو كەسكەكانییەوە هات و لە تەنیشت مردووەكە نیشتەوە. بەبێ ئەوەی چاو لە دەوروبەری خۆی بكا، بە لای سەری مردووەكەدا تێپەڕی. دەندووكە درێژەكەی خۆی ڕێك لە پەنا سەری مردووەكەوە لە ئاوەكە ڕۆكرد و ماوەیەك لەوێدا ڕایگرت.

تەم و مژەكە لێڵتر و خەستتر بۆوە و شتێكی وەك دووكەڵ سەر مردووەكەی داپۆشی. مردووەكە جووڵەیەكی كرد. مەمی دیك ڕاچڵەكی و بەبێ ئەوەی قیت بێتەوە، هەر وا بە كووڕە كووڕ بەرەو مەزراكان ڕای كرد. هەم هانكە هانكی دەهات و هەمیش ئاوڕی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەكرد. گەیشتە پەرژێنێكی پڕ لە كلۆش و پەلی تیژ و دڕك و پێكۆڵ. بەخۆی گوت:

ـ هەتیو، مەمی دیك، ئەوە چ دەكەی؟

لە نێوەڕاستی مەزراكە چەقی. كەس لەو دەوروبەرانە نەبوو. هەموو وڵات چۆڵ بوو. تاوێك هەر وا مایەوە. كوللە فڕكە فڕكە و باز بازێنیان بوو. توند خۆیان بە دەموچایدا دەكێشا و بە خشەیەكەوە دەكەوتنە خوارەوە.

بەرەو دەم ئاوەكە غاری دایەوە، داهاتەوە و لاقی مردووەكەی گرت و بەرەو خوارووی چەمەكە ڕایكێشا. سەیری بەشی سەرەوەی جەستەی مردووەكەی كە هەتا نیوەی لە ئاوەكەدا بوو و سەیری سەری كە تەواو لە ئاوەكەدا بوو و بەردەكانی بن ئاوەكە دەكەوت و هەڵبەزدابەزی دەكرد و قژەكانی كە لە ئاوەكەدا بڵاو دەبوونەوە و تێك دەئاڵان و گوێچكەكانی كە گەورە و بووك دەبوونەوە و ڕوخسارە خێچ و خوارەكەی مردووەكەی دەكرد و حاڵەتێكی سەیر دایدەگرت و بە هەموو توانای خۆیەوە، تەرمەكەی بە ئاوەكەدا بەرەو لای خوارەوە دەكێشا.

ئەو پەتەی كە بە نێوقەدییەوە بوو، كردییەوە. پەتێكی كۆن و پواو و ڕزیو و پڕ لە گرێ بوو. لاقەكانی مردووەكەی لێك بەستن. دارە سەوزە گەزەكەی دەم ڕووبارەكە لە ئاوەكەوە سەری هێنابووە دەرێ. لكێكی بەرزی هەتا نێوەڕاستی ڕووبارەكە كشابوو. مەمی دیك پەتەكەی جارێكی دیكەش لە لاقەكانی مردووەكە ئاڵاند. گەڵای ئەو تووترکەی لە دەوری دارە گەزەكە ئاڵابوو، سوور هەڵگەڕابوو. سوورێكی بریقەداری وەك بلوور. مەمی دیك داهاتەوە و بەرەو ڕەگەكانی تووتڕكەكە چوو. نیوەی ڕەگەكان لە نێو قوڕ و نیوەكەی دیكەیان لە ئاوەكەدا بوو. ڕەگەكانی بە نێو ئاوەكەدا بڵاو ببوونەوە. پەتەكەی لە دارەكە ئاڵاند و سەرێكی گرت و كێشای، ئەوەندەی كێشا هەتا لاقەكانی مردووەكە هاتنە بەرەوە و بە دارەكەوە نووسان. دیسان كێشای. پاژنێی تەرمەكە لە دارەكە چووە سەرێ و هەر كێشای تا بەلەكەكانی مردووەكە بە

دارەکەوە نووسان. سەری مردووەکە لە ئاوەکەدا مایەوە. چاوەکانی زەق زەق ببوونەوە و هەر جارەی شەپۆلێکی روونیان بەر دەکەوت، چوار پێنج هێندە گەورە دەبوونەوە . جاری واش بوو نەدەبینران، چونکە سێبەرێك تاریك دەکەوتە سەر چاوەکان و سەرەکەی.

مەمی دیك گوتی:"باشە." هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لە سەری رۆیشت." لێرە کەس نایبینێتەوە. دوایی دێم و دەیبەم دەینێژم."

ئەوجار گوتی:

- باشە هەر بە راستی ئەو کابرایە کێیە؟ بۆچی هێندە لە سەفەر دەچوو؟ بۆچی هیچ دەنگی نەکرد؟ تەنانەت "ئاخ"ێکیشی نەگوت. وەك چنارە رزیوێك بەلادا هات. هەر بە راستی کەس و کاری هەیە؟ لەوانەیە هەر سەفەر خۆی بێ. خۆ مردووی بنیادەم لە زیندووەکەی ناچێ. دیارە ئەوە سەفەر خۆیەتی.

چووە ئەو بەری رووبارەکە و دانیشت. جلە تەڕەکانی بە گیانییەوە نووسابوون و هەڵمیان لێ هەڵدەستا. ئاوەکە هەڵێدەبرینگاند و دەیسووتاند. لەرزی. برێك دواتر عەرزە سوورەوەبووەکە سمتەکانی سووتاند. خۆی رانەگرت و لە جێیەکی دیکە دانیشت.

سەرەکەی دی کە لەوبەری رووبارەکەوە و لە بن لکی دارە گەزکە و لە ئاوەکەدا دەجووڵایەوە. تاڵەکانی قژی سەری لەگەڵ ئاوەکە دەڕۆیشتن و شەپۆلیان دەدا. ساتێك چاوە زەق و شووشەییەکانی مردووەکەی دی. باسکەکانی وەك باڵی هەڵۆ لێك کرابوونەوە و بێ راوەستان دەجووڵان. دەکرانەوە و وێك دەهاتنەوە، دەتگوت لە ئاوەکەدا باوەش بە بۆشاییەکدا دەکات.

ماسییەکی گەورەی قەپۆزتیژ و بریقەدار لە ئاوەکەدا خۆی هەڵاویشت و بریسکایەوە و بزر بۆوە. چاوەکانی مەمی دیك بە شەوارە کەوتن و ساتێك هیچ کوێی نەدی.

جلوبەرگەکانی بەری وشك ببوونەوە و رەق ببوون. لە جێی خۆی دەرپەڕی و تەرمەکەی لە دارە گەزەکە کردەوە و دیسان بەرەو خوارەوە کێشای. لە ئاوەکەدا سەرەنگرێ دەبوو و دەکەوت و هەڵدەستایەوە. جارێك پێی لە بەردێك هەڵەنگوت و بە سەر مردووەکەدا کەوت و دەستی مردووەکە لە گەردنی ئالاّ. مەمی دیك نەیدەتوانی خۆی لە بازنەی ئەو دەستە رزگار بکا. ئاوەکە لێڵتر و قووڵتر بوو و بووە گێژاوێکی تاریك و پڕ لە بڵق و تۆقلە. مەمی دیك وێڕای مردووەکە لە ئاوەکەدا تلایەوە و هاتەوە دەرێ. دەستی مردووەکەی بە دەستەوە بوو. دەتگوت زیندوو بووەتەوە و وەك دوو بنیادەمی زیندوو هەوڵیاندا لە گێژاوە کەفاوییەکە خۆیان رزگار بکەن. لە تەنیشت یەکترییەوە کەوتنە سەر زیخە تەڕەکە. ماوەیەك بە چۆڕە چۆڕ لە بەر

خۆرەتاوەکە، لە تەنیشت یەکترەوە بێ جووڵە درێژ بوون. جلوبەرگە خووساوەکانیان بە گیانیانەوە نووسا. تاوەکە سووتێنەر بوو. دەمودەست جلوبەرگەکان وەك دار وشك بوونەوە.

مەمی دیك مردووەکەی بە کۆڵی خۆی دادا. زیخ و لمە نەرمەکە وەك کێڵگە و مەزرا پان و بەرینەکان ئەو سەری دیار نەبوو. یەك چڵە گیا چیە لە کەنار رووبارەکە نەبوو. تا چاو بڕی دەکرد زیخ و لم بوو. شوێن پێی باڵندەی گەورە و بچووك بە سەر لمەکەوە دیار بوو. تاوەکە بە سەر لمەکەدا بڵاو دەبۆوە و هێندەی پەڕە جگەرەیە لە سەر لمەکە هەڵدەکشا و دادەکشایەوە. هەتا چاو بڕی دەکرد، هەتا تەپۆڵکەکەی رووبەڕوو پەڕە ناسکەکەی تاوەکە وەك مژێك... پەڕە جگەرەی شەپۆلدار وەك مژ دەخوشی.

مردووەکەی دانا، ئەمجارەیان لە سەر عەرزەکە درێژی نەکرد و دەستەکانی لە سەر ئەژنۆی دانا و بە دارە چنارەکەوە داینیشاند و خۆشی لە تەنیشتییەوە دانیشت. لەو تاوە سووتێنەر و بەتینەدا لاقەکانی وشك هەڵاتن و قوونی سووتا. دەستەکانی لە سەر لمەکە دانا، دەستی سووتان. دەستی بۆ هەر شتێك دەبرد، دەیسووتاند. بە دەستەکانی، دەستی کرد بە هەڵکەندنی لمەکە. ئاوی لێ هەڵقوڵی. قووڵکەکەی گەورەتر و قووڵتر کردەوە، هەتا ئەژنۆکانی خۆی. ئەوجار مردووەکەی تێدا درێژ کرد. چوو و لە مەزرا دوورەکانەوە باوەشێك "کلکە رێوی"ی گوڵداری هێنا و سەری مردووەکەی پێ داپۆشی و لە تەنیشتی دانیشت.

**لــەو شــوێنەی وا حەســەن**
**پێش ئەوەی بگەنە هەورازەکەی**
**ســلێمانلی، شــوولی گــێلاس**
**دەبڕێ.**

## ٧

تەم و مژەکە وەك کیسەڵێکی خۆڵەمێشی لـە بـن ئاوەکـەدا خـەوتبێ، لـە شـیوی لێـڕەوارە دارستانە گێلاسەکەدا نیشتبوو. تاو هەڵاتبوو و مژەکـەی ئەوەنـدەی دیکـە خەسـتتر کردبـوو و پەستاوتبوویە قووڵایی شیوەکەوە. مـژێکی خەسـت خەسـت بـوو وەك شـەو و وەك هـەور، کـە دەتگوت دەکرێ بە دەست بیگریت.

کەس نەیدەزانی حەسەن کەنگێ هەستاوە و کەنگێ لە شیوی لێڕەوارەکەوە چووەتە خوارێ و کەنگێ لە مژەکەدا ون بووە. کەی نەیدەزانی. لەوانەیە لەگەڵ دەرکەوتنی مانگ یان لەوانەشە هەر لە سەرەتای شەوەوە چووبێتە لێڕەوارەکەوە.

"عەلی"یە درێژ کە پێش تاوهەڵات هەستابوو و بە دەم باوێشکانەوە قرچەقرچی لە ئێسکی گیانی هێنابوو، چـاوەکانی پـێش هـەموو شـتێك بـە شـوێن حەسـەندا گـەڕان. هـەموو گیـانی دەیزیڕاند چونکە دوێ شەو لە سەر عەرزە شێدارەکە خەوتبوو و گیانی ڕچیبوو. ماوەیـەك هـەر نەیتوانی ماسوولکەکانی بجووڵێنێ.

دوای تەلی، ئەلیفیش هەستا و ئۆمەخانیش. ئەلیف چاوەکانی هەڵمسابوون و لاقەکانیـشی قەڵیش قەڵیش ببوون. دەتگوت پیر بووە. چاوەکانی ئۆمەخان ڕیـژۆقیان کردبوو. هـەر جـارێکی لە خەو هەڵدەستا، ماوەیەك هەر چاوی هەڵدەگلۆفی بۆ ئەوەی مژۆڵە پێکەوە نووساوەکانی لێـك بکاتەوە. ئۆمەخان بە دوای دایکیدا چووە سەر کانییەکە کە لە قەڵشتی گردەکەوە و لە بن دارە گەورەکەوە هەڵدەقوڵی و پنگـە هـەر چـوار دەوری تـەنیبوو و هـەتا ئـەژنۆی بنیـادەم دەهـاتن. ئاوەکە بە لووساوکێکی درێژ و خێچ و خواردا کە لـە داری کـاژ دروسـت کرابـوو و دەوروبـەری

قەوزەی گرتبوو و پڕ بوو لە وردە بەرد و چەوی سپی، دەهاتە خوارێ. ئەلیف سەری خۆی وەبەر لووساوکەکە دابوو و سەر و مل و قژە ئالۆزەکانی خۆی دەشوشت. هەتا تاو هەلآت هەر وا شوشتی و ئۆمەخانیش هەر لەوێ چاوەڕێی بوو.

عەلی پالّی بە بەردێکەوە دابوو و لە بەر بەرۆچکەکە چەندی بۆی کرابوو دەست و پێیەکانی لێك کردبوونەوە و سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ کردبۆوە و نەدەجوولا. مارمێلکەی بچووك بچووك بە سەر دەست و لاقەکانیدا و لە بەر تاوە تازە دەرکەوتووەکە زمانیان دەرکێشابوو و دەهاتن و دەچوون. "عەلی"یە درێژ هەر ئاگاشی لە مارمێلکە نەبوو.

ئۆمەخانیش دەست و دەموچاوی شوشت و چاوەکانی کرانەوە. گوتی:

ـ ئەوە کوا حەسەن؟ حەسەن نەماوە.

عەلی سەری هەلێنا و چاوەکانی هەلگلۆفین و هەستا و باوێکشکێکی گەورەی دا. بە وردی سەیری دەوروبەری خۆی کرد. دەتگوت یەکەم جارێتی ئەو لووساوکە قەوزەگرتووە و شیوە تەم گرتووە و ئەو چیا لە بەفر داپۆشراوەی رووبەڕووی دەبینێ.

پرسیی:

ـ ئەوە کوا حەسەن؟

ئەلیف سەر و قژە ئالۆزکاوەکەی کە وەك لبادی لێ هاتبوو، دابووە بەر خۆرەکە. قژی زۆر درێژ بوو و رەنگە رەشەکەی کەسکی دەنواند و لە بن تیرێژی خۆرەکەدا رەنگاوڕەنگ دەچۆوە. ئەویش وەك گوێی لە عەلی نەبووبێ، پرسیی:

ـ حەسەن لە کوێیە؟

ئۆمەخان گوتی:

ـ من دەزانم. دوێنێ پێی گوتم... شوولکە گێلاسەکان... و بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ خوارەوەی شیوەکە کرد و گوتی:

ـ چۆتە ئەوێ.

عەلی تووڕە بوو و گوڕاندی:

ـ کوڕە ئەمن ئەوە لاقەکانم ئەستوور بوون و گیانم هاتووەتە سەر لێوم، هەر لە شوولکە گێلاسمان کەم بوو... ئیتر ماندوو بووم، بە خودا لە گیانی خۆم بێزار بوومە. ئێستا دەبێ چاوەڕێی هاتنەوەی بین... کوڕە خۆ نەهامەتی یەك و دووان نییە... توخم و توتکەکەی خۆشت بووەتە بەلای گیانت...

دەستەکانی وەك زۆڕنایەك بە بەر دەمییەوە گرت و رووی کردە خوارووی شیوەکە... تەم و مژی نێو دەربەندەکە وردە وردە پتر دەنیشت و خەستتر دەبوو و دەدرەوشایەوە. سەر چڵی دارسکانی نێو شیوەکە لە نێو مژەکەوە وەدەر دەکەوتن و وەك فلچەیەکی گەورە و چڕی لێ دەهاتەوە.

عەلی بە هەموو هێزی خۆیەوە و بە تووڕەیی هەرای کرد:

- هۆۆۆۆۆۆی ی ی ی حەسەن هۆ ۆ ۆ ۆ ۆ وەڵام بدەرەوە..

زایەڵەی دەنگەکەی شیو بە شیو و رەوەز بە رەوز رۆیشت و دەنگی دایەوە. عەلی راوەستا هەتا زایەڵەی دەنگەکەی بڕایەوە و لەگەڵ تەواوبوونی دەنگدانەوەکەی، دووبارە هەرای کردەوە:

- کوڕە هۆ ۆ ۆ ۆ ی ی ی ی حەسەن هۆ ۆ ۆ ۆ ۆ..

هەر وا دووپاتەی دەکردەوە. کە زایەڵەی دەنگەکەی زۆر بوو، بێدەنگ بوو و گوێی هەڵخست. دەنگەکە کێوا و کێو دەڕۆیشت و زایەڵەی دەنگەکان نەدەبڕانەوە، کە دەشبڕانەوە عەلی دیسان هەرای دەکردەوە: هۆ ۆۆ ۆ ۆۆۆ ی حەسەن هۆ ۆهۆ ۆهۆ.... ساتێك وا نوقمی دەنگەکەی خۆی بوو، حەسەنی لە بیر چۆوە. دەیگوڕاند و گوێی لە زایەڵەی دەنگەکانی هەڵدەخست. لە نەکاو هیچ شتێکی لەبەر چاوەکانی نەمایەوە و لە بن لێوانەوە ناڵاندی:"ئاخ، ئاخ دایە گیان... ئاخ، دایکم ئێستا لەو گوندە چۆڵ و هۆڵەدا و لە نێو ئەو هەمووە دڕندە و دەعبایەدا بڵێی چ بکا؟"

مێشکی گەرم داهات:

- تۆ خوا ئەوە هەمووی نەهامەتی و نەگبەتی نییە؟ ئێستاش ئەو هەتیوە...

بە هەموو هێزی خۆیەوە هەرای کرد. دەنگی وەك گوللەیەك بەر رەوەزەکان کەوت و بڵاو بۆوە و دەنگی دایەوە. دەستەکانی لە ئەژنۆی خۆی راکێشان و گوتی:

- ئەو هەتیوە چووەتە کوێ؟... ئەو هەتیوە لە کوێیە؟ ئەگەر گورگ زگی دڕیبێ، ئەگەر هەڵۆ چاویان کۆڵیبێ چ بکەم؟

کوڵی گریانی هەستابوو. بە بێهێزییەوە لە سەر جێیەکەی خۆی هەڵترووشکا. پاڵی وەدار سنۆبەرێکی باریك دا. دارەکە داهات. عەلی بێدەنگ بوو.

ئەلیف مەنجەڵەکەی لەسەر سێکوچکە گەورەکە دانابوو و خەریکی لێنانی هەلیماوەکە بوو. ئاگرەکە ئەوەندە خۆش بوو مەنجەڵەکە لە نێویدا بەحاڵ دەبینرا. برێك دواتر بۆنی حەزبزوێنی رۆنی "کەرە"ی تواوە هەموو وڵاتی داگرت. بۆن و بەرامەی نەعناکەش تێکەڵی ئەو بۆنە بوو و هەمووان پێکەوە بوونە بۆنە بۆنە خۆشەکەی هەلیماوەکە. عەلی بە بۆنی هەلیماوەکە سەری لە

گێژەوە هات. ئەوەندەی برسی بوو، توورەییەکەی نیشتەوە و خاو بۆوە. لە نەکاو هەم دایکی و هەمیش حەسەنی لە بیر چۆوە. دەرپەڕی و قاپەکەی هەڵگرت و بەرەو مەنجەڵەکە چوو کە ئەلیف تازە لە سەر ئاگرەکە دایگرتبوو و لە بەر تاوەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا. ئەو کەوچکەی بە دەستییەوە بوو، هێندەی ئەسکوێیەك دەبوو. ئەلیف گوتی:

- زۆر داغە.

عەلی دووبارەی کردەوە:

- زۆر داغە.

خێرا خێرا و پەیتا پەیتا فووی لێ دەکرد و دەیخوارد.

شنەبایەکی نەرمی دەهات. سێبەری هەورێك هات و بەسەر لێرەکەدا تێپەڕی. پێنج شەش هەڵۆ دوور لە یەکتری، بە سەر شیوی دار گێلاسەکاندا دەخولانەوە. تەم و مژەکە، کە نیشتبووە بنی شیو و دۆڵەکەوە، تاوەکە تواندبوویەوە، یان بایەکە رەواندبوویەوە.

عەلی قاپەکەی لە لایەکەوە دانا و دەرپەڕی و لە بن ددانە گرەکانییەوە گوتی:

- ئەمن ئەوە دەڕۆم. لێ گەڕێ با ئەو توتکە سەگە بەجێ بمێنێ و بمرێ. خۆ لە دایکم زیاتر نییە...،

- یا ئەڵڵا، دەی با بڕۆین. وەپێشم کەون.

خۆی وەڕێ کەوت.

ئەلیف و ئۆمەخان لە دواوەی پێیان بە عەرزەوە رەق هەڵاتبوو. عەلی لە توورەییان ئاگری لێ دەبۆوە و دەڕۆیشت. ئەلیف بە دەنگێکی نیوەزیندووان ناڵاندی:

- راوەستە عەلی، مەڕۆ. کورە لە دەورت گەڕێم، مەڕۆ.

عەلی ساتێك راوەستا و گوتی:

-ساڵێك لەوەپێش لە سۆنگەی ئەنگۆوە ماڵوێران بووین، برسی و رووت و قووت ماینەوە و نەگەیشتینێ. ئەمساڵیش دیسان...

لە نێوان ددانەکانییەوە تفێکی رۆ کرد:

- با بەجێ بمێنێ و بمرێ...

ئەلیف:

- تۆزێ راوەستە، لە دەورت گەڕێم، سەبرێك بگرە. کورە منداڵۆچکەیەکی ئاوا، چۆن دەکرێ لەو چۆڵ و چیایە بەجێی بێڵی و بڕۆی.

عەلی دیسان بە خێرایی وەڕێ کەوت و بەدەم ڕۆیشتنەوە وەڵامی دایەوە:
- بۆ نابیٚ؟ زۆر باشیش دەبیٚ. هەر ئاوا لێی دەگەڕێم و دەڕۆم. لێی گەڕیٚ با بەجیٚ بمێنیٚ و بمریٚ.
ئەوەی دەگوت، بەڵام وردە وردە هەنگاوەکانی شل دەبوونەوە. ئاخرییەکەی ڕاوەستا. بە لارە لار هاتەوە لای ئەلیف:ی بە گورە گورِ کۆڵەکەی دانا و لە تەنیشتی دانیشت. ماندوو و شەکەت و بێهێز، چاوەکانی لێك نان و بێدەنگ مایەوە. ماوەیەك ئاوا مایەوە، لە نەکاو دەرپەڕی و وەك شێتان بە چەپ و ڕاستی خۆیدا غاری دەدا و هەرای دەکرد:
- حەسەن!... حەسەن!... هەر ئەلێرە بەجێم دەهێشتی بەڵام...
لەو کاتەدا رقەکەی نیشتەووە و ڕووی کردە ئەلیف و گوتی:
- کچیٚ ژنەکەی هیچی لیٚ نەهاتبیٚ؟...
ئەلیف وەڵامی دایەوە:
- جا من چووزانم... ئاخ... چووزانم.
ئەویش هەستی کرد ئەژنۆکانی تینیان تێدا نەماوە و دانیشت. خۆر بەرز ببۆوە. هەوا گەرمی کرد. ئاوی کانییەکە بە خوڕە خوڕ دەڕۆیشت. بە سەدان جرِ و جانەوەر وەك بریسکە بە خێرایی بە سەر ئاوەکەدا خوشین و فڕین و دیسان گەڕانەوە.
لە پشت ڕەوەزەکانەوە دەنگی خشەخشێك هات. عەلی هەر سەری هەڵێنا، حەسەنی دیت. لە جێی خۆی دەرپەڕی و بە قەستی کوشتنی پەلاماری دا. ئەلیف بە لاڵانەوە و پاڕانەوە گوتی:
- کوڕە نەکەی عەلی، لێی نەدەی.
عەلی نەیبیست. هەر بەو تووڕەییەوە، گەیشتیٚ و دەستی بەرز کردەوە. منداڵەکە ڕاوەستابوو و بە چاوی بەتاڵ و سەرسووڕماوەوە چاوی تێوە بڕیبوو. ئاگای لە هیچ کویٚ نەبوو. عەلی لە هەوا دەستی وشك بوون. کۆڵە شوولکەکەی هێندەی قەڵافەتی خۆی دەبوو.
منداڵەکە شەڵاڵی ئارەقە بوو و جلوبەرگەکانی بەری تڵیش تڵیش ببوون. دەموچاوی ڕەش داگەڕابوو. دەست و پێیەکانی رووشابوون و شووخاڵ شووخاڵ ببوون و خوێنی سەر شوێنەر رووشاوەکانی قەتماغەیان بەستبوو. دەتگوت حەسەن لە شەڕگە گەڕاوەتەوە.
عەلی بەسپایی لێی چووە پێشیٚ و شوولکە گێلاسەکانی بە هەر دوودەستی لە پشتی حەسەن کردەوە و فڕێی دایە بن ڕەوەزەکە و گوتی:
- شێت و شوور، ئەو هەمووە شوولکەت بۆ چییە؟... بنیادەم ئەوەندە شوولکەی نەك پیٚ ناچێتە چوکووراوا، دوو هەنگاوی دیکەشی پیٚ نابردریٚ. یاڵڵا بچۆ شتێك بخۆ. ئەلیف خواردنەکە ماوە؟...

ئەلیف بە خۆشییەوە وەڵامی دایەوە:
- بەڵێ ماوە.
عەلی پێی خۆش بوو کە هەلیماوەکە ماوە. گوتی:
- کوڕە سەیری بکە، سەیری ئەو قەد و قەڵافەتەی. بۆ دوو سێ شوولك چیی بەسەر خۆی هێناوە.
حەسەن بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ، لە تەنیشت مەنجەڵەکەوە دانیشت و دەستی کرد بە خواردن. هەر بە ئەسکوێیەکەی بابی. ئەلیف و ئۆمەخان و عەلی لە لایەکەوە راوەستابوون سەیری دەستەکانی ئەویان دەکرد کە وەك مەکینەیەك لە نێوان زاری و مەنجەڵەکەدا دەهاتن و دەچوون.
دوای ئەوەی حەسەن مەنجەڵەکەی تەواو هەڵچۆڕاند، عەلی کۆڵەکەی هەلگرت و گوتی:
- دەی یائەڵڵا با بکەوینە رێ.
حەسەن دەسبەجێ خۆی گەیاندە بن رەوەزەکە، کە باقە شوولکەکەی لێ کەوتبوو. لە تەنیشت شوولکەکان دانیشت و چەندی هەولی دا نەیتوانی بە کۆڵیاندا بدات. نیگایەکی پڕ لە پاڕانەوەی لە ئۆمەخان کرد. دەتگوت بەزمانی بێ زمانی دەڵێ:"چما ئەتۆ خوشکە جوانەکەم نیت؟" ئۆمەخان چووە پێشێ و لێی هەڵێنا بۆ ئەوەی بەکۆڵی دا بدات. حەسەن لە بن بارستایی شوولکەکاندا کووڕ ببۆوە. بەلارە لار دەڕۆیشت و لەگەڵ هەر هەنگاوێکی دەینا، پێی وابوو هەنگاوێکی دیکەی پێ هەڵنایەتەوە. خۆرەتاو لە ئاوابوونێ بوو کە گەیشتنە داوێنی گردەکەی سلێمانلی. ئۆمەخان لە تەنیشت دایکییەوە بوو. جارێکی دیکەش لێی پرسییەوە:
- دایە، ئەدی کوا نەنکم؟
ئەلیف بە شێواوییەوە گوتی:
- ئاگات لێ بێ با حەسەن گوێی لێ نەبێ.
برێك دواتر، حەسەن کە لە بن کۆڵەکەیدا بڕستی لێ بڕابوو و وەك رەژوو رەش داگەڕابوو، هات و لە تەنیشت دایکییەوە راوەستا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:
- دایە، ئەوە نەنکم کوا؟
- وس وس، بابت گوێی لێ نەبێ؟
حەسەنیش بێدەنگ بوو.
برێك دواتر عەلی هات و کۆڵەکەی دانا. بۆنی ئارەقەیەکی تیژی لێ دەهات. حەسەنیش کۆڵەکەی خۆی دانا. ئەویش وەك بابی ئارەقەی کردبوو.

عەلی دەستی لە سەر شانی حەسەن دانا و گوتی:

ـ هەتیوە لاسارە، ئەو شوولکانەت بۆ چییە بەو قوونە خاوێنە دەیگەیێنیتە چوکووراوا؟

حەسەن بزەیەکی کاڵی وەك سێبەری لە لێوانی گەڕا:

ـ دەمەوێ شقارتەیان پێ بکرم. ئەم جارە بیست قوتوو. ئۆمەخان لە سەر زمانی بوو بڵێ:"ئەی عادیل ئەفەنی؟... بەڵام بێدەنگ بوو.

وردە وردە تاریك دادەهات. لێرەکە دەیگرماند، ئاوەکە خورەخوری بوو، بایەکە گڤەی دەهات. سلێمانلی هەورازێکی رژد بوو و سەری لە ئاسمانێ دەسوی. عەلی گوتی:

ـ حەسەن پاڵەوان، بەیانی، دەبێ لەو بەلایە وەسەر بکەوین. خۆ ئەو هەورازەت لەبیرە؟ پێی دەڵێن هەورازەکەی سلێمانلی...

حەسەن گوتی:

ـ بەڵێ لە بیرمە، نەنکم...

ئیتر بێدەنگ بوو.

لەو کاتەدا ئاگرەکەی ئەلیف، گڕی بەرز بۆوە و خۆش بوو و هەموو دەورووبەریان پڕ بوو لە بۆن و بەرامەی شیلەی چنار. لە خوارەوە و دەم کانییەکەشەوە بۆنی پنگە هەستا.

**لۆکـه رنینـﻪوەی خـﻪڵکی یالاك، له مەزرایەکی جوان و بە پیـت و بەرکەتـدا و لـه دەم رووباری جەیحان.**

# ٨

چوکوور له بەر تریفەی ئەو ئەستێرانەدا که جار بـه جـار کزتـر دەبـوون و ورده ورده نـەدیو دەبوو، له شیرین خەویدا بوو. شـەونمێکی وەك بـاران کـەوتبوو و مـەمی دیـك دەتگـوت هـەتا ئەژنۆی چووەتە نێو ئاوەوه و هاتووەتەوه دەرێ. لاقه رووتەکانی له خۆڵه نەرم و فێنکەکه نابوو و دەتگـوت دەیـەوێ لـه ئـاوێکی سـەهۆڵین و سـارد بـدات. بـه پێیـەکانی دوو هێڵـی بـه سـەر خۆڵەکـەدا دەکێـشا و دەڕۆیـشت. خۆڵـه نەرمەکـه لاق و لەتـەری دەلاوانـدەوه و ورده ورده بەولاولای لاقەکانیدا هەڵدەڕژا و ئازاری پانێی هێور دەکردەوه. دەنگی کـپ و کـزی زەنگوڵـەی عارەبانەکان که له دوورەوه دەهات و هەروەها دەنگی گۆرانییەکی نەرم که دیار نەبوو له کوێوه دێ، تێکەڵی بێدەنگییەکەی شەو دەبوو. سێ کـامیۆن بـه هـاڕە هـاڕ بـه جادەکـەدا تێپـەڕین. چراکانیان له دەم جادەکەوه به سەدان هێڵی نوورانیان خـسته سـەر ئاوەکـانی جـەیحان. ئاوەکـه رێك و بێ شەپۆل بوو. ئاوەکه مەند بوو، تەنانـەت شـنەی بایەکیـشی نـەدەهات. مـەمی دیـك شەلاڵی ئارەقه بوو. له دەم رێگەکه دانیشت. دەستی له پنچکه تووترکێك گیر کرد و گوشـیی. پنچکەکه دەستی رووشاند و خوێنی لێ هێنا. مـەمی دیـك بـەری نـەدا. وا هـەژابوو، پشووی دەرنەدەهات. له جێی خۆی دەرپەڕی و لاقەکانی له خۆڵه نەرم و فێنکەکه رۆکـردەوه و دەسـتی کردەوه به کێشانی لاقی به سەر خۆڵەکەدا و شوێن شوێنکردنی خۆڵەکـه. کڵاوەکـەی لـه سـەری داکەند. بۆنی ئارەقەیەکی تیژ و ترش و هەڵماوی به هەوا شێدارەکەدا بڵاو بۆوه.

کەوته نێو گەواڵـه هـەورێکی تـەپۆ و مێـشوولەوه. بـه پەلـه کڵاوەکـەی لەسـەر کـردەوه و گوێچکه و دەموچاوی به دەست داپۆشییەوه. دەستەکانی زۆر زل بوون. مێشووله هورووژمیـان

دێنا. مەمی دیك لاقی لە خۆڵەكە دەرێنا و رای كرد. ئەوەندە هەڵات تا تەواو ماندوو بوو، ئەوجار راوەستا و لە دەم رێگەكە لەسەرخۆڵە نەرمەكە دانیشت. ئەو تەپۆ و مێشوولانەی هورووژمیان بۆ دێنا، بە دەست لەخۆی دەردەكردن و بیری دەكردەوە: بارێكی قورسی لە سەر شانی لاچووبوو. دوای ئەوە، دوای مردنی "ئەو" مەمی دیك ئەوجار دەیتوانی بژیێ. دەیتوانی بچێتە لای زولەیخاش و چیی لە دڵ دایە پێی بڵێ. هەر جارێكی بیری لەو كابرایە دەكردەوە، پانێی پێیەكانی و ران و پشت و ملی دەیزریكاند. كە ئەوی وەبیر دەهاتەوە، خوێن دەمیزت و لە جێ دەكەوت. ئێستا ئیتر "ئەو" نەمابوو. دڵی بە شتێك خۆش بوو كە بۆخۆشی نەیدەزانی چییە. مێشوولەكان پتر هورووژمیان دەهێنا و لە سەر كراسەكەیەوە پێوەیان دەدا. سەفەر ئیتر زیندوو نەبوو. سەفەر، سەفەر مردبوو. "تازە، خۆ هیچ كەسیش نەیدەدواند. تاشباشی سەروەرمان بەر لەوەی شوێن بزر بێ، پێش ئەوەی بچێتە نێو چل سوارەكەوە، گوتی: "هیچ كەسێك... هیچ كەس... هیچ رۆح لەبەرێك، هیچ بوونەوەرێك، هەر لە مرۆڤەوە بگرە تا دەگاتە مێروولەیەك نابێ لەبزی دە لەبزی كوێخا سەفەر بگەڕێ." هیچ كەس نەیدەدواند. ئەو خاوەنی شەش چاو بوو. خەڵكی ژنێكیشیان نەبوو، كەچی ئەو سێ ژنی هەبوو. ژنی جوان جوانیش. ئەویش چ جوانێك! كچەتیوەكەی قیر سمایل بەو پشتە گۆشتن و سمتە نەرمانەیەوە...." مەمی دیك بە دەستە زلەكانی دەموچاوی خۆی گرت. مێشوولەكان شێت ببوون و وزە وزیان دەكرد و هورووژمیان دێنا و ئاگریان تێبەردەدا.

مەمی دیك شەكەت بوو. ئەگەر كاتێكی دیكە بوایە بەو هەمووە ماندوویەتییەوە نەیدەتوانی هەر لە جێی خۆشی ببزوێ. بەڵام شادی و خۆشییە چاوەڕواننەكراوەكەی ناخی، هەموو توانا و هێزێكی پێ دەبەخشی. زۆر بوون ئەو پیاوانەی دەستیان گەیاندبووە كچەتیوەكەی قیرسمایل. بەهێز و لەكوڵ بوو: "پیاو لە ژنی ئاوا وەڕەز دەبێ. هەر بە راستی ئەوجار ئەو كچەی قیر سمایل مێرد بە كێ دەكا؟ دەبێ مێردەكەی زۆر گەنج و بەخۆوە بێ، دەنا لەوانەیە دیسان سەری خۆی هەڵگرێ و وەگوند و دێهاتان بكەوێ و بۆ هەموو پیاوێك بخەوێ. ئەی لەو ژنە بەئالۆوشە. كە پێی لە سەر عەرزەكە دادەنێ ئەو عەرزە دەلەرزێ. پیاو سەهلە، سەگ و پشیلە و باڵندە و جڕ و جانەوەریش كە دەگەنە لای، شێت دەبن و بە شوێن جووتەكەی خۆیاندا دەگەڕێن. تاشباشی سەروەرمان پێش ئەوەی بچێتە نێو چل سوارەكەوە، گوتی: كەس نابێ قسە لەگەڵ ئەو سەگە گلاوە بكات و هەروەها ئەو كوشتنی فەرزە. هیچ كەس تەنانەت مێروولەی یالاكیش قسەی لەگەڵ نەكات. تەنانەت ژنەكانی خۆیشی و خزم و كەسەكانیشی،

هەر هیچ کەس نەیدوێنێ. بەڵێ، کێ دەیوێرا قسەی لەگەڵ بکا. ئەگەر یەکێك ئەو کافرەی دواندبایە، تاشباشی سەروەرمان لە چیای چل سوارەوە، بە تۆفانێکی تووڕەییەوە دەهاتە خوارێ و وای لێ رادەکێشا، چاوەکانی کوێر دەبوون و زمانی لاڵ و دەستەکانی گۆج و ئیفلیج ...." لە نەکاو بەبیریدا هات کە ئیتر ئێستا هیچ کەس ناتوانی کوێخا سەفەر بدوێنێ..."سەفەر ئێستا لە کوێیە؟ لە بن ئاو؟ لە بن دارەکە، لە نێو بیرێکی قووڵ و سی بەردی گەورەش لە سەر تەرمەکەی هەر بەردەی هێندەی سەری بنیادەمێك. ئاوەکە بەسەریدا تێدەپەڕێ. هیچ کەس نایدۆزێتەوە. هیچ کەس... بەیانی خەڵك دەڵێن چی؟ دەڵێن تاشباشی سەروەرمان سەفەری بردەوە. کەسیش نازانێ سەفەری چیی بەسەر هاتووە... خوێنەکەی چۆن فیچقەی دەکرد چەندەش زۆر بوو. هەموو جێیەك، ئاوەکە، بەردەکانی رووبارەکە، ماسییەکان، پنچکە تووترکەکان، دارە چنارەکە. گوڵە کلکەپشیلەکان، تەنانەت مێرووەکانیش شەڵاڵی خوێن بوون. گۆڕەکەی سەفەر پڕە لە خوێن.

رەگی دارەکە شەڵاڵی خوێنە. ئاو بە سەر تەرمەکەی کشاوە. هیچ کەس پێی نادۆزرێتەوە. هیچ کەس، هیچ کەس... بشیدۆزنەوە، تازە خۆ تەرمەکە لە سەفەر ناچێ..." مەمی دیك، کرووشمەی کرد. چزووی هەزاران مێشوولە لە سەر پشتی... وزە وزی مێشوولە گوێی کەڕ دەکەن. پشت و دەست و لاق و ملی و لووت و گوێچەکەکانی خوێنیان لێ هات. وەك شێتان بەلەك و باسك و پشتی هەڵدەکڕاند. بە نینۆکە درێژ و چلکنەکانی، گۆشتی گیانی خۆی دادەڕێ:"خۆ مردوو لە زیندوو ناچێ. دەگۆڕدرێ. هیچ پێی ناچێ. سەفەری مردوو هیچ لە سەفەرە زیندووەکە ناچێ. هیچ، هیچ... مردووەکان لە مردووەکان دەچن. لە مردووەکان...:"

هەوا گەرمە. پشووی توند دەبێ. هەستا. رووت بۆوە و چووە نێو ئاوەکە. ئاوە گەرمەکەی رووبارەکەی پێ سارد بوو. لەرزی. دەست و پێی لە سەرمان سڕ بوون. هەر وا بە دەم لەرزینەوە بەرەو لای خواروو خوشی. گەیشتە بن دارەچنارەکە. مردووەکە پشتی بە دارەکەوە نابوو و هەر وەك خۆی مابۆوە. چاوەکانیشی هەر کراوە بوون و زەق ببوونەوە. مردووەکەی هەستاند و بردی خستییە ئەو قوڵکەیەوە کە هەڵیکەندبوو. کە بە لك و پۆی دارەکان دایدەپۆشی، دەنگێکی گوێ لێ بوو. ئاوڕی دایەوە و سەیری کرد، بنیادەمێکی زبەلاح و رەش داهاتبۆوە و سەیری دەکردن. هاواری کرد و خۆی بە عەرزی دادا. دەستی وەڕانە سارد و خوێناوییەکەی مردووەکە کەوت. دڵی تێکەڵ هات. هێزی ئەوەی نەبوو دەستی بکێشێتەوە دواوە. لە نەکاو مانگ رووناکتر بۆوە و هەموو وڵاتی وەك رۆژ رووناك کردەوە. مەمی دیك،

رووت و قووت، لە تەنیشت تەرمە خوێناوییەکە وەك مێژۆکە دەلەرزی. بە ترس و لەرزەوە بەسپایی ئاوڕێکی دایەوە و سەیری کرد، تارماییەکە بزر بووە. دەرپەڕ و گورج بە پووش و پەلاش و لك و پۆ و گەلای دارەکان تەرمەکەی کوێخا سەفەری داپۆشی. رای کرد و وەك گلۆلە قورقوشمێك چووە بن ئاوەکەوە. ئەوجار بە هانکە هانك هاتە دەرێ و جلوبەرگەکانی لەبەر کردەوە.

دەنگەدەنگێك لەگەڵ دووکەڵی چەوری گازوایل و گەرما و هەڵمی ئاو و ئارەقەی جەستە و تیشکێکی بە تەوژمی وەك زارکی تەندوورێکی نێڵ دراو و پڕ لە ئاوردوو، دەشتەکەی پڕ کردبوو. چوکووراوا خەریك بوو لە خەو هەڵدەستا. چوکووراوا شەکەت بوو، لێی تخێڵ ببوو. بەسپایی هەناسەی دەکێشا و پرخەی دەهات. هەژدیهایەکی هەزار سەر بوو، داغ و سووتێنەر و بە ئالووش و شێت و سەرخۆش و بە لرفە و دوورەهەست. خەریك بوو لەخەو هەڵدەستا. زەردایییەکی چەور و سووتاو کە لە بن خۆرەتاوەکەدا هەڵدەبرینگا... زارکی تەندوورەکە داغ بوو. خۆڵ و خاکەکەی وەك بڵێسەیەکی سوور و بلوورین هەڵدەستا.

لە دەم کێڵگەکەوە راوەستا. سێ تارمایی لە مەزراکەدا دەجوولان. بەسپایی و بە ترس و پارێزەوە دادەهاتنەوە و راست دەبوونەوە. ئەژنۆیان دادابوو و دەستەکانیان بە خێرایی دەجوولان. مەمی دیك بە خۆی گوت:

"یەکێك لەو کافرانە زەڵەجەیە. ئەویتر ژنەکەی بەکرە شێتە و ئەوی لای راستەش... ئەوەی لای راستەش...."

مەمی دیك ئەوەندەی لە بە دەنگ و روخسار و قەلافەت بنیادەمەکانی دەناسییەوە، ئەوەندەش بە جووڵەیانەوە دەیناسینەوە.

"ئەوەی لای راستیشەوە، ژنەکەی تاشباشی سەروەرمانە..."

مەمی دیك وەخۆی هاتەوە. بووژایەوە. تینێکی تێ گەڕایەوە و هەژا و کێوی بوو. لەرزی. چێژێکی بێ سنوور، تاڵ و بێ جڵەو لە گیانی گەڕا. فیکەیەکی لێ دا. ژنەکەی نێوەڕاست بە دەنگی فیکەکە قیت بۆوە. مەمی دیك فیکەیەکی سەبر و کاریگەری دیکەشی لێ دا. ژنەکە بەرەو لای مەمی دیك غاری دا. مەمی دیك نەیتوانی بە سەر پێوە راوەستێ. پێستی لەشی وا رەوییبۆوە خەریك بوو بتەقێ.

ئەوە کاتێکی دیکە بوایە، تەنانەت نەیدەتوانی ئەو فیکەیەش لێ بدات. بەڵام ئێستا جۆرێکی لێ هاتبوو. دیسان فیکەی لێ دایەوە. فیکەکەی لێوڕێژ بوو لە خۆشەویستی و شێتی.

مەمی دیك هەتا ئەو رۆژە توخنی هیچ ژنێك نەكەوتبوو.

ژنەكە بە دەنگێكی لەرزۆكەوە پرسیی:

ـ ئەتۆی مەمی؟ چاوەڕێت بووم.

كامیۆنێك هات و تیشكەكەی ئاوەكەی رووناك كردەوە.

مەمی دیك پرسیی:

ئەتۆ هەموو شەوێ ئەو دەمانە لە خەوێ هەڵدەستی؟

ـ هەموو شەوێ.

ـ زۆر لۆكە كۆ دەكەیتەوە؟

ـ زۆر زۆر. بەڵام بۆ لۆكە هەڵناستم. چاوەڕێم. زەڵەجەش...

ـ زەڵەجە؟..

ـ زەڵەجە لە خەوتن و خەون دیتنێ دەترسێ. مارێك لە كۆڵی نابێتەوە. دەڵێ هەموو شەوێ دێتە خەوم. پەپكە دەخوات و لەگەڵ زەڵەجەی دەنوێ. زەڵەجە دەڵێ:"ئەو چێژەی لەوم دیوە، لە هیچ پیاوێكم نەدیوە. مارەكەم بە هیچ پیاوێك ناگۆڕمەوە."

ـ درۆیە... ئەو درۆزنە، دەترسێ. ئەو لە پیاو دەترسێ. ئەمن دیتوومە.

ـ ژنەكەی تاشباش لە حەژمەتان وەختە شێت بێ. ئەویش چاوەڕێی تاشباشە. هەر سێكمان، هەموو شەوێ، دوای نیوەشەو...

ـ ئەمن تاشباشی سەروەرمانم دیت. لە سەر چیای چل سوارەكە. هەوایەكی فێنك فێنك... ئاخ خوایە چەند فێنك بوو. ئەو چ كاری بە نێو ئەو مێش و مەگەزانەیە. پێی گوتم:"دێمەوە. بەڵام چوكوور فێنك فێنك دەكەمەوە. ئەگەر حەزتان لێ بوو بارانیش دەبارێنم."

دەستەكانی زەڵەجە وەك مەكینە كاریان دەكرد. سێ زەمبیلی گەورەی لێوانلێو كردبوو. مەمی دیكیش وەك ئەو. ئەویش دوو سەوەتەی پڕ پڕ كردبوو. بەڵام ژنەكەی بەكرە شێت، لە سەر گازەرای پشت بۆی كەوتبوو و سەیری ئەستێرەكانی دەكرد. بیری لە چێژ و خۆشییەكەی تاوێك لەمەوبەر دەكردەوە. ژنەكەی تاشباش قسەی نەدەكرد. بەدەست و بە پێ و بە زوڵف و سینگ و ران و جلوبەرگ و بەو سەوەتەیەی بە دەستییەوە بوو، بە هەموو شتێكییەوە بیری دەكردەوە. ژنەكەی بەكرە شێت گوتی:

ـ مەمی دیك وەرە. وەرە لە سەرت گەڕێم. كوڕە ئەمن تا ئێستا كەسی وەك تۆم نەدیوە. مەمی دیك وەرە، وەرە، وەرە،...

زەڵەجە هەرای کرد:

- ژنەتیوە بێ شەرمە، بێدەنگ بە...

هێڵی رووناکاییەك کە لە رۆژهەڵاتەوە دەرکەوتبوو، بەرینتر و گەورەتر بۆوە. شنەیەك هەڵی کرد. سروەی بەیانی... دەموچاوەکانی ماچ کرد. ناخی بنیادەمەکان نوێ بۆوە. جۆرە شادییەکی وەك شادیی هەڵفڕین ناخییانی لێوڕێژ کرد.

هەر کەسە و دەبە تەنەکەکەی خۆی هەڵگرت و رووی لە کێڵگەکە کرد. شان بە شانی یەکتری ریز بوون و هەر لەو کاتەدا هەڵڵا و دەنگەدەنگ لە دەشتەکەوە بەرز بۆوە. خەریك بوو رووناکی دەکردەوە و کرێکارەکان قۆزاخە لۆکەکانیان کە بە شەونم داپۆشرابوون، دەچنییەوە. جەواڵ و کیسە و سەوەتە و داوێنەکان پڕ دەبوون. چەندی خەوەکەیان باشتر دەڕەوییەوە، دەستەکانیان خێراترکاریان دەکرد. هەر کەسەی لۆکەی پتر کۆ بکاتەوە پارەی زیاتر دەباتەوە. زیاترین لۆکەش بە چالاکترین و گورجترین دەستەکان لە بەپیتترین مەزراکان کۆ دەکرێتەوە. ئەو مەزرایەی لە دەم رووبارەکەی جەیحانەوە بوو، کێڵگەی "موتەلیب بەگ" بوو. چل دۆنم دەبوو. خاکی ئەوەندە بە پیت لە چوکووراوادا نەبوو. هەر قۆزاخەیەکی مستێك دەبوو. چڵی لۆکە دەگەیشتە ئەژنۆ و لە زۆر جێیان دەگەیشتە سەر ناوك. هەر چڵێك سەدان قۆزاخەی گرتبوو. ئەو ساڵە بەرهەمی هەموو چوکووراوا ئاوا باش بوو. تەنانەت بەر و بووی مەزراکەی میرئالایش خراپ نەبوو. گوندییەکان دەیانتوانی هەموو قەرز و قۆڵەی خۆیان پاك بکەن و پاشەکەوتێکیش بکەن.

لاقەکانیان بە خۆڵە نەرمەکەدا رۆدەچوو. قۆزاخەی درشت و خووساو و پشکووتوو لە چڵەکانیان لێ دەکرانەوە و دەخرانە نێو تەلیس و داوێن و سەوەتەکانەوە.

لۆکە بە شەونمی شەوێ خووساوە. هەر بۆیە، "پالە" بەر لە تاوهەڵاتێ، لۆکەکە هەر بە قۆزاخەیی و بە تەڕی لە جەواڵەکان دەناخنن، دوایی کە تاو هەڵات و گەرم داهات، لە سێبەری کەپر و خێوەتەکاندا دادەنیشن و لۆکە لە قۆزاخەی دێننە دەرێ و جا چونکە قۆزاخە و قەپیلکەکان تەڕن، ورد و پرد نابن و لۆکەکە پیس ناکەن و لۆکە وەك شیری سپی و بێ پەڵەی لێ دێ. بەڵام لە گەرمادا، ئەگەر قۆزاخەکە بە وشکی کۆ بکرێتەوە و بکرێتە جەواڵەکانەوە و دوایی لۆکەکەی لێ دەربکێشن، قەپیلکەکەی ورد دەبێ و لۆکەکە پیس دەکات و لۆکەی پیسیش بەکار نایە.

مەمی دیك زۆر خێرا کاری دەکرد. دەستەکانی ئەو قەت ئەوەندە بەهێز نەببوون. مەمی دیك قەت ئەوەندە دڵی خۆش نەبووە. کرێکارەکان لە ریزێکی درێژدا و شان بە شانی یەکتر،

هێندێکیان لە سەر چۆکان و هێندێ بە کوورە کوور و هێندێ بە قوونەخشکێ کاریان دەکرد... لەو سەرەوە چاوەکانی مەمی دیك، پشت کۆماوەکەی مام خەلیلی ناسییەوە. دەتگوت دەشەلێ. کۆگا لۆکەی مام خەلیل دوو هێندەی ئیی ئەوانیتر بوو.

مەمی دیك بە خۆی گوت:" ئێستا لە سەفەر دەگەڕێن و لە یەکتری دەپرسن ئاخۆ لە کوێیە؟ دەگەڕێن و دەگەڕێن و نایدۆزنەوە... سێ ڕۆژی دیکە ژنەکە، کچەکەی قیرسمایل دەست دەکا بە گریان و شین. دواییش خەڵکەکە هیچ شوێنەوارێکی نادۆزنەوە و دەڵێن:"سەفەر خۆی پێ نەگیرا. ئەو هەمووە سووکایەتییەی پێ قەبووڵ نەکرا و خۆی کوشت. خۆی خستە نێو بیرێکی قووڵەوە... خۆی بە دەم ڕووبارەکەی جەیحان دادا... تەنانەت تەرمەکەشی نەدۆزرایەوە.

لە نەکاو هەموو گیانی وەلەرزین کەوت. دەست و پێی بێ هێز بوون:"باشە هەر بە ڕاستی ئەگەر یەکێك لەو بیرەدا تەرمەکەی دیتبێ چ بکەم؟ یان قەل و داڵ و سیسارکە کەچەڵە بە سەر بیرەکەدا بسووڕێنەوە؟ یان ئەگەر تەرمەکە جوان دانەپۆشرابێ ئەو کات؟..."

دەستەکانی وەك مەکینە کاریان دەکرد. لە چاوترووکانێکا سەوەتەکەی پڕ دەبوو. دەیبرد و بەتاڵی دەکردەوە و دەگەڕایەوە دەسبەجێ پڕی دەکردەوە.

هەواکەی گەرمی کرد. خاکەکە وشك ببوو بەڵام قۆزاخە لۆکەکان هێشتاش تەڕ بوون. قۆزاخەکان دوو سەعاتێکیش دوای تاوهەڵاتنێ وشك نابنەوە. هەر بە ڕاستی مردووەکە چیی بە سەر هاتووە؟ نەکا بیدۆزنەوە؟ ئەگەر بیبینن... ئەو چەقۆیە دەناسنەوە کە سینگی هەڵدڕیوە...

مەمی دیك بە خۆی گوت:" کوڕە ئەمن زۆر کەرم ها. خۆ چەقۆیەکەم لە سینگیدا بەجێ هێشتووە. خۆ هەمووان دەزانن ئەوە چەقۆی منە."

بەبێ ئەوەی بەدەست خۆی بێ، دەستی بۆ کێلانە بەتاڵەکەی چەقۆکەی برد و حاڵەتێکی نامۆی بەسەردا هات.

هەتاو... هەموو وڵات وەك زارکی تەندوور وابوو. لەگەڵ دەرکەوتنی خۆرەکە، وزە وزی مێشوولە بڕابۆوە. مێشوولە و تەپۆ دوای تاوهەڵاتنێ نامێنن و خۆ لە کەلێن و قوژبن و بن سێبەران دەپەستێون. بەڵام موجوك (وردە تەپۆیەکە) جێیان دەگرێتەوە. موجوك مێشوولەیەکی ڕەشە هێندەی نووکە دەرزییەك. کە گەرماکە هەڵدەکا، بە هەزاران هەزاردانە دێن و خۆ بە دەموچاوی بنیادەمدا دەدەن و دەموچاوەکان ڕەشدا دەگێڕن. خۆ بە دەرکردن و کوشتنیان دەرەقەتیان نایەی. دەچنە نێو چاوی ئەسپ و گوێدرێژ و مانگا و ئاژەڵەکانی دیکەشەوە.

موجوك دەموچاو و سەر و قژی مەمی دیکیان داگرتبوو. هەر ددانەکانی سپی دەچوونەوە. بەڵام ئەو هەر گوێشی لێ نەبوو. بە ترسان وەختا بوو بمرێ. بیری دەکردەوە کە نەکا یەکێك تەرمەکەی دۆزیبێتەوە. زراوی چوبوو. هەر دەیەویست دەست لە لۆکەرنینەوەکە هەڵگرێ و بچێ سەرێکی مردووەکە بدات. نەیدەتوانی. دەترسا وەشوێنی کەون... ئەوکاتە... ئەی عومەر؟..." ئەو سەگبابە، هیچ و پووچە. سەگە هارەکەی سەفەر. ئەو سەگبابە. لێ گەڕێ با سەفەر جوان جوان بشارمەوە. لێ گەڕێ با مەسەلەکەی سەفەر ببڕێتەوە. نۆرەی تۆش دێ..."

گوندی ماندوون. چیی گەمتری دەکا، بۆنی خاك و گیا پێخوستکراوەکە هەموو وڵات دادەگرێ. لە لۆکەجاڕەکاندا بۆنی ئارەقەی لەش تێکەڵی ئەو بۆنانە دەبێ و بۆنی لۆکەش تاڵ و هەڵبرینگاو لە بەر هەتاو.

پشتی مەمی دیك ئارەقەی کردبوو و شۆرەکاتی هەڵدابوو. دڵۆپەی ئارەقە لە نێوچاوانی دەتکان.

دەنگی پێکەنینی ژنێك هات. ژنەکەی بەکرە شێت لە مەمی دیك چووە پێشێ. داوێنی کراسەکەی بۆ ساتێك سەری مەمی دیکی داپۆشی. بۆنی ژنەکە سەری مەمی دیکی لە گێژەوە هێنا.

ـ وەرە مەمی دیك وەرە. ئەمن پیاوی وەك تۆم نەدیوە. پیاوم زۆر دیوە بەڵام هیچ کامیان وەك تۆ نەبوون.

مەمی دیك لەو ساتەدا زەلەیخای دیت. کچێکی کولمە سوور بوو. بیست ساڵ تەمەنی بوو. کچی ئەشە بێوەژن بوو. ژن بوون لە هەموو گیانی دەچۆڕایەوە و هەڵدەقوڵی. مەمی دیك شێت و شەیدای بوو، بەڵام شەرمی دەکرد. نەیدەتوانی سەیری بکا. زولەیخای بۆ چرکەیەکیش لە خەیاڵی نەدەچووە دەرێ. مەمی دیك خەونیشی هەر بەوەوە دەدی و شێتی دەبوو.

هەستا. تەنانەت بیری لەوەش نەکردەوە موجووکەکانی سەر و چاوی دەر بکا. لەم سەرەوە چووە ئەو سەری مەزراکە. بۆنی سەرخۆشیکەری ژنانەی، ژنەتیوەکەی بەکرە شێت لە مێشکیدا بوو. بەرەو لای زولەیخا چوو. بۆ یەکەم جار سەیر دەموچاوی و نێو چاوەکانی کرد. کچە پێی سەیر بوو. مەمی دیك شتێکی دیکەشی کرد کە هیچ چاوەڕوانیی لێ نەدەکرا. بە پتە پت گوتی:

ـ زولەیخا، ئەمن لۆکەم رنیوەتەوە. ئێستاش دەمەوێ بۆ تۆ برنمەوە.

زولەیخا ئەوەندەی پێ سەیر بوو، نەیتوانی هیچ بڵێ. مەمی دیك لە تەنیشت کچەوە چووە نێو ریزەکەوە. کچە سەری سوورِ مابوو. مژۆڵە بەرز و رەشەکانی سێبەریان دەخستە سەر چاوە ئاگرینەکانی.

ورد و درشتی ئاوایی دەیانزانی مەمی دیك شێت و شەیدای زەلەیخایە و ئەوەشیان دەزانی هیچ کات لێی نزیك نەبووەتەوە و تەنانەت نەشیتوانیوە سەر هەڵێنێ و سەیرێکی دەموچاویشی بکات. کە مەمی دیك چووە تەنیشت زولەیخا و قسەی لەگەڵ کرد، هەر هەمووان دەستیان لە کار هەڵگرت و سەیریان کرد. مەمی دیك گوێی پێیان نەبزووت و سەری داخستبوو. کەفوکوڵی ئەشقی زولەیخا هۆشی لێ بڕیبوو و نوقمی چێژێکی سەیر بوو. مووچڕکەی بە لەشیدا دەهات.

ژنەکەی بەکرە شێتیش هات و لە لای راستییەوە دەستی بەکار کرد. هەر وا قسەی دەکرد.

ـ مەمی دیك، مەمی دیك، وەرە لای خۆم. ئەمن پیاوێکی وەك تۆم... مەمی دیك... مەمی دیك...

زولەیخا پێی بە عەرزییەوە وشك ببوو. مەمی دیك ساتێ سەری هەڵێنا و بەو چاوانەیەوە کە ئاگریان لێ دەباری، سەیری زولەیخای کرد و گەش گەش پێکەنی. لە چاوترووکانێکا سەوەتەکەی دەستی پڕ دەبوو. گورج هەستا و لە جەواڵەکەی زولەیخای کرد و گەڕایەوە. هەمووان سەیریان دەکرد، هەر دەتگوت رووت و قووتە. پتر لەو سەیری زولەیخایان دەکرد.

ـ مەمی دیك، مەمی دیك وەرە...

عەرزەکە سوور ببۆوە. وەهەر شوێنێکی بنیادەم دەکەوت دەیسووتاند.

زولەیخا دەستی لە سەر عەرزەکە دادا و لە سەر خاکە داغەکەی دانیشت. گۆشتی گیان بە خاکەکەوە نووسا. بە خۆشییەوە گوتی:

ـ مەمی دیك، پاڵەوانەکەم، گیانەکەم، مەمی دیك. بە حەژمەتی ئەو رۆژەوە بووم.

گیانی گڕی گرت. کە خاکی بنی فێنك بۆوە، هەستا و لە سەر جێیەکی داغ دانیشتەوە. پێستی لەشی و دەستەکانی بە خاکەکەوە نووسابوو و دەسووتایەوە.

تەنانەت گەڵایەکیش نەدەلەرییەوە. خۆر تیرێژی بە سەر عەرزە رێکەکەی چوکووراوادا دەپژاند کە یەکسەر سپی دەچۆوە و چاوی بەشەوارە دەخست، دەبریسکایەوە و هەڵمی لێ هەڵدەستا.

تا چاو بڕی دەکرد سپی و زەرد بوو. شریتێکی باریکی کەسك بە درێژایی چەمی جەیحان کێشرابوو و لەگەڵ چەمەکەدا قەف و پێچی دەخواردەوە و لە قووڵاییە تاریکەکەی رووبارەکەدا نەدیو دەبوو.

بە لای راستدا، ئەو شوێنەی کە رووبارەکە بەرەو رۆژاوا بای دەدایەوە، لێڕەوارێك چڕ بوو کە رەش دەچۆوە. لەو گەرمایەدا هەڵمێکی وەك هەور لەو لێڕەوارە هەڵدەستا.

مەمی دیك پشتی دایە ژان. زۆربەی گوندییەکان خۆیان گەیاندبۆوە بن کەپر و خێوەتەکانیان و سەری توورەکەیان کردبۆوە و لۆکەیان لە قۆزاخە دەردێنا. مەمی دیك دەستی لە کەلەکەی نا و سەیری دوور دووری کرد. ئەوجار داهاتەوە و ملی نایەوە لە لۆکە رنینەوە. زولەیخا:

ـ ئیتر، بەسەر. بەسە. زۆر بوو، بە قوربانت دەبم مەمی دیك... بەسە، ئەمن چۆن دەتوانم ئەمرۆ ئەو هەمووە پاك بکەم؟ بە دە کەسیش ناکرێ..؟

مەمی دیك دەستی راوەستا. سەوەتەکەی لە دەستی بەربۆوە. زولەیخا ترسا. روخساری مەمی دیك وەك یەکەم رۆژ زەرد هەڵگەڕایەوە. ئەو جار سپی بۆوە و دوای ئەوە رەش داگەڕایەوە. دەستەکانی دەلەرزین. لە سەر خاکەکە هەڵترووشکا. زولەیخا:

ـ ئاوت بۆ بێنم؟...

رای کرد و لەو گۆزەیەی لەو پشتەوە داینابوو، قاپێکی ئاو بۆ هێنا و بە دەمییەوە کرد. دەستەکانی مەمی دیك قاپەکەیان پێ نەدەگیرا. چاوەکانی بریبووە سەفەر کە لە دوورەوە دەهات و بۆ چرکەیەکیش نەیدەتوانی چاوی لە سەر هەڵگرێ. دەتگوت لەوە دەترسێ سەفەر غەیب بێ. بەخۆی گوت:

ـ نەکا سەفەر زیندوو بێ؟...

ئەوجار لە خۆی پرسی:"کەوابوو ئەوەی کوژرا کێ بوو؟... ئەو پیاوە کێ بوو؟...."

سەفەر تفەنگێکی جووت لوولی راوی بە دەستێکەوە و کەروێشك و باڵندەیەکیش بە دەستەکەی دیکەیەوە، قیت قیت، بە نێو گوندییەکاندا تێپەڕی و بەرەو کەپرەکان رۆیشت. پانیی پێڵاوەکانی لە لاستیکی ترۆمبێل کرابوون. ئێستا دەچۆوە کەپرەکەی خۆی، کە لەو سەری هەمووانەوە بوو، بە دەستی خۆی نێچیرەکانی کەوڵ دەکردن و ئاگرێکی دەکردەوە و خوێی دەکردن و لە سەر سکڵ و پشکۆکان دایدەنان. جا ئەوجار ئەو بایەی دەهات، بۆنی گۆشتە برژاوەکەی بەرەو ئەو گوندییانە دەبرد کە لە مێژ ساڵ بوو دەمیان وەگۆشت نەکەوتبوو. نای لەو بۆنە خۆشەی کە پیاوی شێت دەکرد.

گوندی لەو رۆژەوەی تاشباش رۆیشتبوو و داوای لێ کردبوون کەس سەفەر نەدوێنێ، یەك قسەشیان لەگەڵی نەکردبوو. ئەویش ئاوا تۆڵەی خۆی دەکردەوە. بە بڵاوکردنەوەی دووکەڵی بۆنخۆشی گۆشتە برژاوەکە بە سەر ئەو گوندییانەدا کە لەمێژ ساڵ بوو چاویان بە گۆشت نەکەوتبوو. هەروەها بە خواردنی گۆشتی سوورەوەکراو و برژاو لە بەر چاوی ژن و منداڵ و گەورە و بچووکیان.

سەفەر دوای برژاندنی گۆشتی نێچیرەکانی، هەڵدەستا و سوێسکەیەکی برژاوی بە دەستەوە دەگرت، لە پێشدا برێکی بارەوبار دەکرد و سەیری دەکرد و ئەوجار دەستی دەکرد بە خواردنی ئەو گۆشتە چەورە. رۆن بە دەم و فلچ و لا لغاوەیدا دەهاتە خوارێ و جار و بارە بە ملچەملچ یەکێك لە پەنجە چەورەکانی خۆی دەلستەوە. کە لە پێش چاوی گوندییەکانی ئەو گۆشتە خۆشەی بارەوبار دەکرد و دەیخوارد و ملچەی لە زاری دێنا، برێك لەولاترەوە، لە نێو گوندییەکاندا دەبووە قیامەت. منداڵ هاواریان لێ بەرز دەبۆوە:"ئەمنیش گۆشتم دەوێ. پاروویەك گۆشت." گوندی هەموو شەوێ لە خەونیاندا ئەوە گۆشتی برژاو دەخۆن و رۆنەکەی بە لا لغاوەیاندا دەچۆرێتەوە و بە دەنگی گریان منداڵەکانیان کە داوای گۆشتیان دەکرد:"دایە گۆشتم دەوێ." لە خەو هەڵدەستان. سەفەر لە گۆشتی نێچیرەکانی پیچکەگۆشتێکی بە ژن و منداڵەکەی خۆی و تەنانەت بە نەخۆشیەکانیشە نەدەدا. بەرماوەی گۆشتەکەشی یان دەشاردەوە یان بە بەر چاوی زەق زەقی گوندییەکانەوە بە دەم چەمەکەی دادەدا.

مەمی دیك هەستا. سەوەتەکەی هەر لەوێ مایەوە. بەرەو کەپرەکان رۆیشت. ئیتر ئەوجار نەیدەتوانی سەیری زولەیخا بکاتەوە و بچێتەوە نێو خەڵکی. هەر هەموو گیانی، بە تایبەتی ئەو شوێنانەی سەفەر بریندار کردبوون، دەیزریکاند و شێتانە دەخوران.

"نەمردووە، بەڵام دەیکوژم."

ئەی ئەو مردووە کێ بوو؟ یانی خەونی دیتبوو؟ ئاخۆ هەموو خەون و خەیاڵ بوو؟

گوندی لۆکەیان لە قۆزاخەی دێنایە دەرێ و ساواری سەر ئاگردانەکان دەکوڵی. تەپوتۆزێك لە رێگە دوورەکانەوە هەڵدەستا و وەك گەواڵە هەوری لێ دەهات.

کوێخا سەفەر لە بن لێوانەوە گۆرانییەکی دەگوتەوە. لە بەر تاوە گەرمەکە، ئاگرەکەی دەکردەوە و سوێسکەکانی چاك دەکرد. هێندەی نەدەبرد کەپرەکان بە دووکەڵی حەزبزوێنی کەبابەکە لیکاویان دەهاتە خوارێ و گوندیی برسی شێت دەبوون.

گوندییەکان ئاوڕیان لە جادەکە دایەوە. لە دوورەوە "عەلی"یە درێژیان دی کە لە بن بارەکەیدا کوورِ بۆتەوەو ئەلیف و حەسەن و ئۆمەخانی بە دواوە بوون.

بوو بە مقۆمقۆ و غەڵبەغەڵب:

ـ مرێمۆکیان لەگەڵ نییە. لەگەڵیان نییە.

ـ "عەلی"یە درێژ مرێمۆکی کوشتووە.

ـ ئاشتووشێتی.

کوێخا سەفەر وازی لە سوێسکەکانی هێنا و بەرەو لای عەلی غاری دا: بەو هیوایەی کە "عەلی"یە درێژ لێی تێك بچێ و چەند قسەیەکی لەگەڵ بکا. بۆ ئەوەی هەمووان بزانن ئەوەی بیدوێنێ نە دەست و پێی ئیفلیج دەبن و نە لە دین وەردەگەڕێ. هەرای کرد:

- ئەی ئەوە کوا مرێمۆك؟ کابرا؟ باشە، دەی بۆخۆت سلامەت.

عەلی کە دەموچاوی لە بن بارە قورسەکەیدا ڕەش داگەڕابوو، سەیرێکی کرد و پشتی تێهەڵکرد.

- دەروجیران ماندوو نەبن.

حەسەن لە عەلاگەیەکدا بیست و شەش شقارتەی پڕ کردبوو. عەلاگەکەی توند بە سینگییەوە دەگوشی. ئەگەرچی ئەمجارەیان شوولکە گێلاسەکانی باش فرۆشرابوون، بەلام حەسەن هەتا هێنابوونی نیوەگیان ببوو. شانەکانی بریندار ببوون. پشتی شووخاڵ شووخاڵ ببوو و دەبرژایەوە. لەو برینانە لە هەوای چوکووراوادا هەتا پاییزێش چاك نەدەبوونەوە.

زەڵەجە هەستا و گوتی:

- ئەیەڕۆ، ئەیەڕۆ خۆ مرێمۆکیان کوشتووە. کوشتوویانە جا هاتوون. دیار بوو هەروا دەکەن.

مام خەلیل هەستا و بە شەلە شەل بەرەو لای عەلی چوو. عەلی هێشتا کۆڵەکەی دانەنابوو و بە سەرسووڕماوییەوە سەیری دەکردن. مام خەلیل تفی زاری قووت دا و قسەی بۆ نەکرا.

گۆملیکسیز ئۆغلۆ لە جێی خۆی هەستا و دەستی پێ کرد:

- کوڕە هەی بێ دین و ئیمانینە، هەی کافرینە، لانیکەم با کۆڵەکەی دابنێ و سلاوی بستێننەوە. دەی باشە، خوا لێی خۆش بێ، عەلی. کەس دایك و بابی بۆ نەماوەتەوە. دیارە ئەویش عومری نووحی بۆ نەهاتبوو...

گوێچکەیەکی بارەکەی گرت و لێی داگرت. چەند گەنجێك چوون بە دار و لك و پۆ، کەپرێك بۆ عەلی دروست بکەن.

مەمی دیك سەری هەڵێنا. لە دوورەوە سێ هەڵۆ بە ئاسمانەکەدا دەخولانەوە. خۆی پێ نەگیرا. دەرپەڕی و بەغاردان دوور کەوتەوە.

**شـەوێكی سـامانّی پـڕ لـە ئەستێرە و تـەپۆی چـوكووراوا، لەگـەڵ گەرمایـەكی شـێدار و هـەڵماوی كـە خـەو لـە چـاوی بنیادەم دەزڕێنێ.**

## ٩

"هەوا گۆڕ" لە ئەوەڵی شەوێوە كردبوویە هەڵلاّ و جنێوی دەدا. دیسان ژانـە دڵەكـەی لێـی هەڵدابۆوە و ئەقڵی لە مێشكیدا نەمابوو.

ـ كوڕە هەی دێهاتییە كەر و بـێ ئەقڵـەكان، هـەی ئـەو دایـك و خوشـك و گـەورە و بچووكانەتان بگێم... ورد و درشتتان، ئەوی لە مێـروو بـچووكتر و لـە چـیای تـۆرووس گەورەتره... ئاخر هەموو سـاڵی بۆچـی دێنـە ئـەو جەحەندەمـە؟ ... بـۆ دانانیـشن لـە گوندەكەی خۆتاندا كە دەڵێی بەهەشتە و ئەو هەمووە كانیاوە پڕ لە وردە چەوە سـپیەی تێدایە و ئاوەكەیان دەڵێی سەهۆڵە. كوڕە هەی گوندیی هیچ و پووچ... ئەمن دڵم دێشێ و خەریكە لە ژانە دڵ دەمرم. هەڵمگرن و لەو چوكووراوایە ببەنەوە كوێستانەكەی خۆم. هەی، هەی ئەو خوشك و دایكەتان بگێم... خۆ ئەمساڵ لۆكەكەی باشە... بەلاّم ئەو ژان و ئازارە دەمكوژێ...

گوندیی ماندوو و شەكەت، یەك یەك و دووان دووان لە دەوری "هـەوا گـۆڕ" كـۆ بوونـەوە. هەوا گۆڕ هەم لـە چـوكووراوا و هـەمیش لـە گوندێـدا، حـەوتووی یـەك دوو جـاران ئـاوای لـێ دەهات. تەنیا نەنە مرێمۆك دەرمانی دەردەكـەی ئـەو بـوو و بـەو مەڵحەمانـەی بـۆی دروسـت دەكرد، ئازارەكەی دەبڕی.

هەوا گۆڕ چەندی ئازارەكەی توندتر دەبوو زیاتر هاواری دەكرد:

ـ كوا نەنە مرێمۆك؟ لە كوێیە هەی كافرینە؟ كوشتتان. ئەنگۆ كوشتتان بۆ ئـەوەی هـەوا گـۆڕی داماو بەو ئازارەوە بمرێ. چما وا نییە؟ كاكە "عەلی"یە درێـژ، چـیت لـە گیـانی مـن دەویـست كـە

هیواكەی ژیانمت كوشت؟ كوڕە وەختە گیانم دەرچێ. نەجاتم بدە.. هۆی خەلكینە... هەی دایك و خوشكتان... هەر لە مێرووله بچووكتر و لە تۆرووس گەورەترتان بگێم....

گەرماكەی شێدارە، كەس سریوەی لێوە نایە. تەنانەت گەڵایەكیش ناجوولێ، ئەستێرەی درشت و درەوشاوە و بە جریوە، شەوە تاریكەكەیان روون كردووەتەوە. مانگ خەریكە هەڵدێ... سیسركەكان سیرپیانە و لە زۆنگاوە دوورەكاندا بە هەزاران بۆق قیرەیانە... هەواكەی خەست و خنكێنەرە... مێشوولە وەك هەور بە ئاسمانا دەسووڕێنەوە. دەنگی باڵیان لە ویزەی با دەچێ. هەموو خەلكەكە وێكرا، خۆیان هەڵدەكرێنن و دەناڵێنن. كەس تا ئێستا ئەوەندەی تەپۆ نەدیوە.

"پاڵە" ئاگرێكی گەورەیان كردووەتەوە و لە دەوری كۆزیلكەیان بەستووە. مێشوولە ناتوانن لە ئاگر نزیك ببنەوە، بەڵام ئەوانەی لە دەوری ئاگرەكە دانیشتبوون، خەریك بوون لە گەرمان بپیشێن*. لە لایەكەوە گەرما شێدارەكەی چوكووراوا و لە لایەكی دیكەوە بڵێسەی ئاگرەكە.

خۆیان لە سەرچەفە و لێفەكانەوە پێچا. خزینە نێو جەواڵ و توورەكەكانەوە. نە دووكەڵەكە كاریگەر بوو و نە چارشێو و جەواڵ و لێفەكان... وزەی باڵەكان بە سەر سەریانەوە و چزووی وەك دەرزی لە لەشیاندا، جا ئەوجار خوران و ئاڵووش..

مام خەلیل هەرای دەكرد:

ـ خوایە گیان، خوایە... خوایە... ئیتر ئەوە چ بەڵایەكە خوایە... خۆزگە زەوی و زار داپچڕێ و ئەو چوكووراوایە قووت بدات.

حەسەن هاواری دەكردز لە كوێستانەوە فێنكاییەك لە مەنجەڵە لەكوڵەكەی چوكووراوا گەڕابوو. لە عەلاگەكەی خۆی یەكەم قوتووە شقارتەی دەرێنا. لە نێوگەڵی خۆیدا یەكەم چڵی داگیرساند و هەتا تەواو بوو، بە تاسەبارییەوە سەیری بڵێسەكەی كرد. ئەوجار هەستا، لە خەلكەكە دوور كەوتەوە. لەو لاترەوە پنچكە درووپەكی دیتەوە. چووە پشتی و دەستی كرد بە هەلكردنی چڵە شقارتەكانی. هەر شەمچەیەكی لێ دەدا و هەتا چڵەكەی تەواو دەسووتا و ئاگرەكەی تینی بۆ پەنجەكانی دێنا، تاسەبارانە سەیری بڵێسەكەی دەكرد و جار و بارەش هەڵدەستا و دەیڕوانی بزانێ گوندی سەیری دەكەن یان نا؟ نیگەران بوو، دەترسا ئەگەر بێت و گوندی ببیننن كە ئەو بەردەوام شەمچە (شقارتە) هەڵدەكا و سەیری بڵێسەكەی دەكا، وا دەزانن شێت بووە.

---

*پیشان: لە موكریان بە كوڵینی شتی رەق بە تایبەتی پەتاتە و كوولەكە لە ناودا، دەڵێن پیشاوە. پەتاتەكە پیشاوە: واتە تەواو كوڵیوە و نەرم بووە. وەی باوكەڕۆ پیشام...

مام خەلیل بەسپایی خۆی خزانده لای عەلی‌یە درێژەوە. دەستی گرت و بە لەبزێکی گریاناوییەوە گوتی:

ـ ئاخ مرێمۆك، ئاخ. هەر وای دەنواند کەیفی بە من نایە و خۆشی ناوێم. بەڵام بڕوا مەکە. ئەوە هەر ڕواڵەتەکەی بوو. ئەو لە ناخییەوە خۆشی دەویستم. تەنانەت لای خۆیشی نەیدەدرکاند. ئەگەر من مردبایەم، ئەو ڕۆژی دووەم دوای من دەمرد. ئیتر من لەمەودوا ناتوانم بژیێم... ئیتر دوای مرێمۆك کارم تەواوە... و لە بانگی دا**. وەك منداڵ زۆر زۆر دەگریا و چڵمی هەڵدەلووشی و خۆی ڕادەژاند.

گوندی گەرما و مێشولەیان لەبیر چۆوە و لە دەوری مام خەلیل کۆ بوونەوە.

ـ ئەو داماوە بۆ مرێمۆك دەگری. خۆی بە سەر لاقی "عەلی"یە درێژی بێدین کێشاوە...

ئەوە نەنە زەڵەجە بوو وای گوت و لە سەری ڕۆیشت:

ـ ئەمن خەونم پێوە دیتی. لە من وا بوو.... ئای خوایە گیان چیم دی. دیم عەلی خەنجەرێکی مشتوو درێژی بە دەستەوەیە. دەستی لە تیتکی مرێمۆك ناوە و خەنجەرەکەی لە پشت ئەستۆی توند کردووە و خەریکە دەیبڕێ. خۆم بە سەردا دا، بەڵام درەنگ ببوو، خوێن فیچقەی دەکرد... خەونم پێوە دیت... خەونم... سەری مرێمۆك لە لایەك و لەشی لە لایەکی دیکەوە کەوتبوو... گوتم خوایە خێر بێ... دواتر بینیم لە چاڵە خوێنێك دام. نەمدەتوانی بجووڵێم. لاقەکانم بە عەرزەوە نووسابوون. هەوڵم دەدا، بەڵام نەمدەتوانی خۆم قوتار بکەم. سەیرم کرد و دیم عەلی کۆڵ و باری تێك ناوە و بە تاقی تەنێ بەرەو چوکووراوا وەڕێ کەوتووە. سەرە خوێناوییەکەی مرێمۆکیشی بە دەستەوەیە... قژە خەنە لێدراوەکانی گرتبوو. سەری مرێمۆك پێدەکەنی و خەزێمێکی زێڕیشی لە لووتیدا بوو.

نەنە زەڵەجە لە کەشکەژنۆی خۆی ڕادەکێشا و دەیلاواندەوە:

ـ وەی ڕۆۆ ۆ ۆ ، ئەو دەستەخۆشکم بوو، وەی ڕۆ بێکەس و تەنیا کەوتمەوە وەك بەردێکی نێو بیرێکی قووڵ...

تەپۆ لە هەر کوێ دەنیشتن، کەوڵیان دەکرد. بە سەر دەرپێ و کراس و عەباوە پێوەیان دەدا و خوێنە وشکەکەی ئەوانیان دەمژی.

عەلی دەستی مام خەلیلی گرت و هەڵیستاند و گوتی:

---

** لە بانگدان: ئەو کەسەی لە نەکاو بە دەنگی بەرز دەگری، دەڵێن لە بانگی دا. ئیدیۆمە.

- وەرە مامە خەلیل. وەرە، قسەیەکم پێتە.

برێك بردییە ئەولاترەوە، شوێنێك کە حەسەن لە پشت پنچکەکەوە شەمچەی لێ دەدا. گوتی:

- بڕوانە مام خەلیل، دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم. هیچ خەم مەخۆ، خۆت ئازار مەدە. دایکم نەمردووە.

خەلیل بە دەستە لەرزۆکەکانی نێوشانی عەلیی گرت:

- چیی؟ یانی نەمردووە؟

- بەڵێ نەمردووە. لە خۆڕا بۆ بمرێ. سەیرم کرد دایکم هێز و تینی ئەژنۆی نییە بە ڕێیەدا بڕوات و ناتوانێ بێتە چوکوور. ئێمەش نانی سێ مانگمان بۆ کرد و لە ماڵەوە بۆمان دانا هەتا دەگەڕێینەوە. کە گەڕاشینەوە... دیارە خۆ لە ئاواییەکەدا بە تەنێ نەماوەتەوە. ئەحە شێتووکەش لەوێیە. تاشباش نۆغڵووش قەرار بوو لە چیای چل سوارەوە بێتەوە. تاشباش نۆغڵو دایکمی زۆر خۆش دەویست. بێت و بزانێ دایکم بە تەنێ لەوێ بەجێ ماوە، دەسبەجێ دێتە خوارێ و دەچێتە لای...

دەستە لەرزۆکەکانی مام خەلیل جووڵەیان لێ بڕا و وەك دەستی مردووان سارد بوونەوە.

- ئاوا؟... کەوابوو مریەمۆك نەمردووە!

هەر لەوێ لە سەر پنچکە دڕووەکە دانیشت. حەسەن شقارتەکەی لێ دا. بڵێسەی شەمچەکە ردێنی مام خەلیلی ڕووناك کردەوە. مام خەلیل کە دانیشتبوو خۆی کووڕ کردبۆوە و دەموچاوی بە دەستەکانی داپۆشیبوو.

دەنگی گۆملیکسیز نۆغڵو بێدەنگیی شەوەکەی شکاند:

- باب و باپیرەکانی من منارەیان لە سەلکی بنیادەم دروست کردووە. خۆ دەزانن. باپیرەی من کراسەکەی بەری خۆی داوەتە هەژاران و خۆی بە رووتی ماوەتەوە... هەر بۆیە بە بنەماڵەمان گوتراوە گوملیکسیز... بنەماڵەی خوێنرێژ... کە لە سەلك منارەیان ساز دەکرد. کوڕە تەنانەت ئەو بنەماڵەیەش ئەو کارەیان نەدەکرد کە عەلی بە سەر مریەمۆکی هێناوە.

کۆستو نۆغڵو دەیگوت:

- عەلی چاکی کردووە کوشتوویەتی، دوای تەمەنێك کە بنیادەم لە دەست و پێ دەکەوێ و ناتوانێ بێتە چوکووراوا، مردنەکەی زۆر باشترە. ژیانەکەی لە خۆڕاییە.

شەوگار شەق ببوو. لە سەرەتای شەوێوە هەتا ئەو ساتە، ورد و درشت، پیر و گەنج، باسی مەرگی مریەمۆکیان دەکرد. کەس بڕوای نەدەکرد مریەمۆك لە ئاواییدا مابێتەوە و نەمردبێ... جگە لە مام خەلیل...

حەسەن لە پشت پنچکەکەوە هەم شەمچەی لێ دەدا و هەم بیریشی دەکردەوە:

"بابم نەنکمی کوشتووە. بۆیەش کوشتوویەتی تا لەکۆڵی نەکا بۆ چوکوور. کەچی نەنکم ئەوی زۆر خۆش دەویشت. مرد و رۆیشت. لێقەوماوە...

زۆر زۆر دەگریا و ئیتر شەمچەی لێ نەدەدا. دەموچاوی نوقمی فرمێسکان بوو. تەپۆ هێندەیان پێوەدا بوو هەموو گیانی لیری کردبوو. گیانی دەخورا. کە تارەقەی دەکرد، ئەو شوێنانەی خوراندبوونی دەکزانەوە. وەك برینێکی خوێت پێوە کردبێن دەبرژانەوە. ماوەیەك هەر وا گریا و هەر لەوێ خەوی لێ کەوت.

ئاخرییەکەی ئەو ئاگرە گەورەی کردبوویانەوە، دامرکایەوە و خەڵکەکە لە قسە کەوتن و ئەو دەستانەی لەشەکانیان هەڵدەکراند، شل بوون و هەر کەسە و پێی خۆش بێ یان ناخۆش، خۆی دایە دەست تەپۆکان. ئیتر تەپۆ بەبێ بەرگێرەوە و بە ئاسوودەییەوە چەندی دەیانتوانی خوێنیان دەمژین.

لەو نێوەدا دوو کەس نەنووستن، یەکێکیان "عەلی"یە درێژ و ئەویتر ژنەکەی بەکرە شێت. "عەلی"یە درێژ بیری لە دایکی دەکردەوە. ئاخۆ تا گەڕانەوەی ئەوان هەر زیندوو دەبوو؟ خۆ مردبایە عەلی قوڕی وەسەر دەبوو. ئەو گوندییانە هەر کەوڵیان دەکرد و دەیانسووتاند و خۆڵەمێشەکەیان بە بادا دەکرد. ئەگەر لە گەڕانەوەدا دیتبایان مریەمۆك مردووە، ئیتر عەلی نەیدەتوانی لەو گوندەدا بژی. ترسێك لە دڵی عەلی نیشت. ئاخۆ پیرەژنێکی بێ دەسەڵات و بێ تاقەت و تین لەو تەمەنەدا دەیتوانی دوو سێ مانگان بە تاقی تەنێ لە گوندێکدا بژیێ؟ ئەگەر نەخۆش کەوتبایە، کێ هەبوو چۆڕە ئاوێکی بە دەمەوە بکا؟ کوڕە نەوەڵڵا، تاقەت ناهێنێ و دەمرێ. لەوانەیە هەر ئێستاش مردبێ.

تەرمە بێ گیانەکەی دایکی هاتە پێش چاوەکانی کە لە بەر گەرماکەدا بای کردبوو. قژە خەنە لێدراوەکانی بە گۆڕێ وەرببوون و خۆڵیان لێ نیشتبوو. دەستەکانی لێك رەویبوونەوە و لەپی دەستەکانی رووە و ئاسمان بوون. بە سەدان مێشی کەسك، لە بەر ئەو خۆرە گەرم و سووتێنەرەوە، بە سەر تەرمەکەدا وەك برووسکە دەهاتن دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە.

"چما ئەوەندە دەژیێ؟ چما شتی وا دەبێ؟ نابێ و نەبووە. دەمرێ. ئەوە چ کارێك بوو کردم؟ بۆ بەتەنێ بەجێم هێشت؟"

ئەوەندە پەشیمان ببۆوە وەخت بوو دیق بکا. خۆزگە دایکیی لەوێ بەجێ نەهێشتبایە. لە خۆی تووڕە بوو. بێت و دایکی لەوێ مردبێ، ئەویش لێرە دەمرێ. بێ ئەولاوئەولا دەمرێ.

لەوانەیە نەشمریّ. ئەویّ ئاوی لێیە، نانی لێیە. مریشك و کەڵەشێری پەرتەوازەی کاروانان هەن. پوورە هەنگەکانی ئۆککەش داغ قۆردووش هەن. ئاخۆ دایکی بە مێشکیدا دەها بچیّ و دەرگای پوورە هەنگەکان بکاتوە؟ ئاخۆ دەیتوانی بچێتە چیا و یالابووك لە توێکڵە کاژەکان لێ بکاتەوە؟ ئاخۆ تین و هێزی لێکردنەوەی یالابووکی هەبوو؟ بێت و بەبیریدا هاتبایە بچێتە یالابووك لێکردنەوە و قەوەشی پێی شکابایە، بە یالابووك دەژیا. گەنجتریش دەبۆوە پێی. یالکبووك وەك کچی بیست ساڵانەی لیّ دەکردەوە.

"هەر بە راستی تاشباشی برامان بووە بە وەلی؟ رۆیشتووە و کەوتووەتە گەلّ چل سوارەی غەیبی؟ یان وەبن بەفران کەوتووە و مردووە؟ هەر بە راستی مردووە؟ ئەگەر نەمردوو و لە چیای چل سوارەکە، لەگەلّ چل پیاوی نەمردا دەژی، ئاخۆ دەزانیّ نەنە مرێمۆك لێی قەوماوە و بلێی فریای بکەویّ؟ نەنە مرێمۆك ئەوی زۆر خۆش دەویست... ناوی تاشباشی لە زاری نەدەکەوت.... هەر بە راستی ئەگەر بنیادەم ببێتە وەلی و تێکەڵی چل سوارەکە بیّ، ئاخۆ هەموو ئەو شتانە لەبیر دەکا؟ ئاخۆ ئەحە شێتوکە، زاواکەی سەرماڵیی پادشای پەرییان دەچێتەوە ئاوەدانی و نەنە مرێمۆك دەدۆزێتەوە و دەیباتە کۆشکی پەرییان؟..."

بەخۆی گوت:"ئاخ، خەریکم ورێنەی دەکەم..."

پێکەنی.

"زاوای سەر ماڵیی پادشای پەرییان، تاشباش ئۆغلو لە چیای چل سوارەکە... چما شتی وا کردەنییە؟ خوا بۆخۆی دەزانیّ ئێستا تاشباشی برام لەکوێیە ئەو لێقەوماوە. لەوانەشە لە شێتخانەی بیّ. ئەو گوندییە بێناموسانە سەری ئەویان خوارد."

وەبیر ئەو رۆژە بەبەفر و بۆران و تۆف و بەندە کەوتەوە کە ژەندەرمەکان هاتن و بردیان:"لە پێش ئۆنباشی جۆماڵییەوە دەتگوت شەکی قوربانییە. تەنیا لە رۆیشتنێدا وەسییەتەکەی کرد:"هیچ کەس تەنانەت ئەسپ چوارپیّ (سەگ)ی ئەو گوندەش نابیّ ئەو کوێخایە بدوێنن." کە ئەوەی گوت، ئای چ هەیبەتێکی هەبوو. رێك لە پیاوانی خودای دەچوو. ئەی دوایی؟ ئۆنباشی جۆماڵی چ راپۆرتێکی داوەتەوە مولازمەکەی؟ تاشباشی سەروەرمان بووتە تۆپەڵە نوورێك، گلۆڵەیەکی گەورەی نوور و لە دووکانەکە خزیوەتە دەرەوە. گلۆڵەیەکی نوور، گلۆڵەیەکی نووری گەورە... وەك دارێکی پڕ لك و پۆ، هەڵفڕیوە و چووەتە چیاکان. ئۆنباشی جۆماڵی چیی گوت؟ گوتی:"وەڵڵا، بیللا، ئە بەو چاوانەی خۆم دیتم، ئاخ ئاخ، هەر جارێکی دیکەی ببینمەوە، دەکەومە سەر دەست و پێیانی و داوای لێبووردن و شەفاعەتی لیّ دەکەم.

هەر دوو چاوم کوێرە بن، کە تاشباشی سەروەرمانم لە کیس چوو." هیچ گومانی تێدا نییە کە تاشباشی سەروەرمان وەلییە، بەڵام چما وەلییەکان ناکەونەوە بیر مرۆڤ؟ نەنە مرێمۆکیان وەبیر نایەتەوە؟ کورە فریام بکەوە براکەم. سۆمای چاوانم، تاشباشەکەم، گیانی من فریام بکەوە."

ژنەکەی بەکرە شێتیش، لەشە گەنج و گەرمەکەی مەمی دیکی لە خۆیدا هەست پێ دەکرد. ئەوەندە گەرم وەخت بوو شێت بێ. ژنە ورووژابوو... رووت و قووت خۆی لە خۆڵەکە دەگەوزاند.

پیاو نەمابوو لەو گوندەدا، سەرجێیی نەکردبێ. جارێك بە هەر پیاوێکی دابایە، ئیتر توخنی نەدەکەوتەوە، بەڵام ئەو مەمی دیکە بستە باڵا و لەڕ و لاوازە، بەو باڵا وردیلەییەوە، شێتی کردبوو. ئەو شەوە مەمی دیکیش دیار نەبوو. لە ئێوارەوە بە دوایدا سەری بە هەموو کونێکدا کردبوو، هەر نەیدۆزیبۆوە. جەستە رووت و قووتەکەی بە تەپۆ و مێشوولەکان ئەسپاردبوو. تەپۆ لێی دەنیشتن، کەوڵیان دەکرد، بەڵام ژنە گوێی لێ نەبوو. ئەو شەوە ئەگەر تەپۆکانیش نەبوایەن، لەو گەرمایەدا ژنەکەی بەکرە شێت، تاقەتی ئەو ورووژان و کەفوکوڵەی نەدێنا و دەتەقی. هورووژمی تەپۆکان بۆ سەر لەشی، خوێناویبوون و هەڵکڕاندنەکەی برێك ئەهوەنی دەکردەوە و وەخۆی دێنایەوە.

عەلی سەری هەڵێنا و لە نێو مەزراکەدا سێ تارمایی دی. هەر سێیانی ناسییەوە. لە دوورترەوە، لە نێو دارستانە تاریکەکەشەوە سێ تارمایی دیکە دەهاتنە دەرێ.

عەلی هەستا و بەرەو رووبارەکە چوو. لە شیوی کەنداڵەکە چووە خوارێ و ماوەیەك لەوێ مایەوە و دەستێکی بە ئاو گەیاند. کە لە سەرەوە گوێی لە دەنگی تەنەکە و دەنگەدەنگی بنیادەم بوو، هەستا و بە پەلە پانتۆڵەکەی هەڵکێشایەوە و یەك دوو لوێچ ئاوی بە سەر و چاوی هەڵپرژاند و بەرەو مەزرای لۆکە وەڕێ کەوت و چۆوە نێو گوندییەکان و لە تەنیشت ئەلیفەوە راوەستا و ملی لە رنینەوەی لۆکە نا. لەو شانەی دیکەیەوە ئۆککەش داغ قۆردوو روو. دڵی خۆش بوو، بۆخۆشی نەیدەزانی دڵی بەچی خۆش بوووە. هێشتا لووتکە و ئاسۆی چیاکان روونـاکی نـەکردبۆوە. تـەنیا لێـورای هـەورەکانی لای رۆژهـەڵات تۆزێـك دەدرەوشـانەوە. درەوشانەوەیەکی تەنك و باریك و درێژ کە بەحاڵ هەستی پێ دەکرا. تریفەی ئەو ئەستێرانەی وا ئاسمانەکەیان داگرتبوو، لە لۆکە سپیەکەی دەدا و کاری گوندییەکانی کە بە دەستەکوتەوە لۆکەیان دەڕنییەوە، ئاسانتر دەکرد.

عەلی بیری کردەوە: دەبێ لۆکە زۆر بڕنینەوە و زۆر بەخێراییش. دەبێ شەو و رۆژ کار بکەین. دەبێ ئەوپەڕی تا مانگێکی دیکە بگەڕێمەوە. مانگێك پێش گوندییەکان. بەشکم

تا ئەو کات دایکم نەمردبێ. بنیادەم هەرچەندە پیریش بێ، دەتوانێ مانگێک بە تەنێ زیندوو بێ و بژیێ.

دەستەکانی خێراتر بوون. ئەوەندە بەخێرایی دەیڕنییەوە خۆشی پێی سەیر بوو. ئاخۆ ئەو دەستانەی وەك مەکینە کاریان دەکرد، دەستی ئەو بوون؟

مەمی دیك دەیەوێ روخساری ئەو پیاوە ببینێ کە لە دار چنارەکەی بەستووەتەوە و ئاوی بەسەردا دەڕوات، کابراکە هەڵدەستێنێ و بە دار چنارەکەیەوە دەنووسێنێ، دادێتەوە و سەیری روخساری دەکا، بەڵام هیچی بۆ ساغ نابێتەوە. شەوێ تا بەیانی هەر خەریکی ئەو مردووە دەبێ، لەو نێوەدا شتێك هەیە کە ئەو لێی تێناگا. کە تاو هەڵدێ، مردووەکە هەر وا بە پشتەوە بە دار چنارەکەوە دەنێ و بەرەو مەزراکە دەگەڕێتەوە. نزیك بە شانزە مێشی کەسك و هێندەی نینۆکە گەورەکەی لاقی بنیادەم،هەر وا بە دەوری سەری مردووەکەدا دەسووڕێنەوە و وزە وزەکەیان هەموو بن دارەکەی داگرتووە. مەمی دیك لە مەزراکە خەریکی لۆکە رنینەوەیە و بۆ ساتێکیش چییە بیری لە مردووەکە نابێتەوە. لەو نێوەدا چەند کەسێك بە قات و پانتۆڵی سپییەوە و کڵاوی حەسیریی پان لە سەر، لە سێ ترۆمبێلی رەش و خۆڵاویدا کە بۆنی بەنزینیان لێ دێ، بە شوێن مردووەکەوەن.

## ١٠

مەمی دیك لە نێو پنچکە دڕوویەکدا قەتیس مابوو و لە دوورەوە بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ، سەیری مردووەکەی دەکرد کە پاڵی بە دارەکەوە دابوو و چاوەکانی زەق ببوون و دەیڕوانی. هەر دەتگوت یەکەم جارێتی ئەو مردووە دەبینێ. هەر بە راستی هەتا ئێستا بۆچی بە جوانی سەیری ئەو تەرمەی نەکردبوو؟ مردووەکە سمێڵەکانی باریك و شۆڕ بوون. هەر

دەتگوت سەری لە شتێك سوورِ ماوە، لێوی خوارەوەی هێنابووە پێشەوە و هەڵیقرچاندبوو. قژی بە لایەکدا کەوتبوو و نیوەی نێوچاوانی داپۆشیبوو. بەو جەستە تەڕەیەوە هەر دەتگوت زیندووە و ئێستا هەڵدەستێ و دەکەوێتە ڕێ. جار و بارەش مردووەکە لە بەر چاوەکانی بیچمی سەفەری دەگرت، وەك ئەو خەفەتبار و تووڕە و درۆزن دیار دەبوو.

مەمی دیك بە حاڵەتێکی سەیر و نامۆوە بەخۆی گوت:"ئەوە دەبێ سەفەر بێ، هەر دەڵێی خۆیەتی... ئەگەر سەفەری نەبێ ئەی کێیە؟ بەڵام خۆ سەفەرمان دی. ئەویش سەفەر بوو."

جلەکانی ئەو کابرایە جیاواز بوون. پێڵاوی سپی و پانتۆڵی ڕەساسیی لە پێدا بوو و چاکەتەکەشی ڕەساسییەکی تار بوو. لینگی زۆر درێژ بوون. چاوەکانی کراوە بوون و زەق ببوونەوە. هەر لە سەر شانی ڕاستییەوە تا نێو قەدی، خوێن بە سەر کراسە سپییەکەیدا هاتبووە خوارێ.

مێشێکی کەسك هەتا چلۆوکی دارەکە هەڵکشا، لەوێوە وەك بریسکە بەرەو تەرمەکە لوور بوو. ماوەیەك هێڵێکی تیشکی کەسکی لە نێوان لکی دارەکە و تەرمەکەدا دروست کرد. مێشەکە ماوەیەك هەر هات و چوو. ئێستا تیشکێکی کەسکی وەك تۆرِ، لە نێوان لکی دارەکە و تەرمەکەدا کێشرابوو. مێشە کەسکەکە بێ پسانەوە تۆڕە تیشکەکەی نێوان جەستە و لکە دارەکەی دەتەنییەوە.

مەمی دیك کە سەری هەڵێنا، تۆڕی نوورە کەسکەکە ساتێك نەما و تیشکی چاوگری گەرما زەردەکە جێی گرتەوە.

مەمی دیك لە نێو دڕکەکە هەستا، دەستەکانی لە کەلەکەی نا. هەموو گیانی شل ببوو. باوێشکێکی دا. حەزی دەکرد لە تەرمەکە بچێتە پێشێ، سەیری دەموچاوی بکا و بزانێ ئاخۆ مردووە یان زیندوو؟ بە لارە لار یەك دوو هەنگاو بەرەو لای چنارەکە چوو و ڕاوەستا. شازدە مێشی کەسك لە بن تیرێژی تاوەکەدا بریسکانەوە و تیژ فڕین و ئەو تیژفڕینەیان، مەمی دیکی تووشی سەرەگێژە کرد. چاوەکانی ڕەشکەوپێشکەیان کرد و چیی وای نەمابوو بکەوێتە عەرزی. تۆڕە ڕەنگە کەسکەکە، ساتێك سڕایەوە و دیسان بریسکایەوە. چەند هەنگاوێکی دیکەشی لێ چووە پێشێ. ئەو جارەیان نە بەلادا هات و نە کەوتیش. بۆ ساتێك پێی وابوو مردووەکە خەریکە هەڵدەستێ. دڵی داخورپا. هەستاوە و بەرەو لای دێ. مەمی دیك چاوەکانی لێك نان و تاوێك دواتر هەڵی هێنان. سەیری کرد مردووەکە هەر لە سەر جێی خۆیەتی. بەرگێکی زەردی گەورە لە دارەکە بەربۆوە و بە سوورە سوورِ هات و لە کن لاقی ڕاستی تەرمەکە کەوتە عەرزی.

مەمی دیك لە نەكاو گەڕایەوە و خۆی لەو حاڵەتە رزگار كرد. بەرەو پنچكەكە چوو و لە نێوەڕاستیدا خۆی مات كرد. دڵی زرم و كوتی بوو. دەیویست لەوێ را بكات و خۆی نەجات بدات. بەڵام هێز و گوڕی ئەوەی تێدا نەبوو لێی دوور بكەوێتەوە و لێی دابڕدرێ. خۆزگە توانیبای لەو مردووە نزیك بێتەوە و نووكی پەنجەكانی لە جەستەی بدات و بزانێ ئاخۆ گەرمە یان سارد بووەتەوە. ئەوەی بە گیان و دڵ دەویست، بەڵام ترس لە دەست و پێی خستبوو.

هەواكەی گەرم بوو. كڵاوی حەسیریی گەڕگەڕییان لە سەر بوو. چەند پیاوێك بوون كە پانتۆڵەكانیان ئوتوو لێدراو و لەو گەرمایەشدا بۆینباغیان بەستبوو. تووشی هەر كەس دەبوون پرسیاریان لێ دەكرد. ترۆمبیلە رەشە بریقەدارەكەیان لە بن تیشكی خۆرەتاوەكەدا تۆزاوی بوو. دەشتەكە یەكسەر تۆز و خۆڵ بوو و بۆنی بەنزینی دەدا.

یەكێك لە پیاوەكانی زۆر درێژ بوو. دەموچاوێكی چرچی هەبوو و چرچ و لۆچەكانی دەموچاوی راستە و راست لە نێوچاوانییەوە هاتبوونە سەر ملی. سمێڵی هەر هێندەی سەری پەنجەیەك هێشتبووەوە، سپی بوو.

دووەم دانەیان قەڵەوە و چاوەكانی دەرپۆقیو و گۆشتن بوو. چاكەت و پانتۆڵێكی رەشی لە بەر كردبوو. كڵاوە حەسیرییەكەی دوو هێندەی كڵاوی ئەوانیتر بوو. سێهەم دانەیان زۆر گەنج بوو. ئەوەندە لەڕ و لاواز بوو سەگ كلكی لێ دابایە دەكەوت. چەناگەیەكی نووك تیژی بچووكی هەبوو و روومەتەكانی تێك قوپیبوون و لێوەكانی تەنك بوون.

- شەوكەت بەگتان نەدیوە؟ كەس شەوكەت بەگی دیتووە؟ شەوكەت بەگ....

هەموو ئەو دەشتە لە شەوكەت بەگ گەڕابوون. زەڵەجە گوتی:

- نەمدیتووە. لە خەوندا دیتوومە. لە خەونما... ئەجن ئەجنیان كردووە. نا هیچم نەدیوە.

- هیچمان نەدیوە.

- بابە گیان، شەوكەت بەگ دەڵێم شەوكەت بەگ...

- ئەو شەوكەت بەگە سمێڵ بابڕەكە... ئەوی دەستەكانی زۆر زلن. ئەو شەوكەت بەگ دەڵێم.

- هیچمان نەدیوە... هیچ.

چوونە لای سەفەر. سەفەر لە قوولكەیەكدا خۆی لەو كەروێشكە مات دابوو كە لە نێو پنچكەكانی رووبەڕووی بوو. سێرەی لێ گرتبوو. كە ئەو سێ پیاوەی دی، راچڵەكی.

- شەوكەت بەگت دیتووە؟ شەوكەت بەگ دەڵێم...

ـ شەوکەت بەگ بەولایەدا بەروخوار چوو. سۆڵێکی سپیی لەپێدا بوو. بەو لاقە پان و زلانەیـەوە... شەوکەت بەگ... تاشباشیشم دی. ئەو قەدەغەی کرد. قەدەغـەی کـرد کـە هـیچ کـەس قـسەم لەگـەڵ نەکا. ئێستاش کەس قسەم لەگەڵ ناکا، تەنانەت ژنەکانیشم. تەنانەت گزیرەکەی خۆیـشم لـە چاوەکانم خۆشتر دەویست. تەنانەت "عومەر"یش، عومەرەکەی خۆم. لەو گوندە کەس نامدوێنێ. هـەر هـەموو دەترسن نەکا خوا غەززەبیان لێ بگرێ... ئێستاش کە ئەنگۆ قسەتان لەگەڵ کردم، چیتان لـێ هـات. تاشباش ئۆغلۆ ئەگەر وەلی بوایە، پێش هەمووان غەززەلی لە ئێوە دەگرت. ئـەو کابرایـە وەلـی نییـە، وەڵڵا بیللا، وەلی نییە. ئاخر چۆن دەکرێ، ئەو کە لـە سـەگ گلاوتـر بـوو، ببێتـە وەلـی؟ دەڵـێن چۆتە کۆڕی چل سوارەی غەیبی، چما شـتی وا دەبـێ؟ دەڵـێن تاشـباش بووەتـە تۆپەڵـە تیـشکێك و چـووەتە ئاسمانێ. ئۆنباشی جۆماڵی گوتوویەتی بە دوو چاوی خۆم دیتوومە. شتی وا نابێ، نابێ نا کاکـە گیـان. چما ئاوا سووك و ئاسانە ببیتە وەلیف ئەویش وەلییەك کە ببێتە نوور. ئـەمن بـڕوا ناکـەم. هـەر ئەگـەر ئێستا تووشی ئەو تاشباش ئۆغڵوە وەلییە بم، دوو تفی لە نێوچـاوانی دەکـەم. ڕێـك لـە نێوچـاوانی، لـە نێوان هەر دوو چاوەکەی. گوندییەکان ناچاریان کرد. ئەو داماوە خۆشی کـەیفی لـێ نـەبوو... بـە زۆر و زۆرداری... ئاوا قوڕیان وەسەر کرد. ئەمن باش دەزانم. تاشباش ئۆغلۆ لە ڕێگـا، یـان ڕای کـردووە یـان لە سەرمان ڕەق هەڵاتووە و مردووە. ئۆنباشی جۆماڵییش بۆ ئەوەی خۆی ڕزگار بکـات ئـەو حەقایـەتی تۆپەڵە نوورەی هەڵبەستووە. ئاخر برای من، ئـەو تاشباشـە چڵمنە چـۆن دەبێتـە وەلـی؟ چـما شـتی وا دەبێ؟ نەخێر گیانەکەم، نابێ، کورتی ببڕینەوە، تاشباش کاتێ دەڕۆیشت گوتی، ئەگەر قسە لەگەڵ ئـەو سەفەرە بکەن، لە چاوترووکانێکدا وەك بەرد ڕەقتان دەکەم. ئێستاش ئەوە کەس نامدوێنێ....

گریان ئەوکی گرتبوو. لە سەری ڕۆیشت:

ـ کوڕە دوو قسەم لەگەڵ بکەن. برادەرینە، ناوم بێنن. هەر ئەوەنـدەش بـۆ مـن غـەنیمەتـە. هەر ئەوەندەتان بە زاردا بێ و بڵێن:"کوێخا سـەفەر"، ئەوەنـدەم بەسـە، بـەخوای بەسمـە. ئـەوە ساڵێکە، لەوانەیـە پتریـش. هـیچ کـەس تەنانـەت بـۆ جـارێکیش نـاوی مـنی بـە سـەر زاریـدا نەهاتووە. خەریکە شێت دەبم. ئەگەر شێتیش نەبم، بە دڵنیاییـەوە خـۆم دەکـوژم. ئـەمڕۆ وەرن میوانم بن. سەیر کەن، سێ سوێسکەم کوشتووە، چەور و قەڵەو...

سوێسکەکانی یەك بە یەك نیشان دان:

ـ ئەوەتا... هەتا عەسرێ دوو کەروێشکیش دەکوژ، شووشەیەك (بتڵێك)ی گەورەشـم ڕاکـی (ئارەق) هەیە. یاخوا خۆشتان بێ. جا لەگـەڵ کـەبابی سوێـسکە زۆر خۆشـە. ئـەمن شـەوکەت بەگتان بۆ دەدۆزمەوە. هـەروەها بـاب و بـاپیر و ژن و منداڵەکەشـی دەدۆزمـەوە. تکاتـان لـێ

دەکەم وەرن... گوێم بدەنێ، ئەمن شەوکەت بەگم دیتووە. تاوێـك پـێش ئێـستا هـەر ئـەلێرەوە داگەڕا. بانگیشم کرد:"شەوکەت بەگ، شەوکەت بەگ." گوتی:"پەلـە مەکـە، دەگەڕێمـەوە." دوای تاوێك دەگەڕێمەوە...

سێ پیاوەکە بێ جوولە راوەستابوون. پیاوە کەڵەگەتەکە گوتی:

ـ ئەتۆ هەر لێرە چاوەڕوان بە. لۆکەڕنینەوە زۆر باشە. خودا تاشـباش بـە نەحلـەت بکـا. شـەوکەت بەگیش ئەوە لەو دەگەڕێ. گوتوویەتی هەر دەیدۆزمەوە. خودا تاشباش بە نەحلەت بکا.

بە غاردان لە رووبارەکە ئاودیو بوون و لە خەرمان و لێڕەوارێك تێپەڕین.

مەمی دیك دیتنی. بە دیتنی ئەوان، ترسێك هەموو گیانی داگرت و دانیشت. هەر شـازدە مێشەکە بە وزە ورز و شێتانە دەستیان کـردەوە بـە تەنینـەوەی تـۆڕە کەسـکە کانزاییەکـەیان. تۆڕێکی ئاڵۆز و کەسك... پیاوەکان نیزك دەبوونەوە. تۆز و خـۆڵێکی وەك هـەور، لـە بـن پێـی پیاوە کەڵەگەتەکەوە هەڵدەستا.

مـەمی دیـك هـەموو تـینی خـۆی کـۆ کـردەوە و بـەرەو مردووەکـە، کـە بـە چـاوە شـین و زەقەکانییـەوە لێـی دەڕوانـی خـۆی درێـژ کـرد. پەنجـەی لـە سـەر رانـی داگـرت. پەنجـەی بـە گۆشتەکەیدا چووە خوارێ. دەنگی پێیەکان نزیکتر بوونـەوە. لـە جێـی خـۆی دەرپـەڕی و خـۆی هاویشتە نێو پنچکەکانەوە. جگە لە ترپەی دڵی گوێی لە هیچ شتێکی دیکە نەدەبوو.

پیاوەکان گەیشتنێ و لە بن دارە چنارەکە راوەستان و سەیری دەوروبەریان کـرد. یـەکێکیان هات و لە تەنیشت ئەو پنچکەوە راوەستا کە مەمی دیك تێیدا مات ببـوو. دووانەکـەی دیکـە بە سەر مردووەکەوە مانەوە. هێندێ شتیان بـە مردووەکـە گـوت، بـەڵام چـونکە هیـچیان لـێ نەبیستەوە، هەر لەوێ ماوەیەك بێ جوولە راوەستان.

بایەکی فێنك هەڵی کرد و تێپـەڕی. تۆزێـك دواتـر تونـدتر بـوو. لـە ڕێگەکانـەوە تـەپوتۆز هەستان. لە رووبەڕوویانـەوە، لـەو بـەری رووبارەکـەی جـەیحان، خـۆڵ و خـاك بـە گێژەڵووکـەوە کۆڵەکەی دەکرد بەرەو ئاسمانێ و بە بن تیشکی تیرێژی تاوەکەدا هەموو دەشتەکەی داگرتەوە.

کۆڵەکەی باهۆزێك نزیك بۆوە. رەنگەکەی شین دەچۆوە. دارە چـنارەکە، مردووەکـە، مێـشە کەسکەکان و مەمی دیکـی داپۆشـی. کـە باهۆزەکـە تێپـەڕی، سـێ پیاوەکـە کڵاوەکانیـان بـە سـەرەوە نـەمابوو. باهۆزەکـە رفانـدبوونی. مردووەکـە لـەو تـەپوتۆزەد نـەدەبینرا. گـەڵای دارچنارەکەش نوقمی تۆزە سپییەکە بوون و چنارەکە دەتگوت لە خۆڵ دروست کراوە. مێشەکان هەر کامەیان ببوونـە تۆپەڵـە خـۆڵێکی بـچووك. ئـیتر نـە بریـسکانەوە سـەوزەکە مـابوو و نـە

درەوشانەوەیان لە بن تیشکی خۆرەکەدا. تۆپەڵە تۆز و خۆڵەکانیش بێ پسانەوە لە نێوان مردووەکە و لیك و پۆی چنارەکەدا دەخولانەوە.

پیاوە کەڵەگەتەکە گوتی:

ـ تف، نەحلەتی خوات لێ بێ. شەوکەت بەگ ئەو تاشباش ئۆغلوەی پێ نادۆزرێتەوە. مەحاڵە تاشباش ئۆغلو چووبێتە سەر چیای چل سوارە. بووبێتە تۆپەڵە نوورێك و فڕیبێ.

ئەوی لە هەمووان کورتەبالاتر گوتی:

ـ ئەرێ دەڵێن چی قۆڵبەستی بکەین؟

ئەویتر وەڵامی دایەوە:

ـ کوڕە لێی گەڕێن. قۆڵبەستکردنەکەی چ قازانجێکی هەیە. چما شەوکەت بەگ دەگەڕێتەوە؟

کەڵەگەتەکە گوتی:

ـ نا، ناگەڕێتەوە، جارێ با بڕۆین کڵاوەکانمان بدۆزینەوە. ئەو ڕەشەبا نەحلەتییە لەکوێوە هات.

ڕۆژ ئاوا بوو. پیاوەکان ڕۆیشتن. مەزرای لۆکەکە، لە بن تیشکی ئەستێرەکاندا سپی دەچۆوە. سەد هەزار گوڵ ئەستێرە لە گردێکەوە بەرەو گردێکی دیکە دەفڕین. مەمی دیك بۆنی گۆشتی برژاوی بەسەردا هات بە دوای ئەویشدا بۆنی ڕاکی... ئیتر شەو شێدار بوو و ئاو و بۆنی زۆنگاو...

مەمی دیك ناڵاندی:"باشە ئەمن ئەو پیاوە چ لێ بکەم؟ بیبەمە کوێ؟ بۆتە بەڵای گیانم. بیبەمە هەر کوێ، دەیدۆزنەوە. ئەمنیش لە دار دەدەن. زمانم بە لا لغاوەمدا دێتە دەرێ و وەك ڕەشکە هەڵدەمسێم و ڕەش دادەگەڕێم..."

تەرمی خۆی هاتە پێش چاوی کە بە پەتەوە کراوە و ڕادەوەشێ. لاقەکانی شۆڕ بوونەتەوە. پەنجەکانی پێی بەو نینۆکە زەرد و قەڵێشوانەیەوە دەگەنە سەر عەرزی. لاقەکانی ناحەز بوون، پیس بوون، نارێك بوون. مووی لێ بوونە نەشتەر.

مردووەکەی بە کۆڵی دادا و بەرەو چەمی جەیحان وەڕێ کەوت. لە قەراغ مێشەڵانەکە کۆنە بیرێکی لێ بوو. بەری بەیانی بوو کە بیرەکەی دۆزییەوە. زارکی بیرەکەیان بە تاشەبەردێکی گەورە و قورس گرتبوو. هەتا تاو هەڵات هەر خەریك بوو ئاخری توانیی بەردەکە لابەرێ. تەرمەکەی لە زارکی بیرەکەوە خستە خوارێ و پشوویەکی ئاسوودەی هەڵکێشا. ئەوجار چوو و لە تەنیشت دایکییەوە دەستی کرد بە لۆکە ڕنینەوە. لە لای ڕاستی خۆیەوە "عەلی"یە درێژی دی. دەستەکانی عەلی ئەوەندە خێرا کاریان دەکرد، نەدەبینران.

**مەمی دیك لەگەڵ مۆتەکە و سەرسووڕماوییەکی سـەیر و سەمەرەدا دەستەوئێخەیە. نازانێ ئەو ڕووداوانە ڕاستن یـان خەونن؟ نازانێ خەون دەبینێ یـان بەخەبـەرە؟ دەزانـێ زۆر گەرمـــە... هـــەروەها گەواڵـــەی تـــەپۆ و مێـــشوولەکانیش دەبینێ. بە کورتی، بۆ ساتێکیش ئـەو بەڵایـەی لـە مێـشکی ناچێتە دەرێ کە لە نێو بیرەکە دایە.**

## ١١

بەرەبەری ئێوارێ بوو. سەر ئاوەکەی چەمی جەیحان بۆ ساتێك ڕەنگێکی شینی تۆزاویی لـێ نیشت. دوای ئەوە وردە وردە تۆزەکە ڕەوییەوە و لە ژێرییەوە، ڕەنگێکی شینی ڕوون دەرکەوت. هەر دەتگوت لە تیشکێك لە بن ئاوەکەوە لێی دەدا. گژ و گیا و پنچکەکانی کەنارەکە و مێش و مێشوولە و مەزرا سـپییەکەی دەم ئاوەکـە هـەمووی شـین داگـەڕان. سـەر ئاوەکـەی جـەیحان بچووکترین شەپۆلیشی نەدەدا. تا چاو بـڕ دەکـا شـینایی. وەك ئـاوێکی مەنـد. هـەر دەتگـوت چەمی جەیحان ڕاوەستاوە و ڕووناکاییە تەماوی و جاروبارە درەوشاوەکانی بە سەرەوەیە. ساتێك لە لای باشوورەوە بریسکەیەکی تیژ وەك تیر هات و هێڵێکی سووری باریکی بە سـەر ئاوەکـەدا کێشا و نەما. ئەو هێڵە سێ جار هات و ڕابرد. گەرماکە دەیکوڵاند. بە سەدان پەڕەسـێلکە بـە ئاسمانێدا دەفڕین و وەك بریسکە بە بەرچاوەکانی مەمی دیکدا تێدەپەڕین. مەمی دیك تـووڕە دەبـوو، بـەڵام هیـچی لـە دەسـت نـەدەهات. ئەسـپ چـەندی خێـرایش غـار بـدات، هێـشتا پەڕەسێلکەکان وەشوێنی دەکەون و هەر بەو خێراییـەش بـە بـەر لووتیـدا دەفـڕن. ئاخرییەکـەی ئەسپەکە هەر ماندوو دەبێ، بەڵام پەڕەسـێلکەکان هـەرگیز. پەڕەسـێلکە ئـاوا لـە تـرۆمبێلیش دەکەن. بەڵام ئاخۆ دەگەنە فڕۆکەش؟

"دەبێ مردووەکە بخاتە فڕۆکەوە. کێ دەزانێ مردووە؟ جلوبەرگی جوانی لە بەر دایە و چاوەکانیشی لێك نەناون و وەك دوو شووشە... دوو لەتە شووشەی گەورە. بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ دەڕوانێ. پێڵاویشی لە پێ دایە... جلوبەرگەکانی برێکیش گنج و لۆچ بوون، بەڵام کەس نازانێ. دادەنیشێ لە فڕۆکەکەدا یان پاڵ دەکەوێ و شانی بە دیوارەکەیەوە دەنێ.

"باشە بە راستی ئەو مردووە کێیە؟ دیارە لەوانە.. یەکێك لە ئاغاکانە. جگە لەوەش، بزەیەکی تەوساویی لەخۆباییانەشی لە چاوەکانیدا هەیە کە لە روخساریشیدا ماوەتەوە. سمێڵ بابریشە، وەك سمێڵەکانی ئۆککەش داغ قۆردوو: ئیماندار، ساف و سادە، لاسار و چاوبرسی... فڕۆکەیەك دەبێ بێ و بیبا و لەو سەرەوە، زۆر لە سەرەوە، لە سەر لێڕەوارێك... نا، نا... لە بیابانێك... لە سەر دەریایەکی قووڵ... رێك لە نێوەڕاستەکەی... نا، نا... لە بیابانێك... دەریایەك... بیابانێك... لێڕەوارێك..."

مەمی دیك ئاخێکی هەڵکێشا و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ کوڕە کوا فڕۆکە برالە... ئاخ، کوا فڕۆکە...

" کێ لەو بیرەدا مردووەکە دەدۆزێتەوە؟ هەمووان دەتوانن بیدۆزنەوە؟ ئاخر چۆن؟ باشە، سەگەل دەیدۆزنەوە... ژەندەرمەکانیش... ئەگەر بۆگەن بکا و بۆگەنەکەی لە بیرەکەوە بداتە دەرێ و هەموو چوکوور دابگرێ چی؟ هەر هەموو پاڵەی لۆکەچن، لووتیان دەگرن. بۆگەنەکە لووتیان پڕ دەکا. هەر هەموویان بەرەو بیرەکە غار دەدەن... هەزار کەس، دوو هەزار کەس، پێنج هەزار کەس، سەت هەزار نەفەر، هەر هەموو خەڵکی چوکووراوا بە منداڵ و گەورە و پیر و لاوەوە، هەر هەموو لە دەوری بیرەکە کۆ دەبنەوە."

چڵە گیایەك لە دندووکی پەڕەسێلکەیەکەوە کەوتە سەر ئاوە مەندەکەی جەیحانەوە. هێندێ وردە شەپۆلی دروست کرد و تا دوور لەرییەوە.

نێو بیرەکە تاریك بوو. مەمی دیك لە تەرکی بیرەکەدا بازنەیەکی روونی وەك ئاوێنەی دی. هەرچی سەیری دەکرد، ئەو بازنەیە گەورەتر دەبۆوە. رێك لە نێوەندی ئاوێنەکە، روخسارێکی زەرد بە سمێڵە شۆڕەکانی و دوو چاوی زەقی شووشەییەوە، لە نێو بازنە روونەکەدا، لەو دوورەوە لەو پەڕی تاریکایی بیرەکەوە، سەیری ئەویان دەکرد. مەمی دیك هەموو گیانی لەرزی و گوتی:"ئەوەتا، هەر کەس سەیری نێو بیرەکە بکا، دەیبینێ. بیرەکانی چوکوور سەرنجی خەڵك رادەکێشن. مەحاڵە یەکێك بەو رێگەیەکدا تێپەڕێ و لانەدا وسەیرێکی نێو ئەو بیرە نەکا. خەڵك لە بیرەکاندا سەیری

روخساری خۆیان دەکەن. ئاوی نێو بیرەکە، روخساری بنیادەمەکان لە ئاوێنە باشتر نیشان دەداتەوە."

مەمی دیك روخساری خۆی لە تەنیشت سەر و سمێڵە شۆڕەکانی مردووەکەوە دی. روخساری تێکسمڕاو و رەش و هەر هێندەی لەپی دەستێك دەبوو.روومەتەکانی تێك قوپیبوون و چاوی بە قوولڵدا چوبوون و چەناگەی دەلەرزی.

بە پیاوەکەی نێو بیرەکەی گوت:

- زۆر دەترسم. کوڕە بەر نەحلەتی خوای کەوی. بوویتە بەڵای گیانی من. ئێستا ئەمن چ بکەم؟ بتبەمە کوێ؟ بتبەمە هەر جێیەکی دەدۆزنەوە. هەر شتێکت لێ بکەم هەر دەزانن من تۆم کوشتووە. چیت لێ بکەم، چیت لێ بکەم؟ بۆخۆت بڵێ. تۆخودا دەی بڵێ...

گریا. وێنەکەی ئەویش لە نێو بیرەکەدا لیچی هەڵقرچاند و چاوەکانی قیچ کردبووە و دەگریا. سەری تەرمەکەش بە سمێڵە شۆڕەکانی و چاوە زەقە شووشەییەکانییەوە لەگەڵی دەگریا.

مەمی دیك لە دوورەوە سێ سواری بینی کە وەك بای شەماڵ دەهاتن و ئەسپەکان تۆزیان دەکرد. لە پشتیانەوە هەورێك تەپوتۆز بەجێ دەما. سێبەرەکانیان بەسەر ئاوەکەی جەیحانەوە کە دەتگوت راوەستاوە و کەسك دەچۆوە، دەمایەوە. یەکێك لە ئەسپەکان حدوود بوو، ئەویتر ئەسپێکی کوێت و ئەویتریان بەڵەك. سوارەکان جلوبەرگی سپییان لەبەردا بوو، جامانەی سووریان لە سەر و لاقەکانیان رووت بوو. ئەسپەکانیان نە هەوسار و رێشمەیان پێوە بوو و نە زین. رووت بوون.

مەمی دیك بە هەموو تین و هێزی خۆی پەلاماری بەردەکەی زارکی بیرەکەی دا. بەردەکە هەر وا سووك و ئاسان لە جێی خۆی نەدەبزوا. مەمی دیك زۆری قەوە لەخۆی دا و لەخۆی نووسا. پێستی دەستی دامالکا و هەر دوو دەستی خوێناوی بوون. سوارەکان بە جاڕەکاندا و بە خێرایی دەهاتن. ناڵی ئەسپەکان وەك ئاوێنە دەبریسکانەوە و بریسکەی ناڵەکانیان تێکەڵ بریسکە بریسکی لاسك و کلۆشەکان دەبوو.

مەمی دیك شەڵاڵی ئارەقەیە... لە دەمووچاوی و نووکی لووتییەوە شۆڕ شۆڕە ئارەقە دەچۆڕێتەوە و جلە تەڕەکانی وا بە لەشییەوە نووساون هەر دەڵێی لە ئاوت هەڵکێشاوە. ئەسپەکان نیزك دەبنەوە. مەمی دیك پاڵ بە بەردەکەوە دەنێ. لە نەکاو وای پاڵ پێوە نا، مووغەرەی پشتی قرچەی لێوە هات. ئیتر نەیدەتوانی پشتی راست بکاتەوە.

"کوڕە خۆ راستە و راست دێنە ئێرە، بۆ سەر بیرەکە." مەمی دیك لە سەر زارکی بیرەکە وازی لە بەردەکە هێنا و خۆی خستە پشت پنچکە گیایەکانەوە و لەوێ مات بوو. هەڵدەلەرزی.

پشتیشی زۆر دێشا. سوارەکان هاتن و هەر بەو خێراییە بە پەنایدا تێپەڕین. هەواکەی زۆر گەرم و شێدار بوو. ئەسپەکان ئارەقەیان کردبوو و پێستیان گۆڕابوو و ڕەش داگەڕابوون. جلوبەرگی سوارەکانیش ئەوەندەیان ئارەقە کردبوو، بە لەشیانەوە نووسابوون و بۆر ببوون.

سوارەکان گەڕانەوە. دیسان هەر بەو خێراییە بە سەر گیا و پنچکەکاندا تێپەڕین و ئەوجار بەسەر بیرەکەدا بازیان دا. یەکێك لە سوارەکان لە ئەسپەکەی بەربۆوە و لە تەنیشت بیرەکەوە تلی دا. هەر کەوتە خوارێ، داهاتەوە و سەیرێکی نێو بیرەکەی کرد. دوو سوارەکەی دیکەش ڕاوەستان و بە ئەسپایی لە ئەسپەکانیان دابەزین و ئەسپەکانیان لە چڵە گەزەکان بەستەوە. ئیتر هاتنە سەر بیرەکە و لە سەر چۆکان دانیشتن و سەیری ناوەوەیان کرد.

مەمی دیك وەك بوولەرزەی لێدابێ دەلەرزی. وا دەلەرزی دەهات هەڵفڕێ. چاوی بڕییە ئەو پیاوانەی وا شەڵاڵی ئارەقەیەکی سارد بوون و سەریان بە بیرەکەدا کردبوو و دەتگوت کڕنۆشیان بردووە. دەبوو هەتا ئەوان بێ جووڵە بوون، ئەو را بکا. بەڵام لاقەکانی شل ببوون و لەدووی نەدەهاتن. بەخۆی گوت:"بە نەحلەت بن". ئیتر خۆی خزاندە نێو پنچکەکانەوە. ڕێك لەو کاتەدا وەك پەرجۆیەك بووبێ، تینی لە ئەژنۆی گەڕا. هەستایە سەر پێ. رووبارەکەی جەیحانی لە بەر بوو. خۆی بە ئاوەکەدا دا. هەموو وڵات شین دەبۆوە. دەست و پیی شین بوون. گەیشتە کەنارەکە. لاقەکانی هەتا ئەژنۆی بە قوڕەکەدا ڕۆچوون و قوڕاوی بوون.

کە دەگاتەوە کێڵگەی لۆکە، خۆر ئاوا بووە و ئاگرێکی گەورەیان کردووەتەوە. گەرماکەی شێدارە. بۆنە قورس و خەستەکەی گەڵای داری "بابادەم" شەپۆل دەدا. لە دووریشەوە لە کێڵگەبرینجەکانەوە و لە گوڵی کەسك و پاراوی شەڵتووکەوە، بۆنێکی خۆشی گژ و گیای تێکەڵ بە بۆنی زۆنگاوان هەستاوە و دێ. دەنگی باڵی مێشوولان دێز ئاشقە کەچەڵە تێی چریکاندووە. گۆرانییەکی زۆر کۆن. گۆرانیی خەمێکی هەزاران ساڵە، گۆرانییەك بە تەمەنی خاك... لە بوولێڵەکەدا، خاك، کۆگای لۆکە، مەزرا و ئاوی مەند و بێجووڵە و ئەستێرەنیشانی جەیحان سپی دەچێتەوە. دنیایەکی سەیر و سیحراوییە.

دەنگی ئەو تەراکتۆرانەی بۆنی بەنزینیان دێ و دەنگی کامیۆن و ترۆمبێل شەوەکەیان پڕ کردووە...

ـ براکەم، دورمووش چۆنی؟

ـ باش نیم. دیسان هەڵیداوەتەوە. ئەمڕۆ عەسرێ سووکە لەرزێکم پێدا هات و تێپەڕی. جا هەر ئاواش دەست پێ دەکا.

- دەی باشە، وەرە بچینە دەم ئاوەکە.
دورمووش پێی چەقاند و گوتی:
- نایەم. لەو قوڕ و لیتەیە ماندوو بووم. پێنج ڕۆژان لەبەر ژنەکەی بەکرە شێت بپارێمەوە زۆر باشترە.
مەمی دیك:
- دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم. کاری قوڕ نییە. کوڕە ئێستا ژنەکەی بەکرە شێت زۆر دەستەمۆیە. بۆ هەموو کەس رادەوەستێ. دڵی کەس ناشکێنێ، جاریٚ ئەتۆ وەرە.
مەمی دیك دڕدۆنگ بوو. دورمووش تازە هاوڕێ و هاوڕازی ئەو بوو. هەموو شتێکی بۆ ئەو دەگێڕایەوە. شتێك نەبوو ئەو بیزانێ و دورمووش نەیزانێ.
گەیشتنە دەم ئاوەکە و لە تەنیشت پنچکەکان دانیشتن. مەمی دیك دەستی پێ کرد:
- براله دورمووش، دوو کەسم دی... هەر دوو چاوم کوێر بن ئەگەر درۆیان بکەم. هەر بەو دوو چاوەی خۆم دیتمن... دوو کەسم دی..
دورمووش قسەی پێ بڕی و پرسیی:
- تاشباش ئۆغلۆت دی؟ ها؟
مەمی دیك هێمن و لە سەرە خۆ گوتی"
- ئەو نا، ئەو بنیادەمەی دەڵێم نە پێشتر دیتوومە و نە ناویشیم بیستبوو. یەکێکیان ڕێك لە خۆم دەچێ. ڕێك لە خۆم. وردیلە و کز و لەڕ و ترسنۆك. زراوی چووە. ئەویتر پیاوێکی زەبەلاحی وەك کوێخا سەفەر. بیری لێ بکەوە، بیهێنە پێش چاوت، یەکی وەك من، شەوێك کوێخا سەفەری کوشت. ئەمن دیتم.
- بێدەنگ بە. بە کەس نەڵێی. سەرت نایەشێ پرێسکەی لێ مەبەستە.
- دیتم، ئەو بنیادەمە وردیلەیەی لە من دەچێ، مردووەکەی بە کۆڵی داداوە و دەیبا و دەیەوێ لە شوێنێك بیشارێتەوە. چ بکا؟
- بینێژێ.
- ناشتی بەڵام نەحەسایەوە. پێی وابوو لەوێ دەیدۆزنەوە و ئەگەر بیدۆزنەوە ئەو لە دار دەدەن. یانی هەر ئەو بنیادەمەی لە من دەچێ...
دورمووش هاواری کرد:
- ئەرێ وەڵڵا لە داری دەدەن. هەر گوێشیان پێی نابزوێ. دەی ئێستا مردووەکەی چ لێ کردووە؟...

مردووەکە بە سەر کۆڵی وردیلەکەوەیە...

- جا چۆن تەرمێکی ئاوا زەبەلاح بەولا و لادا دەگێڕێ؟...

- دەیگێڕێ ئیتر... چ بکا... داماوە...

دورمووش ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- راست دەکەی، چ بکا. زۆر قوڕە. چ بکا؟ دەی دیارە، خۆ هەتا مردن ناتوانێ هەر بە کۆڵ بیگێڕێ... ئاخرییەکەی یەکێك هەر دەیبینێ...

بیر و خەیاڵ نوقمی کرد. بەزەیی بە کابرا وردیلەکەدا هاتبوو.

مەمی دیك یەك پشوو قسەی دەکرد. باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو تەرمە لە سەر شانی گەنجە وردیلەکە چەندە قورس بووە و دەیگوت تەرمەکەی بردووەتە کوێ شاردوویەتەوە و دوایی دەریهێناوەتەوەو متمانە بە هیچ شوێنێك تەنانەت بە چاوەکانی خۆیشی ناکا.

- جا ئێستا ئەو لە کوێیە؟

مەمی دیك گوتی:

- لە سەر بیرەکەن.

ئەو جار باسی ئەو سێ پیاوەی کرد کە بە سەر بیرەکەدا نووشتابوونەوە و دوایی پرسیی:

- هەر بە راستی دورموش، ئەتۆ پێت وایە ئەوانە کێن؟

دورمووش گوتی:

- ئەوانە برای کابرا کوژراوەکەن. لە سەر بیرەکە ئاگایان لە تەرمەکەیە. دەزانن کە پیاوە وردیلەکە هەر دێتەوە بیبا. دەزانن ئەو متمانەی بە هیچ کەسێك و تەنانەت بە چاوەکانی خۆیشی نییە. چاوەڕێن بێ و بیگرن و لە داری بدەن.

مەمی دیك گوتی:

- ئاخ، لە داری دەدەن... ئەگەر بزانی چەندەم بەزەیی بەوبنیادەمە وردیلەیەدا دێتەوە... وەختە ئاورم بۆی تێبەربێ.

دورمووش لە جێی خۆی هەستا و گوتی:

- یاڵڵا... با بچینە سەر بیرەکە. بچین و بەو بنیادەمە وردیلەیە بڵێین هەتا ئەوان نەڕۆن، توخنی بیرەکە نەکەوێتەوە.

رووبارەکەی جەیحان نوقمی بە ئەستێرە داپۆشرابوو و لە تیشکێکی زەردی لوولدراو دەچوو. لە پردەکە پەڕینەوە و گەیشتنە زەوییە بەردەڵانەکە. ئەو زەوییەی بە سەریدا دەڕۆیشتن، قەڵشت

قەلّشت ببوو و بەردی زل زلی لیّ قوت ببۆوە. بەردەکان وەك ئاگر سوور بوونەوە. بۆ دەست لیّدانیّ نەدەبوون. هەواکەی گەرم و خەست بوو. مارەکان لە بن بەردیّکەوە دەخزینە بن بەردیّکی دیکە و لە کونیّکەوە خۆیان لە کونیّکی دیکە دەکوتا.

کە گەیشتنە سەر بیرەکە، بەرەبەرە بەری بەیانی بوو. سیّ پیاو هەر وا سەریان بە بیرەکەدا کردبوو و لەویّ مابوونەوە. ئەسپەکانیان هەر کامەیان لمبۆزیان لە مەلّۆ گیایەکەی بەر دەمیان نابوو و بۆنی گیایەکە بەرز ببۆوە.

دورمووش پرسیی:

ـ هیچ ناجوولّیّن. چ بووە. ئەو بچووکە چییە؟

مەمی دیك:

ـ ئەوەتا لەو پنچکانە دایە.

پنچکەکان لە هەوا شیّدارەکەی بەری بەیانیدا خەرمانیّك گولّی کیّوی بوون و بۆن و بەرامەیەکی خۆشیان لیّ هەلّدەستا.

دورمووش گوتی:

ـ دەبیّ پیّی بلّیّین را بکا.

لە نەکاو دیتیان هەر سیّ پیاوەکمە هەستان و ئیتر خۆیان بە عەرزەکەوە مەلاّس دا.

ئەو مەزرایەی لۆکەیان لێ دەرنییەوە، مەزرایەکی بە پیت و بەرەکەت بوو. کە ئەوان گەیشتبوونە چوکوور، کابرایەکی سمێڵ بابڕی کورتە باڵای ورگن، لە بەر دەمیان قوت ببۆوە و گوتبووی: "ئەمساڵ دەبێ ئێوە مەزراکەی من بدروونەوە." گوندی هاتبوون و دیتبوویان کە مەزرایەکی بە پیت و بەرەکەتە. قۆزاخە هەر یەکەی پڕ بە چنگێك. مەزراکەش چوارسەد دۆنمی تەواوە. بێ و نەبێ ئەوە دەستی تاشباش ئۆغڵو بەرەکەتی خستووەتە ئەو مەزارەی. ئەو کابرایە کێ ناردبوویە پێشوازیی ئەوان؟ تاشباش ئۆغڵو، گوندییەکان لەو مەزرا بە پیت و بەرەکەتەدا دڵیان زۆر خۆشە. گەرمایە، مێشوولەش هەیە، بەڵام دیسانیش دڵ خۆشن. لەو نێوەدا تەنیا سێ کەس دڵیان خۆش نییە: یەکەمیان: سەفەری چارەڕەش، کە هیچ کەس نایدوێنێ. دووهەمیان مەمی دیکی چارەڕەش و سێهەمیان "عەلی"یە درێژە چارەڕەشەکە.

## ۱۲

عەلی درێژ لە سەر زەوییەکە، گیانی دەلەرزی. ویستی هەستێ، بەڵام نەیتوانی و دیسان خەوی لێ کەوتەوە. لە خەودا، نەك لە خەودا بەڵکو لە دنیای نێوان خەو و خەیاڵدا دەستەکانی بێ راوەستان لۆکەیان دەرنییەوە. هەموو گیانی دێشا. ماسوولکەی وەك دار وشك و رەق ببوون.

عەلی چاوی هەڵێنا و سەیری ئاسۆی کرد. هیچ شوێنەوارێکی کازیوەی بەیانی دیار نەبوو. هەر ئەستێرە گەورە کلکدارەکە، وەك لەتێکی هەتاو لە سەر لووتکەی چیاکان دەدرەوشایەوە. شنەی بەیانی هەڵیکردبوو و روخساری عەلیی دەلاواندەوە. شادییەکی تەڕ و تازە، لە ناخی

عەلی گەڕا. بنیادەم چەندی بێهیوا و خەفەتباریش بێ، کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستێ و سروەی بەیانی لە سەر و چاوی دەدا، شادییەکی لە تاریف نەهاتوو ناخی دەئاخنێ. دەڵێی دیسان لە دایك بووەتەوە.

عەلی بە زۆری هەستا. گوندی هەموو خەریك بوون وەخەبەر دەهاتن. خڕە خڕێکی سامناك لە لای کەپرەکەی گۆملیکسیز ئۆغلۆوە دەهات. نەنە زەڵەجە لە خەودا لێوەکانی پەیتا پەیتا دەجووڵان و قسەی دەکرد. "هەوا گۆر" لە سەر جاجمێکی تەنك، لە سەر پشت خەوتبوو و دەست و پێیەکانی تەواو لێك ڕەواندبۆوە و لە خەوێدا چڵمی هەڵدەلووشی و دەگریا. مەزرای لۆکە لە تاریك و ڕوونی بەیانیدا دەتگوت دەشتێکی پڕ لە بەفرە و تا چاو هەتەر دەکا سپی دەچێتەوە. وەك چۆن سپیایی بەفر لە تاریکایی شەوێدا ڕەنگ دەداتەوە، سپیایی لۆکەش تاریکایی دەشکێنێ و کاڵی دەکردەوە. گیان قورس وکوتراوەکەی لە بەر یەك کێشایەوە. نێسقانەکانی قرچە قرچیان لێوە هات. لە مەزراکە چووە دەرێ و لە خەرەندەکە چووە خوارێ. لە قووڵایی خەرەندەکەوە دەنگێکی وەك ناڵە ناڵ دەهات. گوێی هەڵخست. دەنگی هەناسەکانی ژنەکەی بەکرە شێتی ناسییەوە. هەمیشە ئاوا بە نرکە نرك هەناسەی دەدا، دەتگوت خەریکە بخنکێ و لە ئاویلکەدانە. بە خۆی گوت:

"هەتیو ئەو مەمی دیکەش دەڵێ ئاگرە."

بەسپایی لەوێ دوور کەوتەوە و بەرەو لایەکی دیکەی خەرەندەکە ڕۆیشت کە دەنگەکەی نەدەگەیشتێ. بەرەو ئەستێرە کلکدارەکە ڕاوەستا و میزەکەی هەڵڕشت. ئەوجار بەرەو لای ڕاستەی سووڕایەوە و تارماییەکی دی، کە خۆی کووڕ کردبۆوە و کرووشمەی کردبوو. پرسیی:

ـ مام خەلیل، ئەوە تۆی؟

مام خەلیل بە دەنگێکی کزەلۆکەوە گوتی:

ـ منم.

بە دەستە لەرزۆکەکانی خەریکی هەڵپێچانی جگەرەیەك بوو. ئاخرییەکەی پێچایەوە و بۆ لێوی برد. بەردە ئەستێیەکی هێندەی لەپی دەستی لە گیرفانی دەرێنا و پوشووی لە سەر دانا و لێکی دا. پووشووەکە ئاگری گرت و بۆنە خۆشەکەی لەو هەوا خۆشەی بەیانیدا بڵاو بوویەوە و عەلی و مام خەلیلی مەست کرد.

مام خەلیل بە لەبزێکی گەرم و نەرمەوە گوتی:

ـ ڕۆڵە عەلی، وەرە ئێرە، قسەیەکم پێتە.

لە فێنکایی شنەی بەیانییەکەدا بەرەو کەناری جەیحان داگەڕان. نەرمە بایەکە وردە شەپۆلی خستبووە سەر ئاوە مەیلەو کەسکەکە.

مام خەلیل دەستی عەلیی گرت و لە سەر عەرزە رێکەکە و لە سەر چیمەنی دەم ئاوەکە دانیشاند. دەستی راستەی لە سەر شانی عەلی دانا. ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی پێ کرد:

ـ کوڕم، عەلییەکەی خۆم، براڵە. ئەتۆ کارێکی باشت نەکرد. کوێخا سەفەر دەستت لێ هەڵناگرێ. لە تەویلەت دەکا. تاشباشی مەزنمان بەر لەوەی تێکەڵی چل سوارەی غەیبی بێت، ئەمری فەرموو کەس لەبزی دە لەبزی ئەو سەفەرە نەگەڕێ کە بە هەر چوار مەزەبەکە خوێنی حەڵاڵە. هەی ئافەرم بۆ ئەو گوندییانە، سەت ئافەرم... سەت هەزار ئافەرم... چاوە رەشەکانی ئەو گوندییانە ماچ دەکەم. ئەوان ئەمنیش نادوێنن. دەزانی بۆ؟ چونکە ساڵی رابردوو ئەو گوندییە هیچ و پووچانەم درەنك برد بۆ لۆکە رنینەوە. چونکە گوندێکی ئاوا گەورە نەیتوانی ئەسپێك بۆ من پەیدا بکا. بەڵام، ئەمساڵ نازانی گوندەکەی ئینجەجیك چییان بۆ کردم؟ ئەسپێکی عارەبییان بۆ هێنام و گوتیان:"سوار بە و بڕۆ بۆ چوکوور، مام خەلیل ئاغا." ئەوجار سواری ئەسپەکەیان کردم و دەستیشیان ماچ کردم. گوندییەکان کوێخا سەفەری زۆڵ و بیژوو نادوێنن. بەڵام پیاوەکانی حوکمەت لە شاری گوێ نادەنە قسەی تاشباش ئۆغلوی وەلی. قسەی لەگەڵ دەکەن. با هەر قسەی لەگەڵ بکەن. تاشباش مشووری ئەو کافرانەش دەخوا، تاشباشی مەزنی من... هەر بە راستی عەلی، تۆ خودا، دەی بڵێ بزانم، تاشباش چۆن بوو بە وەلی؟

عەلی گوتی:

ـ چووزانم. خودا دەزانێ.

مام خەلیل زیاتر لە عەلی چووە پێشێ و قۆڵی گرت و گوتی:

ـ گوێ بگرە عەلی. ئێستا کوێخا سەفەر دەچێتە لای حوکمەت و دەڵێ:

"حوکمەت گیان، عەلی دایکە پیرەکەی خۆی کوشت، چونکە دایکە پیرەکەی نەیدەتوانی بێتە چوکوور. کوشتی و ناشتی. حوکمەتیش دێ و دەتگرێ و لە تەویلەت دەکا. باشە ئەو کارەت چۆن کرد؟ بۆچی وات کرد؟ چما بنیادەم دایکی خۆی دەکوژێ؟ بە تایبەتی کە دایکێکی وەك مریەمۆکی هەبێ؟ چۆن دڵی دێ بیکوژێ؟ مریەمۆك حەیف نەبوو؟ چۆن دڵت هات؟ ئەمن و ئەو پەنجا ساڵی رەبەق لێرە وەك سەگ و پشیلە ئامبازی یەکتری بووین، بەڵام نە ئەو دەیتوانی بەبێ من بژیێ و نە منیش بەبێ ئەو... چۆن دڵت بەرایی دا عەلی؟ چۆن مریەمۆکت کوشت؟

مام خەلیل لە بانگی دا. عەلی قسەی دەکرد. بەڵام مام خەلیل خۆ گوێی لێ نەبوو و زۆڕ زۆڕ دەگریا. وەك منداڵان لووشمە لووشی بوو و ردێنی لە فرمێسکاندا خووسا.

ناخرییەکەی عەلی توانیی دەنگی خۆی بگەیێنێتە گوێی:
- کوڕە مام خەلیل، ئەمن دایکمم نەکوشتووە. دایکم لە گوندە. خۆ دوێنێ پێم گوتی. بۆچی بڕوات نەکرد؟ خۆی حەزی لێ بوو و رازی بوو بەوەی لەوێ بمێنێتەوە. پێی گوتم:" رۆڵە عەلی، ئەتۆ هەستە بچۆ چوکووراوا. تەبەکێکیش نان بۆ من بەجێ بێڵن. هەتا دەگەڕێنەوە خۆم دەژیێنم."
مام خەلیل خەیاڵ هەڵی گرت. ئێستا زانیبووی مریەمۆک زیندووە. نێوچاوانی تێک نا. دەستەکانی عەلیی گرت و گوتی:
- عەلی گیان. تکایەکم لێت هەیە. ئەو کارەم بۆ بکە. بەڵێنم پێ بدە. ئەمن باشترین برادەری برایمی بابت بووم. بیکە بۆ خاتری ئێسك و پرووسکەکانی بابت رووم لە عەرزی مەدە.
عەلی هەر دوو دەستەکانی مام خەلیلی گرت و خۆمانە گوشینی:
- مام خەلیل. چما تا ئێستا داوایەکت لە من کردووە و گوتبێتم نا؟ مام خەلیل دڵی خۆش بوو:
- باشە، بە مریەمۆك مەڵێ، ئەمن دوێ شەوێ و ئەمڕۆ، بۆ مەرگی وی گریاوم. باشە؟... نەچی پێی بڵێی؟
عەلی گوتی:
- نایڵێم. بەڵام ئەی گوندییەکان؟
- لە تۆ دڵنیا بم؟ ... گوندی نازانن ئەمن بۆچی گریاوم. بە کەریان دەزانم.
- دڵنیا بە و خەمت نەبێ.
مام خەلیل:
- سوێند بخۆ.
عەلی: سوێندێ دەخۆم.
مام خەلیل قورئانێکی بچووکی لە باخەڵی دەرێنا:
- دەست بەو قورئانەدا بدە.
- ئەوە پێمدا دا.
- کورە بە گیانی ئەولادەکانم گڵێش لێمی نابیستێ کە بڵێم مام خەلیل بۆ مریەمۆك گریاوە. بە هیچ کەس، بە گورگ و مێروولە و قالۆنچە و بە بەرد و دار و بە ناویش، بە هیچ شتێك و بە هیچ کەسی ناڵێم. سوێند دەخۆم. نامیین....

"عەلی"یە درێژ گوتی:

ـ سوێند دەخۆم، ئامین.

جا دەستی لە سەر قورئانەکە هەڵگرت. مام خەلیل پشوویەکی ئاسوودەی هەڵکێشا و قورئانەکەی لە گیرفانی خستەوە و گوتی:

هەتا ئێمە دەگەڕێینەوە، مرێمۆك دەمرێ. تازە ئەگەر تۆ نەشتکوشتبێ.

بنیادەم لەو تەمەنەی ئەودا، بە تاقی تەنێ لەو گوندەدا، لە نێو ئەو هەمووە باڵندە و درندە و دەعبایەدا ناژیێ. هەر بە راستی جگە لە نانی وشك، هیچی دیکەتان بۆ بەجێ نەهێشت؟

ـ بڕێکیش ترخێنە مابۆوە. دایکم گوتی: ئەنگۆ بڕۆن بۆ چوکوور، ئەمنیش دەچمە کۆشکی پەرییان و ئاگام لە منداڵەکانی ئەحە شێتۆکەی خۆم دەبێ. لەوانەشە ئێستا ئەحە شێت چووبێ و لەگەڵ خۆی بردبێی بۆ کۆشکێ.

مام خەلیل لە کەلێنی ددانە چیرەکانییەوە تفێکی کرد و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هەتیوە کەرە، چما دەهێڵن دایکت بچێتە نێو کۆشکی پەرییانەوە؟ خۆ بشهێڵن، دەیخنکێنن و فڕێی دەدەنە دەرەوە. ئەتۆ پێت وایە ئەمن نەچوومەتە کۆشکی پەرییان؟ بە حاڵی سەگ خۆم لە چنگی پەرییەکان نەجات دا. ئەحە شێتی چی، تەڕەماش... کێ دەڵێ ئەحە شێت بووەتە زاوای سەرماڵی پادشای پەرییان؟

"عەلی"یە درێژ ویستی لە بەرانبەر مام خەلیلدا لای ئەحە شێتۆکە بگرێ، بەڵام پاشگەز بۆوە.

دوای بێدەنگییەکی زۆر، مام خەلیل گوتی:

ـ ئەتۆ دەبێ، تا زووە خۆت بگەیێنیتەوە دایکت. هەتا گوندی دەگەنەوە، دایکت لەوێ دەمرێ. دیارە ئەگەر نەتکوشتبێ.

عەلی بە دڵپڕییەوە گوتی:

ـ چۆن دەتوانم بڕۆم مام خەلیل. چۆن دەکرێ ئەو مەزرا بە پیت و بەرەکەتە بەجێ بێڵم و بڕۆمەوە؟ دە ساڵە تووشی مەزرای ئاوا بە پیت و بەرەکەت نەبووین. ئەمساڵ دەتوانین قەرز و قۆڵەکانمان پاك بکەین و لە چنگی عادیل رزگارمان بێ. چۆن بەجێی بێڵم و بڕۆمەوە مام خەلیل؟

مام خەلیل سەری هەڵێنا و گوتی:

ـ ئەگەر لە هاتنێدا دایکتت نەکوشتبێ و نەتناشتبێ، دەبێ کارێك بکەی عەلی. دەبێ هێندەی دوو کەسان لۆکە بڕنیتەوە. دەبێ ددان بە جەرگتدا بگری و هەر کار بکەی. دوو

هێنده، سێ هێنده، پێنج هێندەی کەسێك لۆکە کۆ بکەیتەوە و پارەی باش پەیدا بکەی و لە ماوەی پانزە رۆژاندا بگەڕێیتەوە ئاوایی. لەو پانزە رۆژەشدا مریمۆك نامرێ. دیارە ئەگەر نەتکوشتبێ و نەتناشتبێ. ئەوە سوێندت بە سەری ئەولادەکانت خوارد و دەستت بە قورئانێ دادا. باشە، ئەمسال ئەمنیش لەگەڵ تۆ کار دەکەم و یارمەتیت دەدەم. مەشلێ ئەو مام خەلیلە پیرە چۆن دەتوانێ یارمەیتم بدا. پیرە هەڵۆی شاخان مام خەلیل، زۆر باش دەتوانێ یارمەتیت بدات و ئەتۆش دەچی و دایکت رزگار دەکەی. مریمۆکی باش و بە بەزەیی و ئازا و بەغیرەت، دیارە ئەگەر نەتکوشتبێ...

عەلی دەستی مام خەلیلی گرت و ماچی کرد و بە نێوچاوانییەوە نا. گوتی:

ـ خوا راوەستاوت بکا مام خەلیل. سایەت لە سەرمان کەم نەبێ. ئەمن تا زووە کارەکەم دەکەم و خۆم دەگەیێنمەوە دایکم. ئەمن زۆر بە خێرایی لۆکە دەڕنمەوە.

مام خەلیل:

ـ ئەمنیش یارمەتیت دەکەم.

لە لای سەرووەوە، لە مەزراکەوە دەنگی تەنەکە هات. چەند کەسێك کۆخین. ئەوجار دەنگەکە پتر بوو و پەرەی سەند. دوورتر، لە برینجە جاڕەکەشەوە دە پانزە تەقە کرا...

مام خەلیل گوتی:

ـ یاڵڵا زوو بە... هەموو هەستاون. دەبێ چەندی تینمان تێدایە کار بکەین. ئەمن ئەمساڵ لۆکەی خۆم نادەمە کوڕەکەم، نایدەمە ئەو حاجییە چڵمنە. دەیدەمە تۆ.

عەلی دەستی گرت و گوتی:

ـ نا، ناکرێ مام خەلیل. لۆکەی خۆت بۆ خۆت. نامەوێ. ئەمن خۆم دەگەیێنمەوە دایکم. ئەتۆش هەر لێرە بەڵێن بدە لۆکە بۆ من خڕ نەکەیتەوە، ئەگینا ناچمەوە لای دایکم.

مام خەلیل ئەو قسەیەی عەلیی هیچ بە کەیفێ نەبوو. لاسارییەك بە قسەکەیەوە دیار بوو. نەدەکرا وەڵامی نەدەکرا بە قسەی نەکە. گوتی:

ـ دەی باشە. ئەمساڵ لۆکە بۆ تۆ نارنمەوە. بەڵام ئەتۆ دەبێ، سێ هێندە، پێنج هێندە، سەت هێندە کۆ بکەیتەوە. عەلی وەڵامی دایەوە:

ـ کۆ دەکەمەوە.

جا وەڕێ کەوت.

ـ دەبێ خڕ بکەیتەوە و تا زووە خۆت بگەیێنیتەوە لای دایکت.

عەلی ئاوڕی دایەوە و گوتی:

- خۆ دەگەیێنمەوە.

- دەبێ بگەیتەوە ئەوێ و دایکت نەجات بدەی. کە گوندییەکان دەگەڕێنەوە، بێت و بە سەر تەرمی مرێمۆکە خۆشەویستەکەماندا بکەون، ئەوە نییە بۆخۆت دەیزانی. دەتکوژن. ئەمان عەلی گیان. زووتر بگەوە دایکت و نەجاتی بدە.

- دەیگەمێ و نەجاتیشی دەدەم.

عەلی دیسان کەوتەوە ڕێ. لاقی تێك دەئالاَن. چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو. گریان ئەوکی گرتبوو. بەخۆی گوت:" ناتوانی بنیادەم بناسی... هەمووان پێیان وایە مام خەلیل دوژمنی بەخوێن تینووی دایکمە و لەوەتەی وەبیریشم دێ، هەمیشە وەختە چاوی یەکتری دەرێنن. لەو دنیایەدا نەبووە و نەبینراوە دوو کەس ئەوەندەیان رق لە یەکتری بێ... بەلاَم ئێستا مام خەلیل چیی نەمابوو دڵی بتۆقێ بۆ دایکم... ئەی خوایە ،گیان پەنام بەتۆ، بڕوا ناکەی. ئەگەر دایکم بمرێ، مام خەلیلیش ڕۆژێك ناژیێ. بڕوات بێ...."

بەری بەیانیان، لە بوولێڵی بەیانیدا، ئەو خەڵکە خەواڵووە زۆر بە سپایی دەجوولاَنەوە. ئەو دەستانەی لۆکەیان دەڕنییەوە بەردەوام دەهاتن و دەچوون. توورەکە پڕ دەبوون. لە مەزرا دوورەکانی دیکەشەوە قریوە و هەڵلاَ بەرز ببۆوە. شەکی کرێکارەکان لە خوناوکەی بەیانیدا وا خووسابوو دەتگوت باران باریوە. شنەی بەیانی گیانە تەڕەکانی هەڵدەلەرزاند. چیای "گاوران" لە بن پەردەی تەمێکی مەیلەو شیندا دیار بوو. سێ ئەستێرەی گەورە لە سەر چیاکانەوە کە یەکێکیان کلکدار بوو، دەدرەوشانەوە. ئەستیچرە کلکدارەکە دەسووڕایەوە و تریفەی داویشت. لەسەر لووتکەی چیاکانەوە و لە دوورەوە هێڵێکی باریك و کاڵی رووناکی، بلێیی و نەڵیی بلاَو دەبۆوە.

"عەلی"یە درێژ چەقۆت لێدابا خوێنی نەدەهات. هەموو لەشی بەخاو کەوتبوو... خۆ لە دەستی هاتبایە، یەکسە مەزراکەی هەڵدەلووشی. وای کار دەکرد، کەس دەستی نەدەدی. تەلیسەکەی دەمودەست پڕ دەبوو لە قۆزاخە و دەیبردەوە بن کەپرەکان و لە سەر حەسیرێك هەڵیدەڕشت. مام خەلیلیش هەر وا گورج و تەڕدەست کاری دەکرد. کەس هەتا ئێستا ئەو مام خەلیلە ڕێگر و ڕاکردووەی یەمەن و دوژمنەی مرێمۆکی کە بە هەر چوار مەزەب خوێنی حەلاَڵ بوو، نەدیبوو ئاوا بە گیان و دڵ لۆکە بڕنێتەوە.

کرێکارەکان جار و بارە تۆزێك رادەوەستان و سەیرێکی دەستەکانی عەلییان دەکرد کە وەك مەکینە کاریان دەکرد. زۆر لە مێژ ساڵ بوو ئەوانە لۆکەیان دەڕنییەوە و لەو ماوەیەدا نە "عەلی" و نە کەسێکی دیکەیان دیتبوو ئاوا بە خێرایی و وەك مەکینە کار بکا.

عەلی پشتی دێشا و گیانی دەیزیڕاند. ئێستا ئارەقەی دەکرد و ئێسقانەکانی نەرم دەبوونەوە. بەڵام دەیزانی دوای ساردبوونەوەی ئارەقەکەی دیسان گیانی دەیدایەوە ژان و ئیتر لە کاری دەخست. عەلی لەوە تۆقیبوو.

مەمی دیك لە تەنیشت دایکییەوە بە هێمنی لۆکەی دەڕنییەوە و جار نە جارێك سەرێکی هەڵدێنا و سەیرێکی ئاسمانی دەکرد کە لایەکی بە هەور داپۆشرابوو. بە ژوور سەرییەوە فرەی باڵ.... هەڵۆی گەورە گەورە بە شاباڵیانەوە لە تاریك و روونی ئاسمانی بەیانیدا بەرەو کەناری رووبارەکەی جەیحان و بەسەر مێشەڵانەکەدا دەفڕین.

دایکە، ئاوڕی لە کوڕەکەی دایەوە کە بەبێ دەنگی و وەك نیوەزیندووان لۆکەی دەڕنییەوە و گوتی:

ـ رۆڵە ئەوە بۆ وای؟ ئەمساڵ وەك ساڵی ساڵان نی؟ نە شەوت شەوە و نە رۆژت رۆژ.

هەموو رۆژێ، دایکە لانیکەم جارێك، ئەو پرسیارەی لە کوڕەکەی دەکرد. مەمی دیك، یان وەڵامی دەدایەوە، یان هیچی نەدەگوت. کە وەڵامیشی دەدایەوە، چیی لەو کاتەدا بە مێشکیدا دەهات، دەیگوت و دایکیشی هیچی بۆ نەدەچۆوە سەر یەك.

ـ هیچم نییە دایە. زۆر غەریبیی تاشباشی سەروەرمانم کردووە.... دوێ شەوێ هاتە خەونم. لە دەریایەکی نووردا دەدرەوشایەوە. لە دەم کانیاوێکی فێنکی پڕ لە عەتری پنگە، راوەستابوو. بە ژوور سەرییەوە دارە سنەوبەرەکان... هەر هەموو شوێنێك نوقمی گوڵ و چیاکان سەرخۆشی بۆنی گوڵان... تاشباشی مەزنمان لارەمل و رەنگ بزرکاو، وەك مردووان، هێمن... لە خەو راپەڕیم. دەنگی خوڕەی کانیاوەکە هەروا لە گوێمدا بوو... نازانی چ کانیاوێك... هەڵدەقوڵی و کەفی دەچڕاند.:.. ئەوەندەش سارد بوو نەتدەتوانی دەستی تێدا راگری... وەخەبەر هاتم و....

دایکی دیسان لێی پرسییەوە:

ـ ئاوا، دەی دەی... کەوابوو ئاوا؟ ئیشەڵڵا تاشباشی سەروەرمان بەو زووانە دێتەوە و ئەو دڵەی تۆش دادەکەوێ... تاشباشی مەزنمان بەو زووانە بە هانامانەوە دێ... لانیکەم لە چنگ ئەو مێشوولە و گەرما خنکێنەرە نەجاتمان دەدا.

نەنە "ئاناقیز" لێیان نزیك ببۆوە. هەم لۆکەی دەڕنییەوە و هەمیش گوێی لە قسەیان هەڵخستبوو. راستە خەڵك پێیان دەگوت نەنە "ئاناقیز" بەڵام ئەو هێشتا زۆر گەنج بوو.

مێردەکەی بە تۆمەتی بڕینی داری لێڕەوار قۆڵبەست کرا و دوای ئەوەی رای کرد، ئیتر رووی لەو مەملەکەتە نەکردەوە. ئیتر کەس بە سۆراغی نەزانی. هیچ کەس وەك مێردەکەی ئاناقیز لە بەندیخانە نەتۆقیبوو. ئاناقیز، شەوێك دوای راکردنی مێردەکەی، هەر بەیانییەکەی ئەو رۆژە هەڵدەستێ و سەیر دەکا هەموو مووی سەری سپی بووە. خەفەتێك دایگرتبوو کە شەش مانگی رەبەق نە دەرگای لە سەر کەس کردەوە و نە لە هاموشۆی کەسیشی کرد. ئاناقیز ژنێکی گەنج بوو. چاوەکانی رەش و درشت و جوان و چەناگەی باریك و پێستێکی ئەسمەر و نەرم و ناسك و لێوی سوور و هەستبزوێن بوون. بەژن و باڵایەکی بەرز و سمتی خڕ وەك تەختی فەنەر بوو. شەرمی دەکرد لەوەیکە مێردەکەی بەجێی هێشتوە، بەڵام دواتر لە بیری کرد و هاتەوە نێو خەڵکی. وەك خیز و خۆڵ لە گوندی یالاك و گوندەکانی دیکەوە خوازبێنیکەری هەبوو. ئاناقیز وەڵامی هیچیانی نەدایەوە، گەڵەگاشی نەبوو و سەیری هیچ پیاوێکیشی نەدەکرد. تا ئێستا یەك قسەشی نەهاتبۆوە سەری.

ـ ئەوە پازدە ساڵە لەو چوکووراوا کاولبووەدا، لۆکەی دەڕنمەوە. هەتا ئێستا نە گەرمای ئاوام دیتووە نە مێشوولەی ئاوا.

مەمی دیك بە زاری داپچڕاوەوە سەیری ئاسمان و ئەو هەڵۆیانەی کرد کە بە باڵی کراوەیانەوە دەڕۆیشتن . گوتی:

ـ نە لۆکەی ئاواشمان دیتووە خوشکە ئاناقیز. ئەگەر هەموو ساڵێ لۆکە ئاوا قوڕی پێوە بدا، دیارە گەرماکەشی توندتر دەبێ و تەپۆ و مێشوولەشی پتر دەبێ. باران و گەرمایە ئەو لۆکەیە دەکاتە لۆکە. ئەو قۆزاخانە دەبینی... هەموو چڵ و لکەکان پڕن و هەر قۆزاخەیەکیش پڕ بە چنگێك. ئەگەر هەموو ساڵێك مەزرای ئاوامان وەگیر بکەوێتەوە، و هەموو ساڵێکی چوکوور ئاوا بەرەکەتی تێ کەوێ، گوندییەکانی ئێمە دەوڵەمەند دەبن. قەرز و قۆڵەی عادیلیش دەدەینەوە. چەند باشە بنیادەم قەرزبار نەبێ... ئەمساڵ لە سایەی سەری تاشباشی سەروەرمانەوە ئەو مەزرایانە بەرەکەتیان تێ کەوتووە. بەڵێ. ئەی چۆن. لەمەودوا لە هەموو ئەو مەزرایانەدا کە ئێمە لۆکەی لێ دەڕنینەوە، هەر وا دەبن.

ئاناقیز:

ـ ئیشەڵڵا چاوی سەفەر کوێر دەبێ. ئیشەڵڵا سوورە کوانێکی لێ دێ و هەلا هەلا دەبێ. هیچ کەس نایدوێنێ. هەر سێ ژنەکەی و منداڵەکانیشی... جا ئەگەر ئازان با قسەی لەگەڵ بکەن. تاشباشی سەروەرمان وەك بەرد رەقیان دەکا. بە درێژایی کستانێ لەو ژن و منداڵەی

هەڵدا و ئێسك و پرووسكی هەموو تێك كردنەوە بۆ ئەوەی یەك قسەی لەگەڵ بكەن. خۆ دەزانی دراوسێمانە. بە درێژایی ئەو زستانە جوێنی بە تاشباش دا. ئەی خوایە گیان، جنێوی چۆنی دەدا. جنێوی وای دەدا رووت نییە بیانڵێیەوە، هەر كەس نەیبیستوون. جنێوی بە هەموو شتێكی تاشباشەكەمان دەدا. ئێستاش خۆ دەزانن دەڵێ چی؟ دەزانی دوێنێ چیی بەو ئاغایانە دەگوت وا لە شارییەوە هاتبوون؟ سوێسكەی بۆ سوور كردبوونەوە و ئارەقی دەدانێ. بۆنی چەوری سوێسكەی برژا و سوورەوەكراو لیكاوی لە زاری چۆڕاندووینەوە... دەزانی چیی دەگوت؟... بەو دوو گوێیانەی خۆم لێیم بیست، دەیگوت:"تاشباش مرد. رەق هەڵات و مرد. وەك چۆن ئێمە ئەو سوێسكە برژاوانە دەخۆین، ئاوا گورگەكانیش تاشباشیان خوارد. خواردیان و دوایی چۆنە سەر بەفرەكان و بە كەیفی خۆیان گوویان كرد." دەیگوت:"ئەو گوندییە گەوجانە، هێشتاش ئەو تاشباشە دەپەرستن كە بووەتە گووی گورگ. تاشباش ئەگەر كەراماتێكی هەبوایە، نەدەبووە گووی گورگ." ئەوانەی لە شاریشەوە هاتبوون، قاقا پێدەكەنین و ملیان بادەدا. پێی دەگوتن:"گورگ خواردیان و دایاننایەوە. كەچی هێشتا من لە چنگی رزگارم نەبووە. قورگمی وا گوشیوە پشووم دەرنایە. تەنانەت ناتوانم سەردانی شاریش بكەم. لەوێ هەمووان پێم پێدەكەنن. لە چوكووراوا هەموو بیستوویانەتەوە كە گوندییەكانم بە ئەمری تاشباش ئەمن نادوێنن. تاشباش مرد. تەقی. بەڵام ئەو گوندییە بێناموسانە ئاخرییەكەی وەزگم پێ دەدەن. ئەوانە خۆ بنیادەم نین..." ئاخ ئەگەر ئەو گوندییانە بنیادەم بوایەن، قسەكردنی چی، هەر دەبوو وڕجو وڕجی بكەن....

دایكی مەمی دیك بێدەنگ بوو و دەتگوت گوێی لە هیچ نییە. چۆكی دادابوو و پەیتا پەیتا لۆكە تەڕ و پشكووتووەكانی كۆ دەكردەوە. جار و بارەش باوێشكێكی دەدا. ئاوری لە ئاناقیز دایەوە. بەڵام لە بوولێڵەكەدا دەموچاوی بە جوانی نەدی. بەهێمنی و دڵنیاییەوە گوتی:"خوشكێ، پێت وایە گوندی لەتوپەتیان نەدەكرد و هەر لەتێكیان نەدەخستە پێش دەمی سەیەك؟ بەڵام لەبیرتە سەروەرەكەمان تاشباش چیی گوت؟ گوتی:"نابێ موویەك لە سەری ئەو سەیە كەم بێتەوە. نابێ دەستتان بە خوێنی ئەو سەیە گلاو بكەن. هەر قسەی لەگەڵ مەكەن با فجەی بكا. با خۆی بخواتەوە و دیق بكا و بمرێ." ئەگینا خەڵكەكە لەت و پەتیان دەكرد..."

مەمی دیك لە نێوان ددانەكانییەوە گوتی:

ـ ئەگینا لەتوپەتی...

دەستەکانی بریسکاندیان. بەخۆی گوت:"ئەو هەلۆیانە بۆ کوێ دەچن؟ هەر بە راستی بۆ کوێ؟..." لە ناخیدا و لە قوژبنێکی دڵیدا هەستی بە بۆشاییەك کرد. حەسەن و ئۆمەخان لە لای چەپی "پاڵە" و کرێکارەکانەوە بوون. پاڵەش لە تەنیشت یەکەوە ریزیان بەستبوو. ریزێك دوور و درێژ کە پێنسەد مەتر دەبوو. لە کارکردنێدا ئانیشکیان وێك دەکەوت.

گۆملیکسیز ئۆغلۆ زۆر لە "عەلی"یە درێژ تووڕە بوو. چونکە عەلی لە لای راستییەوە کاری دەکرد و ئەوەندە خێرا بوو هەموو جارێ سێ چوار مەتری بەجێ دەهێشت و ئەوجار دەگەڕایەوە و لۆکەی پێش گۆملیکسیزی دەڕنییەوە.

گۆملیکسیز ئۆغلۆ خەریك بوو لە داخانی شێت دەبوو. دەیبۆڵاند و دەیگرماند. تووڕە دەبوو و دەیگوڕاند، بەڵام عەلی گوێی لێ نەبوو.

ـ کوڕە خۆ ئەوە بنیادەم نییە، دێوەزمەیە. هەر دەڵێی لۆکە هەڵدەلووشێ. ئەگەر بەری بدەن، هەر هەموو مەزراکە قووت دەدا. ئەو بنیادەمە بەو جۆرەی دەچێتە پێشێ، رۆژێ سەد و بیست کیلۆ خڕ دەکاتەوە. خوا دەزانێ خڕ دەکاتەوە...

لە مێشکی خۆیدا پەیتا پەیتا کاری رۆژانەی عەلیی لێك دەدایەوە و شێت دەبوو: هەر کیلۆیەی بیست قرۆ... سەد کیلۆکەی دەکاتە بیست لیرە. سی کیلۆش دەبێتە شەش لیرە ئەوە بیست و شەش لیرە. هەموو رۆژێ بیست و شەش لیرە. هەر ئەو بنیادەمە بە تاقی تەنێ هێندەی بنەماڵەیەك کۆ دەکاتەوە. ئاوا بڕواتە پێشێ، رۆژێ سەد و پەنجا کیلۆ خڕ دەکاتەوە. ئەو کات داهاتەکەی دەبێتە چەند؟ رێك سی لیرەی تورك.

سەری راوەشاند و بە گوڕاندنەوە گوتی:

ـ وەی، وەی وەی، هەی دایك و خوشکت بگێم...

تەپۆ لە بن گوێی وزە وزیان بوو و بە پشتیانەوە دەدا و ئاگریان تێبەر دەدا. کراسەکەی گۆملیکسیز ئۆغلۆ بە چزووی تەپۆ خوێناوی ببوو. پێستێکی ناسکی هەبوو. پشتی هەموو بریندار ببوو.

"ئەوەی دایکی خۆی کوشتبێ، چ خێر و بەرەکەتێکی لێ هەڵدەوەرێ؟... ئەوەی هەر لە خۆڕایی دایکی خۆی بکوژێ، ئەی دیارە قەت نابێتە بەشەر."

گۆملیکسیز ئۆغلۆ کە لەگەڵ تڕی بزن بەشەڕ دەهات خۆی پێ نەگیرا و گوتی:

ـ نەحلەتی خولای لێ بێ. دایکی خۆ کوژ.

تووڕەکەی هەڵگرت و چووەی لای راستی ریزەکە. لە تەنیشت بەکرە شێتەوە راوەستا و دەستی کرد بە لۆکە رنینەوە.

ـ کوڕە ئەو بنیادەمە پیاو شێت دەکا. براله خۆ دەستەکانی دەست نین... وەك قیتار... كۆ ناکاتەوە، هەڵدەلووشێ... هەر نەحلەتی خوای لێ بێ..

بەکرە شێت بە پێکەنینەوە و بە دەنگی بەرز گوتی:

ـ جاری جاران وا نەبوو. ئەویش وەك من و تۆ وا بوو. سی، چل و ئەگەر زۆری خڕ کردبایەوە پەنجا کیلۆی کۆ دەکردەوە. هەر بە یەك دوو رۆژان، کۆگاکەی ەئو هێندەی کۆگای چوار کەسی لێ هاتبوو. "عەلی"یە درێ دوای کوشتنی دایکی، گۆڕاوە.

لەو سەری ریزەکەوە، حەسەن و نۆمەخان دەستیان لە کار هەڵگرت. ئاوڕیان دایەوە و سەیری یەکتریان کرد و پێیان بە عەرزییەوە رەق بوو. لە بوومەلێڵەکەدا بە زەحمەت روخساری یەکتریان دەدی. حەسەن بە دەنگێکی کزلۆکەوە گوتی:

ـ ئەمن دەمزانی. ئەمن دەمزانی بابم وا دەکا.... ساڵێ رابردوو نەنکمی لە کوڵ کرد و پشتی بریندار بوو. هەر کات باسی نەنکم دەکرا، مووی لێ دەبوونە نەشتەر. رەنگی بە رووەوە نەدەما... ئەی خوایە گیان...

نۆمەخان:

ـ بابم نەنکمی کوشت. ئەمن بە چاوی خۆم دیم. لە خەوێدا خنکاندی و کوشتی. بەو دوو دەستە زلەی قوڕگی وا رێك گوشی... نەنکە لێقەوماوەکەم دەسبەجێ مرد.

حەسەن:

ـ ئەی بۆ ئەو کات پێت نەگوتم... بەشکم نەجاتم دابایە...

ـ وەختێك کوشتی دیتم... دیتم بابم دەستە خوێناوییەکانی لە ملی نەنکم دەکاتەوە.

حەسەن ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا. بەبێ دەنگی گریا و فرمێسکی بە روخساریدا دەهاتنە خوارێ و لەوێوە دەکەوتنە سەر سینگی.

حەسەن:

ـ نەنە زەڵەجەش خەونی پێوە دیتووە کە بابم نەنکمی ئاوا کوشتووە. بۆ هەمووانی گێڕاوەتەوە... خۆزگە بابم نەنکمی نەکوشتبایە و ئێمەش ئەمساڵ نەهاتباینە چوکور.

نۆمەخان وەك بنیادەمی گەورە گوتی:

ـ چ هاتباینە چوکوور و چ نەهاتباین، نەنکمی هەر دەکوشت. هەر ئەم زستانە کە قسەی لەگەڵ دایکم دەکرد گوێم لێ بوو. بەو گوێیانەی خۆم لێیم بیست. بابم دەیگوت:"کوڕە لە دەستی ئەو ژنە وەگیان هاتووم. بووەتە بەڵای گیانم. لە گیانی خۆم وەڕەز بوومە. ناشمرێ لە چنگی نەجاتمان بێ..."

ئەویش لە بانگی دا. حەسەن گوتی:

ـ بێدەنگ بە ئۆمەخان. با کەس نەزانێ بۆ مەرگی نەنکمان دەگریین. ئەگینا بابمان دەخەنە زیندانەوە. ئێمەش لەو چەقی چوکووراوایە لێمان دەقەومێ.

دەمودەست ئۆمەخان ژێر بۆوە و چاوەکانی سڕییەوە و گوتی:

ـ مەترسە حەسەن، کەس گریانەکەمی نەدی.

حەسەن پەیتا پەیتا بەبێ ئەوەی دەریخا دەگری، گوتی:

ـ ئیتر شقارتەکانم بە کاری هیچ نایەن. نەنکم نایانبینێ. خۆت دیتت کە بە حالی سەگ ئەو شوولکە گێلاسانەم بەو چیا و چۆلەدا هێنا. هێشتاش سەر شانەکانم بریندارن. پشتم شکا. بنی پێم بلۆقی کرد. مردم. ئێستا خۆ نەنکم نەماوە. خۆ نەنکم نەماوە بیانبینێ، ئەی بە کاری چی دێن... هەر هەمووی فڕێ دەدەم.

ئۆمەخان بە هەژاوی گوتی:

ـ فڕێیان مەدە. خۆ شێت نەبووی. بیاندە بە من.

حەسەن گوڕاندی:

ـ دەست هەڵمەگرە لە کارەکەت، قسە بکە و کاریش بکە. سەیر بکە، بابم نەنکمی لەبەر چنگێك لۆکە کوشت. سەیری دەستەکانی بکە... چەندە برسیی لۆکەن... هەر وا دەڕنێتەوە. دەڕنێتەوە و دەڕنێتەوە. گوندی ئەوە لە داخانی شێت دەبن. لە بەغیلییان خەریکە بتەقن. بابم هەموو ڕۆژێ پێنسەت کیلۆ خڕ دەکاتەوە. هێندەی پێنج کەسان.

ئۆمەخان لەسەرخۆ و بە ترسە ترس لە حەسەن چووە پێشێ و دەستی لە باسکی حەسەن دا و پرسیی:

ـ ئەو پیاوانەت دی؟ ... ئەو و ڕۆژ دەگەڕێن. بە کڵاوە حەسیری و جلە سپیەکانیانەوە... دەمانچەشیان بە قەدییەوەیە. سەفەر سوێسکەی چەور و بڕژاوی داونێ. لە پیاوی حوکمی دەچن. سێ جار بە سواری ئەسپ دیتوومن. سێ جار لە مەزراکەدا... سێ جار لە دەم رووبارەکە... بەردەوام دەسووڕێنەوە. بە دوای بابەوەن کە دایکی خۆی کوشتووە. ئاخرییەکەی دەیگرن و دەیبەن. کوێخاش بە خوێنی سەری بابم تینووە.

حەسەن تووڕە بوو و گوتی:

ـ گەوجە، ئەوانە لە بابم ناگەڕێن. ئەگەر لەو گەڕابایەن، ئیتر شەو ڕۆژ لە چوکووراوا و دەشت و رووبار و مەزراکاندا بۆ دەخولانەوە؟ ئەوانە لە شەوکەت بەگ دەگەڕێن. بەڵێ، شەوکەت بەگ...

ـ شەوکەت بەگ کێیە؟

حەسەن خۆی گرت و هاواری کرد:

ـ هەر ئەوەی گوتم... شەوکەت بەگ... شەوکەت بەگ ئیتر... دەی لۆکەکەت خڕ بکەوە. هێندەی نەماوە تاو هەڵبێ. تەلیسەکەمان هێشتا بەتاڵە. دایکم بزانێ، چیت پێ دەڵێ...

دوای ئەوە، خۆی نارەحەت بوو کە لە ئۆمەخان تووڕە بووە... داماوە نەنکی مردبوو. هەر وا دەشگریا. دیارە بابیشی دەگریێ. راستە دایکی خۆی کوشتووە، بەڵام لە خۆی خۆشتر دەویست. خودا دەزانێ بۆ کوشتوویەتی. کەس نازانێ بنیادەم چ دەکا... لە بەر نەبوونی دایکی خۆی کوشتووە. هەی خودا بتبڕێ هەژاری و نەبوونی...

ئۆمەخان گوتی:

ـ نەنکم...

و گریان ئەوکی گرت. زۆڕ زۆڕ گریا و بە گریانەوە لۆکەی دەڕنییەوە.

حەسەنیش لە گریانێ دەلەرزی. نەنکی دەهاتە پێش چاوی و دەگریا. قسە شیرینەکانی مریەمۆکی وەبیر دەهاتنەوە و دەگریا. ئۆمەخان لە کەلەکەی حەسەنی کوتا و گوتی:

ـ سەیرکە حەسەن. سێ سوارەکە... لە سەر ئەسپی رووت... خەریکە لە شەوکەت بەگ دەگەڕێن.

سێ سوارەکە بە ڕێگا پڕ لە خۆڵەکەی دەم رووباری جەیحاندا، بە چوار ناڵە بەرەو باشوور دەڕۆیشتن. حەسەن بە لەبزێکی گەرمەوە گوتی:

ـ بۆیان نادۆزرێتەوە... نایدۆزنەوە... شەوکەت بەگ خۆی شاردۆتەوە...

ئۆمەخان:

ـ شەوکەت بەگ خۆی حەشار نەداوە. یەکێك کوشتوویەتی و ناشتوویەتی...

نەنە زەڵەجە لەخەونێیدا دیتوویەتی شەوکەت بەگ کوژراوە... دوو هەزار سەگ دەوریان دابوو.. هەر لەتەی بە دەم سەیەکەوە... زەڵەجە بەخەون دیتوویەتی... سێ سوارەکەش...

حەسەن گوتی:

ـ بێدەنگ بە ئەوە دێن... شەوکەت بەگ خۆی شاردۆتەوە. خەریکن چاوشارکێ دەکەن.

سێ سوارەکە بە خێرایی تێپەڕین. مەمی دیك دەرپەڕی، تا لە چاوان ونبوون و تێکەڵی تاریکاییەکە بوون، لە سەر پەنجەی پێی هەستابوو و سەیری دەکردن.

کوێخا سەفەری بە دوای ئەواندا پەیدا بوو. تفەنگەکەی بە شانییەوە و قەتارە فیشەکەکەی بە قەدەوە و بە توورەکەی راوەوە، توند هات و بە بەر چاوی گوندییەکاندا تێپەڕی.

مەمی دیك رق و تووڕەییەك ناخی مەمی دیکی تەنییەوە و لە تووڕەییان دەست و پێیانی نەرزین. "ئەتۆ... تۆ دەبێ ئەنجن ئەنجن بکرێی... دەبێ ئەنجن ئەنجن بکرێی... ئەو داماوە تاوانی چ بوو؟ ئاخ... چارەڕەش... تۆ دەبێ بتخەنە پێش سەگەل... ئەی چەندە خۆشە کەس قسەت لەگەڵ ناکا....

لە دوور دوورەوە، لە بن هەورە سپیەکانەوە، بەلای رۆژاوادا، لە شانی چەپی لێڕەوارەکەوە و لە نیوەی تاریکاییەکەدا، داڵ و هەڵۆ و سیسارکە کەچەڵە دەسووڕانەوە. نیگا تیژەکانی مەمی دیك لە دوورەوە باڵندەکانی لێك هەڵداوارد کە بە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە.

مەمی دیك ئۆقرەی نەبوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"دەیدۆزنەوە. ئەمجارە هەر دەیدۆزنەوە. باشە ئەمن ئەو داماوەم بۆ لەو بیرە خست؟ بنیادەم بیری بۆ ئەوە ناچێ کە لەوانەیە داڵ و هەڵۆ و سیسارکە بە سەر تەرمی مردوویەکدا بسووڕێنەوە کە لە بنی بیرێك دایە. ئاخ خوایە گیان دەیدۆزنەوە، دەیدۆزنەوە. دوای ئەوە بکوژەکەشی دەدۆزنەوە. لە داری دەدەن و کوێخا سەفەریش دەمێنێتەوە.

ددانی چیڕ کردنەوە.

خۆزگە ئێستا کە هێشتا رووناکی نەکردووەتەوە، بچێ و مردووەکە لە بیرەکە دەبێنێتەوە... بەڵام تا دەگاتە ئەوێ خۆ رووناکی دەکاتەوە. ئەگەر رووناکبوونەوەی هەوا بگاتە ئەوێ، ئەی چۆن دەتوانێ مردووەکە خێرا لە بنی بیرەکەوە بێنێتە دەرێ؟ لە کوێی بشارێتەوە. تازە ئەگەر بشیشارێتەوە، چووزانی دیسان هەڵۆکان بە سەر سەریدا ناخولێنەوە.

زۆر لە مێژ بوو ئەو بیرەی لە مێشکیدا دێنا و دەبرد، بەڵام هەر نەیدەوێرا دەستی بۆ بەرێ. "خۆزگە، مردووەکە لوێ بێنمە دەرێ و لە تەلیسێکی بخەم. بەڵام ئاخر تەلیس (گۆنی) زوو دەڕزێ. دەبێ لە جەواڵێکی بوزووی بخەم و سەری توند بدروومەوە... ئەوجار بەردێکی وا کە پێم هەڵگیرێ، لە جەواڵەکە ببەستم و بیخەمە قووڵترین گۆمی جەیحانەوە، بیخەمە بەنداوەکەی "عەلی باتمادی"ییەوە... لەوێدا ئیتر کەس نایدۆزێتەوە. هیچ کەس ناتوانێ لەوێی دەربێنێتەوە. ئەمنیش لە چنگی ئەو بنیادەمە رزگار دەبم.

تاوێك بڕیاری دەدا و چاوی دەبڕییە جەواڵە بوزووەکەی کۆستوئۆغلۆ و نەخشەکەی دەکێشا کە چۆنی لێ بدزێ. لە خەیاڵی خۆیدا دەیدزی و دوایی پاشگەز دەبۆوە. جاری وابوو بیانووی بۆ ئەو پاشگەزبوونەوانەی خۆی دێنایەوە و جاری واش بوو پێویستی بە بیانوو نەبوو. بەخۆی دەگوت:"ناکرێ، کوڕە ناکرێ پیاو مردووەك بخاتە نێو ئاو و قوڕ و لیتەوە." و پاشگەز دەبۆوە.

ئەگەر پێویست بێ مردووەکە ببینێ و دیسان دەریبێنێتەوە... بەڵام چ پێویست دەکا؟ بنیادەم کوا پێویستیی بە مردووە؟ بە هەر حاڵ ئەگەر پێویست بوو، مەمی دیک چۆن دەتوانێ لە بنی ئاوەکەدا دەریبێنێتەوە؟

بەڵام مردووەکە لە کوێی ئەو دەشتەی چوکووراوادا بشارێتەوە؟ خۆ ناکرێ لە بن چنار و بنی ئاوێدا بیشارێتەوە. گۆڕی قووڵیشی بۆ هەڵدەکەنی، دەیبەیتە لێر و زۆنگاوان، لە بیری دەخەی، هەر نابێ و نابێ. ئەو مردووە لە چوکووراوایەکی ئاوا گەورە و بەریندا جێی نابێتەوە. جێی نابێتەوە.

ئێستاش ئەوە داڵ و هەڵۆ. ئاخر کافرینە، ئەنگۆ لە بنی ئەو بیرەیدا چۆن مردوو دەبینن؟

مێشوولە بە وزە وز هرووژمیان بۆ دێنا، ئاگریان لە دەست و پێ و دەموچاوی بەردەدا. وەك شێتان خۆی هەڵدەکراند. وەختێك خۆی هەڵدەکراند، پتر بیر مردووەکە دەکەوتەوە.

گوندی بە بێ ئۆقرەییەوە چاوەڕێی تاوکەوتنێ بوون. کە تاو هەڵدەهات، گەرمایەك دەستی پێدەکرد وەك جەحەندەم. هەموو وڵاتی دەسووتاند. گەرماکەی چوکووراوا پیاو دەکوژێ. راستە بەڵام بە شەوان و لە فێنکایی بەیانیاندا هورووژمی تەپۆ و مێشوولە تاقەت لە بنیادەم دەبڕێ.

مەمی دیك رووی کردە ژنەکەی تاشباش کە لە تەنیشتییەوە لۆکەی دەڕنییەوە و گوتی:

ـ خوشکەکەم، ئەو مێشوولانە هەر دەڵێی ئیسکیان هەیە. چزوویان دەڵێی شمشێرە. ئەگەر دە دانەیان بە دەستتەوە بنووسێن و خوێنت بمژن، بە خودا دڵۆپێك خوێن چییە لە دەمارەکانتدا ناهێڵنەوە. هەڵیدەچۆڕێنن.

پاڵە نەمابوو هەموو گیانی بریندار نەبووبێ. لە سەرانسەری چوکووراوادا، هەرچی کرێکارە ئەوە حاڵی بوو.

ژنەکەی تاشباش ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ بەخوای ناتوانم لە سەر پشت بنووم. هەموو پشتم برینداره. چەندی چەند ساڵە دێمە چوکوور، تا ئێستا نە تەپۆ و مێشوولەی ئاوام دیتووە و نە بیستووشمە.

ورده ورده رووناکی دەکردەوە و یەك جێ تاو هەڵات و هەموو وڵاتی رووناك کردەوە. لاسکە تەڕ و گەڵا خووساوەکانی لۆکە وشك بوونەوە. زەوییەکەش هەڵبرینگایەوە و سوور بۆوە. تۆز و خۆڵ لە گەڵا لۆکە نیشتبوو. بڕێك دوای تاوهەڵاتنەکە، ئەو گەڵایانەش کە خوناوکەیان لەسەر نیشتبوو، وشك بوونەوە و تەپوتۆز هەستا و تویژێکی ناسك سەر گەڵاکانی داپۆشی.

گەرماکە دەمودەست هەڵچوو. کوڵاندی. زەوییەکە وەك ئاگر داییسا. نەدەکرا پێی پێخاوس
ـە سەر عەرزی دابنێی. لە تاوهەڵاتنەوە ئیتر ئەوانەی پێیان وابوو پێویستیان بە پێڵاو نییە،
ـچار بوون پێڵاوە کۆن و دڕاوەکانیان لەپێ بکەنەوە.
سێ ئەسپ لە دەم جەیحان بەسترابوونەوە. دووی بەڵەك و یەکی ڕەش. کرێکار هەموو
خوێیان لێ دانەوە. "خەلیل داهێزراو" لە لای ئەسپەکانەوە دەهاتەوە. گوتی:
ئەسپ شەلاڵی خوێنن. ئای لەو تەپۆیانەی ئێرە. سەیری دەستم بکەن. ویستم دەستێك بە
پشتی ئەو ئەسپانەدا بێنم ئاوام لێ هات. دەستی پێشان دان. شەلاڵی خوێن.
هەڵۆی سەر بیرەکە زۆر بوون و زۆرتریش بوون.
مەمی دیك لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئاخ، ئاخرییەکەی دەیدۆزنەوە."
تاوەکە دەیبرژاند. دەتگوت کوورەت نێڵ داوە. تەمێکی خۆڵەمێشی بە سەر چوکووراوە
ـی کردبوو*. چوکووراوا لە تیشکێکی هەڵماویدا قورس و بریقەدار بوو. ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا،
نە تەمەکەدا دەدرەوشایەوە. هەڵمی لێ هەڵدەستا. سەد هەنگاو پێش خۆتت نەدەدی. تا چاو
بڕی دەکرد لە درەوشانەوەیەکی تەماویدا ڕۆچوبوو و لە چاوی دەدا. ڕووباری جەیحان لە زیوی
تواوە و مەند و داغ و بە لرفە و پڕشنگدار و هەڵماوی دەچوو.
پاڵە، کە لە بەر تاوەکە ئارەقەیان دەڕشت و دڵۆپەی ئارەقە جێ چزووی تەپۆی شەوی
ڕابردوویانی دەکزاندەوە، بێجووڵە و شەکەت لە جێی خۆیان مابوونەوە. مام خەلیل کوور ببۆوە
و دەستەکانی خێرا خێرا دەهاتن و دەچوونز دەستەکانی "عەلی"یە درێژیش نەدەبینران. دەستی
مەمی دیکیش هەروەتر. دەستەکانی ئەو لۆکەیان دەڕنییەوە و چاوەکانیشی نیگەرانی هەڵۆکان
بوون... لە بەر ئەو گەرما هەڵماوی و پڕشنگدار و سووتێنەرەدا، هەڵۆکان وەك پەڵەی ڕەش
ڕەش لە ئاسمانە خۆڵەمیشین و تەماوییەکەدا هاتۆچۆیان بوو. دوور دەکەوتنەوە و دەهاتنەوە
پێشێ بەڵام هەر دەهاتن و پتر دەبوون. پەڵە ڕەشەکان لە بەر تیریژی خۆرەکە لەسەرخۆ
دەسووڕانەوە و مەمی دیك هەر جارێکی چاوی پێیان دەکەوت، دڵی دادەخورپا. پەڵە ڕەشەکان
نوقمی ڕووناکاییە تەماوییەکە... پەڵە ڕەشە بریقەدارە پەرش و بڵاوەکان کە بە ئاسمانەوە
دەسووڕانەوە... سێبەریان وەك سەدان پەڵە دەکەوتە سەر زەوییە سوورەوە بووەکە... دەهات و
دەهات و خاڵ خاڵ دەبوو. بە سەر داوەڵە بەجێماوەکاندا خاڵ خاڵ دەبوون.

---

*باکردن: ئەگەر شتێك بە تایبەتی تەرم و کەلاك لە ناخەوە دەماسێ، دەڵێن بای کردووە. دیارە بۆ ورگیش
بەکاری دێنن. دەڵێن ورگم بای کردووە.

"کێ لەو گەرمایەدا دەچێ ئەو بیرە بدۆزێتەوە؟ وای دانێین دۆزیشییەوە، چۆن بیری بۆ ئەوە دەچێ کە تەرمێکی تێدایە؟"

ئەو خەیاڵە ئاوپڕژێنی دڵی دەکات و هێوری دەکاتەوە. تاوێـك تـەرمی نێـو بیرەکـەی لـەبیر دەچێتەوە و مل دەنێتەوە کار کردن. بەڵام برێك دواتر، بیرێکـی ئـاڵۆزی دیکـە دەریدەپـەڕێنێ. مووی لێ دەبێتـە نەشـتەر، بـەڵام هیـچی لـە دەسـت نایـە جگـە لـەوەی چـاوی ببڕێتـەوە ئـەو هەڵۆیانەی لە دوور دوورەوە بەسەر لێڕەوارەکەدا دەسووڕێنەوە.

دڵی دەگوشرێ. دەچێتە لای دورمووش، ماوەیەك شـەلاڵی ئارەقـە، بـەبێ ئـەوەی قـسەیەك بکا، لە تەنیشت دورموشەوە لۆکـە دەڕنێتـەوە. دورمـووش گـەنجێکی نـەرم و نیـانی دەموچـاو درێژووکە و پێست روونە، کە پێستی تاو بردوویەتی و چاوەکانی کە شـوێنی برینێـك لـە نێـوان برۆکانییەوەیە، بەردەوام دەڵێی بیر دەکاتەوە. جار بە جار بە روخساری ئارەقەکردوو و چاوی پـڕ لە پرسیارەوە ئاوڕ دەداتەوە و سەیرێکی مەمی دیك دەکات.

دەڵێ:

- گوێ بدەیە، گـوێ بدەیـە دورمـووش. هـەر بـە راسـتی ئـەو تەرمـەت لـە بـیرە لـە بـنی بیرەکەدایە؟... لە بیرمان چۆوە. ئەدی، لە بیرمان چۆوە. هیچ کەس پێی نادۆزرێتەوە. تەرمەکە هەر لەوێدایـە. ئەگـەر سـەدان و هـەزاران داڵ و هـەڵۆ و سیـسارکەش بـێن و لـە سـەر بیرەکـە بخولێنەوە، ئەو سێ سوارەی شەو و رۆژ بە سواری، لە تەرمەکە دەگەڕێن، ئەقڵیان نایبڕێ لە نێو بیرەکە دایە...

سەیری ئەو لایە ناکات کە هەڵۆکان بە ئاسمانەوە دەسووڕێنەوە نەکا دورمووش بزانێ.

دورمووش بە سەرسووڕماوییەوە گوتی:

- نازانم. بەشکم ئەقڵیشیان بیبڕێ، بەشـکم نەشـیبڕێ. هـەڵۆ لـە سـەر کـەلاکی حـەیوانیش دەسووڕێنەوە..

ئەوجار سەری هەڵێنا و گوتی:

- لەوێ، لەو دوورانە... سەیر کە... هۆ لەوێ، هەڵۆکان ئەوە دەخولێنـەوە. چـما نەتـدیوە؟ بڕوانە، بڕوانە. هەر لەوێ گیانەکەم... سەدان و بگرە هەزاران هەڵۆ.

مەمی دیگ دەستی کردە سێبەری چاوی و سـەیری لای بیرەکـەی کـرد. هـەڵۆکان دوو سـێ هێندە ببوون. بەخۆی گوت:" دەیدۆزنەوە... ئاخرییەکەی لـە بـنی بیرەکـەدا دەیدۆزنـەوە...."

ئەوجار گوتی:

ـ نابینم، کوان هەڵۆ لە کوێن، هیچ نابینم.

دورمووش گوتی:

ـ تاوەکە لە چاو دەدا. بۆیە نایانبینی. ئەمڕۆ گەرمتر دەبێ. ئاگرباران دەبێ. ئەمڕۆ ناتوانین هەناسەش بکێشین.

لە ئاسمانەوە ئاگر دەباری. بەڵام تەپۆ نەبوو. تەپۆ نەمابوون. هەرچی هەبوو خۆی لە کەلێن و قوژبنان کوتابوو.

"لەو گەرمایەدا کێ دەتوانێ لە تەرم بگەڕێ؟ بچێتە نێو بیر؟..." بە گومانەوە سەیری روخساری مەمی دیکی کرد:" نەکا ئەو هەتیوە لە کەللەی دابێ." هەر دێ و باسی مردوو و تەرم و بیر دەکا."

سێ سوارەکە بە لینگدان هاتن. ل دەم چۆمەکەی جەیحانەوە تەپوتۆزێکیان لە دوای خۆیان بەجێ هێشت و بەرەو کونە رێوی (تیلکی بۆجاغی) رۆیشتن. مەمی دیک دڵی داخورپا. وەختێك دیتی شتێکی وەك تەرم یان بنیادەم بە تەرکی ئەسپەکەیانەوە نییە، حەسایەوە:

"ئەو هەڵۆیانە لەوێ، سێ رۆژان، حەوتووەك، دە رۆژان دەسوورێنەوە، دوایی یەکێك دێ و ئەوێ دەگەڕێ، بەڵام کەلاکێك نادۆزێتەوە... کە نەیدۆزییەوە، سەیری نێو بیرەکە دەکا و ئەودەم لە ئاوێنەی بنی بیرەکەدا چاوەکانی مردووەکە دەبینێ، وەك شوشە. کە دیتی، جا مردووەکە دێنێتە دەرێ. کێ شەوانە لەو دەوروبەرانە دەسوورێتەوە؟ یەکێکیان سەفەر و ئەویتر مەمی دیك. کێ کوشتوویەتی؟ مەمی دیك کوشتوویەتی."

سەیری هەتاوەکەی کرد. هێشتا زۆری مابوو بۆ نیوەڕۆ. دەبوو شەو دابێ کە بتوانێ تەرمەکە لە بیرەکە دەربێنێتەوە. هەیهوو زۆری ماوە بۆ شەو. بەڵام ئاخۆ تا ئەو کات یەکێك نایە تەرمەکە بدۆزێتەوە؟

نیوەڕۆ داهات. تاوەکە شێ و تەڕایی بە عەرزییەوە نەهێشت. زەوییەکە قەڵشت قەڵشت بوو و لە ئاسمانەوە ئاگر باری، لە سەر "یۆمورتالیك"ـەوە کۆڵەکەیەکی باریکی تەپوتۆز هەستا. چەند کیلۆمەترێك رۆیشت و نیشتەوە. کامیۆنەکان، ترۆمبێلەکان، عارەبانە و تەراکتۆر کە عارەبانەیان لێ بەسترابوون، بە تەپوتۆز بە جادەکەی ئاناوەرزادا تێدەپەڕین. تۆز و خۆڵ وەك هەور بەری ئاسمانی دەگرت. جا چونکە سوزە و کزەی بایەکیش نەدەهات، هەروا بۆ ماوەیەك دەمایەوە.

لە مەزرا بێسنوورەکانی لۆکەدا، تەنەکە لە بەر تاوەکە دەبریسکانەوە و لە چاویان دەدا... لە گەرماکەدا، کرێکارەکان لۆکەیان لە قۆزاخەی دەردێنا و جەواڵەکان بەتاڵ دەبوون. کاتی

عەسرێ وەختێك شیبا هەڵیدەکرد، دیسان دەستیان دەکردەوە بە لۆکە رنینەوە. ئەوجارە ئیتر قۆزاخەیان نەدەرنی و لە جەواڵی باخنن، بەڵکو هەر لەوێ بە سەر لاسکەکانیانەوە لۆکەکەیان لە قۆزاخەی دەردێنا. لۆکە کۆ دەبۆوە وقاپۆری قۆزاخە هەر لەوێ بە سەر لاسکەوە دەمانەوە. هەتا بەرەبەری شەوێ هەر وا لۆکەیان لە قۆزاخەی دەردەکێشا.

مەمی دیك:

- ئەمرۆ نیوەڕۆیە باڵندە لە بەر تاوێ دەبرژێن و تلّپ بەر دەبنەوە. وەرە با بچین مەلەیەکی بکەین.

دورمووش گوتی:

- با بچین.

دەنگە گڕەکەی گۆملیکسیز ئۆغلۆ بەرز بۆوە:

- یاڵڵا کرێکار دەی، لۆکە وشك بۆوە. ئیتر دوای ئەوە رنینەوەی حەرامە. بۆ چونکە لەگەڵ خۆڵ و خاك لێکی ناکەیتەوە. حەیفە. یائەڵڵا دەی تەواوی بکەنز

هەر کەسە و جەواڵ و قەرتاڵە و تەنەکەی خۆی هەڵگرت و بەرەو کەپرەکان وەڕێ کەوت. زەڵەجە لە پێش هەموانەوە دەڕۆیشت و ئۆککەش داغ قۆردوو بە قژی سپیی وەك لۆکەوە بە دوایدا.

کرێکار دوای پشوویەکی کورت، جەواڵیان کردەوە و دەستیان کرد بە دەرکێشانی لۆکە لە قۆزاخە. لەو مەزرایە رازی بوون. لاسکە لۆکە دەگەیشتە نێوکی پیاو. قۆزاخە یەکی چنگێك بوون و لاسك هەموو نوقمی قۆزاخە بوون. هەموو دڵیان خۆش بوو. لەو مەزرایەدا ئەوی لە هەموان تەمبەڵتر و دەستەوستانتر بوو، رۆژێ چل کیلۆی خڕ دەکردەوە.

ئاشقە کەچەڵە تەمموورەی هەڵگرت و تێی چریکاند. گۆرانییە گەرمەکەی شەپۆل شەپۆل رۆیشت و وەك بەردێکی بنیشێتە بنی گۆمەوە، لە کێڵگەی لۆکەدا نیشتەوە. لەو گەرما پڕشنگدارەدا گۆرانی شتێکی سەیر بوو. دەتگوت لە دوورەوە دێ. ئاشقە کەچەڵە بێدەنگ بوو. سازەکەی دانا و گوتی:

"بە سەری قاراجا ئۆغلانی باپیرەم"

لە جەحەندەمەکەی چوکووراوەوە، لە گەرما پشووبڕەکەی ئەوێوە، لە مێشوولە خوێنمژەکانییەوە، هەزاران سڵاو...

لە کانیاوە ساردەکان، لە کوێستانە پڕ لە سنەوبەرەکان، سڵاو...

دەستی کردەوە لە دەرکێشانی لۆکە. ژنەکەی و ژن خوشکەکەی و شەش کوڕەکەشی لۆکەیان لەگەڵ دەرنییەوە. هەر شەش کوڕەکەشی سازیان لێ دەدا و گۆرانییان دەچڕی. بۆکرووزێکی تاڵ لە لۆکەکە هەڵدەستا و تێکەلی بۆنی خاك و زەوییە قەلشیوەکە دەبوو کە دەتگوت خۆڵەمێشە. برێك دواتر ئاگردانەکان نێڵ دران و ساوارەکە وەسەر نرا. مەنجەڵەکان لە بەر تاوەکە قوڵت قوڵت کوڵان.

"عەلی"یە درێژ سەیری هیچ کوێی نەدەکرد. گێژ و خەیالاوی، نوقمی جووڵەی دەستەکانی بوو کە خێرا خێرا کاریان دەکرد. دوو جەواڵی زۆر گەورەی ئاخنیبوو و لێوانلێوی کردبوون. لە بەر دەستی بوون. عەلی تا ئێواری چۆن ئەو هەمووە لۆکەیە لە قۆزاخە دەردەکێشێ؟ هەمووان پێیان سەیر بوو.

عەلی هەموو رۆژێ ئەوەندەی لۆکە دەرنییەوە و هەموو رۆژێ هەمووان دەیانگوت، باشە ئەوە چۆن ئەو هەمووە قۆزاخەیە پاك دەکات، کوڕە وەڵلا ناکرێ. کەچی هەموو رۆژێش پێش هەمووان لێ دەبۆوە و جا ئەوجار دەچوو یارمەتیی مام خەلیلی دەدا.

مەمی دیك زراوی چوبوو. بە پەلە پەل قۆزاخەکانی تەواو کرد و بەبێ ئەوەی شلەساوارەکەی بخوات، چووە لای دورمووش گوتی:

ـ یاڵلا دورمووش، دەی براکەم دەی. با برۆین و خۆمان بەو ئاوە فێنکە دابدەین.

دوو گەنجی دیکەشیان رەگەڵ کەوتن. مەمی دیك نەیتوانی بڵێ نەنگۆ مەیەن.

مەمی دیك نەیدەتوانی چاو لە هەڵۆکان بتروکێنێ. کە جارێکی دیکەش سوارەکانی دی وا بە لینگدان دەڕۆن، بەندی دڵی پسا و گوتی:

ـ وەی باوکە رۆۆ ... باوکە رۆۆ... دەیدۆزنەوە. ئاخرییەکەی بیرەکە دەدۆزنەوە.... ئەو هەڵۆ بەنەفرەت بووانە، هەر بۆنی کەلاکیان بۆ دەچێ، ئیتر دەست هەڵناگرن...

لە پێش هەمووانەوە غاری دەدا. ئەوانی دی نەیدەگەیشتنێ. گەیشتە دەم ئاوەکە. دەسبەجێ خۆی رووت کردەوە و خۆی بە ئاوەکە دادا و خێرا بە مەلە پەڕییەوە ئەو بەر. هانکە هانکی بوو. برێك راوەستا و دیسان دەستی کردەوە بە مەلەکردن. کیسەڵە خۆڵاوییەکان لە دەم ئاوەکە خۆیان لە بەر تاوەکە هەڵخستبوو و بە شلپ و هۆڕی ئەو خۆیان لە ئاوەکە هاویشتەوە. مەمی دیك لەو بەری چەمەکە، لە سەر لمەکە درێژ بوو و چاوی لە ئاسمانێ بڕی. ئاسمان خۆڵەمێشین بوو و لەو گەرما بەتین و هەڵماوییەدا، هەڵۆیەك بەتەنێ، باڵە گەورەکانی لێك دەدا و بەرە بیرەکە لوور دەبۆوە. مەمی دیك گوتی:

ـ برۆ، ماتڵ بووی، بچۆ سەر بیرەکە و تەرمەکە بدۆزەوە... برۆ با بیرەکە بدۆزنەوە... بیدۆزنەوە و بمکوژن.
گوێی لە دەنگێکی کز بوو کە دەتگوت لە بن ئاوەکەوە و لە بن عەرزییەوە دێ و بە ناڵینەوە دەیگوت:
ـ وەی سووتام، برادەرینە، کوڕە سووتام.
هەواگۆڕ، دەلەرزی و هاواریشی دەکرد:"سووتام، خۆم بخەمە نێو ئاوەکەوە؟"
مەمی دیك وەڵامی دایەوە:
ـ خۆی تێخە.
هەواگۆڕ بەبێ ئەوەی جلەکانی داکەنێ، خۆی بە ئاوەکەدا دا. تاوێك بەبێ جووڵە لەوێدا مایەوە. ئەوجار هاتە دەرێ. لە دەم ئاوەکە لە سەر گژ و گیایەکە درێژ بوو. برێك دواتر دەستی کردەوە بە ناڵین:
ــ سەرمامە. خەریکە رەق دەبمەوە. خەریکە دەمرم براینە. نەجاتم بدەن. لە دایك و خوشکتان بەم، برادەرینە...
پێستی دەموچاوی وێك هابتوو و زمانی قەڵشت قەڵشت ببوو و دڵۆپی درشتی ئارەقەی بە نێوچاوانییەوە بوون. وەك مێژۆکە دەلەرزی. هەواگۆڕ گرمۆڵە دەبوو، وێك دەهات و خۆی لە بەر یەك دەکێشایەوە و دەلەرزی. دەیگوت:
ــ برادەرینە نەجاتم بدەن. کوڕە هەی دایك و باب و خوشك و برا و قیبلە و .....برادەرینە...
مەمی دیك لە ئاوەکە هاتە دەرێ. ترس و نیگەرانی وەك خۆرکە لە ناخەوە دەیخوارد:
"باشە یانی چی، پیاوەکانی ئەو کابرایە ئەو هەمووە هەڵۆیە بەو ئاسمانەوە دەبینن و ناچنە سەر بیرەکە."
لەو کاتەدا زولەیخای لێ پەیدا بوو. بەرەورووی دەهات. مەمی دیك وەجموجۆڵ کەوت و سەری داخست. هەر لەو کاتەدا کە سەری دادەخست، بزە شیرنەکەی زولەیخای دی. بەخۆی گوت:"ئەو کچەتیوە منی خۆش دەوێ. خۆشی دەوێم بەڵام..."
سەفەری هاتە پێش چاوی. گیانی، هەموو جێ برینەکانی وەژان کەوتن و برژانەوە.
تیژ بە تەنیشت زولەیخا دا تێپەڕی. بەندی دڵی دەلەرزی. رێك لەو کاتەدا ژنەتیوەکەی بەکرە شێتی هاتە پێش چاوی. ژنەتیوە یەك پارچە ئاگر بوو. ژن نەبوو بڵێسەی گڕ بوو. ئەو ژنە تورت و

ناسکە ئەوی خۆش دەویست. دەگمەن بوون ئەو پیاوانەی دووجار بچنە لای... دوو جار بۆ کەسی شل نەدەکرد. هەموو ئەو پیاوانەی سواری دەبوون، ئیتر بۆی شێت دەبوون و سوێیان دەهاتەوە، بەڵام ئەو ژنە دووی بە هیچ کەس نەدەدا. سێی هەر نەدەدا نەدەدا.

مەمی دیك سینگی دەرپەڕاند و گوتی:"ئەمنی خۆش دەوێ، "سێ"ـم دەداتێ. پەنجاشم دەداتێ."

لاقەکانی، بەرەو کەپرەکەی بەکرە شێت راکێشیان کرد... ژنەکە لە نێو کەپرەکەدا خەریکی لۆکە دەرکێشان بوو. مێردەکەشی لە خوار لاقییەوە نووستبوو. مەمی دیك داهاتەوە و چووە نێو خێوەتەکە و لە تەنیشت ژنەوە دانیشت. ئەژنۆی وەئەژنۆی ژنە کەوت. ژنە ناڵاندی:

ـ وەیش ش... ئەژنۆت لابەرە... لاییبەرە. شێتم مەکە."

دەمودەست هەموو گیانی ژنە گڕی گرت. دەستی دەسووتاند.

ـ هەستە بڕۆ مەمی دیك... زوو بڕۆ... ئەمشەو بن دارەکە.

مەمی دیك، هەڵۆکان و تەرمەکە و سەفەر و لۆکە و هەواگۆڕ و هەر هەموو شتێکی لە بیر چۆوە. کە لەوێ دوور دەکەوتەوە، گۆرانییەکی لە بن لێوانەوە دەگوتەوە، قەت نەیگوتبوو....

**پازدە ژەندەرمە و ئەفسەرێك، شەش پۆلیس و سێ پیاو کە بە رووتی بە سەر ئەسپەکانیانەوە بوون و کڵاوی لێوار پانیان لەسەر بوو و بەرەو مەزراکە دەهاتن و گوندییەکانیان هەڵدەپێچا. گوندی زەندەقیان چوو.**

## ١٣

بەرەبەری ئێوارە بوو. لە بەری رۆژئاواوە بایەکی توند هەڵیکردبوو و وەك داوی جاڵجاڵۆکە چوکووراوای تەنیبۆوە و تەپوتۆزی لە رێگە و بانان هەستاندبوو. جار و بارە لە رێگەکانەوە گێژەڵوکە و باهۆزی هەڵدەستاند و دەیسووڕاند و بەرەو رۆژهەڵات و چیاکانی تۆرووسی دەبرد و دواتر دادەمرکایەوە.

کرێکارەکان لە بەر ئەو با فێنکەی رۆژاوادا، لۆکەیان لە قۆزاخە دەردەکێشا و دەتگوت تازە لە خەو هەستاون، دەبووژانەوە و خۆیان لەبەر یەك دەکێشایەوە. ئاسمانی سەر بیرەکە لەبەر هەڵۆ دیار نەبوو لە لای رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە لەشکرێك هەڵۆ بەرەو بیرەکە دەهاتن.

جار و بارە سێبەری ئەو هەورانەی وا لە باشوور و لە دەریای سپییەوە دەهاتن، بە سەر مەزراکەدا تێدەپەڕین. سێبەرە فێنکەکان تاوێك سەر مەزراکەیان دادەپۆشی و ئەوجار بەرەو تۆرووس دەڕۆیشتن. لە دوورترەوە، لەگ لەگەکان بە قاچە درێژ و دەندووکە سوورەکانیانەوە لە مەزراکاندای دەهاتن و دەچوون و دەگەڕان.

کرێکارەکان پشت لە باشوور، ریزێکی رێك و شان بە شانی یەکتری، ریزیان بەستووە و هیچ قسە ناکەن. هەر کەسە سەری لەبەر خۆدایە و هەر دەستەکانیان کار دەکات. هەر مەمی دیکە بیر و مێشکی لە شوێنێکی دیکەیە. دەستەکانی لۆکە دەرێننەوە و هۆشی بە لای بیرەکە و ئەو هەڵۆیانەوەیە وا لە سەری دەسوورێنەوە. هەڵۆ لە بری ئەوەی کەمتر ببنەوە، هەر دێ و پتر دەبن.

لە نەکاو لە ڕێگەی شاری جەیحانەوە تەپوتۆزێکی وا هەستا، دەتگوت ئەوە لەشکرێکە و بەرەو ئەویٚ دیٚ. بڕێك دواتر لە نێو تەپوتۆزەکەدا دوو کامیۆن، یەکێکیان سوور و ئەویتر شین، وەدەر کەوتن. کامیۆنەکان پڕ بوون لە ژەندەرمە و پۆلیس. ژەندەرمە و پۆلیسەکان بەشە کانزاییەکانی جلەکانیان دەدرەوشایەوە. کامیۆنەکان لە دەم مەزرای لۆکەکە ڕاوەستان. ژەندەرمە و پۆلیسەکان، لە تەپوتۆزدا ون ببوون. ژەندەرمەکان و ئەوانی دیکەش دوای ئەوەی دابەزین ماوەیەك هەر شەمکەکانیان تەکاند. وەك فەردە ئارد تۆزیان لیٚ هەڵدەستا.

ژەندەرمەکان و مولازم و مفوەز، مەدەنی و پۆلیسەکان هاتنە نێو لۆکەجاڕەکەوە.

مولازمەکە بە گوندییەکانی گوت:

ـ دەست لە کاریٚ هەڵگرن و وەرنە ئێرە.

گوندی زەندەقیان چوو و چوون لەبەر یەکەوە. بوو بە سرتوخورت:

ـ ئەها، دایك کوشتن، ئەو مریٚمۆکە لێقەوماوە بەستەزمانە بیٚ تاوانە؟

ـ هاتوون "عەلی"یە درێژ بەرن.

ـ چما شارە بەرەڵلایە، سەری مریٚمۆکێکی زەق و زیندوو ببڕیت و بیخەیتە بەر دەم دەعبا و دڕندانەوە و ئەوجار بێی و لە چوکووراوا لۆکە خڕ بکەیتەوە؟ چما حوکمەت نازانیٚ؟

ـ پیٚی وایە لە چوکووراوا بکوژی دایکی نادۆزنەوە؟

هەمووان ئاوڕیان لە عەلی دابۆوە. هەرچی ئەو دەیکرد، ئەوان بە جۆرێکیان لێك دەدایەوە. دەیانویست بزانن لە بەردەم ژەندەرمەکاندا چ دەکا؟ هەر هەمووان لە دەوری یەکتری کۆ ببوونەوە و عەلی گوێی لە فەرمانی مولازمەکە نەببوو. ئەو بیٚ ڕاوەستان لۆکەی دەڕنییەوە. لە خەیاڵی خۆیدا نوقم ببوو و ئاگای لە دەوروپشتی خۆی نەمابوو.

مولازمەکە بە دەنگە گڕ و بەرزەکەی کە ڕاهاتبوو بنەڕێنیٚ، نەڕاندی:

ـ هۆی، لەگەڵ تۆمە. پاڵە، هۆۆی لینگ درێژ... وەرە ئێرە بزانم...

عەلی دیسان گوێی لیٚ نەبوو.

ـ چما شتی وا دەبیٚ...

ـ خۆی گێل کردووە...

ـ عەلی زیرەکە...

ـ کوڕە خوێنی مریٚمۆك ون نابیٚ... بەندەیەکی باشی خودای بوو مریٚمۆك...

ـ مرۆڤ چۆن دەتوانیٚ سەری دایکی خۆی ببڕیٚ؟...

ـ سەیری کەن، سەیری بکەن... هەر وەڕووی خۆیشی ناهێنێ. وەك نە بای دیتبێ و نە بۆران...

مولازمەکە لە عەلی چووە پێشێ و بە نووکی پۆستاڵەکەی لە کەلەکەی کوتا. عەلی راچڵەکی. هەر مولازمەکەی دیت، قیت بۆوە و دەستەونەزەر راوەستا.

بە دەنگی بەرز گوتی:"ئەمر بفەرموو مولازم؟"

نیگەرانی و ترس بە روخسارییەوە دیار بوو. رەنگی بە رووەوە نەمابوو و لێوەکانی دەلەرزین.

مولازم ئەو ترسان و دەست تێکەڵهاتن و دەستەونەزەر راوەستانی عەلیی پێ خۆش بوو:

ـ بچۆ لای ئەوانە.

عەلی دەستی بە لا کەلەکەیەوە نووساندبوون و بە هەنگاونانی سەربازییانە بەرەو ئەوانیتر چوو و لەوێ دەستەونەزەر راوەستا.

لەو نێوەدا، سێ کەسیش کە سواری ئەسپی بێ جل و زین بوون و کڵاوی حەسیریی لێوار پانیان لە سەر بوو، لە ئەسپەکانیان دابەزین و یەکێکیان هات و لە تەنیشت مولازمەوە راوەستا و کڵاوەکەی هەڵگرت و سەری دانواند. پێستە سوورەکەی تەپڵی سەرە رووتاوەکە لە بەر تاوەکە بریسکەی هات و تۆزێك دەلەرزی. گوتی:

ــ ئەوانەن جەنابی مولازم. ئەو لێکۆڵینەوانەی لە چەند رۆژی رابردوودا کردوومانن، دەریدەخەن کە... هەموو شتێك لێرە قەوماوە. دەبێ یەك بە یەکی ئەوانە و تەنانەت منداڵەکانیشان لێپێچینەوەیان لێ بکرێ.

مەمی دیك کە سەیری ئەو هەڵۆیانەی دەکرد وا بە شەپۆلی پەیتا پەیتا لە رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە بەرەو سەر بیرەکە دێن، بەخۆی دەگوت:" ئێستا دەیانبینن، خوایە گیان خۆت پەردەیەکیان بەسەر چاویدا بکێشی. ئای خۆزگە کەمتر بووبانەوە... یان لانیکەم ماوەیەك گەڕابانەوە و رۆیبایەن و دوای رۆیشتنی ئەوانە گەڕابانەوە. ئەو کاتە خوای دەکرد سەد ئەوەندە دەبوون."

مولازم چاوی پێدا گێران و نیگاکانی لە سەر "عەلی"یە درێژ وەستانەوە. زۆر کەیفی بە عەلی هابتوو. ئەو بنیادەمە ئەگەر شتێکیش بزانێ، دیارە راستییەکەی دەڵێ. عەلی هێشتا دەستەونەزەر راوەستابوو. دەستەکانی توند بە رانەکانییەوە دەگوشی و ئەژنۆی دەلەرزین.

مولازم گوتی:

ـ ئازاد، وەرە پێشێ.

مفوەزەکە لە پێشەوە و دوو پیاوی ئاسایی سەرباز نەبوون) بە دوایدا چوونە بن دارێکی دەم رووباری جەیحان دەستیان کرد بە لێپێچینەوە لە عەلی. عەلی دەیگوت:

ـ بوختانە. ئەمن نەمکوشتووە. چما دەکرێ بنیادەم...

پۆلیسە جل مەدەنییەکە دەیگوت:

ـ خۆ ئێمە نالێین تۆ کوشتووتە. کێ کوشتوویەتی؟

ـ کەس نەیکوشتووە. هیچ کەس. نانی دوو مانگی... ئەویش نانی ساج برژاو، وەك هەنار، و کەلەشێرێکی قەلەویش. لە شیوەکەدا گێلاسیشی لێیە، سێوی لێیە هەرمێی لێیە. هەتا ئێمە دەگەڕێینەوە... ئەگەر ئەوم هێنابایەتە ئێرە، لە ڕێگایە دەمرد. وەڵڵا بیللا، لە نیوەی ڕێیە دەمرد. چما ئەمن دڵم بەرایی دەدا بیکوژم. چما شێت بووم؟ ئێستاش بڕۆن، بچنە ئەوێ، بزانن زەق و زیندووە یان نا....

ـ لە کوێ بیدۆزینەوە؟

ـ لە گوندەکەی خۆمان... ماڵەکەی خۆمان. ڕاستە بە تەنێ بە جێ ماوە، بەڵام خۆ ئەو قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد.

ـ گوندەکەتان لە کوێیە؟

عەلی چیاکانی تۆرووسی کە لە پشت پەردەیەکی تەمەوە بەحاڵ و مەیلەوشین دیار بوون، نیشانیان دا:

ـ ئەوێ، گوندەکەی ئێمە لە پشت ئەو کێوانەوەیە. ماڵەکەی ئێمەش لەوێیە.

"کوڕە ئەو بنیادەمانە قسەی زۆر سەیر دەکەن. خۆ قسەیان لە زمانی دەرناکێشرێ. ئەو گوندییانە لە هەرچی بوونەوەری سەر زەوییە سەیرترن. نهێنی پارێز و کەڕن وەك بەرد."

پۆلیسە جل مەدەنییەکە نەڕاندی:

ـ شەوکەت بەگ، ئەمن چ کارم بە دایکی تۆیە. کەیفی خۆتە چیت لێ کردووە و چۆن هاتووی، بە من چی؟ کوا شەوکەت بەگ؟

عەلی ملی بەلارەوە نا و گوتی:

ـ هەر نەمدیوە و نایناسم. نازانم. ئەمن درەنگ گەیشتمە چوکوور. شەوکەت بەگ ناناسم و قەتم نەدیوە.

عەلییان بەر دا. عەلی شێوا بوو. زۆر دەترسا. کە گەیشتەوە لای خەڵکەکە، ترسەکەی تۆزێك ڕەوییەوە.

گۆملیکسیز ئۆغلو لەگەڵ مولازمەکە قسەی دەکرد:

ـ ئەمن پێم وایە کوشتوویەتی. جگە لەوە سەریشی بڕیوەز درۆ دەکا، وەك سەگ. هەزار جار درۆ دەکا. دەڵێ ئەمن دایکمم لە گوندی بەجێ هێشتووە و هاتووم. گۆزەیەکیشم هەنگوین و گۆزەیەك ڕۆن و سی و هەشت مریشك و کەڵەباب و شازدە بزن و نانی ساجی بەشی دوومانگم بۆ داناوە و هاتووم. بڕوای پێ مەکە. کوڕە دەغیلە نەکەی بڕوای پێ بکەی. ئەو دایکی خۆی کوشتووە. مریەمۆك نەمردبایە، دەمێك بوو وەڕێ دەکەوت و دەهاتە چووکوور. مریەمۆك مردووە. مریەمۆکی داماو. مریەمۆك بێ وێنە بوو. مریەمۆك وەك فریشتە وا بوو. وەك پەلکی گوڵ. ئەگەر مریەمۆکت ناسیبایە، دەستیت ماچ دەکرد، خۆتت پێ نەدەگیرا و ماچت دەکرد. کوشتی و بڕایەوە. ئەو زمانە شیرنەی مریەمۆك چووە بن گڵ و ڕزی. لەو کاتەوەی هاتووینە چوکووراوا و زانیومانە مریەمۆکیان کوشتووە، دەستمان بۆ هیچ ناچێ. گوندێکی گەورە، نوقمی ماتەم و خەفەت. هەر هەموومان، لە حەوت ساڵانەوە هەتا حەفتا ساڵان، فرمێسك بە چاوانمانەوە گیر نابێ. مریەمۆکی کوشت و فڕێی دایە بەر دەمی قەل و داڵ و دەعبای کێوی. ئەتۆ سەیری ئەو لارەملییەی عەلی مەکە. ئەو دوو ڕووە. لێرە لە بەردەمتا دەستەونەزەر ڕادەوەستێ و خۆڵی بەری پێت ماچ دەکا، هەر ئەوەندەی پشتت تێ کرد، وات گاڵتە پێ دەکا سەرت سوور بمێنێ. ئاخ مریەمۆك، ئاخ بۆتۆ...

" ئەگەر دەتەوێ من بناسی، ئەمن منداڵی سوپام جەنابی مولازم. دەزانی بۆچی پێمان دەڵێن گۆملیکسیز ئۆغلو؟ باپیرەم:"دەرەبەگی مەزن" فەرماندەی سوپاییەکان، کراسەکەی لەبەر خۆی دادەکەن و دەیدایە هەژاران و لێقەوماوان و بە نیوەڕووتی دەگەڕایەوە ماڵێ. ئەوە کاری هەمیشەی بوو. هەر ئەوەندەی چاوی بە لێقەوماوێکی ڕەش و ڕووت دەکەوت، کراسەکەی خۆی دادەکەن و لەبەری ئەوی دەکرد.؟ ئەوە بۆیە جەنابی مولازم، لە بەر ئەوەی باپیرە گەورەی من قەت کراسێکی لەبەردا نەبوو، ناویان نا گۆملیکسیز و بە ئەوە و نەتیژەشی دەڵێن " گۆملیکسیز ئۆغلو". ئێستاش ئەمن بە تاقی تەنێ قورسایی ئەو بنەماڵەیە کەوتووە سەر شانی من. خەمت نەبێ، باشاری دەکەم. براڵە، جەنابی مولازم...

ـ زۆر باشە، هەمووی ئەوان بەجێی خۆی، ئەی شەوکەت بەگ؟...

ـ دەست و دڵاواییەکی باپیرەم هێندەی دەریاکان بوو. تۆزێك ڕاوەستە، با باسی باپیرەم تەواو بێ. تۆرەمەی ئێمە لە سایەی دەست و دڵاواییەکەی باپیرەمەوە نازناوی گۆملیکسیزیان پێ بڕاوە. باب و باپیرانم گومبەزیان لە سەلکە بنیادەم ساز کردووە و ڕازاندوویانەتەوە. ئەگەر

پێت خۆشە، "عەلی"یە درێژ لە دار مەدە جەنابی مولازم. لە سێدارەدان شتێکی باش نییە، بەڵام... خۆ.. دەکرێ لە زیندانی بکەی... ئاخر دایك هەر بەڵای گیانی ئەولادەکانیانن... ئیتر هەمووان رێ و شوێنی وی رەچاو دەکەن. دەبێتە داب و هەر کەسە و دایکی خۆی دەکوژێ. تەنانەت ئەتۆش دایکت دەکوژی. ئەمنیش بەداخ دەبم لەوەیکە دایکی خۆمم نەکوشتووە...

ـ باشە، باشە، بیبڕەوە، ئەی شەوکەت بەگ؟...

ـ ئەها شەوکەت بەگ؟ بەخوای، شەوکەت بەگ پێی بەو مەزرایەدا نەهاتووە. هەر کەس بێتە ئەو مەزرایە لە پێشدا سەرێك لە کەپرەکەی ئێمە هەڵدێنێ. لەوە زیاتر نییە. تەنانەت لەو چوکووراوایەش، لەو دۆزەخی تەپۆ و خۆڵە سوورەوەبووەدا کەس نییە بە سەر ماڵی مندا باز بدات و بچێتە ماڵێکی دیکە. مەحاڵە. یانی ئەوەی کە شەوکەت بەگ پێی لەو مەزرایە نەناوە. شەوکەت بەگ دەڵێی؟ ئێمە نە دیومانە و نە بیستوومانە و نە خەبەریشمان لێی هەیە. هەروەها لێرەش نییە. ئێمەش هیچ بە سەر و سۆراغی نازانین. بەڵام "عەلی"یە درێژ لێرەیە. لەوە زیاتر پێوەندیی بە منەوە نییە.

مەمی دیك چاو لە هەڵۆکان هەڵناگرێ. هەڵۆیەك کە باڵەکانی لە باڵی هەمووان گەورەترە، لێیان جوێ بۆوە و بە تەنێ بەرەو رۆژهەڵاتێ، بەرەو چیای گاوران لە شەقەی باڵی دا و رۆیشت. دەگوت دەیەوێ را بکات. مەمی دیك بە سێرەی چاوی لە ژەندەرمەکان دەڕوانێ. ژەندەرمە وردیلەکە، لە کوڕێکی زیت و وریا دەچێ. گەنجێکی لە بەر دڵانە، دەم بە پێکەنین و قوت. پیاو لە ناخۆشترین ساتەکانی ژیانی و لە تاڵترین رۆژەکانیشدا سەیری روخساری پیاوێکی اوا بکا، هەرچی و خەم و پەژارەی هەیەتی دەڕەوێتەوە. هیوادار دەبێت و خەمی نامێنێ. ژەندەرمە گەنجەکەش چاوی بڕیوەتە ئەو تاقە هەڵۆیەی دابڕاوە. لە نێو بنیادەمەکاندا تەنیا یەکێکیان سەیری هەڵۆکان دەکات و ئەویش هەر ئەو ژەندەرمە وردیلەکەیە. مەمی دیك چیی سەیری دەموچاوی ئەو ژەندەرمەیە دەکات، خەیاڵ هەڵیدەگرێ و هیواداریش دەبێ و ترسەکەی دەڕەوێتەوە. مەمی دیك نیگەرانی "عەلی"یشە.

لە دڵیدا گوتی:"عەلی لە دار دەدەن. لە داری دەدەن. هەر وەك چۆن پارەکە، کوڕەکەی "وەلی زۆڕنا"یان کە دایکی خۆی کوشتبوو، لە بازاڕی "ماراش: بە پەتەوە کرد، ئەویش ئاوا لە بەر بازارەکەی شار بە پەتەوە دەکەن."

"ئەگەر یەکێك سەر بە بیرەکە دا بکات.... لە ئاوێنەی ئاوەکەی بنی بیرەکەدا دوو چاوی زەق، دوو چاوی بریقەداری وەك شووشە دەبینێ کە لە بن ئاوەکەوە لە سەرەوە لە هەتاوەکە

دەڕوانن. چاوەکان تەواو دەرپۆقیون. هەزاران هەڵۆش کە لەو سەرە دەسووڕێنەوە، لە ناوێنەی ئاوی بیرەکەدا دەبینرێن و چاوەکانی مردووەکەمش لە نێوەندی ئاوێنەکەوە و لە نێوان ئەوانەوە."

ـ ئەگەر یەکێکی دایکی خۆی نەکوشتبێ، چما فەوجێك ژەندەرمەی وەشوێن دەکەون؟ وا نییە براله؟ ئەگەرچی مریەمۆك ژنێکی لاساریش بوو... هەقی خۆی بوو وای لێ بێ. زمان پیس و نەحەجمیو بوو. دەمودەست عەلی بگرن و بیبەن. لەو گەرمایەدا مێشکتان دەکوڵێ و نەخۆش دەکەون. زووتر، خێراتر. خێرابن ئەگینا دەپیشێن. نۆبەتێ دەگرن.... تاو هەڵدێ و لە عەرزتان دەدا. خێراکەن، زوو بن. ئەو تاوەی ئێرە، هەر کەس لەگەڵی رانەهاتبێ، دەیکوژێ. هەتاوی ئێرە وەك بەرد قورسە. ئەو تەپۆیانە کەوڵتان دەکەن. سواری ترۆمبێلەکانتان بن و تا زووە گیانتان رزگار بکەن. ئەو هەڵۆیانە؟ دەی باشە، هەڵۆ لە هەموو شوێنێك هەیە و بە ئاسمانێدا دەسووڕێنەوە. هەڵۆکان ئاسمانی چوکووراوایان پێ خۆشە. چوکووراوا ئاسمانێکی ساماڵ و خۆشی هەیە. سەیر بکەن، ئەوە یەکێکیان لە دەستەکەی جوێ بووەوە و خەریکە دەڕوات. هەڵۆکان وەك مێگەلە مەڕ وان. ئێستا ئەوانەش کە بەو ئاسمانەوە دەسووڕێنەوە وەشوێن ئەو یەکە دەکەون و دەڕۆن . دیارە دەچنە چیای گاوران. دەچنە رەوەزە رەش و پڕ لە سونبولەکانی. سەیری هەڵۆکان مەکەن. عەلی، شەوکەت بەگ سەهلە، مێروویەکیشی پێ ناکوژرێ. مێشێك، کوڕە تەنانەت کرمێکیشی پێ ناکوژرێ. تەنانەت "موجوك"ێکیش. هیچ گیانلەبەرێکی پێ ناکوژرێ. ئێستا دایکی خۆی کوشتووە، ئەوە شتێکی دیکەیە. عەلی بەرن و بڕۆن. ئەو تاوە مێشکتان دەکوڵێنێ و نەخۆشتان دەخا. عەلی قەرار بوو لەگەڵ ئێمە بێتە چوکوور. نەیدەتوانی سێ چوار رۆژان بە ژوور سەری دایکییەوە بێ و چاوەڕێ بێ. ئەوجار بە ئێمە چی براله...

سەیری هەڵۆکان مەکەن. دیارە بەرەو چیای گاوران دەڕۆن. دەچنە رەوەزە رەشەکانی ئەوێ... مریەمۆك بوو کە گیانی دەدا، لەوانەبوو رۆژێك و پێنج رۆژ و سەد رۆژ بخایەنێ. تەنانەت ساڵێکیش... عەلی چی کردبایە... دەسەڵاتی چ بوو ها؟ خۆ ئەو نەدەکرا هەر چاوەڕێ بێ، ئەگینا وەختێك دەگەیشتە ئێرە لۆکە نەدەما. بڵێی و نەڵێی مریەمۆك ئەمڕۆش نەمردبایە سبەی هەر دەمرد. دەی باشە، عەلییش هەر ئەوەندە قوڕگی گوشی و سلاری کردەوە.... ئێستاش ئەوە هەڵۆکان بە سەر تەرمەکەیەوە دەخولێنەوە. هەموو هەڵۆکانی تۆرووس، عەلی بۆخۆی هات بۆی گێڕامەوە. دەزانیی چیم پێ گوت؟ هەقی خۆی بوو عەلی، ئەتۆش هەقتە. عەلی شەوکەت بەگی پێ نەدەکوژرا و نەشیکوشتووە. ئێمەش شەوکەت بەگمان نەکوشتووە. هەر بە راست، شەوکەت بەگ کە دەچووە راوێ، چەکی پێ بوو؟

ـ نا، چەکی پێ نەبوو.
ـ گوندییەکانی ئێمە چەك لە بنیادەم ناکێشن. کەوابوو دیارە گوندییەکانی ئێمە شەوکەت بەگیان نەکوشتووە. لە خزمەتت دامە جەنابی مولازم.
ئاگرباران بوو. عەرزەکە وەك ئاسنی سوورکراوە وا بوو. بنی پێیانی دەبرژاند. گەڵایەکیش چییە نەدەجووڵاوە. گەرماکەی قورس بوو وەك قورقوشم و پشووی لە پیاوی دەبڕی و گەڵا و دار و عەرزی سوور دەکردەوە.
"عەلی"یە درێژ خوڕ خوڕ ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە. بن پیلەکانی ئارەقەیان دەردابوو. خۆڵ و ئارەقە بە شمەکانیانەوە بوو بە قوڕ. ئارەقە بە جۆگەلە لە نێوچاوان و دەست و لاقیان دەچۆڕایەوە.
مولازمیش ئارەقەی دەڕشت. ژەندەرمەکان، گوندی، منداڵ، ژنەکان، پۆلیس و هەر چی لەوێ بوو، شەڵاڵی ئارەقە بوون. دارە بییەکەی دەم رووبارەکەش ئارەقەی کردبوو. لە نەکاو بایەك هەڵیکرد، گێژەڵووکەی و باهۆزی هەستاند و هەموو مەزرا و کێڵگەکانی تەنییەوە. تاوێك بە دەوری گوندییەکاندا سووڕایەوە و ئەوجار لێیان نزیکتر بۆوە و ئەوانیشی داگرت. ماوەیەك هەر لەوێ سووڕایەوە و وردە وردە کشایەوە و ڕۆیشت. دوای ڕۆیشتنی گێژەڵووکەکە، هەر کامەیان دەتگوت پەیکەرەیەکن لە قوڕ و خۆڵ دروستت کردوون. هەر کەسە و نێوچاوانی خۆی دەسرییەوە. دەنگە دەنگێکی سەیری قورگ خاوێنکردنەوە لە هەموان بەرز ببۆوە.
تاوەکە دەتگوت ئاوێنەیە. تیژ، تیژ... ڕووناك و تاقەتبڕ. سێبەری ئەو هەورانەی دەهاتن و تێدەپەڕین تار بوون. هەتاوەکە لە سپیایی لۆکەجاڕەکەدا بەتینتر و سووێتێنەرتر بوو.
مولازم داوای ئاوی کرد. ئاویان بۆ هێنا. ئاوەکە ئاغ و لێڵ بوو. بۆنی زۆنگاوی لێ دەهات. بۆ زاری برد بەڵام پێی نەخورایەوە. هێڵنجی هات. یەکێك لە پۆلیسەکان، لە بن پینچکێك لێی کەوتبوو و نەیدەتوانی هەستێ. وەك سەگێکی گەرمالێدراو، زمانی دەرکێشابوو.
زەڵجە یەخەی کراسەکەی هەتا بن سینگە داتەپیوەکانی کردبۆوە. مووەکانی دەتگوت دەزووی بادراون و بە پێستە چرچ و لۆچەکەی سینگییەوە نووسابوون.
دەیگوت:
ـ دیتم. بەو دووچاوەی خۆم تارماییەکم دی. تاریك بوو. ئەمن سواری گا کێوییەك ببوون و لەو تاریکاییەی شەوێدا تیشکێك هات. پیاوێکی چوارشانەی وەك کوێخا سەفەری خۆمان

نالآندی. تاشباشی مەزنمان چەقۆکەی لە سەر قورگی دانابوو و دەیبڕی. کابراکە لە بن دەستیدا پەلەقاژەی بوو. لە نەکاو خوێن فیچقەی کرد. دەست و باسك و لاقەکانی کابرا لە بەر یەك کێشرانەوە و بێجووڵە کەوت.

ـ لە کوێ دیت؟

ـ جا دەتەوێ لە کوێ بێ؟ لە چوکووراوا. تەپۆ وەك خیز و خۆڵ بوو. تەپۆی ئێسکدار. چزوویان هەر یەکەی هێندەی دەرزییەك... وەك دەرزییەکی ژەهراوی. هرووژمیان کردە سەر کابرا چوارشانەکە... کابرا رووت بوو. خواردیان و تەواویان کرد. هەر ئێسقانەکانی مایەوە. مستێك ئێسقانی سپیی وەك ئەو لۆکانە... تەپۆ خواردیان و تەواویان کرد.

هەورەکان هێدی هێدی وەك بایەوانی کەشتی بە سەر دەریای سپییەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەچوون. بایەوانی سپیی درەوشاوە. هەڵۆکان لە لێرەوارەکەوە لوور دەبوونەوە. سێ دەستەی هەڵۆی لێك جودا، لە سێ شوێنی جیا جیا دەسووڕانەوە. دەستە گەورەترەکەیان، باڵ لە سەر باڵ، بەسەر بیرەکەوە دەسووڕانەوە.

ـ یەك پشوو دەگەڕا. لە بەیانییەوە تا شەوێ. ئەوەی ئێوە پێی دەڵێن شەوکەت بەگ. یەکێکیان ئەو بوو.... و یەکێکیشیان کوێخا سەفەر. قەڵافەتی هەر دووکیان لە شەوێدا دوو هێندە و سێ هێندە و بگرە دە ئەوەندەی لێ دەهاتەوە. شەوکەت بەگ زۆر گەورەتر بۆوە. رۆژێکیان شەوکەت بەگم دی کە یەك بە مەیدانێ راکشاوە. هەڵۆکان بە سەر سەرییەوە دەسووڕانەوە. ئەوجار سەیرم کرد شەوکەت بەگ وەك فیشەك دەڕوات. هەتا گەیشتە لێواری دەریا. ئاوەکان بەسەری کشابوون.

ـ چووە نێو ئاوەکە؟

ـ بەڵێ چوو.

ـ سەیرە، شەوکەت بەگ لە ئاو دەترسا.

ـ لە ئاوەکە هاتە دەرێ و لە بن دارەکان، لە کەنارە خەڵوەتەکە... لە نێو بیرەکە... نێو بیرەکە... هەڵۆکان... شەوکەت بەگە بەرەو دەریا سپی خوشی و رۆیشت. بەو دوو چاوانەی خۆم دیتم. کوێخاش بە شوێنییەوە بوو. کوێخا سەفەر، لە گوندەکەی ئێمە، کەس کوێخا سەفەر نادوێنێ. تاشباشی مەزنمان، خۆ دەیناسن؟ هەر ئەوەی حەوت تۆپەڵە نووری بە دواوەیە و ژەندرەمەکان بردیان. کە ژەندرمەکان تاشباشە مەزنەکەی ئێمەیان دەبرد، گەورە و سەروەرمان گوتی: هیچ کامێکتان هەتا مردنێ، نابێ لەبزتان دە لەبزی ئەو سەفەرە بگەڕێ و

ناشبیٚ بیکوژن. ئەو سزایەی بەسە. بەلاّم هەر ئەو سزایەی بەس نییە. سەر خۆ لە تاشباشی نەدابوو. تاشباش خۆ سیٚ مانگی رەبەق خوێن نەمیزتبوو... ئەوە من بووم خوێن دەمیزتم. ئەمن بووم کە لای کەس سەرم هەڵنەدەهات. ئەمن بووم خۆم لە چاوەکانی زولەیخا دەشاردەوە. کوێخا سەفەر هەموو شەویٚ لەگەڵ شەوکەت بەگ قسەی دەرکد. هەتا بەیانی سرتوخورتیان بوو. من دەڵێم دوو سەد، تۆ بڵیٚ هەزار سەگ لە دەوروبەری ئاناوەرزاوە هاتن. سەگەل... هەر وا دەوەڕین. شەوکەت بەگ خەریکی قسەکردنیٚ بوو.

ـ سەیرە ئەو شەوکەت بەگە قەت قسەی نەدەکرد.

ـ تاشباشی مەزنمان شەوێکیان لە خواررووی عوسمانییەوە و لە داوێنی چیای گاورەوە هات و حەوت تۆپەڵە نووری بە دواوە بوون هەر یەکەی هێندەی مناڕەیەك.

شەوکەت بەگ هەستایە پیٚ و گوتی:"ئەی خوایە گیان، وەڵلاهی سەیرە."

ـ خوایە گیان، یانی سەیرە؟

حەسەن شوولکێکی لە دارە بییەکە بڕی. هەر دووك سەری هێندەی بڕگە پەنجەیەك دەبوو. شمشاڵێکی لیٚ دروست کرد. حەسەن شمشاڵێکی باشی لیٚ دەدا. لە بابی نەدەمایەوە. شمشاڵێکیش دیکەشی بۆ ئاشقە کەچەڵە دروست کرد. کە پەنجەی لە سەر شمشاڵیٚ بزاوت، لە نەکاو هەواکەی فێنکی کردەوە و گەرماکەی دامرکایەوە.

ـ بابم نەنکمی کوشت. بە دەست خۆی نەبوو، ئەی چی کردبایە ئەو لێقەوماوە. شەوکەت بەگ مامی خەلیلی باش دەناسی. ئەمن ئەوەندەم بیری مامە تاشباشم کردووە مەگەر خودا بزانیٚ. شمشاڵێکیش بۆ ئەو دروست دەکەم. هەر مەپرسە چەندەم غەریبیی کردووە.... ئەستەغفیروڵلا... تاشباش، مامە تاشباش نییە، سەرروەرمانە تاشباش. ئێستا لە کوێستانێیە، لە دەم کانیاوە فێنکەکان و لەو دەشتانەدا کە جۆگەکانیان بۆنی پنگەی لێوە دیٚ، لەگەڵ چل سوارەکە... چل سواری ردێن درێژ، کە هیچ کات نامرن. تاشماشی مەزنیشمان ردێنی سپی بووە. هەمووان وا دەڵێن، ئەمن چووزانم... ئەمن زۆرم بیری مامە تاشباشم کردووە. خۆزگە سەرروەرمان نەبوایە و لە لامان بوایە. هیچ کام لەو بەڵایانەمان بە سەر نەدەهاتن. سوودی چییە بۆتە سەرروەرمان؟ سوودی چییە کە ردێنی درێژ بووە؟ مام خەلیل شەوکەت بەگی کوستووە. شەوێکیان چەقۆیەکی لە زگی دا و کوشتی. هەر دوو چاوم کوێر بن ئەگەر درۆیان بکەم. مام خەلیل گوتی:"شەوکەت بەگ، شەوکەت بەگ، خوا رۆژی تۆی بە دەستی من تەواو کردووە." دەستی بەرز کردەوە و خەنجەرەکەی لێدا... شەوکەت بەگ وەك دارێکی گەورە کەوتە

عەرزی. ئەی تەرمەکەی چ لیٚ کرد؟ ... ئەها... ئەنگۆ ئەقلّتان پیٚی ناشکیٚ. مام خەلیل سەرکردەی دزەکانە، بە چوار مەزەب و کتیٚبان کوشتنی حەلالّە. لە یەمەنیٚ رای کردووە... پەتیٚکی لە ملی تەرمەکە خست و لە گۆمەکەی چۆمیی هاویشت. ئەوکەت بەگ بوو بە خۆراکی ماسییان.

ـ ماسی شەوکەت بەگیان خوارد؟... خوایە گیان، زۆر سەیرە.

دەنگی شمشالّەکە، نیوە شاد و نیوە خەمبار، دەگەیشتە دوورترین مەزراکان. کریٚکارانی مەزراکانی دیکەش دەستیان لە کەلەکەیان دەنا و قیت رادەوەستان و ئاوڕیان لەو لایە دەدایەوە و لە خۆیانیان دەپرسی، ئەوە چ باسە لەویٚ؟ و دیسان بەسەر لۆکەدا دەنووشتانەوە ملیان لە کار دەنایەوە. دیارە برێك دواتر دیسان دەست لە کەلەکەیان دەنیٚنەوە و قیت رادەوەستنەوە و ئاوڕ دەدەنەوە بزانن لەو لایە چ بایە.

ژنەکەی بەکرە شیٚت پیاوەکان دەژمیٚریٚ:"پازدە ژاندەرمە و ئەفسەریٚك دەبیٚتە شانزدە و شەش پۆلیسیش دەکاتە بیست و دوو. سیٚ کەسی کلاو پانیش دەکاتە بیست و پیٚنج. دەبیٚتە بیٚست و پیٚنج شەو. دلّی پڕ بوو لە ترسیٚکی نامۆ و شەرم و شتیٚکی وەك خۆ بە کەم زانین... ئەوانە لە دنیایەکی دیکەوە هاتوون.

ـ ئەوکەت بەگ دەفەرموون؟ هەر دەنووست...

ـ خوایە گیان، سەیرە. شەوکەت بەگ قەت نەدەنووست.

رۆژ ئاوا بوو، شەو داهات. زەوی هەلّمی لیٚ هەلّدەستا و بۆنی تالّیٚکی لیٚوە دەهات. تەپۆ دەتگوت گەوالّە هەورن دیٚن. هەر کەسە و بە ناچاری دەموچاوی بە لەپی دەستی دادەپۆشی و خۆی دەتلاندەوە. تەپۆ کەولّیان دەکردن. کەس باشاری نەدەکردن.

مام خەیل گوتی:

ـ کوڕە دەستم بکەنەوە. دەستم بکەنەوە با مشوورێك لەو چارەڕەشییە بخۆم. ئەمن کەسم نەکوشتووە. دزی دەکەم، لە یەمەنیٚ رام کردووە، درۆیان دەکەم، نویٚژان ناکەم و رۆژووان ناگرم، بەلاّم پیاو ناکوژم.

هەموو گوندی یەکدەنگ هاواریان کرد:

ـ مام خەلیل پیاوکوژ نییە.

دەستەکانی مام خەلیلیان کردەوە. هاواری کرد:

ـ زووبن و خیٚرا بکەن. لاسك و کلۆش بیٚنن. قالۆری گۆلّەبەڕۆژەی بیٚنن، قالۆری گەنمەشامی و کلۆشی گەنم، خەرمانیٚك هەلّدەنەوە.

گەنجەکان دەمودەست بە قسەیا کرد.

لە دەم رووبارەکە ئاگرێکی گەورە بڵێسەی سەند. بای رۆژاوا هەڵیکردبوو. مام خەلیل گوتی:

- جا ئێستا بەرەو بایەکە راوەستن. تەپۆ کەیفی بە دووکەڵ نایە.

هەموو چوون و بەرەو بایەکە، کە دووکەڵی دێنا، راوەستان. دووکەڵێکی گەرم دەهات وەخت بوو پێی بخنکێن. ئیتر تەپۆ نەما. بەڵام گەرمای دووکەڵەکە خراپتر بوو.

مولازم گوتی:

- زۆر باشە، باشە. لەگەڵ هەموان قسەمان کرد. شەوکەت بەگ بێرەدا نەهاتووە. وەختە بخنکێین.

بە پەلە غاریان دا و خۆی خستە کامیۆنەکانیانەوە. دسەبەجێ سەیارەیان داگیرساند. شەبا و ئەو بایەی بە رۆیشتنی کامیۆنەکان وەرووەمەتیان دەکەوت، دەتگوت بڵێسەی ئاگرە.

پیاوە کڵاو پانەکان، گورج خۆیان خستە سەر ئەسپەکانیان و لە چەقی شەوەکەدا ون بوون. یەکێکیان گوتی:

- شەوکەت بەگ لێرەیە. ئەگەر لێرە نەبوایە، ئەگەر نەهاتبایەتە ئێرە، ئەی بۆچی پارەیان داوە بە ئێمە لێرەی لێ بگەرێین؟

بەرەو لێرەوارەکە لینگیان دا. وا راهاتبوون. هەتا بەیانی ئەسپیان لینگ دەدا و بەوجۆرە خۆیان لە گەرما و تەپۆ دەپاراست. بە رۆژیش دەنووستن.

گوندی ئەمشەو دەیانتوانی بە ئاسوودەیی بنوون. ئاگرەکە کوژابۆوە. ئەو دووکەڵەی لە چەند کۆتەرە بییەك هەڵدەستا، هێور هێور بۆ لایان دەهات. بایەکی توندیشی دەهات و تەپۆی دەرفاند.

مەمی دیك لە شەکەتییان وەخت بوو بمرێ. چەند جار ویستی هەستێ و سەرێکی بیرەکە بدات، بەڵام نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. هەموو گیانی دەیزیراند، دەتگوت هەموو ئێسکەکانی لەشیان کوتاوە. بەڵام نەدەکرا هەڵنەستێ. ئەمرۆ مەترسییەکی ئاوای لەکۆڵ ببووەوە کە یان خودا یان تاشباشی مەزنغان فریای کەوتبوون. هەڵۆکان هەر دێن و پتر دەبن. .. ئەوەندە پتر دەبن کە پیاوێکی گەمژەش بیری بۆ ئەوە دەچێ سەرێك بە بیرەکەدا بکات.

جارێکی دیکە لەخۆی نووسا. دەنگی لە ئێسکانی هات. ئاوڕی دایەوە. قەڵافەتێکی زل و زەبەلاح کە برێکیش بۆ پێشەوە نوشتابۆوە، لۆقی داویشت و دەرۆیی. دڵی داخورپا. نەکا ئەو بێ.

دەرپەڕی و لێی چووە پێشێ. کابرا راوەستا و ئاوڕێکی دایەوە. مەمی دیکیش راوەستا. کابرا ملی رێیەی گرتەوە. مەمی دیکیش بە شوێنیدا. بەو شێوەیە لەو تاریکە شەوەدا، کابرا لە پێشەوە و مەمی دیك بە دوایدا، بەرەو بیرەکە چوون. کابرا چوو و لە سەر زارکی بیرەکە دانیشت. مەمی دیکیش لەولاترەوە و رووبەڕووی دانیشت. هەڵۆکان دیسان بە ئاسمانەوە هەر دەهاتن و ژمارەیان پتر دەبوو. باڵیان لێك دەدا و دەنگی باڵیان شەوی پڕ دەکرد.

**عەلی سەری لێ تێك چوبوو. چیی نەمابوو ئەویش وەك ئەوانیتر باوەڕ بکا کە دایکیی کوشتووە. ئاخۆ دایکی لە پاش هاتنەکەی ئەوان مردبوو؟ دڵەخورپەیەتی و جینگڵ دەدا. دەستی بۆ کار ناچێ. لەو کاتەی شەوێدا کە لە تەنیشت مەزراکە و بەومانگەشەوە دانیشتووە و لەگەڵ ژنەکەی قسە دەکا.**

## ١٤

عەلی لاسکە لۆکەیەکی تاڵ و تۆزاویی لە زاری نابوو و دەیجوی. وەك کەسێکی سابوونی خواردبێ و تف بکاتەوە، ئەویش کەفە لیچقەکەی فڕێدەدایە دەرەوە و چێژی لێ وەردەگرت.

خەڵکەکە هەمووان دەستیان لە کار و ژیانیان هەڵگرتبوو و باسی ئەویان دەکرد. هیچ کەس تەنانەت خزم و کەسەکەشی چاویان لە چاوی نەدەکرد و ئەوانەش کە چاویان لێ دەکرد، وەك پیاوکوژێکی چەپەڵ، لە رووی بەزەییەوە یان بە چاوێکی سووکەوە و زیاتریش بە بێزارییەوە لە بنی پێیەوە تا تەپڵی سەری سەیریان دەکرد. کوێخا سەفەر کە هیچ کەس قسەی لەگەڵ نەدەکرد، لە بنەوە دنەی دەدان. لە سەر وەسییەتەکەی تاشباش کەس نەیدەدواند، بەڵام بە قسەیان دەکرد. تاشباش ئۆغڵو ئەو کاتەی ژەندەرمەکان دەیانبرد، گوتبووی کەس نابێ لەبزی دە لەبزی بگەڕێ، بەڵام نەیگوتبوو کەس نابێ گوێ بداتە قسەی و قسەی مەبیستن... سەفەریش قسەی لەگەڵ هەمووان دەکرد، بەڵام هیچ وەڵامێکی وەرنەدەگرتەوە. وەڵامی نەدەبیستەوە بەڵام هەرکەسێکی پێی خۆش بوایە بەگژ یەکێکی دیکەی دا دەکرد و ئەو کارەی ئەو، لە هەموو کەس پتر، تەنانەت لە "عەلی"یش پتر، مەمی دیکی شێت دەکرد.

ترسێك ناخی عەلیی تەنیبۆوە. گوندی رۆژ بە رۆژ زیاتر لێی بە قیندا دەچوون و تووڕەتر دەبوون. ئەوانەش کە وەك ئیزراییل لە مرێمۆك دەسڵەمینەوە، ئێستا کە ناوی دەهاتەوە نێو

ناوان ـ خۆ بەردەوامیش هەر باسی ئەو بوو ـ هەر دوو چاویان دەبووە رووبار و فرمێسکیان بۆ هەڵدەڕشت. هەزار و یەك حەقایەتیان لە سەر ئەوەیکە عەلی چۆن و بە چ زەجر و ئەشکەنجە و ئازارێك مریەمۆکی کوشتبوو، هەڵبەستبوو و هەمووشی بە گوێی عەلی دەگەیشتنەوە. هەموو رۆژێ حەقایەتێکی نوێیان هەڵدەبەست. و هەر پێنج شەش رۆژ جارێك مریەمۆکیان بە مەرگێك دەکوشت. ئەو حەقایەتانە، بە پێی دۆستایەتی و نزیکیی خەڵکەکە لە عەلی و رق و بێزارییەکەیان لە مریەمۆك جیاواز بوون. زەڵەجە هەموو شەوێ لانیکەم سێ خەونی بە مەرگی مریەمۆکەوە دەدی. هەموو گوندییەکان لە منداڵی حەوت ساڵانەوە تا پیری حەفتا ساڵانەیان، دڵنیا بوون لەوەی عەلی مریەمۆکی کوشتووە. کەس بە مێشکیدا نەدەهات کە باشە عەلی بۆ دەبێ دایکی خۆی بکوژێ؟ و کەسیش تۆزێك دوودڵ و دڕدۆنگ نەدەبوو.

یەکێك لەو نەقڵانەی دەیانگێڕایەوە، ئیتر عەلیی پێ شێت دەبوو. کێ هەڵیبەستبوو؟ عەلی بۆی نەدەدۆزرایەوە. خۆ دۆزیبایەوە، هەر چۆنێك بوایە عەلی قسەیەکی لەگەڵ دەکرد و لە سەر ئەو درۆیە پێی دەگوت پووتێك چەند کلیۆیە.

گوتی:

ـ ئەلیف، باشە ئەمن چ خراپەیەکم بۆ ئەو گوندییانە بووە ئاوام لێ دەکەن؟

عەلی لە خانەی حەسەن و ئۆمەخانیش سەری هەڵنەدەهات. چونکە ئەوانیش وەك گوندییەکان بە تووڕەیی و دوژمنانە سەیریان دەکرد. لە نێو هەموو خەڵکی ئاواییەکەدا تەنیا دوو جووت چاو، وەك جاری جاران بە خۆشەویستی و میهرەبانییەوە سەیریان دەکرد. یەکێکیان چاوە پرووشەکانی مام خەلیل بوو کە کەوتبوونە بن برۆ سپییەکانییەوە و ئەویتر چاوە مەڕی و درشت و زوڵاڵ و پڕ لە عەشق و خۆشەویستییەکانی ئەلیف بوون.

ئەلیف بێدەنگ بوو. نەیدەتوانی هیچ بڵێ و هیچ دەرمانێك بۆ ئەو دەردەی مێردەکەی بدۆزێتەوە. لە پەژارە و خەم و خەفەتدا دەمرد و زیندوو دەبۆوە.

عەلی گوتی:

ـ پێت وایە تا دەگەڕێینەوە دایکم خۆ رابگرێ و نەمرێ؟

خەم خەفەت روخساری ئەلیفی داپۆشی. چرچ و لۆچی قووڵی پەژارە تەنانەت لە بن تریفەی مانگەشەوەکەشدا دیار بوو. گوتی:

ـ بە باوەڕی من نامرێ. نامرێ بەڵام خۆی دەکوژێ. ئەمن پێم وایە خۆی دەکوژێ. وەختێك دەگەڕێینەوە، لە سەر ڕێگەی کاروانەکە، تەرمەکەی دەدۆزینەوە.

- یانی تۆ دەڵێی خۆی دەکوژێ؟
- ئەگەر بزانێ لێرە گوندی چ بەڵایەکیان بە سەر تۆ هێناوە و خەریکن هەر بە زیندووی کەوڵت دەکەن و وەختە وەك سەگ بتخۆن، بە دڵنیاییەوە خۆی دەکوژێ، بەڵام بێت و بزانێ ئەتۆش وەك گوندییەکان ئەوت بەلاوە گرنگ نییە، ئیتر کاتێ دەگەڕێینەوە، زەق و زیندوو دەیبینینەوە. تەنانەت دەبینی وەك کچۆڵەیەکی پازدە ساڵانە قیت و گەشە.
- نانەکە بەشی دەکا؟
- ئەگەر پێی خۆش بێ بەشی دەکا.
- چێشتیش لێ دەنێ.
- ئەگەر پێی خۆش بێ.
- جا چێشتی چی؟
- لە ئاوایی، ئێستا لانیکەم، دە پازدە مریشك و کەڵەشێر بەجێ ماون. ئەگەر هەر ڕۆژێ یەکێکیان بگرێ و لێی بنێ...
- جا دایکم بەو تەمەنەوە چۆن ئەوانەی پێ دەگیرێ؟
- کەیفی بێنێ زۆر باشیان دەگرێ...
- لە بەر دەم ماڵەکانەوە باخچەی سەوزە و کەوەری لێیە... لە خوارتریشەوە پەرێزی برینج و... لەگەڵ ئەوەشدا لێرەوارەکەش یالابووکی هەیە...
- هیچ مەترسە و خەمت نەبێ. ئەحە شێتۆکەش دەچێتە لای. بەشکم بیباتە کۆشکی حەزوورەکەشی. بەشکم بچێ و لە ئاواییش لەگەڵیدا بمێنێتەوە. دوو بە دوو پێکەوە، لە ئاوایی... یەکێ شێت و یەکێ پیر و پشت کۆماوە... هەتا دەگەڕێینەوە جووقەوار لە مریشك و کەڵەشێر دەبڕن...
- ئەلیف، پتر لە هەر شتێك حەزم لە چییە؟
ئەلیف پرسیی:
- حەزت لە چییە؟...
- ئەگەر پێم بڵێن ئەرێ "عەلی"یە درێژ... ئەگەر پادشای پەرییان بێ، ئەگەر پێغەمبەر گەورەکەمان بێ. بڵێ... ئەگەر تاشباش ئۆغلوی برامان بێ و بە من بڵێ ئەی بەندەی خودا، ئەی "عەلی"یە درێژ، هەر ئارەزوویەکی هەتە داوای بکە... دەزانی چیم دەویست؟ دەمگوت ئارەزووم ئەوەیە کاتێ لە لۆکە ڕنینێ دەگەڕێینەوە، دایکم لە دەرەوەی ئاوایی بە پیرمانەوە بێ

و بلێ:"بەخێر هاتنەوە، خێر و بەرەکەتتان هێنا، لە چوکووراوای پڕ لە بەرەکەت چیتان بۆ مـن هێناوەتەوە؟

ئەلیف ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ ئەمنیش جیا لەوە هیچ ئارەزوویەکم نییە.

ـ جا ئەو کات، دەچووم و لەبەر دەم یەك بە یەکی گوندییەکان رادەوەستام و تفێکم لـە نێـو چاویان دەکرد.

وا لەو خەیاڵەی خۆیدا نوقم ببوو کە تەنانەت ئاگای لەو تەپۆیانەش بڕابوو کـە ئاگریـان لـە پشتی بەردەدا و خوێنەکەیان دەمژی و بە سەروچاوییەوە نووسابوون.

بڕێك دوای ئەوە، لە دەم چەمی جەیحانەوە ئاگری گەورە گەورەیان کردەوە و چوون لە بەر بـا و دووکەڵەکەی دانیشتن.

لەمەودوا، ئەو ئاگرە دەبوو تا بەیانی بایەسێ بۆ ئەوەی گوندی لە بەر دووکەڵەکەی بنوون و تەپۆ پێوەیان نەدا. هەموو شەوێ یەکێکیان دەکردە کێشکی ئاگرەکە کە هەتا بـەیانی نـەهێڵێ بکوژێتەوە. یەکەم شەو وەبەر مـەمی دیـك کـەوت. مـەمی دیـك نەیدەویـست یەکـەم کێـشك قەبووڵ بکا، بەڵام گوندییەکانی پێ قایل نەکرا.

مەمی دیك کە ئاگرەکەی دەکردەوە، دڵەخورپەی بـوو و تـرس و دڵـەڕاوکێ لەوانـەبوو دڵـی بتەقێنن. بۆ ساتێکیش چییە نەیدەتوانی چاوی لە ئاسمانی سەر بیرەکـە هـەڵگرێ و لـە دوورەوە شەقەی باڵی هەڵۆکان دەهات و گوێی لێ دەبوو. ئاخۆ ئەوەی لە سەر زارکە بەردینەکەی بیرەکە دانیشتبوو، ئێستاش لەوێیە؟ ئاخۆ تەرمەکەی لە بیرەکە هێنابووە دەرێ؟

بەیانی زوو، کە لە خەو هەڵدەستی، دەبینی هەڵۆ ئاسمانەکەی چوکووراوایان داپۆشیوە. ئاوا بچێتە پێشێ، هەر وای لێ دێ. کوڕە خۆ دیاریش نییە ئەو هەمووە هەڵۆیە لە کوێوە دێن، پۆل پۆل دێن و لـە ئاسمـانی چـوکووراوادا دەسـووڕێنەوە و دەخولێنـەوە. سـووڕانەوەی هـەڵۆ لـە بـن تریفـەی مانگـە شـەو دا حاڵـەتێکی نـامۆی هەیـە... دەڵێـی پـشتێندێکی گـەورەی ئاسمـان رایخستبێ، بە بادا دەشەکێتەوە و شەپۆل دەدا. باڵ و پەڕی بریقەدار، باڵەکانیان لە بەر تریفـەی مانگ بریقەیان دێ.

"بە ئانقەت لێرە بەجێیان هێشتم، بە ئانقەست... هەر هەموویان دەزانن. هەمووان دەزانن و لە بنەوە سەیری من دەکەن و گاڵتەم پێ دەکەن. چۆن دەبێ نەزانن.... مەحاڵە...

عەلی دەستی ئەلیفی گرت و گوتی:

ـ سەیری ئەو گوندییانە چەندە خراپ و هیچ و پووچن. باشە چما دەکرێ بنیادەم ئەوەندە چەپەڵ بێ؟ بە دیتنیان ڕشانەوەم دێ. ئەوەی ئەوانە لەگەڵ منی دەکەن، هیچ گوندییەك لەگەڵ ئەویتری ناکا... ئەوانە زۆر چەپەڵن. هەر باب و باپیریشیان چەپەڵ بووە. چوون بە حوکمەتیان گوتووە. کوڕە خۆ چیی وای نەمابوو سەرم بە پتەوە بکەن. سوپاس بۆ خودا مفوەزەکە پیاوێکی ژیر بوو. بڕوای بە قسەکانی من کرد نەك هیی ئەوان. مولازمەکەش کەیفی بە من هات.

ئەلیف:

ـ باشە ئەوە چۆن بوو؟ بڕوا ناکەم. کەوابوو لەو حوکمەتەشدا...

عەلی گوتی:

ـ مفوەزەکە خەڵکی ئەنتەپە. خەڵکی ئانتێپ باش و جوامێر و ژیرن. خۆزگە ئەمنیش خەڵکی ئەوێ بوایەم. بەخودای خەڵکی ئەوێ بوایە قەت تووشی ئەو نەهامەتییانە نەدەبووم... ئێستا ئەگەر دایکم مردبێ... وەختایەکی دەگەینەوە ئاوایی، ببینم دایکم مردووە و لە گۆڕێ کەوتووە... دەستێکیشی لە زاری سەگێك دایە... خۆ ئەو کاتە..

هەر دووکیان بێدەنگ بوون.گ

شەوەکە پڕ بوو لە دەنگی جڕ و جانەوەر. وزە وزی تەپۆ قیامەتی نابۆوە. بایەکە نیشتەوە و گەرمای ئەوەکە شێدار و بەتین بوو. شەپۆل شەپۆل گەرمایەکی بەتین لە زەوییەوە هەڵدەستا و بە سەرو دەموچاویان دەکشا.

ـ لەوانەشە تاشباشی برام وەلی بێ. لەوانەشە ئێستا لە ئەشکەوتی چل سوارەکە، لای ئەو چل پیاوە نەمرە بێ. لەوانەشە تاجێکی لە تیشك لە سەر بێ کە وەك خۆ دەدرەوشێتەوە. لەوانەشە تا ئێستا ڕدێنی درێژ و چەرموو بووبێت و وەك تۆڕ کەوتبێتە سەر سینگی. ئیشەڵڵا تاشباشی مەزنمان، نەنە مرێمۆکی لە پەنای خۆی گرتووە و داڵدەی داوە و ئێستا دەیپارێزێ. ئیشەڵڵا ئاگای لە وەزع و حاڵی ئێمەش هەیە... ئیشەڵڵا تاشباشی برام بووەتە وەلی...

بە دەگمەن هەڵدەکەوێ ئەلیف تووڕە بێ و نەتوانێ پێش بە تووڕەبوونی خۆی بگرێ. تووڕە بوو و گوڕاندی. عەلی قەت ئاوا بە تووڕەیی نەیدیبوو.

ئەلیف گرماندی:

ـ ئاگات لە دەمت بێ، بە "سەروەر"مان ناوی بێنە. باشە ئەوە دامنا سەردەمانێك برادەریشت بووبێ، هەر چییەك بێ تۆ ئەو وەلییە و ئەتۆ بنیادەم. ئەگەر تۆ ئاوا قسەت نەکردبایە و لە بەر تاشباشی سەروەرمان پاڕابایتەوە، ئەو هەتا دەگەڕاینەوە، نەنە مرێمۆکی

دالّده دەدا و تەنانەت دەیبردە ئەشکەوتەکەیشی. بەلاّم ئەتۆ نازانی ئاگات لە زمانت بیّ. پەیتا پەیتا دەلّیی "تاشباشی برام". ئەو برای تۆ نییە. سەروەرمانە.

ئەوانەی لەبەر دووکەلّەکە دانیشتبوون، گوێیان لـە دەنگـەدەنگ و هەراکـەی ئـەلیف بـوو. زەلّەجە گوتی:

ـ دەر و جیرانە خوشەویستەکانم، لە خەوێمـدا عـەلی دایکـی خـۆی کوشـتبوو و عـەلیفیش منداڵەکانی ورد ورد دەئەنجنی. خۆم پیّ نەگیرا. هاوارێکم کرد و لە خـەویّ راپـەڕیم. ئـەلیفیش رێك وەك ئێستا دەیشیڕاند. بچن و لە چنگ ئەو حەیوانە خوێنمژە رزگاری بکەن... بڕۆن...

کەس لە جێی خۆی نەبزووت.

لەو لاترەوە، لەو بەری ئاگرەکەوە، کەژاوە سپیەکەی سـەفەر لـە بـەر شـنەبایەکی نـەرم کـە هەلّیکردبوو، هێمن هێمن دەجوولاّیەوە. لە ناوییەوە دەنگی سەفەر کە گۆرانییەکی دەگوتەوە و دیاریش نەبوو چ گۆرانییەکە، دەهات و کوێخا سـەفەر بـیری دەکـردەوە:"عـەلیی سـەگباب... هەتا من هەم ناهێلّم ئاوێکی خۆش لـە قوڕگـت بـچێتە خـواریّ... نـاهێلّم ئـاوای بخـۆی، ژن و منداڵ و گوندی و گزیرەکەم و خزم و کەسم من نەدوێنن و تۆش کـەیفیّ بکـەی؟ نـاهێلّم ئـاوای بخۆی. لە کونە لووتت دەهێنمەوە دەریّ. ئەوە دەشبینی. هەروەها سووك و ریسوات دەکەم. خۆ دەزانم تۆ مریەمۆکت نەکوشتووە، بەلاّم هەتا دەگەڕێینەوە مریەمۆك دەمریّ... دەمـریّ، دەمـریّ. مریەمۆك دەمریّ و خەلّکی ئاوایی کە دەگەڕێینەوە و سـەیر دەکـەن مریەمـۆك مـردووە. ئـەتۆش، ئەتۆش، ئەتۆش... "عەلی"یە درێژی هـیچ و پـووچ... ئـەو وەلییـە گلاّوەتـان، ئـەو تاشباشـە گلاّوەشتان مردووە و قەل و داڵ و دەعبای کێوی خواردوویانـە. ئـەتۆش، ئـەتۆش "عـەلی"یـە درێژ، ئەتۆش دەمری. مریەمۆك دەمریّ... پێتان وایە دەتوانن ئەمن هـەر وا ئەشـکەنجە بـدەن؟ خەیاڵتان خاوە. یانی کوێخا سەفەر تۆلّە ناکاتەوە؟ کوڕی کوێخا "خدر"؟... دەست لە هـەموو سەروەت و سامانی خۆم هەلّدەگرم. ئەگەر پێویـست بـیّ، لـە گیـانی خۆشـم مایـە دادەنـێم بـۆ ئەوەی مریەمۆك بکوژن. جا ئەو کات ئـەتۆ بـڕۆ و دەرد و کـوڵی دلّـت بـۆ بەردەکـەی هـەورازی سلێمانلی هەلّڕێژە. هەر هەلّبەزە و بلّیّ دایکمم نەکوشتووە. پێت وایە ئەو گوندییانە، لە حەوت ساڵانەوە هەتا حەفتا ساڵانەکەیان، شایەتیت لە سەر نادەن؟ ئەوانە خۆ ئاخرییەکـەی مـن هـەر دەدوێنن. یان دەمدوێنن، یان هەرچی بەلاّ و نەهامەتییە بە سەریان دیّ. ئەمن دەستم لە گیانی خۆم شوشتووە. لە پێشدا تاشباش ئۆغلۆ گوتبووی دەردم داوە بە سەفەر... دوایەش ئـەتۆ وات گوت، "عەلی"یە درێژ... باشە رەوایە ئەوەندەم خراپـە لەگـەلّ بکـەن؟ چـما ئـەو مەملەکـەتی

تۆرووسە لەوەتەی هەیە، کوێخایەکی وەك منی بەخۆوە دیتووە؟ جا ئێستا ئەنگۆ هەر خراپەم لەگەڵ بکەن. چما خودا هەڵدەگرێ. ئەمن هەرچی هەمە و نیمە فیدای ئەو گوندییانەی بکەم و جا ئەنگۆش بێن ئەوا لە من بکەن. وەلییم بۆ دروست بکەن. چما پیاو ئەوەی پێ قەبووڵ دەکرێ؟ چۆن شتی وا دەبێ، پیاو بەبێ بیستنی قسەیەکی دۆستانە وخۆمانە و گەرم و برایانە و تەنانەت بەبێ قسەیەکی دوژمنانە و پڕ لە بێزارییەوە بژیێ. تاشباش ئەمنی نەکوشت، بەڵام ئەوەی بە سەری هێنام، لە مەرگیش خراپترە، بەڵام... بەڵام ئەمن ئەنگۆ ناچار دەکەم قسەم لەگەڵ بکەن. هەرچی لە دەستم بێ دەیکەم بۆ ئەوەی زارتان پێ هەڵپچڕم. خەونێکم بۆ "عەلی"یە درێژ دیتووە... ئەویش چ خەونێك. هەتیوە بێناموسە... پێت دەڵێم پووتێك چەند کیلۆیە... ئەوی لەگەڵ منتان کرد، چما خودا هەڵیدەگرێ؟... هەر سێ ژنەکەم، کە لە گیانیان خۆشتر دەویستم، لەبزیان دە لەبزم ناگەڕێ و یەك قسەم لەگەڵ ناکەن. تەنانەت کە سەرجێییشیان دەکەم... ئەدی لە کاتی سەرجێییکردنیشدا... کوا خودا هەڵدەگرێ؟.. تەنانەت منداڵە چەپکەگوڵەکانیشم زار ناکەنەوە قسەیەکم لەگەڵ بکەن. ئای مەرگ لە کوێی ئەو ژیانە لە هەزار مەرگ خراپترە. پێتان وایە تۆڵەت لێ ناکەمەوە؟ پێت وایە بەزەییم بە فرمێسکی چاوتدا دێ؟ ئەمساڵ خوا بۆی گەیاندن. ئیتر تا مردن چاوتان بە مەزرایەکی وەك ئەوە ناکەوێتەوە.

مەمی دیك کە ئاگرەکەی بارە و بار دەکرد، هەموو گیانی لەرزی. لە زۆنگاوە دوورەکەوە قیرەی بۆق هەستا و دەمودەست بێدەنگ بوونەوە. لە تاریکاییەکەدا، لە ئاسمانە پڕ لە ئەستێرە درشتەکانەوە، هەڵۆکان لە پەڵەیەکی کاڵی دوور دوور دەچوون.

"ئەو پیاوەی لە سەر زارکی بیرەکە دانیشتووە، ئاخۆ لە ئاوێنەی ئاوەکەدا دەموچاوی مردووەکە نابینێ؟ ئەو کابرایە مردووەکە...."

مەمی دیك نوقمی ئارەقە بوو. هەواکەی قورس و شێدار بوو. ئاگرەکە بڵێسەی دەکێشا و تین و گەرمایی لە زەوییەوە بەرز دەبۆوە و لە لایەکیشەوە تەپۆ و مێشوولە..

مەمی دیك بیری کردەوە، بێت ئەو پیاوەی لە سەر زارکی بیرەکە دانیشتووە، مردووەکە ببینێ، باشە چ دەکا؟ هەر بە راستی چیی دەکرد؟ هیچ... خاترجەم بوو و بیری کردەوە کە باشە ئەو پیاوە بۆ دەبێ چاو لە ئاوێنەی ئاوی بیرەکە بکا؟ بەخۆی گوت:"بەیانی زوو... نا، سبەی شەوێ، دەچم و مردووەکە لە بیرەکە دێنمەوە دەرێ."

"عەلی"یە درێژ ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و پرسیی:

ـ ئەلیف، ئەو چەند رۆژە قەلافەتی سەفەرت دیتووە؟ هەر سەیری من دەکا و پێدەکەنێ. دوێنێش کە بە تەنیشتمدا تێدەپەڕی، تەشەرێکی هاویشت و گوتی:"دەڵێن مریشکت برژاندووە و خواردووتە... هیچ لێت بە دوور نییە." نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە... تاشباشی سەروەرمان، تۆبە، تۆبە، کارێکی بەجێی نەکرد. ئەو پیاوە چیی لە زاری دێتە دەرێ بە هەمووانی دەڵێ، بەڵام کەس ناتوانێ متەقی لێوە بێ و وەڵامی بداتەوە. پێم وایە شتێکیشی لە بن سەری دایە بۆ من. ئەتۆ رات چییە؟

ئەلیف گوتی:

ـ پێکەنینێکی قۆڕ و بێتامی هەیە. گوندییش هەموو کلکیان لەکلکی ئەو ئالاندووە. ئەتۆ هەرچۆنێك بێ، دەبێ خۆت بگەیێنیتەوە دایکمان. نەکا بەلایەکی بەسەر بێ.

عەلی:

ـ خۆ دەبینی، چۆن و چەندە خێرا لۆکە دەرنەوە. دەیبینی. خۆم پێم سەیرە دەستم وا دێن و دەچن. هەر دەست بۆ لۆکە دەبەم، ئەوەندەی یەك و دوو جەواڵم پڕ دەبن.

ـ هەر بۆیەشە خەریکن شێت دەبن. دەبینن سێ هێندە، پێنج هێندەی ئەوان لۆکە دەرنییەوە. زۆربەش لە بەر ئەوەیە وا تووڕەن، نەك لە بەر کوژران و نەکوژرانی دایە گیان. دایکتیان کردووەتە بیانوو.

عەلی:

ـ هەر گوویەکی پێیان دەخورێ با بیخۆن. با ئەمن قەرزەکانم پاك بکەم و بگەمەوە دایکم...

هەمووان نووستن. ئاگرەکە دامرکایەوە و تەنیا بلێسەیەکی بچووکی لێ مایەوە. شنەیەکی نەرمی دەهات. شەوەکە تۆزێك رووناك بۆوە. کامیۆنێك بە رێگا دوور دوورەکەدا تێپەڕی و دڕی بە تاریکاییەکەی شەوێ دا. دەنگی کامیۆنەکە لە رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دایەوە. عەلی ماوەیەك چاوی لە کامیۆنەکە بڕی. چرای کامیۆنەکە دارستانەکەی رووناك کردەوە.

گوتی:

ـ ئەلیف، ئەلیف.

کە ئاوڕی دایەوە ئەلیف خەوی لێکەوتبوو. بەخۆی گوت:"ئەو داماوە، قەت بەختەوەریی و خۆشیی نەدی. ماندوویەتی لە لایەکەوە و ئەو نەهامەتی و بەلایانەش وا بە سەر گوندەکەمان

دێن، لە لایەکی دیکەوە، دەردی بێدەرمانی دایکیشم دەردی سەرباری دەردانە. کوڕە بنیادەم بەردیش بیێ خۆی پیێ ناگیرێ."

دایکی، یەك بە مەیدان لە خۆڵ و خاکەکەدا کەوتووە. رەگە کەنگرێکی دڕکاویی بە دەستەوەیە. باسکێکی نەماوە. لە بنەوە هاتووەتە دەرێ. لە دوورەوە لە لێژاییە وشك و بەردەڵێنەکەوە، پیرە گورگێکی لەڕ، بە کەلەکەی تێك قوپاو و زمانی دەرکێشراوەوە، بە لارە لار دێتە خوارێ. بۆنی مردووی کردووە. بڕێك دواتر، مرێمۆك لەتوپەت دەکا.

عەلی هەوڵی دا ئەو خەیاڵاتە لە مێشکی دەراوێ. گورگە لەڕەکە و تەرمی دایکی لە پێش چاوی لابەرێ. بەڵام دەتگوت هیچ نەقەوماوە، گورگەکە دیسان بە لارە لار لە لێژاییەکەوە بەرەو تەرمەکەی دایکی دەهاتەوە. لەو لێژاییە بەردەڵێنەوە کە زەوییە پڕ لە دڕوو و داڵەکەی لە بن تاوە بەتینەکەدا قەڵش قەڵشت ببوو...

گورگەکە هات. لە مردووەکە چووە پێشێ. زارە زلەکەی داپچڕی. ددانە سپیەکانی وەدەر کەوتن. مڕاندی، بەڵام نەیتوانی تەرمەکە هەڵدڕێ، ئەو گورگە لاسارە چەند جارێکی لە مردووەکە چووە پێشێ و هەموو جارێش بە زمانە داچۆڕاوەکەیەوە هەر بە لێژاییەکەوە بوو و دیسان بە نێو کەنگرە وشکبووەکاندا بە لارە لار هاتەوە خوارێ.

عەلی بەخۆی گوت:"دەبێ تا زووە خۆم بگەیێنمەوە لای دایکم." و سەری نایە سەر بالیفەکەی و بیری کردەوە:"ئەگەر بەر لە مردنی بیگەمێ.، ئەگەر بیگەمێ..." ئەوجار گوتی:"بەیانی وەڕێ دەکەوم." پێخەفەکەی بەسەر خۆی هەڵکێشا. ئەوجار گەواڵەیەك تەپۆ هرورژمیان بۆ هێنا. عەلی ئەوەندە شەکەت بوو، نەیتوانی دەریان بکا و خەوت.

**گوندی سەبارەت بە مەرگی مرێمۆك گەلێ چیرۆکان دەگێڕنەوە. هەموو رەو رووداوانەش لە رۆژێکی ئەوەندە گەرمدا کە، لە گەرمان کەس هەناسەی دەرنایە، و لە نیوەڕۆیەکدا و کاتی لۆکەڕنینەوە دەقەومێن.**

## ١٥

هەواکەی لە رادەبەدەر گەرم بوو. سریوەی هیچ شتێك نەدەبیسرا. پەڵەی هەورە سپیەکانی سەر دەریای سپییش دیار نەبوون. ئاسمانە ساو و ساماڵ و چۆڵ بوو. تەنانەت باڵندەیەکیش بە ئاسمانەوە نەبوو. سەر رەوەزەکانی ئاناوەرزاش باڵندەیەکی لێ نەبوو. رەوەزەکانی ئاناوەرزا وەك بڵێسەیەکی رەش، لە گەرماکەدا هاڵاویان لێ هەڵدەستا. زەوییە سوورەوەبووەکە، کلۆش و لاسکە گەنمی دووردراوە و ئاوی جەیحان و لۆکەی سپی کە وەك دەمی تیژی چەقۆ دەبریسکانەوە، لە نێوان دەرەوشانەوەیەکی زیویندا هاڵاویان لێ هەڵدەستا.

زەوییەکە دەتگوت ئاسنی سوورەوە کراوە.

ئەلیف قەرتاڵەکەی دەستی فرێ دا. بەرەو ئەو بەرمیلە ئاوە چوو کە برێك لەولاترەوە بوو و قاپەکەی پڕ کرد و هەڵیقوڕاند. ئاوەکە قوڕاوی و زەرد و وەك خوێن، شلەتێن بوو. ئەلیف بە هێمنی و بەدەم پشوودانەوە ئاوەکەی خواردەوە.

پاڵە، بەبێ ئەوەی خۆیان بجووڵێنن، بە سپایی و بە نووکی پەنجەیان لۆکەیان لە قۆزاخەی دەردەکێشا. تەنانەت چڵە گیایەکیش چییە نەدەبزووت. هەر دەتگوت نەك لە بن تیشکی خۆردا، بەڵکو لە بن قورقوشمی تواوەدان. دەستەکانی عەلییش جووڵەیان لێ برابوو و خۆیان لەگەڵ ئەو دنیا بێجووڵەیە رێك خستبوو. چوکووراوا لەوەتەی هەبوو رۆژی ئاوا بێجووڵە و قورس و خەستی بەخۆوە نەدیبوو.

ئەلیف ئەو قۆزاخانەی ژماردن کە لە بە چڵەکەی بەردەستییەوە بوون. بەخۆی گوت:"بیست و هەشت دەنك. ماشەڵڵای خوای لەو بەرەکەتەی." بەبێ ئەوەی بجووڵێ، لۆکەی هەر بیست و هەشت قۆزاخەکەی دەرکێشا. رووبەڕووی ئەو و بڕێك لەو لاترەوە، بڕکە تەماتەیەك سوور دەچۆوە. ئەلیف پێش هەمووان دیتی. بڕکەکە پڕ بوو لە تەماتەی سوور و گەیو. شەپۆلێکی شادی بە دڵیدا هات:"پڵاوەکەی بەتام دەبێ." رێك لەو کاتەدا کە دەیویست خۆی باوێتە سەر بڕکەکە، لە نەکاو دیتی دوو ژن خۆیان هاویشتە پێشی و لە جێی خۆی وشك بوو. ژنەکان دەمودەست بڕکە تەماتەکەیان داڕنی. ئەو بڕکەیەی تاوێك لەوە پێش سوور دەچۆوە، ئێستا هەر لقە رەش و رووتەکانی پێوە مابوە. ئەلیف بڕکەیەکی دیکەی دی. هێشتا نەجووڵابوو کە نزیك بە دە ژنی دیکە هرووژمیان بۆ برد. چیی زیاتر دەچووە پێشێ، بڕکە تەماتەکان پتر دەبوون. کرێکار هەمووی خەریکی تەماتە کۆکردنەوە بوون. ئەگەر حەسەن نەدەبوو، ئەلیف تا دەجووڵایەوە، ئەو شەوە ساوارەکەیان بەبێ تەماتە دەمایەوە. باش بوو لە پێش حەسەنەوە و لە نێو لاسکە بەرز و شینەکانی لۆکەدا، بڕکە تەماتەیەك وەدەر کەوت... و حەسەن دەمودەست، لە چاوترووکانێکدا، بڕکەکەی داڕنی.

تەماتە کرێکارەکانی بووژاندەوە. خێراتر بەربوونەوە لۆکە رنینەوە. هەر هەموو چاویان بڕیبووە دەستەکانی عەلی. خەریك بوون لە داخانی شێت بن. دەیانگوت:

ـ دیارە هەر کەس دایکی خۆی بکوژێ، ئیتر دەستەکانی وەك دەڕاسە کار دەکەن.

ملە درێژ و پڕ لە چرژ و لۆچەکەی زەڵەجە درێژ ببۆوە. لەچکە سپییەکەی خزیبووە سەر شانی و قژە تەنك و خەنەلێدراوەکانی وەدەر کەوتبوون. پرچە هۆنراوە و باریکەکەی لای راستەی دەتگوت کلکە پشیلەیە کەوتووەتە سەر سینگی. زەڵەجە شەلاڵی ئارەقە بوو:

ـ "ساتلمیش" دەیگێڕایەوە. ساتلمیش لە سەربازی رای کردبوو و لە پێشدا سەرێکی لە ئاوایی هەڵێنابۆوە. دەیگوت:"سەت خۆزگە نەچووبامەوە ئاوایی." ساتلمیش دوێنێ هات و ئەمڕۆ رۆیشت. دەیگوت:"لە چیاکان هاتمە خوارێ... ئەوە شانزەیەمین جارم بوو را بکەم. دوازدە ساڵە سەربازم. هەر مانگێکم سەربازی کردووە. لە لایەکەوە لە ترسی ژەندەرمە و لە لایەکیشەوە لە تینوێتیان خەریك بوو بخنکێم. ئاگرم لە هەناوی بەربووبوو. کانیاوی سوورە گوڵ تۆزێك لە پێشمەوە بوو. کەس بەو کانییە نالێ "کانیی سوورە گوڵ". ئەمن ئەو ناوەم لێ ناوە. چەوە سپییەکانی بنی دەبریسکێنەوە. ئاوەکەی دەڵێی سەهۆڵە. شووتییەکی تێبخە، ئەوەندەی یەك و دوو لە نێوەڕاستەوە شەق دەبا. کوڕە خۆ ناتوانی بۆ ساتێکیش پەنجەتی تێدا راگری.

دەبیەستێ. ئەمن ناویم ناوە کانیی سوورە گوڵ. خەڵکی پێی دەڵێن کانیی:"چیلیك بۆیدوران".
خۆزگە نەچووبایەم. گوێم لە دەنگی ناڵینێك بوو. پێم بە عەرزییەوە رەق بوو. سەیرم کرد ئەوە
عەلی سەری دایکیی لە ئاوێك ناوە و لێی گەڕاوە. لاق و جەستەی مرێمۆك لە دەرەوە،
پەلەقاژەیانە. نەنە مرێمۆك خۆی رادەپسکێنێ و پەلەقاژەیەتی. ئەمنیش واقم ورماوە و
راوەستاوم و سەیری دەکەم. کوڕە عەلی زۆر بەقەوەتە. زۆر زۆر... سەری مرێمۆکی لە ئاوەکە
نەهێنایە دەرێ." ساتیلمیش دوای ئەوە دەڵێ:"نەنە مرێمۆك جوولەی لێ بڕا. ماندوو بوو.
لەرزی. دەست و پێی لە بەر یەك کشانەوە و جارێکی دیکەش لەرزی و لاقی راکێشا."
ساتیلمیش دەڵێ:"عەلی سەری داکیی لە ئاوەکە هێنایە دەرێ و لە تەنیشت کانییەکە دەرێژی
کرد. دوای تاوێك، دەستی لە کەلەکەی نا و سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد و ئەوجار
تەنافێکی کە لە قەدی خۆی ئاڵاندبوو، کردەوە و لە لاقەکانی دایکیی بەست و بە لێژاییەکەدا
رایکێشا بەرەو خوار. سەری مرێمۆکی داماو بە عەرزەکەدا دەکشا و قژە درێژەکەی خۆڵاوی
دەبوو. ئەمنیش ئەوە وەشوێنیان کەوتووم و پێ بە پێ لەگەڵیان دەڕۆم. هەر دەڵێی سیحر و
جادووم لێکراوە. عەلی ئاوڕێکی دایەوە و سەیری کرد ئەمن بە شوێنییەوەم. چاوەکانی لە ژێڵلا
هاتن. وەك دوو گۆمی خوێن. بەو چاوانەوە لێم ورد بۆوە. من ترسام و رام کرد. ئەویش کەوتە
شوێنم. ئەمن بە راکردن و ئەو بە غاردان. شەو و رۆژێك ئاوا رامان کرد و من خۆم خستە نێو
شیوی ئاشەکەی هەنارستانەوە و رزگارم بوو. دەمزانی عەلی ناوێرێ لەو شیوە نزیك بێتەوە و
دەترسێ. ماری ئاشەکە بنیادەم بە خڕی قووت دەدەن. عەلی دوو رۆژ برسی و تینوو لە
هەنارستانەکەدا هەر چاوەڕێ بوو و ئەمنیش هەر وەتر. خۆ هاتبامە دەرێ هەر دەیکوشتم.
مارێکی رەشی گەورەم لێ پەیدا بوو و هات و لە بەر کونی کۆنە ئاوەڕۆیەکە پەپکەی خوارد.
سەیرم کرد مارێکی دیکەش هاتووە و ئەوسەری شیوەکەی گرتووە. جا ئەگەر ئازای وەرە و لێرە
بڕۆ دەرەوە. مارێك لەم سەرەی و مارێکیشی لەو سەرییەوە. فکرێکی باشم بەمێشکی دا
هات. بەخۆمم گوت: کوڕە، عەلی دەبێ ئێستا رۆیبێ. جا لە برسانیش زگم بە پشتمەوە
نووسابوو. دەبێ لێرە بڕۆمە دەرێ، بەڵام چۆن؟ رێك لەو کاتەدا مارەکەی لای سەروو، سەری
هەڵێنا. وەك باڵندان بەچاوێك سەیری کردم. لە چاوەکانم ورد بۆوە. ماوەیەك هەر وا سەیری
کردم و ئەو جار بەسپایی خوشی و رۆیشت..." ساتیلمیش دەڵێ:"لە شیوی ئاوەڕۆیەکە هاتمە
دەرێ و خۆم گەیاندە چوکووراوا. ئێستاش ئەوە لێرەم." ساتیلمیش دوێنێ بەیانی عەلیی دیت
و وەك مێژۆکە دەستی کرد بە لەرزین. وا دەلەرزی هەر مەپرسە. لە کەڕەی بەیانییەوە لەرزی

هەتا شەویّ. زاری ببووە تەڵەی تەقیو. لاقەکانی رەق ببوون و دەلەرزی. کە خۆر ئاوا دەبوو، سەری هەڵێنا و ماوەیەك سەیری ئاسمانی کرد. ئەوجار لە پڕ دەرپەڕی. بە دەم راکردنەوە هەرای دەکرد:"خوایە گیان فریام کەوە. "عەلی"یە درێژ هات، کوڕە فریام کەون...."

دەموچاوی زەڵەجە پڕ بوو لە چرچ و لۆچ. پێستی تاو بردبووی و وەك چەرمی لیّ کردبوو. رۆژ بە رۆژ ملی درێژتر دەبۆوە دەیگوت:

ـ هەی خوا بتبڕیّ چ گەرمایەکی. ئێستا گەرماکە بە لایەکی، ئەو ئاوە قوڕاو و شلەتێنەش هەر بنیادەم دەکوژیّ. نەحلەتی خودا لەو تەپۆیانەی چوکووراوا. لەحنەت لە تاشباشی سەروەرمان. ئێستا کە چووەتە ریزی چل سوارەوە، لانیکەم دەکرا کارێکی وا بکا خودا رسق و رۆزییەکەی ئێمە لە جێیەکی دیکە ببڕێتەوە و لەو دۆزەخەی چوکووراوا رزگارمان بوایە...

لە دوورەوە، لە باکوورەوە، چیاکانی تۆرووس کە دەورانەدەور دەشتێکی پان و بەرین و رێکیان لەخۆ گرتبوو، نوقمی رووناکایی و تەم و مژ بە رەنگە خۆڵەمێشییەکەیەوە، هەر دەتگوت سات بە سات کاڵ دەبێتەوە و دێتە خواریّ و وەك بڵێی وردە وردە لە چاوان ون دەبیّ، وەك هەورێکی خەست لەو بەری زەوییە پان و هەراوەکەی چوکووراوا نیشتبۆوە.

کرێکار نوقمی ئارەقە بوون. بە هانکە هانك سەیری لای باکوور و ئاسمانی سەر دەریای سپییان دەکرد. هەورە سپییە لۆکەییەکان هەڵنەدەستان، هیچ سەر و سۆراغێکیشیان نەبوو. هاتنی ئەو هەورانە بەو مانایە بوو کە بای رۆژاوا خەریکە هەڵدەکات. ی

گۆملیکسیز ئۆغلۆ:

ـ زۆر گەرمە. ئەمڕۆ برژاندینی. ئەو هەورە نەحلەتییەش خۆ دەرناکەویّ، ئەو با نەحلەتییەش خۆ هەڵناکا. خۆ یەك دوو ئەعاتی دیکە ئاوا بیّ، هەر هەمووومان دەپیشێین و هەڵدەقرچێین.

جامانە بەسەر جامانەیان و ژنان لەچك و دەسماڵ و لاپێچیان لە سەریان لابرد. یەخە و بەرۆك کرانەوە. بۆنی ئارەقە چەور و خەستەکە وردە وردە لە گەرماکەدا نیشتەوە. بۆنی ترشاوی ئارەقە و بۆنە تاڵەکەی لۆکە تێکەڵاو دەبوون و لە چەقی گەرماکەدا دەنیشتەوە.

برێك لە پێشتریانەوە، شتێك لە سەر لاسکە لۆکەیەك دەدرەوشایەوە و دەکوژایەوە و بریقەی دەدایەوە. حەسەن پەلاماری دا. دەعبایەکی درشت بوو، پێستێکی رەقی هەبوو بە هەزار و یەك رەنگەوە... کەسك و خەت خەتی سووری گەش و شین و کریستاڵی و رەنگی زردی جۆراوجۆر... ئاسك و تورت... حەسەن دەعباکەی گرت، سووڕاندی و سەیری کرد و ئەوجار

هێـور لـه سـەر لاسـكێكی دیكـەی دانایـەوە. دەعباكـە لـە سـەر ئـەو لاسـكەش هـەر وا دەبریسكایەوە. حەسەن چاوی پڕ بوون لە ئاو.

ئاشقە كەچـەڵە، وەك سـاز لـێ بـدات، بـەرەو پێشـەوە نوشـتابۆوە و بـەبێ ئـەوەی سـەیری دەورپشتی خۆی بكا، بەبێ جووڵە وەك پەیكەرەیـەك لۆكـەی دەڕنییـەوە. بـەرۆكی كراسـەكەی ئاوەڵا كردبوو و تووكە سپی و درێژەكانی سینگی كەوتبوونە دەرێ.

ئۆمەخانیش چاوی پڕ بوون لە فرمێسك.

كوڵمەی كچەكەی قیرسمایل سوور سوور بوون. تاو بردبوونی و تورت و هەوەس بزوێن بـوون. مەمكە خڕەكـانی لـە بـن كراسـەكەیەوە كەروێشكەیان دەكرد. سـەیری چاوی یـەك بـە یـەك پیاوەكانی نێو ریزەكەی كرد و هەر دەهات و گەرم دادەهات و ئاگری تێبەردەبوو.

ـ لە ئەشكەوتەكەی پەرییان مریمۆك دەلالایەوە:"عەلی، چما ئـەتۆ كـوڕی مـن نـی؟ چما شیری ئەو مەمكانەمت نەخواردووە؟ عەلی، كوڕم بنیادەم چۆن دڵی دێ دایكی خـۆی بكـوژێ؟ مەمكوژە عـەلی، هەر كەس دایكی خۆی بكوژێ، قەت ئـازاو رزگـار نـابێ عـەلی، مـەمكوژە عەلی، باشە رۆڵە لەو گوندە بە تاقی تەنێ دەمێنمەوە تا ئەتۆ دەگەڕێیتەوە." شەوێ تا بەیانی و بەیانی تا شـەوێ لـە بـەر عـەلی پاڕایـەوە. عـەلی نەیكوشـت. بـەلام بـە پـەتێكی ئەسـتوور مریمۆكە لیقەوماوەی لە دارە كاژەكەی بەر زاركی ئەشكەوتەكە شـەتەك دا و گـوتی: " دایـە، هەتا ئێمە دەگەڕێینەوە ئەتۆ لێرە بە. ئەو رۆژەی گەڕامـەوە دەتكەمـەوە." ــ "كـوڕە عـەلی، عەلی، ئەوە زۆر لە مەرگەكە خراپترە، دەسـت و پـێم بكـەوە عـەلی ی ی ی ی". عـەلی دوور كەوتبۆوە و رۆیـشتبوو و دەنگـی مرێمـۆكی نەدەبیـست كـە لـە كێوەكانـدا دەنگـی دەدایـەوە. زایەڵەی دەنگی مرێمۆك لە چیاكان دەئالا و ئەشكەوتی پەرییانی دەلەرزاندەوە. شـەو داهـات، ئەستێرەكان هاتنە دەرێ و لوورەی گورگان بەرز بۆوە. هەر شێو و دۆڵێـك و دەنگـی گـورگێكی لێ دەهات...

ـ كێ شتی وای دیتووە؟ كامە هیچ و پـوچ و چـەپەڵ؟... باشـە ئـەی بۆچـی مرێمـۆكی لـە دارەكە نەكردووەتەوە؟

بێدەنگییـەكی خەسـت و زۆر و مـەرگبار بـاڵی بەسـەردا كێـشان. هـەمووان وشـك بـوون و دەستەكانیان لە جووڵە كەوت. لە نەكاو دەنگێك هەستا:

ـ ئەمن دیتم.

دەنگێكی دیش:

- ئەمن دیتم.

"عەلی"یە درێژ کە وەخۆ هاتبۆوە و دەستەکان وەك جاران هەر خەریك بوون. تاوێکی دیکە جەواڵەکەی پڕ دەبوو لە قۆزاخە.

ئەو فڕۆکە شەڕکەرانەی بە هاش و هووش لە فڕۆکەخانەکەی ئەنجیرلیکەوە هەستابوون، هەواکەیان هەڵمژی و لە زۆر زۆر نەوی بە سەر سەریاندا تێپەڕین و بەرەو چیاکانی تۆرووس چوون و تاوێك دواتر لە پشت لووتکەی چیاکان لە چاوان نەدیو بوون. بە شوێن ئەواندا پۆلە فڕۆکەیەکی دیکەش هاتن و رابوردن. لەگەڵ تێپەڕینی هەر دەستە فڕۆکەیەکدا، کرێکارەکان دەستیان لە کاریێ هەڵدەگرت و قیت رادەوەستان و هەتا فڕۆکەکان لە نێو تەم و مژەکەی تۆرووسدا لە چاوان ون دەبوون، هەر سەیری ئاسمانیان دەکرد و دیسان ملی دەنایەوە لە کارکردنێ. فڕۆکە هەتا ئێواریێ هەر هاتن و بە سەر سەریاندا تێپەڕین و لە مژەکی تۆرووسدا ون بوون.

زۆر زۆر گەرم بوو. کرێکارەکان روویان لە لای تۆرووس بوو. چیاکانی تۆرووس دەتگوت تواونەتەوە و بوونەتە تەم و مژ، نوقمی تیشك، جارێك نەدیو دەبوون و تاوێکی دیکە وەك پشتوێندێکی باریك، شینایییە کاڵەکەی دەشتەکەیان لە ئامێز دەگرت.

چیاکانی تۆرووس هەر جارێکی گەرماکە بە تەوژم دەبوو، هەر ئاوا ون دەبوون و بە دیار دەکەوتنەوە... کرێکارەکان بە تەنێ لە ریزێکدا کاریان دەکرد. وەك دەنکە تەسبێحی رەنگاوڕەنگ. لە دەشتە رێك و کاکی بە کاکییەکەدا، بنیادەمەکان لە دوورەوە دەتگوت مێروولەن و جووڵە ناکەن و لە جێی خۆیان چەقیون. هەر دەتگوت کار و پیشەیان ئەوەیە دەشتە زەر و تۆخ سەوز و پڕ لە بریسکە بریسك و خۆڵاوییەکە، بە رەنگی دیکە برازێننەوە.

- لووتی مرێمۆك راساوە. خوێن دڵۆپ دڵۆپ دەڕژێتە سەر خۆڵەکە و ون دەبێ. دەستەکانی مرێمۆك تا مەچەکیان لە خۆڵەکە رۆچوون. مرێمۆك بە گاگۆلکێ خۆی راکێش دەکا. لاقەکانیشی هەتا گوێزینگان لە خۆڵدان. دەموچاویشی خۆڵاوییە. لەوانەشە هەرچی خوێنی هەیەتی بە خوڕ لە لووتییەوە بچۆڕێتەوە. هەوسارێك لە گەردنی مرێمۆك دایە و سەری دیکەی هەوسارەکە بە دەستی ئەحە شێتۆکەوەیە... قەمچییەکیشی بە دەستەکەی دیکەوە و مرێمۆك بە دوای خۆیدا رادەکێشێ و هەر کات حەزی لێ بوو دەگەڕێتەوە چەند قەمچییەکی دەگەیێنێتێ. گەیشتنە بەردەڵێنێك، ئەحە شێتۆکە مرێمۆك بەو نێو وردکە بەرد و چەوەدا رادەکێشێ. دەستەکانی مرێمۆك شەڵاڵی خوێنن. بەردە تیژەکان دەستیان بڕی. هەر دوو کیان

پێکەوە لە ڕەوەزێك خلۆر بوونەوە. مریەمۆك سەرتاپێی خوێناوییە. لە مل و باسك و پانیێ قەڵشیوەکانییەوە خوێن دەچۆڕێتەوە. لە زارییەوە کەف و خوێن دێتە دەرێ. مریەمۆك لە سەر ڕەوەزەکەوە کەوتە نێو شیوەکە و ئەوجار هەستایەوە و خۆی بە سەر تاتە بەردێکی سپی دادا. چنجرووکی لە بەردەکە دادەگرێ و دەیرِنێ. دیسان هەڵدەستێتەوە. چاوەکانی وەك چاوی بۆق دەرپۆقیون. پشتی شکاوە... خێچ و خوار بووە... خوێن دادەنێ... هەوسار لە ملدا... ئەحە شێت لەولاترەوە، لە سەر بەردێك دانیشتووە و بێخەم و خەیاڵ بە مریەمۆك پێ دەکەنێ. "عەلی"یە درێژیش لە سەر بەردێکی دیکەوە ڕاوەستاوە. مریەمۆك عەلیی دیت. دەنگی دەرنایە. لە بەر عەلی دەپاڕێتەوە، بەڵام دەنگی دەرنایە. باشە بۆ دەنگی نییە؟ دەڵێ چی؟ دەپاڕێتەوە، کەچی دەنگی دەرنایە. ڕەوەزەکان لە بەر گەرماکە سوور دەچنەوە. گڕیان گرتووە. بۆوەی نابن دەستیان لێ بدەی. دڵۆپە خوێنی مریەمۆك بە سەر ڕەوەزەکەدا دەتکێ و دەمودەست دەبێتە هەڵم. مریەمۆك دەپاڕێتەوە، دەلاڵێتەوە. ئەحە شێتۆکە بە تووڕەییەوە لاقەکانی مریەمۆك دەگرێ و هەڵیاندێنێ و پەیتا پەیتا بە ڕەوەزەکەیدا دەکێشێ. مریەمۆك هێشتا زیندووە و تەنیا چاوەکانی وەك چاوی بۆق دەرپۆقیون. خوێنەکەی دەبێتە هەڵم و هەڵدەستێ. مریەمۆك لە سەر بەردەکە دادەنیشێتەوە. سەری پەتەکەی ملی بە دەستی ئەحە شێتەوەیە... "عەلی"یە درێژ لەولاترەوە دەستی بەرداوەتەوە و ڕاوەستاوە. مریەمۆك خۆ لە بەر کەس ناپاڕێتەوە، غیرەتی ئیزنی وەی پێ نادا، بەڵام ئێستا دەلاڵێتەوە و دەپاڕێتەوە. ئەوە گیانە و گاڵتەی پێ ناکرێ گیان شیرینە. لەو دنیایە هیچ شتێك لە گیان شیرینتر نییە و بنیادەم بۆ گیانی خۆی دەپاڕێتەوە. چەندە باش دەبوو کە بۆ گیانیش نەپاڕابایەوە و ملی کەچ نەکردبایە. چەندە باش دەبوو بنیادەم غووروری خۆی بۆ هیچ شتێك نەشکاندبایە. بەڵام مریەمۆك دەپاڕێتەوە. دەنگی دەرنایە. ئەحە شێتۆکەش، شێتانە پێدەکەنێ.

ـ عەلی، عەلێ، کوڕە چما ئەتۆ دڵت نییە؟

ـ چما دڵی تۆ دار و بەردە کوڕم؟

ـ مریەمۆك نامرێ... بەڵای گیانتە. هەتا تۆڵەی ئەو کارەت لێ نەکاتەوە نامرێ... لێی دەدەی، دەیشکێنی، دەیکوژی، ورد ورد دەیئەنجنی، ئاگری دەدەی، بەڵام مریەمۆك نامرێ.

"گیایەکی نەمرە" مریەمۆك. عەلی، عەلی، هیچ بەزەییەك لەو دڵەتدا نییە؟

ـ دڵی عەلی لە ئاسن و بەردە.

ـ عەلی، عەلی، ئەتۆ ڕێت دەکەوێ* کوڕی مرێمۆك بی؟ دایکی دایکانە مرێمۆك. ڕێی دەکەوێ دەست ڕاگری و بە سەریدا بڕوات. ڕێزی بگرن و هەموو بەیانی و شەوان دەستی ماچ بکەن. عەلی، عەلی، باشە تۆزێك، هەر تۆزێك ئینسانییەتت تێدایە؟

ـ دڵی عەلی، لە دار و بەردە.

ـ وەڕێ کەوت. لە شیوەکەدا نەمایەوە و وەڕێ کەوت. زۆر کەوت و هەستایەوە. شەوێکیان بە دارێك هەڵگەڕا و شەوێکیان بە کەوتن و هەستانەوە خۆی گەیاندە کۆنە گۆڕستانێك. لە بن دارەکەی چاکی نووست. چاوەکانی هەڵێنا و سەیری کرد ئەوە دارە گوێزەکە نوقمی نوور و ڕووناکییە و دەدرەوشێتەوە و شەوەکەی کردووەتە ڕۆژی ڕووناك و خەریکە لە چیای تۆرووسەوە بەرەو خوار دەکشێ. مرێمۆك لە نێوەڕاستی کۆنە گۆڕستانەکەدا دەکەوێ. بەیانی سەیر دەکا ئەوە لە نێوەڕاستی گۆڕەکانە. هەموو تینی خۆی دایە لاقەکانی و ڕایکرد، چەندی ڕایکرد، هەر نەیتوانی لە گۆڕستانەکە بچێتە دەرێ. سێ شەو و ڕۆژان ڕایکرد و ڕزگاری نەبوو. بە ترس و لەرزەوە و بە ههانکەهانك لە گۆڕستانەکەدا بە دەوری خۆیدا خولایەوە و لە تەنیشت کێلێکەوە و لە بن دارە چنارێکی نێو کلۆر و سەرشین، کە قەدی دارەکە هەر توێکڵێکی هێندەی پەنجەیەکی لێ مابۆوە، کەوت و جووڵەی لێ بڕا. لك و پۆی دارەکە شین بوون. مارێکی ڕەش لە لکە شینەکەی دارەکە هاڵابوو. مارێکی درێژ بوو. ڕەش ڕەش. مارەکە لە لکەوە بەرەو خوار دەخوشی، دەخوشی و دەخوشی... ئێستا تەنیا سەری کلکی بە دارەکەوە مابۆوە. هەناسەری وەدەموچاوی مرێمۆك دەکەوت. درۆشە سێ چوکڵە سوورەکەی دەرکێشابوو. سوور سوور وەك بڵسەی گڕ. مرێمۆك چ بکا؟ هاوار بکا؟ خۆ دەنگی دەرنایە. ڕا بکا؟ خۆ لاقی لە دوو نایە. هەناسەی مارەکە وەك بڵێسەیەك بە سەر دەموچاوییەوەیە. مارەکە پەپکەی خوارد. وەك بەردێکی ڕەشی گەورە. بە خێرایی هات و لە سەر سینگی مرێمۆك کەوت. مرێمۆك تەنانەت نەیتوانی "ئاخ"ێکیشی لە زاری دەربێ و گیانی دەرچوو... عەلی، عەلی! چما ئەتۆ هیچ... مەگەر ئەتۆ... مەگەر ئەتۆ... هیچ ، دین و ئیمان و بەزەییت نییە؟ ... عەلی، عەلی! تۆ ئازا و ڕزگار نابی. شیری دایکتت لێ حەرام دەبێ و تۆڵەت لێ دەکاتەوە.

ـ دڵی عەلی لە دار و بەردە.

---

* ڕێی ناکەوێ: لە موکریان، واتە شیاوی ئەوە نییە. بە بابییەوە ڕێی ناکەوێ کچی منی بووك بێ... واتە بە خۆی و باوکیشییەوە شیاوی ئەوە نییە...

چەند پەڵە هەور لە ئاسۆی دەریای سپییەوە هەستان. بایەکی نەرمیش هەڵیکرد و لەشی کرێکارەکانی فێنك کردەوە و نیشتەوە. لەو ڕێگە و بانانەوە کە وەك داوی جاڵجاڵۆکە دەشتەکەیان گرتبۆوە، توێژێکی تۆز و خۆڵ هەستا و نیشتەوە. تەنانەت ئەو کزە بایەش گیانێکی وەبەر کرێکارەکان نایەوە. دورمووش تێی هەڵکرد ** و دەست و پەنجەی پاڵە کەوتنەوە کار.

لە باشوورەوە و لە سەر دەریای سپییەوە، پەڵە هەورێکی گەورە، گەورەتر بۆوە و بەرزتر چوو.

مام هەلیل بە دەستی ڕاستەی بڕۆ سپییەکانی هەڵدانەوە و ڕووی لە باشوور کرد:

- ئەمڕۆ بای ئێواریێ، زۆر فێنك و توند و بە تەوژم دەبێ. لەوانەیە بارانیشی پێوە بێ.

- خۆش خەبەر بی مام خەلیل. بە هاوینان لە چوکووراوا باران ناباریێ.

هەورە سپییەکان هەر هاتن و زۆرتر و بەربڵاوتر بوونەوە، ڕوونتر بوونەوە، پتر هەڵکشان و هەموو ئاسمانەکەی سەر دەریای سپییان داپۆشی. لە نەکاو بایەکەی ڕۆژاوا تەقییەوە و گرماندی.

لە جادە و ڕێ و بانەکانەوە، تۆز و خۆڵ بەرز بۆوە. گێژەڵووکەی سەر ڕێیەکان گەورەتر بوونەوە و بەرەو تۆرووس کشان. ئارەقەی لەشی کرێکارەکان وشك بۆوە.

دەموچاوەکەی "عەلی"یە درێژ درێژتر بۆتەوە. پێستە تاوبردووەکەی پڕ لە چرچ و لۆچ و دەبریسکێتەوە. نێوچاوانی گرژە و ژەهری لێ دەباریێ. لێوەکانی دەلەرزن. دەستەکان لە بەر لەرزینێ، رادەوەشێن و چاوەکانی دەڵێی دوو پیاڵەی خوێنن. دەڵێ:

- ئەمن دایکمم نەکوشتووە. وەڵڵا بیللا نەمکوشتووە. چما پیاو دایکی خۆی دەکوژێ؟ کوڕە دەستم لە ئێخەی بکەنەوە و لە کۆڵم بنەوە. بە زیندوویی کەوڵم مەکەن. چەندی چەند ساڵە ئەمن دەناسن، یانی ئەمن پیاوێکم داکی خۆم بکوژم؟ بە دایکمم گوت:"دایە گیان، نەنە مرێمۆك، لەگەڵ وەرە بۆ چوکووراوا، وەك ساڵی پێشوو لە کۆڵمت دەکەم و دەتبەم. ئەگینا بێت و بە تەنێ لێرە بەجێ بمێنی، گوندی هەر کەوڵم دەکەن و دەمخۆن." نەهات. گوتی:"ئەمن چم بە گوندی. ئەمن لە ئاواییەکەی خۆم دەمێنمەوە. بە خێر و خۆشیی دەژێم. گوو بەو نەریتە. لێگەڕێ با ئەو پیرانە نەچنە چوکوور." ئەدی، دایکم وای گوت و پێی چەقاند. ئەلیف بەشی دوو مانگ نانی بۆ بەجێ هێشت. ئەمنیش هەنگوینی سێ پوورەم دەرهێنا و بۆم دانا. لەگەڵ دوو بزنی شیردەر و سی مریشکیشم دۆزییەوە و بۆم برد. گۆزەیەکیش ڕۆنی زەنگ... هەرچی بنیادەمێکی پیر پێویستیی پێی دەبێ، سێو و هەرمێی لێرەواریش پێ گەیون. گوڵیش

---

** تێی هەڵکرد: واتە دەستی کرد بە گۆرانیگوتن. گۆرانیگوتنی لە نەکاو.

پشکووتوون. لە لێڕەوارەکە پنگە هێندەی باڵای پیاوێك هەستاوە و دەوری کانییەکان....
دایکم لە ئاواییەکە مایەوە. ئەحە شێتیش ئەوە لە ئاواییەکەیە... دوو بە دوو، دەخۆن و دەخۆنەوە و پڕیسکەی دڵ بۆ یەکتری دەکەنەوە. دایکم خەمی هیچی نییە. شیر و هەنگوین و ڕۆنی کەرەی لە بەر دەستانە. ئەمن دایکمم نەکوشتووە. بڕوا بکەن برادەرینە. خۆ ئەمن هەتا لۆکە تەواوبوونێ لە چوکوور نامێنمەوە. ددانم بە جەرگی خۆمدا گرتووە و بۆیەش وا بە پەلەپەل و خێرا کار دەکەم، بۆ ئەوەی زوو لێ ببمەوە و خۆم بگەیێنمەوە دایکم. هەر ئەوەندەی بەشی قەرزەکانی عادیل ئەفەنی لۆکە بڕنمەوە، دەمودەست دەچمەوە لای دایکم. چیا و چۆڵ و دەشتان دەکەمە هەنگاوێك و خۆم دەگەیێنمەوە دایکم. ئێستا دایکم ئەوە لە ماڵەوەیە و لە سەر کانییەکە نوقمی عەتر و بۆن و بەرامەی پنگەیە. لە بن دار کاژ و سنۆبەرەکانە و لە بن ئاگرە سوورەکە مریشك سوور دەکاتەوە، دۆی فێنکی بەسەردا دەکا و مریشکەکە لەگەڵ دۆ دەخوات. مریشکی چەور و دۆی فێنك... بۆن و بەرامەی سنۆبەر و بای فێنك... بایەکی فێنکی دێ... فێنك فێنك ... تەنانەت تاوەکەش گەرمی ناکا. مێش و مەگەزیش دیار نین. ئاخ کوڕە ئێرە چەندە گەرمە. باش بوو دایکم نەهات. وەلییەکەشمان سەردانی دەکا. تاشباشی مەزنمان دەستەکانی نەنە مرێمۆك ماچ دەکا. نەنە مرێمۆك قسەی لەگەڵ دەکا. چونکە نەنە مرێمۆك بنیادەم نادوێنێ، بەڵام قسە لەگەڵ چل پیاوچاکەکە دەکا، سەت بریا ئەمن لە جێی ئەو بوایەم، ئەمن بوایەم لە بری ئەو، بەڵام مخابن...

گێژەڵووکەیەك بە سووڕەسووڕ دەهات. گێژەڵووکەیەك کۆڵەکەی کردبوو هێندەی دوو یان سێ منارە. لۆکەڕن ماوەیەك لە گێژەڵووکەکەدا مانەوە. "عەلی"یە درێژ یەك پشوو باسی دایکیی دەکرد. زار و لووت و هەموو دەموچاوی پڕ ببوو لە خۆڵ، خەریك بوو دەخنکا... بەڵام بێ پسانەوە باسی دایکیی دەکرد. گێژەڵووکە تێپەڕی و دوور کەوتەوە، بڕێکی لە گەڵای لۆکە و گەڵا گەنمەشامی و پووش و پەڵاشەکان لەگەڵ خۆی برد و لەچکەکەی سەری فاتمۆکێشی ڕفاند و بە سەر ئاوەکەی جەیحانێی دادا. کرێکارەکان سەرتاپێیان سپی ببوو، برۆ و مژۆڵ و دەست و پێ و قژ و جلورەگەکانیان نوقمی خۆڵ و سپی ببوو.

ـ دڵی عەلی، لە بەرد و ئاسنە.

زۆر گەرمە... دڵۆپ دڵۆپ خوێن بەسەر ڕەوەزە سوورەوەبووەکاندا دەچۆڕێتەوە و خوێنەکە دەچۆڕێتەوە و دەمودەست لە سەر ڕەوەزەکە دەبێتە هەڵم.

کوێخا سەفەر بەو برینە بێ دەرمانەی لە سەر دڵییەتی، بە بێزاری و توورەییەوە و بەردەوام چاڵ بۆ عەلی و گوندییەکان هەڵدەکەنێ و داویان بۆ دەنێتەوە. لە دنیادا بنیادەمە بەدفەڕ و چەپەڵەکان، کار و پیشەیان هەر ئەوەیە کە بنیادەمەکان تووشی چارەڕەشی بکەن. ئەو داوانەی دەینێتەوە، کاریگەرن. خاکی ئەو دنیایەی ئەمڕۆ بۆ وەبەرهێنانی تۆوی رق و نەفرەت و ئەو خراپەکارییەی مرۆڤ دەیچێنێ، لەبارە. سەفەر پەنا بۆ هەموو خراپەیەك دەبات بۆ ئەوەی دەست و پێی عەلیی پێ شەتەك بدات و گورزی گورچووبڕی خۆی لێ بوەشێنێ. دوایی ئاوی گوێی گوندییەکان دەداتەوە. کوێخا سەفەر ئامادەیە بمرێ، بەڵام تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە. با گوندی چەندەی کەیفیان دێنێ، نەیدوێنن. کوێخا سەفەر دەزانێ چییان لێ دەکا.

## ١٦

سەفەر گرماندی:

- وەرە بزانم. بە دوومدا وەرە. چەند قسەیەکم پێتە. ئەم جارەیان دەبێ ئەوەی من دەیڵێم بیکەی. جاری پێشوو ئەگەر بە قسەت کردبایەم، ئەو بەڵایەی تاشباش ئۆغڵومان بە سەر نەدەهات و ئەمن تووشی ئەو حاڵ و رۆژە نەدەبووم.

دەڕۆیشت و بەبێ ئەوەی ئاوڕێك بداتەوە قسەی دەکرد. عومەریش پێ بە پێ بە شوێنیدا دەڕۆیشت و بیری دەکردەوە. دەیویست بزانێ چ باسە. هەر جارێکی سەفەر بانگی دەکرد و ئاوا دەیبردە شوێنی چۆڵ، دیار بوو شتێکی لە بن سەریدا هەیە. دڕکەکانی داری "بابادەم" بە

شەڵوارەکەیەوە دەنووسان. لە دڕکەڵانەکە تێپەڕین و گەیشتنە دەم چەمی جەیحان. جەیحان لەو خوارەوە وەك جۆگەیەکی کەسك و مەند و تار دیار بوو. ئاوێکی تۆخ سەوز، سەوزێکی وەك ژەهر، ڕەنگێکی نامۆ و پڕ لە سێبەر. بە دەوری پنچکە دڕکەدارە تووتڕکەکەدا سووڕانەوە و لە کەندێك چوونە خوارێ و گەیشتنە لمەکەی دەم ئاوەکە. سەفەر لە پێشەوە و عومەر بە دوایدا، بە دەم چەمەکەدا بەرەو خوار چوون.

لە کەناری چەمەکەوە جێ پێی سەیر و سەمەرە تێکەڵ ببوون. جێ پێی کەروێشك، چەقەڵ و سەگ و سمۆرە و سەگلاو و باڵندەی جۆراوجۆر... عومەر سەیری شوێن پێیەکان و لە هەمووشیان پتر سەیری جێ پێی سەفەری دەکرد.

ـ هەموو چوکووراوا بەو شتە دەزانن. لای کەس سەرم هەڵنایە و هەروەها لای کەس ئابڕوو و حەیام بۆ نەماوەتەوە. لە ئەنکەرەوە تا ئەدەنە باس باسی منە و لەو دنیایەدا حەیا و شەرەفم چووە. بێ ئابڕوو، بێ ئابڕوو. لە ئەدەنە باسی من دەگێڕنەوە و پێ دەکەنن. دەچمە هەر کوێ، هەر کەس بمناسێ و بزانێ کێم، لە بەر پێکەنین دەست بە زگییەوە دەگرێ. لە چوکووراوایەکی ئاوا گەورەدا، کەس نییە ئاگای لە سەربردەی من نەبێ. هەر لە حەوت ساڵانەیانەوە بگرە تا پیری حەفتا ساڵەیان. کەس نییە ئاگای لەوە نەبێ. بوومەتە بنێشتە خۆشکەی سەر زار و زمانان. بەسەرهات و باس و خواسی من بووەتە نوقڵی مەجلیسان. کوێخایەك کە گوندییەکانی خۆی نایدوێنن... تەنانەت ژنەکانیشی و منداڵەکانی و خزم و کەسەکانیشی نایدوێنن. تاشباشی سەروەرمان و وەلیی وەلییەکان کاتێ دەچوو بۆ لای چل سوارەی غەیبی، ئەمری کردبوو بە گوندییەکان، ئەمان و سەد ئەمان نەکەن بچن تاشباش بدوێنن ها. نەیدوێنن. بەڵێ. ئێستا لە هەموو چوکووراواش ئەو نەقڵە دەگێڕنەوە و پێم پێ دەکەنن. عومەر، پێت وانییە بەو دەردەوە بمرم؟ هەروەها، ئەی خوشکەزاکەی خۆم، ئەی برای خوێنیم، هەموو منداڵ و ژن و خزم و کەس و کار و هەروەها هەرچی ماڵ و سامانی هەمە لە لایەك و تۆ عومەرەکەی خۆم لە لایەك. وەرە بڕوانە خاڵی خۆت بووەتە گەپجاڕ و مەسخەرەی عالەمێ... مەسخەرە... گوێت لێمە؟ مەسخەرە... ئەمن چۆن دەتوانم ئەوە قەبووڵ بکەم؟ ئەمن چۆن بەو ناوزڕاوییەم نەمرم؟ ئەو ناوبانگە ناشیرنەم نەوە دوا نەوەش هەر نامێنێتەوە؟ بە سەرهاتی ئەو پیاوەی هەتا مردیش کەس نەیدواند، پیاوێك کە کوێخاش بوو، بۆ یەکتری ناگێڕنەوە؟ لە تاریخدا نایینووسن؟ کتێبی گەورە گەورە... حوکمەتەکان... چوکووراواییەکانیش نامدوێنن. ئاخر گەمژەیینە، چما ئەو تاشباش ئۆغڵووە شێتە ئەمری بە ئێوە کردووە نەمدوێنن؟ ئەو بە گوندییەکانی خۆمانی گوتووە و هەروەها ئەی سەگەلی چوکووراوا، ئەو کارە بە ئێوە چی؟

هەروەها بەنگۆ چی؟.... باشە نا، نا بەنگۆ چی؟... ئەگەر ئێمە هەر ئەویٚ شەویٚ تاشباشی مەزنمان کوشتبایە...

سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و تفێکی گەورەی رۆکرد و گوتی:

ـ هەر ئەلێرە راوەستە بزانم. چەند قسەیەکم پێتە.

عومەر رۆڵەم سۆمای چاوانم و هەروەها گەورە دارەکەی تۆرەمەی من.

لە سەر تاتە بەردێك دانیشت و گوتی:

ـ وەرە ئێرە و رووبەڕووی من دانیشە عومەر.

لەبزی قسەکردنەکەی خۆمانە و نەرم و نیان بوو. هەر کات دەیویست عومەر کارێك لە ملی عومەر بپەستێویٚ و بە ناچاری پێی بکا، دەراوی زاری ئاوا خۆش دەبوو. ماوەیەك بەبیٚ ئەوەی چاو بترووکێنیٚ، چاوی لە چاوەکانی عومەر بڕی. ئەوەش یەکێك لە عادەتە کۆنەکانی بوو. عومەریش سەری بەردابۆوە و دەیویست بزانیٚ ئەو پێشنیارە گرنگە چییە و بەبیٚ ئۆقرەییەوە چاوەڕوان مایەوە.

دەستی برد و مەچەکی عومەری گرت. دەستەکانی وەك ئاگر وا بوون. دەی قسە بکە دەی. خەریکە شێت دەبم. قسە بکە دەی. لانیکەم تۆ بمدوێنە. وەرە قسە بکە. کوڕە وەختە شێت بم، قسە بکە دەی. قسە بکە و پێشنیارێکیشم بۆ هەیە. کارێکی گەورەمان هەیە. دەی باشە قسە بکە، قسە بکە و پێم بڵێوە خاڵە سەفەر.

بێدەنگ بوو و چاوەڕیٚ ما. دیسان بەبیٚ ئەوەی چاوی بترووکێنیٚ، چاوی تێوە بڕیبوو. عومەریش وەك بەرد بێدەنگ بوو.

ـ دەزانی چییە عومەر، ئەو تاشباش ئۆغڵوە وەلی نەبوو. گوندییەکان کردیانە وەلی. ئەویش لە داماوی و چارەڕەشیی خۆیان بە شوێن پاڵپشتێکەوە بوون. ئەو تاشباشەیان وەچنگ کەوت و پەڕ و باڵیان وێخست و لە سەر تەختی وەلییایەتییان دانا. ئەویش یەکسەر باوەڕی کرد کە بووەتە وەلی. چما وەلی رەق هەڵدیٚ و دەمریٚ؟ دەی پێم بڵیٚ دەی، چما دەمریٚ؟...

عومەر ئەگەر توانیبای قسەی لەگەڵ بکا، بە سەریدا دەینەڕاند:"تاشباشی مەزنمان نەمردووە، چما نەتبیست نایب عەریف (ئۆنباشی) چیی گوت؟ گوتی بوو بە نوور و بەرەو لووتکەی چیاکان چوو." بەڵام نەیتوانی هیچ بڵیٚ و تووڕە بوو.

سەفەر هەر چاوەڕیٚ مایەوە و قسەی کرد و قسەی کرد. و چاوی لە دەمی عومەر بڕی... هەرچیی کردی و کراندی، عومەر یەك قسەشی نەکرد.

سەفەر ئاخێکی هەڵکێشا و بە دڵپڕییەوە گوتی:
ـ تێگەیشتم. قسە ناکەی. هەمووانم لێ بوونەتە دوژمن. وا باشترە خۆم بکوژم و نەجاتم بێ.
عومەر بەزەیی پێی دا هاتەوە و بەخۆی گوت:"خالۆ سەفەرم زەمانێك هەڵۆ بوو هەڵۆ. کوڕە چما دەکرێ پیاو مل لە بەر ملی وەلییان بنێ؟ باشە مرۆڤ بۆ دەبێ خۆی تووشی ئەو گێچەڵانە بکا؟ ئەوەتا ئاوایە وەلییەکان پیاوی ئاوا ریسوای هەر دوو دنیا دەکەن. وای لێ دەکەن ئاوا لە گیانی خۆی وەڕەز بێ. هەتا مردنێ کەس قسەت لەگەڵ ناکا مامە سەفەر. ئەتۆ کارێکی باشت نەکرد کە سووکایەتیت بە وەلییە گەورەکەی خودا کرد. سووکایەتی و بێ حورمەتیت بە سەروەرە باشەکەی ئێمە کرد."
سەفەر سەیری کرد قسەکانی کاریان لە عومەر کردووە و رەنگ و روخساری گۆڕاوە. لە سەر قسەی خۆی رۆیی:"
ـ ئەمن دەبوایە خۆم بکوژم و بە ژیانێکی ئاوا پڕ لە سووکایەتی قایل نەبم، بەڵام چ دەکەی ژیان شیرنە... گوو بەو ژیانە. بەڵام چ دەکرێ ژیان شیرنە. ئاخ دەبوو من خۆم بکوژم.
سەیری کرد عومەر چاوی پڕ بوون لە ئاو، بەڵام قسەش ناکا:"کوڕە تەماشا کە لە دەسەڵاتی ئەو تاشباشە."
لە نەکاو ترسێك ئاخی رووناك کردەوە:" نەکا ئەو تاشباش ئۆغڵوە هەر بە راستی وەلی بێ. ئەگەر تاشباش وەلی بێ، هەم لەو دنیایە و هەمیش لەو دنیا قوڕمان وەسەر بووە. تەنانەت سەگەکانیش سەیرم ناکەن." لە ناکاو پێی وابوو عومەر لێی تێگەیوە. بە هەژاوییەوە گوڕاندی:
ـ تاشباش لێی ناوەشێتەوە وەلی بێ. ئەو سەگە بەرەڵڵایە، ئەو پیاوە گەمار و هیچ و پووچە لێی ناوەشێتەوە ببێتە وەلی، مەحاڵە و شتی وا نەبووە و نابێ.
هەڵچوو و هەڵچوو و دەست و پێی کەوتنە لەرزین:
ـ نا، شتی وا نابێ، نەبووە و نابێ.
بۆ ئەوەی خۆی لەو بیر و فکرەی پێشووی رزگار بکا، پەنای بۆ ئەو دوو قسەیە بردبوو.
ـ نا، نەبووە و نابێ. کاکی خۆم و هەروەها نەبووە و نابێ...
هێمن بۆوە و ئارەقەی سەر و چاوی سڕییەوە. چڵێکی بچووکی لەو پنچکە هەڵپساند و لە زاری نا. ماوەیەك هەر وا بەبێ دەنگی بەرانبەر یەکتری دانیشتن. عومەر بە پێی ئەزموونی خۆی دەیزانی دوای ئەو ساتە شتێکی گرنگ دێتە پێشێ. دەیزانی و دەشیویست بزانێ ئەو شتە چییە. روخسارە زرد و درێژەکەی کوێخا سەفەر هەر دەهات و درێژتر و زەردتر دەبوو.

سەری هەڵێنا و ئەو چڵە گیایەی جوویتبووی، تفی کردەوە. دەست راستەی وەك مێشێك لەخۆی دەربکا، راوەشاند. تفی زاری قووت دایەوە و سەری داخست. ماوەیە لە فکرەوە چوو و ئاخرییەکەی سەری بەرز کردەوە و چاوی لە چاوەکانی عومەر بڕی و بە نیگایەکی تووڕە و شێتانەوە، ماوەیەك هەر وا چاوی لە چاوی بڕی. عومەر چەند جارێکی نیگای خۆی لێ دزییەوە بەڵام نەیتوانی ئەو حاڵەتەی ئەو بگۆڕێ. نیگای سەفەر هەر وا بەبێ ئەوەی بگۆڕدرێ مایەوە.٠

دارە گەزەکە لك و پۆی خۆی بە سەر ئاوەکەدا بڵاو کردەوە. مێشەنگوین بە وزەوز لەو پوورە هەنگە زەردانەوە دەهاتنە دەرەوە کە بەو لقانەوە هەڵواسرابوون وا شۆڕ ببوونەوە سەر رووبارەکە.

سەفەر دەستی بە عەرزەکەدا کێشا و گوتی:

ـ برالە عومەر، دەبێ بچیتەوە ئاوایی و مریەمۆکم بۆ بکوژی. ئەمنم ئەوەم لێت دەوێ. عەلی مریەمۆکی نەکوشتووە. مریەمۆك ئێستا لە دێیەکەیە و چاوەڕێی گەڕانەوەمانە. چاوەڕوانە یەکێکی لێ پەیدابێ. ئێستا هەڵدەستی دەچیتەوە ئاوایی و مریەمۆك دەکوژی و دەگەڕێیتەوە. هەر ئەو زستانە خۆم ژن هێنانەکەت بۆ رێك دەخەم. مانگایەکیشت دەدەمێ... مریەمۆك هەر شتێك بێ، لە پیرەژنێك پتر نییە. سەد لیرەشت دەدەمێ. نابێ کەس بە رۆیشتنەکەت بزانێ. دەبێ وەك مار بوخشێی و لە چاوترووکانێکدا بگەیتەوە ئاوایی. تەرمەکە لە سەر رێگایە فڕێ مەدە. نامەوێ جڕ و جانەوەری دڕندە بیخۆن. ئێمە پێویستیمان بە کەلاکی مریەمۆك هەیە. دەبێ کەلاکەکەی لە ماڵەکەی عەلیدا دابنێی و دەرگاکە گاڵە بدەی، وابێ بە کارمان بێ. خەڵك کە گەڕانەوە دەبێ بیبینن و "عەلی"یە درێژ بە پەتەوە بکەن. دەی یاڵلا زووبە دەی خۆت تەیار بکە.

هەستا و خۆڵی پانتۆڵەکەی تەکاند و وەڕێ کەوت.

ـ ئەتۆ راوەستە و مەیە. نابێ پێکەوە بمانبینن.

عومەر تاوێك لەوێ مایەوە. ئەوجار بەسپایی هەستا، هەموو گیانی دێشا، دەتگوت کوتاویانە.

دڵەکوتەکە بەرە بەر پتر دەبوو و کەشەکەشی جار بە جار ماتتر. دەتگوت هەر هەمووی لە بن سەری "عەلی"یە درێژ دایە. هەموو گوناحەکەیان داویشتە ملی ئەو. تەپۆ و گەرما و ئەو ژەندەرمانەی دەهاتن و دەچوون و مەسەلەکەی شەوکەت بەگ، دەتگوت هەر هەمووی خەتای عەلی بوو... بە بچووکترین جووڵەی عەلی، لە دین دەهەری دەبوون. هەر ئەوەی نینۆکی هەبوو خۆی پێ بخورێنێ، بەلای ئەوانەوە وەك جنێو وا بوو. ئەو کەشە مات و قورسە خەریك بوو بیانخنکێنێ، بەڵام حەسەن و ئۆمەخان حاڵیان لە هەموان خراپتر بوو.

## ١٧

ئۆمەخان نقورچکێکی لە حەسەن کوتا و بابیی نیشان دا. عەلی داهاتبۆوە و خێرا خێرا لۆکەی لە قۆزاخەکە دەردەکێشا و کۆگا لۆکەکەی تەنیشتی هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە. جرِ و جانەوەری وردیکە و رەش، بچووکتر لە مێروولە لە قۆزاخەکانەوە دەڕژانە خوارێ و بە هەڵەداوان بەملا و لادا رایان دەکرد. دەزووەکی درێژ لە سەر دەست و پانتۆڵەکەی عەلی و پێشەوەشی پڕ بوو لە جرِ و جانەوەری رەشی لۆکە...

برێك لەولاترەوە لە بەر تاوەکەوە، مەنجەڵێك کە بە دووکەڵ رەش ببوو، لە سەر ئاورەکە دەکوڵی و هەڵمێکی سپیی لێ هەڵدەستا. دووکەڵی ئاگرەکە نەدەبینرا. ژنەکەی تاشباش لە سەر خاکەکە هەڵتڕووشکابوو و بە ئەسکوێیەکی دار، ئەو ئاوەی لێك دەدا، کە دەکوڵی. "عەلی"یە درێژ بە دەم دەرکێشانی لۆکەوە، چاوی لەو بڕیبوو. ژنەکە لە بەرخۆیەوە و بە سپایی گۆرانییەکی ئەوەندە بە سۆزی دەگوتەوە، کزەی لە جەرگی ئینسان دێنا.

هەواکەی زۆر گەرم بوو. تەپۆ نەمابوون و پەنایان بردبووە بەر سێبەران. کوێخا سەفەر لەو سەری کەپرەکان داری ئەستوور ئەستووری ئاگر دابوو و ئاگرێکی گەورەی کردبۆوە و لە بەر تاوەکە بێ رەنگ و سپی دەچۆوە. کوێخا سەفەر سوێسکەیەکی قەڵەوی لە نێوەڕاستەوە هەڵدڕی و خاوێنی کردەوە، خوێ و بیبەری لێ دا و هاویشتییە سەر ئاگرەکە. گۆشتە سوێسکە هەر گەیشتە سەر ئاگرەکە، دەنگی چزەچزەکەی بە بۆنی برژانەکەیەوە بەرز بۆوە. گوندی لیکاویان لە زاری هاتە خوارێ و "عەلی"یە درێژ بە بێ ئەوەی خۆی بیەوێ، دەستەکانی راوەستان و هەواکەی هەڵمشت. دووکەڵە خەستەکە و چەوریی کەبابەکە هەموو مەزراکەی داگرتەوە. سریوەی هیچ شتێك نەدەهات. بۆنی کەبابەکە ماوەیەك لە هەواکەدا راوەستا و ئەوجار وردە وردە، چەوری و قورسایییەکەی نیشتە سەر عەرزی. ئۆمەخان نقورچکێکی لە حەسەن کوتا و باوکیی نیشان دا. "عەلی"یە درێژ دەستی راگرتبوو و بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ، نیگا بەتاڵەکانی بڕیبووە ئەو دوو باڵە سوێسکەیەی بە دەست سەفەرەوە بوون و لیکاوی خۆی قووت دایەوە. رۆنی سوێسکەکە بە لا زاری سەفەردا چۆڕابۆوە تا سەر ملی و سەفەر بەو شەویلکە بەهێزانەیەوە توند گۆشتەکەی دەجووی و لە بن چاوانەوە، لە حاڵەتی روخساری ئەوانیتری دەڕوانی و کەیفی دەکرد. چونکە هەمووان ئاوی زاریان قووت دەدایەوە و پەڕەی لووتیان دەلەرزییەوە. قاچە قەڵشیوە بچووك و گەورەکان لە تەنیشت جەواڵە لۆکەکانەوە لە کەپرەکان هاتبوونە دەرەوە و لە بەر تاوەکە مابوونەوە، هەر دەتگوت خڕکە بەردی ورد و درشتن و حاڵەتێکی کەسەرباریان هەبوو. مێش و مەگەز لەو لاقانە دەنیشتن.

"عەلی"یە درێژ لەو چەند رۆژەدا زۆر لەڕ و لاواز ببوو. ملی درێژتر ببۆوە و چاوەکانی بە قووڵدا چووبوون و پێستی دەموچاوی پڕ ببوون لە چرچ و لۆچ. دەستەکانی دەلەرزین. بڕێك دواتر وەخۆ هاتەوە و خێرا خێرا وەك بریسکە پەلاماری قۆزاخەکانی دا. قۆزاخەی بەتاڵ و لۆکە لە دەستەکانیدا هەر کامە و بەرەو لایەك دەچوون.

کۆگای کەس لە هیی عەلی گەورتر نەبوو، دوای ئەویش کۆگای مام خەلیل. مام خەلیلیش کە سەیری ئەو کۆگایانەی دەکرد، لە خۆشیان وەخت بوو شاگەشکە بێ و بفڕێ. مام خەلیل دەیزانی لۆکەی خۆی بۆ چییە، بۆیە گیانی لە خۆشیان لە بەر یەك دەکشایەوە.

لە کەپرەکانەوە دەنگی هیچ گۆرانی و ئاوازێك نەدەهات.

مەمی دیك جار و بارە لە کەپرەکەی دەردەپەڕییە دەرێ و دەستی دەکردە سێبەری چاوی و سەیری دوور دوور و لای چەپی دەکرد.

ئەو هەڵۆیانەی بە سەر بیرەکەوە دەسووڕانەوە، هێنـدەی منارەیـەك لـە بەرزاییەکـەوە وەك کۆڵەکەیەك لە سەر سەری یەکتری دەخولانەوە و ئەوەندەی چاو هەتەری دەکـرد لـە ئاسمانەکـەدا هەڵدەکشان. مەمی دیك لە دڵی خۆیدا گوتی:

"خودایـە گیـان، ئەوانـە چییان دەوێ؟ هـەتا دوێـنێ ئـەو ئاسمانـەیان داپۆشـیبوو و وەك هەورێکی رەش بەر تاوەکەی چوکووراوایان گرتبوو. ئێستاش دەڵێی کۆڵەکەیەکی رەشن و هـەتا چاو هەتەر دەکا لەو ئاسمانە بێسنوورەی چوکووراوادا بەرەو سەر هەڵکشاون."

وەك کۆڵەکەیـەکی رەش.. لـە سـەر بیرەکـە چـەقیون و بـە سـوورە سـوورە بـەرەو ئاسمـان هەڵدەکشێن.

مەمی دیك تارماییەکی بـە لێڵـی دی:"پیاوێـك لـە سـەر بەردەکـەی سـەر زارکـی بیرەکـە دانیشتبوو و هەر لەوێ دەتگوت سێبەرێکە و لە تاوێدا تواوەتەوە. پەڵەیـەکی رەش... مـەمی دیك گوتی:"خوایە، ئەو بنیادەمە شێت بووە، هیچ برسـیی نـابێ؟ پێویـستیی بـە هـیچ شتێك نابێ؟ گیانی شل نابێ؟ باشە ئەو چ بنیادەمێکە؟ خۆ لەوێ هەڵناستێ بچین و ئـەو مردووەمـان لەو ئاوە دۆزەخییە بێنینە دەرێ. مردووەکەمان، بەر لەوەی بەڵایەکی بە سەر بێت و هەڵۆیەکان بیخۆن و تەواوی بکەن." ددانەکانی لەچیرەوە بردن. لە تووڕەییـان لـەرزی:"هەڵناسـتێ نـا. لـە سەر بەردی بیرەکـە هەڵناسـتێ سـەگبابی بێنـامووس. سـەگی سـەگبابە دەڵێـی بـە چـل زنجیر بەوێیانەوە بەستۆتەوە. ئەمن دەزانم چـۆنی هەسـتێنم. زۆر باشـیش دەزانم. لەبـەر ئـەو کابرایـە مردووەکەمان وەختە لە بیرەکـەدا بـڕزێ. هـەی هـاوار، دەڕزێ. ئـاخر کـابرا، چما ئـەتۆ هـیچ کارێکت نییە؟ چووی و لە سەر ئەو بەردە دانیـشتووی؟ نـەکا قوونـت بـەو بـەردەوە نووسابێ؟ هەڵۆکانیش دەڵێی بە ئاسمانەکەوە نووساون. ئەنگۆ بـێ و نـەبێ شـتێك لـەو بیرە دەزانـن. یـان ئەوەتا مردووەکەی ئێمە لەوێدا دەڕزێنن یان دەیخۆن و تەواوی دەکەن."

زەوییەکە دەتگـوت ئـاگرە و لاقـە رووتـەکانی دەسـووتاند. سەریشی لـە گێـژەوە دەهـات. گەڕایەوە و خۆی بە کەپرەکەدا کرد و پەلاماری جەواڵە لۆکەکەی دا. کە پەنجەی وە لۆکە فێنك و تەڕەکان کەوت، وەخۆ هاتەوە.

"هیچ ساڵێك گوندییەکان وەك ئەمساڵ نـەبوون. ئـاوا بێـدەنگ و بـێ کـەیف. زۆر سـەیرە. نادیاربوونەکەمی تاشباشی مەزنمان بووەتە هۆی ئەوەی گوندی هیوایان بە هیچ شتێك نەمێنێ، تەنانەت بە تاشباش سەروەریشمان. کورە وەرنە سەیر، هەر کەس ناویشی ناهێنێ."

ئۆمەخان سیخورمەیەکی لە حەسەن کوتا و دیسان باوکیی نیشان دایەوە.

ـ حەسەن داهاتەوە و بە سرتە بە ئۆمەخانی گوت:
ـ زۆر خێرا کار دەکەم. ئێستا نا ئێستا جەواڵەکە تەواو دەکەم و دەچمە لێڕەوارەکە. دەی ئەتۆش خێراکە، ئەوە ئەو دەستە ئیفلیج بووانەت بۆ ناجوولێن؟
ئۆمەخان بزەیەکی هاتێ و گوتی:
ـ دەستەکانی من کار دەکەن. ئەتۆ خەمی وەت نەبێ.
حەسەن:
ـ دەچینەوە لای ئەو هێلانەیەی پار دۆزیبوومانەوە. سەرێکیش لە لانی گۆڕهەڵتەکێنەکەش دەدەین. دوای ئەوەش تووترك دەخۆین و دواتریش... خۆ پارت لە بیر ماوە؟
ئۆمەخان:
ـ خۆ پارەکە لەو مەزرایە نەبووین کە بچین و ئەو هێلانەیە بدۆزینەوە. پارەکە چما لە نیزك دەریای سپیی نەبووین؟
حەسەن تێی خوڕی:
ـ بێدەنگ بە کچەتیو، بێدەنگ... ئەوە هەر لێڕەوارەکەیە، ئەگەر ئەتۆ نایەی چاوت دەربێ... ئەمن خۆم بە تەنیایی دەچم و هێلانەکە دەدۆزمەوە.
ئۆمەخان گوتی:
ـ حەسەن تووڕە مەبە. نەمویست تووڕەت بکەم. هێلانەکەی تۆ هەر لەو دارستانە دایە. هەر هێلانەکەی پارەکەیشە. کاژێری گۆڕهەڵتەکێنەکەش هەر لەوێیە. جا ئێستای کە نانمان خوارد و ئەوانە نووستن...
حەسەن بزەی هاتێ:
ـ تا ئەوانە دەنوون...
ئەلیف لە دەرەوە و لەبەر گەرماکە مەنجەڵی پڵاوەکەی وەسەر ئاگرێ نابوو... خەریك بوو ساوارەکەی بە تەماتەوە لێ دەنا. دوای تاوێك رۆنەکە لە تاوەکەدا کەوتە چزە چز. ئێستا چزەچزی تاوەکانی دیکەش بەرز ببۆوە. بونی رۆنەکە لەو هەوا گەرم و ماتەدا بڵاو بۆوە... ئەلیف مەنجەڵی ساوارەکەی کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، بە غاردانێ هێنایە کەپرەکە و لە سەر سینییەکە ئاوەژووی کردەوە:
ـ دەی دەست پێ بکەن. پڕە لە تەماتە. زۆر خۆشە.
لە هەر چوار لاوە چوار کەسی پەلاماریان دا.

هەر چێشتەکە تەواو بوو، عەلی دەستی چەپەی لە بن سەری نا و دەسبەجێ خەو بردییەوە.
ئۆمەخان گوتی:

- دایە، ئەمن و حەسەن دەمانەوێ کاتێ ئێوە دەنوون، بچینە دەم ئاوەکە و تووترك خڕ بکەینەوە. حەسەنیش دەیەوێ هێلانەکەی پارەکە بدۆزێتەوە.

کەی دەیگوت:"هێلانەکەی پار" بە ئانقەست لە سەر وشەی "پار" راوەستا و چاوی لە چاوی دایکی بڕی، بەڵام کە دایکی هیچ گوێی نەدایێ، دیسانەوە گوتی:

- حەسەن دەیەوێ هێلانەکەی پاری بدۆزێتەوە، باڵندەکەی چەند جووچکەیەکی هەڵێناوە. دەیەوێ بیانبینێ... هێلانەکەی پارەکەی....

ئەلیف:

- دەی باشە، بەس زۆر دوور مەکەونەوە. بە دارانیش هەڵمەگەڕێن ها، بەردەبنەوە. لای عەسرێش هەر بایەکەی رۆژاوا هەڵی کرد، بگەڕێنەوە. دەبێ زۆر بەخێرایی لۆکە بڕنینەوە. دوو سێ هێندەی خەڵکەکە. ئەگەر بابتان بەو زووانە نەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی، نەنکتان دەمرێ ها، خۆ بێت و نەنکیشتان بمرێ، گوندی هەر بە زیندوویی کەوڵمان دەکەن و وەك سەی هار دەمانخۆن. دیوتە چ بە بابتان دەکەن. زوو بگەڕێنەوە.

ئەویش سەری وەعەرزی کرد و شەکەتی شلی کرد.

حەسەن و ئۆمەخان دوور کەوتنەوە. هەموو گوندی لە خەویدا بوون. کەس سریوەی لێ نەدەهات. گەرما و تاوەکە و دەنگی جڕ و جانەوەر و سیسرە و زەردەزیرە دەشتەکەیان ئاخنیبوو...

گەیشتنە دەم ئاوەکە. بەو بژوێنەدا کە پڕ بوو لە گەڵای "بابادەم" تێپەڕین. گەیشتنە دڕکەجاڕ و تووتڕکەجاڕەکە. دوای ئەوەی لە کانیاوێکی وەك بەفراو ئاویان خواردەوە، لە کەناری جەیحانەوە گەیشتنە لێڕێکی بچووك. حەسەن قۆڵی ئۆمەخانی گرت و گوتی:

- بڕوانە، تەماشاکە ئۆمەخان. مەمی دیکت بینی؟ تەماشا چۆن را ھەکا. هەموو رۆژێ ئاوایە. بە غاردان دەچێتە شوێنێك و بە غاردانیش دەگەڕێتەوە. دەموچاویت دیتووە؟ وشك و رەق هەڵاتووە ئەو داماوە.

ئۆمەخان ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- داماوە، گۆشتی پێوە نەماوە، دەڵێن ئەو ژنەتیوەی بەکرەشێت تەڕایی تێدا نەهێشتووە. هەموو شەوێ لەگەڵیەتی. ئەو داماوە هەر خەوی نییە. دیارە هەر قەت قەت شوێنێکی نەبووە. لێقەوماوە.

حەسەن تووڕە بوو. گوتی:

- لێقەوماوی چارەڕەش. ئەو ژنەی بەکرە شێتیش بووەتە بەلاّی گیانی ئەو گوندە. دەبێ بکوژرێ و ئەو گوندە لە چنگی رزگاریی بێ. ئەگینا هەموو لاوەکانی ئەو دێیە تێوەدەگلێن.

ئۆمەخان:

- وەیش ش ... وەیش ش.. تێوە دەگلێن. کوڕە سەیرکە چۆن رادەکا. هەر بە راستی هەموو رۆژێ دەچێتە کوێ؟

حەسەن لەخۆباییانە گوتی:

- دیارە دەردێکی هەیە. دەردێکی بێدەرمان.

ئۆمەخان گوتی:

- حەسەن بزانە دەڵێم چی.

تاوێك راوەستا و گوتی:

- شتێکت پێ بڵێم؟ وەرە وەشوێنی بکەوین و بزانین دەچێتە کوێ و چ دەکا؟

حەسەن برێك دوودڵ بوو. بە نووکی لاقی، خۆڵە گەرمەکەی لێك دا و بیرێکی کردەوە و گوتی:

- زۆر باشە، با برۆین.

جا بەرەو ئەو لایە رۆیشتن وا مەمی دیك رۆیبوو:

- سەیر کە ئۆمەخان. بۆ ئەوەی بزانین مەمی دیك چ دەکا، نابێ ئەو بمانبینێ. بێت و بمانبینێ، کارەکەی ناکا.

ئۆمەخان گوتی:

- دەبێ زۆر وریا بین.

هەنگاوی خۆشتر کردن.

مەمی دیك وەك با دەفڕی و تەپوتۆزی لە عەرزی هەڵدەستاند. منداڵەکانی هەر وا بە خێراییە بە شوێنییەوە بوون. مەمی دیك بە راستە رێگا پڕ لە خۆڵەکەدا دەڕۆیشت و منداڵەکانیش بە نێو پنچکەکاندا.

مەمی دیك ساتێك لە نێو تەپوتۆزدا ون بوو. منداڵەکان ترسان. جار بە جار پتر حەزیان لێ بوو بزانن چ باسە. مەمی دیك دیسان وەدەر کەوتەوە. دڵیان خۆش بۆوە. جا ئەوجار مەمی دیك زۆر خێراتر رای دەکرد. رای کرد و رای کرد و گەیشتە شوێنێك و لە نەکاو راوەستا. ماوەیەك بێجووڵە

راوەستا. منداڵەکان چوونە نێو کێڵگەیەکەوە پڕ پڕ بوو لە گەڵای داری "بابادەم". مێشەڵانێکی تەماتە کێوییان لە پێش بوو. هەردووکیان بە هانکەهانك خۆیان گەیاندە ئەوێ و خۆیان بە عەرزەکەوە مەڵاس دا. پشوویان لە سینگیاندا ڕاگرتبوو. چونکە هەر وا سەد هەنگاوێك لە مەمی دیکەوە دوور بوون. بڕێك لەولاتریشەوە بیرێکی لێ بوو. جوان دیار بوو. کوێرە بیرێکە. سێپەك* و چەرخی ئاوهەڵکێشانەکەی هەر مابوو بەڵام سەتڵ و پەتەکەی پێوە نەمابوو. بەردەکانی لێواری بیرەکە هەڵکەنرابوون و لادرابوون و کۆڵە** بەردینەکەی لەولاترەوە کەوتبوو. دارەتوویەکی لە تەنیشتییەوە بوو. دارەکە تۆزاوی و بێ گەڵا و بار بوو.

ئۆمەخان بە سرتە گوتتی:

ـ خەریکە سەیری نێو بیرەکە دەکا. بێ و نەبێ شتێکی تێدایە...

لە نەکاو حەسەن زەرد هەڵگەڕا. هەستا و بەلادا هات و دیسان دانیشتەوە و لووتی خۆی گرت.

ـ دڵم تێکەڵ هات. ئۆمەخان... ئەو بۆگەنە.. لە کوێوە دێ؟...

ئۆمەخانیش گوتی:

ـ ئەو بۆنە...

ئەویش دەموچاوی تێك نا و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

ـ هەناسەم لێ بڕا.

مەمی دیك کە لە سەر جێی خۆی وشك ببوو، هەستا و چەند هەنگاو بەرەو بیرەکە چوو و دیسان لەسەر جێی خۆی چەقی.

حەسەن لە نەکاو ڕشایەوە. ئۆمەخان کە بە دەستێکی لووتی خۆی گرتبوو، لەوێ دووری خستەوە و بردییە ئەولاترەوە و گوتی:

ـ وەرە ڕا بکەین. ئەو بۆگەنە دەمانکوژێ.

دەتگوت هەموو دنیا بۆگەن بووە. قورس و تاڵ و بێزارکەر. هێڵنجی بە بنیادەم دەدا و سەری لە گێژەوە دێنا. بۆگەنە ئەوەندە خەست بوو دەکرا بیگوشی. ئەو بۆگەنە کەوتبووە سەر

---

* سێ پەك: سێ پایەی دار. بە تایبەتی ئەو سێ پایە دارەی بۆ مەشکەژاندنێ دایدەنێن.

** کۆڵ: ئەو دۆڵەی لەبەردەم بیرەناوەکاندا ساز دەکرێ و دادەنرێ و بۆ مەڕ و ماڵات پڕ دەکرێ لە ئاو.

تاوەکە و خۆڵە سوورەوەبووەکە و گژ و گیا و گەڵا و دار و پنچك و ئەو باڵندانەش کە دەفـڕین. هەر هەموو شتێك، تەنانەت ڕووناکاییەکەش بۆگەن ببوو و بـۆنی لەشـێکی کرمـۆڵ و گـەنیو و باکردووی دەدا....

مـەمی دیـك بـە خێرایـی چـەند هـەنگاوێکی دیکەشـی نـا و لـە سـەر بیرەکـە ڕاوەسـتا. نەدەجووڵا. تاوەکە وەك قورقوشم قورس بوو و سێبەرەکەی ئەوی وەك بازنەیەکی ڕەش دەخستە بەر پێیەوە.

هەر دوو منداڵەکە کەوتنە کۆخەکۆخ. چاویان لە مەمی دیك بڕیبوو و هەوڵیان دەدا چەندی پێیان دەکرێ پـێش بـە کۆخینەکـەیان بگـرن، بـەڵام بـێ سـوود بـوو. بۆگەنـە پیسـە چـەورەکە بنیادەمی شێت دەکرد و وەك زەروو پێیانەوە نووسابوو و خـوێنی دەمـژین. منداڵـەکانیش وەك مەمی دیك لە سەر جێی خۆیان وشك ببوون و نەدەجووڵان.

تاوەکە دەتگوت گێژی دەدا. خەستتر بۆوە. ئێستا چـاوی هـەردووکیان لەڕەشـەوە دەهـات. پنچکەکان گەورەتر بوونەوە و زەوییەکە حاڵەتێکی سەیری پەیدا کرد. لەو دەمەدا سەیریان کرد مەمی دیك لە سەر زگ درێژ بوو و سەیری نێو بیرەکەی دەکرد.

حەسەن گوتی:

ـ مرد، خۆی لە بەر ئەو بۆگەنە ڕانەگرت و مرد. مەمی دیکی داماو. وەرە با بڕۆین.

بەڵام لە جێی خۆی نەبزووت. چەند جارێك گوتی:" وەرە بـا بـڕۆین." بـەڵام نـەیتوانی پـەل ببزێوێ. نەیدەتوانی چاو لە مەمی دیك هەڵگرێ کە لە سەر بەردەکەی لێواری بیرەکە لـە سـەر زگ ڕاکشابوو و سەری بە بیرەکەدا کردبوو.

لە نەکاو پەرجۆیەك ڕووی دا. مەمی دیك قیت بۆوە و ڕاوەستا و خۆی لە بیرەکە هاویشت. چەند ساتێك دواتر بە جلوبەرگە خووساوەکانییەوە کە بە گیانییەوە نووسابوون، لە بیرەکە هاتـە دەرێ و وا بەخێراییەوە بەرەو دەشتەکە و کەناری جەیحان ڕایدەکرد لاقەکانی نەدەبینران.

حەسەن گوتی:

ـ ڕای کرد. دەی نۆمەخان. با ئێمەش بچین و سەیرێکی نێو بیرەکە بکەین.

پیلی کچەی گرت وکێشای. نۆمەخان خۆی ڕادەپسکاند و گوتی:

ـ وەرە ڕابکەین. ئەمن وەختە بمرم. ئەو بۆنە دەمخنکێنێ. دەست و پێ و قژ و زار و هـەموو گیانم بۆگەن بووە.

حەسەن تووڕە بوو:

ـ دەی کەیفی خۆتە مەیە.

پالێکی پێوە نا و بە غاردان بەرەو بیرەکە چوو. کە گەیشتە سەر بیرەکە وەك مەمی دیك ماوەیەك بێجوولە راوەستا. ئەوجار وەك مەمی دیك لە سەر بەردەکەی لێواری بیرەکە درێژ بوو و سەیری نێو بیرەکەی کرد. لە ئاوێنەی ئاوەکەدا وێنەی خۆی دی. قژەکانی وەك درووی ژووشك گرژ ببوونەوە و لە بەر ئاوەکە کاڵ ببوونەوە و سوور دەچوونەوە. سەیری لێوە تویَ تویَ و قەڵشیو و چاوە درشتەکانی خۆی کرد. باشە مەمی دیك دەبیَ بچێتە نێو بیرەکە؟ چما چیی تێدایە؟ باشە مەمی دیك بۆچی چووە نێو بیرەکە؟ سەری لە گێژەوە هات و ترسا بکەوێتە نێو بیرەکەوە. بە زەحمەت هەستا و بەرەو لای نۆمەخان چۆوە کە هەر وا لە سەر جێیەکەی خۆی راوەستابوو و دەستی گرت و هەر چۆنێك بوو خۆیان گەیاندە دارستانەکە... بۆنەکە بە شوێنیانەوە بوو و دەیخنکاندن. کە گەیشتنە لێڕەکە، خەستایی بۆنەکە کەم بۆوە. وەخۆ هاتنەوەمە و هەردووکیان لە نەکاو شەکەت و ماندوو لە سەر عەرزەکە کەوتن و تخێڵ بوون. هەر دووکیان رەنگیان بە رووەوە نەمابوو.

دوای ماوەیەك، وەك ئەوەی لە ئەنگوستەچاوێکی قورس و قووڵ بێنە دەریَ، وەخۆ هاتنەوە. مۆتەکەیەکی تاریان لەکۆڵ بۆوە.

حەسەن گوتی:

ـ قسە مەکە... بۆگەن... مەمی دیك...

لە بەر دارستانەکەوە بوون، حەسەن لە پێشەوە و نۆمەخان بە دوایدا چوونە نێو لێڕەکە. حەسەن لە بن دار چنارێکی کە لك و پۆ بەرزەکانی وەك هەورێك بڵاو ببۆوە، راوەستا و گوتی:

ـ هێلانەکەمان دەبیَ هەر لەو دەوروبەرانە بیَ. هێلانەکەی پار دەڵێم.

سۆلە سوورەکانی لە پێی دەرهێنا و بە دارەکە هەڵگەڕا. لك بە لك و گەڵا بە گەڵای سەیر کرد و نۆمەخان لە خوارەوە بەبیَ ئۆقرەییەوە دەیپرسی:

ـ هەر نەتدۆزییەوە؟ دیارە لە کۆنی ئەو لکەی دیکە دایە. نا، نا؟ ئەو ناڵێم ئەوەیان.

حەسەن لە سەرەوە قیژاندی:

ـ نۆمەخان، ئەوەتا، دۆزیمەوە.

خۆی خستە سەر لکێکی ئەستوورتری دیکە. لە پشت گرێیەکی گەورەوە کە لە قەڵشی لکەکەدابوو، هێلانەیەکی تێدا بوو. کەچی دەمودەست گوتی: ئەی هاوار، خۆ ئەوە هێلانەکەی پارمان نییە. جووچکەی تێدا نییە." بە هانکە هانك هاتە خواریَ.

ـ بەڵام زۆر لە هێلانەکەی پارمان دەچوو. ئەگەر جووچکەکانیشی تێدا بوایە، ئەوە راست خۆی دەبوو. پێت وایە هێلانەکەمان چیی لێ هاتووە؟

نۆمەخان گوتی:

ـ حەسەن گیان، براکەم، ئەو مەزرایەی پار لۆکەمان لێ دەرنییەوە لێرە نەبوو کە ئەو هێلانەیەش هەر ئەو بێ.

حەسەن هەڵچوو:

ـ هێلانەکە خۆیەتی. جووچکەکانی هەڵفڕیون. گەورە بوون و هەڵفڕیون. دەی خۆ دیارە. جووچکەی مەل گەورە دەبن و باڵ دەگرن. لەوانەشە مار زرنەقووتەکانیان خواردبێن و دایکەکەشیان تەرە بووبێ. چ بکا مەلی داماو. چووە و لە سەر دارێکی بەرزتر هێلانەی کردووە کە مار نەیگاتێ. ئێستا ئێمە دەبێ لە سەر دارێکی بەرزتر لە هێلانەکەمان بگەڕێین.

نۆمەخان لەبن لێوانەوە گوتی:"ئاخر ئێرە هەر ئەو شوێنەیە وا کە ئێمە ساڵی رابردوو لۆکەمان خڕ کردەوە؟ هێلانەکەی ئێمە هێلانەی پەڕەسێلکە بوو." بەڵام حەسەن نەیبیستوو و گوێی نەدایێ.

بە دارستانەکەدا تێهەڵبوون. گوڵی سەیر و سەمەرە و گەورە گەورە پشکوتبوون. گوڵەکان کێوی بوون. حەسەن کە گەیشتە بن دارچنارێکی گەورەی دیکە، دیسان وەسەر کەوت. ماوەیەك بە نێو چڵ و پۆپەکانیدا گەڕا و ئاخرییەکەی هاتە خوارێ و گوتی:

ـ پڕە لە هێلانە. بەڵام هەموویان بەتاڵن. هەرچی جووچکەیە مار خواردوونی. باڵندەکانیش تەرە بوون و رۆیون. لێرە، لەو مێشەڵانەدا هیچ باڵندەیەك ناتوانێ بژیێ. هەروەها هیچ شتێکی دیکەش. حوکمەت دەبێ مشوورێکی لێ بخوا، و ماری لێ نەهێڵێ و هەروەها ئەو حوکمەتەی ئێمەش خۆ حوکمەتی خۆمانە، بەڵام تۆزێك کەمتەرخەمە. ئاخرییەکەی نەیتوانی ئەو مارانە بدۆزێتەوە کە باڵندەکان دەخۆن.

بە دارێکی دیکەش هەڵگەڕا و بە لارەملی و لوتت داژەنیوییەوە هاتە خوارێ. دەگەیشتە هەر دارێکی، لێی دەچووە سەرێ و بە تووڕەیی دەهاتەوە خوارێ. گوتی:

ـ مارەکان باڵندەیان نەهێشتووە.

نۆمەخان هەر ئەو قسەیەی بیست دەستی کرد بە گریان. دانیشت و دەموچاوی لە نێو هەر دوو لەپی دەستی نا و زۆر زۆر گریا. بە گریانەوە گوتی:

ـ ئەمن دەترسم. دەترسم. مار ئێمەش دەخۆن...

حەسەن لە تەنیشتییەوە دانیشت. ویستی شتێکی پێ بڵێ، بەڵام پاشگەز بۆوە. دەستی بە سەر و قژیدا هێنا، دەستەکانی لە نێو دەستی خۆی نا. ئۆمەخان هەر وا دەگریا. حەسەن بۆ ئەوەی ترسەکەی بڕەوێنێتەوە، بە شوێن قسەیەکدا دەگەڕا و نەیدەدۆزییەوە. ئاخرییەکەی گوتی:

ـ مارەکان باڵندەکانیان خوارد و ڕۆیشتن. باڵندەیان لێرە نەهێشت و چوونە دارستانێکی دی. ئێستا ئەوە باڵندەی ئەوێ دەخۆن. کە باڵندەیان لەوێش بڕی، ئەوجار دەچنە لێڕەوارێکی دی. لەوێشەوە...

ئۆمەخان هێورتر بۆوە و ناڵاندی:

ـ وەیش ش ، هەتا ئەو مارانە هەبن، ئەو دنیایە باڵندەی تێدا نامێنێ. پێت چۆنە بچین و رابگەیێنین و بڵێین مارەکان باڵندەکان دەخۆن، بۆ ئەوەی گوندی بێن و مارەکان بکوژن و باڵندەکان نەجات بدەن...

حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ کەس تاقەتی شتی وای نییە. ئاخرییەکەی مار جووقەوار لە باڵندەش دەبڕن و دنیا بێ باڵندە دەکەوێتەوە. بەبێ باڵندە... زۆر حەیف و مخابن... باشە، هەستە با بڕۆین.

ئۆمەخان هەستا. چاوەکانی بە قۆڵی کراسەکەی سڕییەوە. دەستی یەکتریان گرت. ئۆمەخان ئەو کاتانەی زۆر پێ خۆش بوون. چونکە هەمیشە وا نەبوون. تەنیا ئەو دەمانەی زۆر پێکەوە باش دەبوون، حەسەن دەستی دێنا و دەستە بچووکەکەی ئۆمەخانی دەگرت. ئۆمەخان بەوەی دەزانی و لە خۆشیان وەخت بوو بفڕێ.

لە کانییەك ئاویان خواردەوە. گوڵیان چنی. لێرە هەست بە گەرما بەتینەکەی دەرەوە نەدەکرا. دوای ئەوەی دیسان ئاویان خواردەوە، گەیشتنە کۆنە ئاوەدڕ. حەسەن هەر چاوی بەوێ کەوت، دەستی ئۆمەخانی بەردا و بەرەو ئاودڕەکە رای کرد و هاواری کرد:

ـ وەرە ئۆمەخان، وەرە. هێلانەکەمان لێرەیە. جووچکەشی لێیە.

کە ئۆمەخان بەرەو کۆنە ئاودڕەکە غاری دا، ، باڵندەیەکی رەنگاوڕەنگ وەك فیشەك لە کونەکە دەرپەڕی و فڕی.

حەسەن لە خۆیان هەڵدەبەزی و وەك شێتان پێ دەکەنی. ئۆمەخانیش لە خۆشییەکەیدا بەشدار بوو. تریقانەوەی منداڵانەیان لە دارستانەکەدا دەنگی دایەوە. حەسەن:

ـ دۆزیمانەوە. دیتت، دۆزیمانەوە. باڵندەیەکمان دۆزییەوە کە مار نەیخواردووە. ئاخرییەکەی دۆزیمانەوە... باڵندەکان زۆر فێڵبازن. مار هەموو باڵندەیەکی پێ ناگیرێ.

ئۆمەخان:

- شوکر بۆ خودا کە پێی ناگیرێ.

حەسەن پاڵی بە کەندەڵانەکەوە دا و دانیشت. ماوەیەك چاوەکانی هەروا لە سەر یەك دانان و ئەوجار بە دەنگێکی شەکەتەوە گوتی:

- وەرە ئۆمەخان، وەرە لە لام دانیشە.

روخساری، خەمبار و تێکسمڕاو بوو.

ئۆمەخان چوو و شان بە شانی دانیشت و دەستی لە دەستی نا. حەسەن دەستی نەکێشایە دواوە. نیگا ترساوەکانی لەو بڕی و گوتی:

- خۆزگە ڕێگەیەکی رزگاربوون هەبێ ئۆمەخان. بابم خەریکە دیق دەکا.

ئۆمەخان:

- دیق دەکا.

بۆشاییەك لە ناخی حەسەندا هەبوو. بۆشاییەکی هەست پێکراو. بەخۆی دەگوت:"هێلانەکەمان دۆزییەوە، باڵندەکەشمان. ئەی ئەوجار؟" وەك شتێکی لەبیر کردبێ، بەشوێنیدا دەگەڕا... شتێکی... شتێکی لەبیر کردبوو:

- لەوانەیە ئەو گوندییانە پەلاماری بابم بدەن و بیکوژن. خەریکن لە داخی بابم شێت دەبن. چونکە لە هەمووان پتر لۆکە خڕ دەکاتەوە. تەنیا مام خەلیل بابمی خۆش دەوێ.

ئۆمەخان گوتی: - تەنیا مام خەلیل... پیاوی چاکە. نووری لە روخساری دەبارێ.

حەسەن بە ترسەوە گوتی:

- سەبر سەبر، با نەنەکم نەبیستێتەوە...

ئۆمەخان:

- خۆ بابم نەنکمی کوشتووە. جگە لەوەش، ورد وردیشی کردووە. باسکی نەنکم ئێستا بە دەمی گورگێکەوەیە.

هەر دووکیان بێدەنگ بوون. تاوێك دواتر حەسەن گوتی:

- خۆزگە مامە تاشباشم دەهاتەوە. هیچ چارەیەکی دیکەمان نییە. خۆزگە بێتەوە و بابم و ئێمە و ئەو گوندییانەش رزگار بکا.

ئۆمەخان بە هێمنی گوتی:

ـ حەسەن پێی مەڵێ "مامە". کەسێك بووبێتە وەلی، ئیتر ناکرێ "مامە" بێ. پێی بڵێ "سەروەر" و خۆت گوناحبار مەکە.

حەسەن:

ـ خۆزگە تاشباشی مەزنمان بێتە ئێرە و...

راوەستا و بیری کردەوە، چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك:

ـ بەڵام نازانم بۆچی دڵم بۆی توند بووە. خۆزگە مامە تاشباشم دەهاتەوە...

ئۆمەخان:

ـ دەهاتەوە و باڵندەکانیشی لە چنگی ئەو مارانە رزگار دەکرد.

حەسەن:

ـ یان دەهاتەوە و ئەمنیشی دەبردە ئەشکەوتی چل پیاو چاکەکە. ئەمن ئاوم بۆ دەبردن و قاوەم بۆ ساز دەکردن.

دەنگی لەرزی و بوو بە نووزە.

ئۆمەخان:

ـ ئەمنیش بەرە. ئەوان پێویستیان بە کچێکیشە.

حەسەن گوتی:

ـ بە کچێکیش... لەو دنیایە کەس لە مامە تاشباشم باشتر نییە. منداڵەکانی زۆر خۆش دەوێن. خۆ ئەگەر بزانێ ئێمە لێرە لە چ حاڵێك داین، هەر دێ... لێم سوورە دێ...

لەوە پتر قسەی پێ نەکرا. گریان ئەوکی گرت.

ـ ئەگەر بزانێ حاڵمان چۆنە لێرە...

مام خەلیل دالّغەی لێداوە. دەبێ چ بکا بۆ ئەوەی عەلی زووتر خۆی بگەیێنێتەوە ئاوایی و لای مرێمۆک؟ئەوە لە مێشکیدا هەر دەیهێنێ و دەیبا. ئاخرییەکەی رێیەک دەدۆزێتەوە و بە عەلی یە درێژی دەڵێ. "عەلی"یە درێژ دوودڵە.

## ١٨

مام خەلیل ئارا و قارای نەبوو. لە نوێنەکەی دەرپەڕی. شەوێ هەر بە جلوبەرگەکەیەوە نووستبوو. لە سەر جاجمێکی کە ئەویشی لە سەر گژ و گیاکان راخستبوو، درێژ ببوو و جاجمێکی دیکەشی بەخۆی دادابوو. ئەو شەوە کرێکارەکان ئاگریان نەکردبۆوە و زوو نووستبوون. رۆژی پێشتری هەر لە بەیانییەکەیەوە بای رۆژاوا هەڵیکردبوو و وردە وردە خێراتر ببوو. هەر بۆیە ئەو شەوە ئیتر تەپۆی نەبوو. تەپۆ خۆ لە بەر بای بەتەوژم راناگرێ. تەپۆ لە هەوای مات و شەوە بێ بایەکاندا کە هیچ سۆزە و کزەیەکی نایە، وەك هەور سەر دەشتەکە دادەپۆشێ. لەو شەوانەدا کە بای رۆژاوا هەڵدەکا، کرێکارەکان هەر سەریان وەبالیف دەکەن، خەویان لێ دەکەوێ و لە شەوی بێ تەپۆ و فێنك و بێ گەرمادا. ئەگەر شەوی ئاوا نەبێ، خۆ پاڵەی لۆکە، لە چوکووراوا خۆ راناگرن و تاقەت ناهێنن، هەموو لە پێ دەکەون و تێدا دەچن. لەو گوندانەی چوکووراوا ساڵ هەبووە کە هەرگیز لەبیر ناچنەوە و ئەو ساڵانە بە ساڵی رەشەمەرگی پاڵە و سەپان بەناوبانگن. لەو ساڵانەدا هەموو شەوەکان مات بوون و بای رۆژاوا نەهاتووە.

مام خەلیل بەسپایی و بە سەری پەنجەی پێی، وەك پەرە کایەك بە تەنیشت کەژاوە تەپۆگرەکەی کوێخا سەفەردا کە لە بەر بایەکە دەشنایەوە، تێپەڕی و گەیشتە کەپرەکەی

عەلی. گوندی لە بەر تریفەی مانگەکە و لە تەنیشت کۆگای لۆکەکانیان لە سەر عەرزەکە درێژ ببوون و لێی نووستبوون. هێندێکان پرخە پرخیان ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت و دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی دەخنکێن. پرخە پرخی هێندێکیان لە گۆرانیگوتن دەچوو و ئی واش هەبوو خۆی لەبەر یەك دەکێشایەوە. ئەوانە گەنجەکان بوون. هێندێکیشان دەنگێکی ناسکی وەك نالاندن لە قوڕگیان دەهاتە دەرێ.

کۆگا لۆکەکان لە بن تریفەی مانگە شەوەکەدا برێك گەورەتر و سپیتر دەچوونەوە و دەدرەوشانەوە و سێبەرە تارەکەیان بەرەو ڕۆژهەلات دەکێشرا و دەشتەکە لە بەر تریفەی مانگ شەوەکە تەماوی و سپی، وەك هەلمێکی سیحراوی و شیری، مەیلەوشین دەچۆوە... لەگەڵ شیبایەکە هەڵدەکشا و دادەکشایەوە. ڕەوەزەکانی ئاناوەرزاش لە هەلکشان و داکشانی ئەو تیشکەدا، وەك گەوهەرێکی نامۆ چاوی بنیادەمیان دەنگاوت. کۆمەڵە خانووەك کە بوونەتە لان و پەناگەی هەزاران دەعبای دڕندە، بەو شوورا و دیوارە دارماوانەوە... دەتگوت ئەوە مێردەزمەیەکی حەفتا ساڵەیە و پێنج هێندەی بنیادەمێکە و لە ڕەوەزەکانەوە دێتە خوارێ.

مام خەلیل بە سەر سەری "عەلی"یە درێژەوە ڕاوەستا کە لە سەر عەرزەکە خۆی گرمۆڵە کردبوو و وەك مستێکی قووچاو خەوی لێکەوتبوو. تاوێك بە دڵسۆزییەوە لێی ورد بۆوە. بیری کردەوە:"عەلی"یە درێژ پیاوی چاکە. زۆریش باشە، زۆر... ئەگەر ئەو مریمە جادووبازە نەدەبوو، عەلی هەر بۆ کۆڵ ئەمنی تا ئێرە دێنا. ئەگەر ڕۆژێك ئەمن لە پێ بکەوم، ئەو حاجییە چلمنەی کوڕم، کە بە ملی شکاوی و بەناخێری گیانی کوڕمە، هەر ناوڕیشم لێ ناداتەوە. ئەگەر بشمرم، ئەو حاجییە نەحلەتییە کە بەستۆی شکاوی کوڕمە، بەبێ شوشتن و کفن و دفن، لە قوولکەیەکم داوێ. هەر ئەو پیاوەی ئەوەتا لێرە نووستووە، فریام دەکەوێ. هەر ئەو پیاوە تەرمەکەم هەڵدەگرێ و تەنانەت مەلام دێنێتە سەری کە قورئانم لە سەر بخوێنێ و ئەگەر لەو ڕۆژە ڕەشانەیدا ئەمنیش دەستی بگرم، تا هەیە هەر چاوی بە سەرمەوە دەبێ. لەوانەیە ئەو حاجییە چلمنە هەر ڕاشم نەگرێتەوە، بەلام ئەو پیاوە دەمباتەوە ماڵەکەی خۆی. ئەگەر لە نێو ئەو هەمووە دوژمنەدا، پشتی بگرم، "عەلی"یە درێژ تا مردن چاکەی منی لە بیر ناچێتەوە. ئەمنیش تا مردن پارووم لە ڕۆنێ دایە."

مام خەلیل داهاتەوە و بە دەنگێکی هێمن و لەبزێکی شیرن گوتی:

ـ عەلی گیان، عەلی گیان، هەستە هەستە.

عەلی هیچ نەبزووت. مام خەلیل لە تەنیشتی لە سەر چۆکان دانیشت و دەستی بە تەوێڵیدا هێنا:

ـ هەستە، کوڕم عەلی، هەستە کوڕی خۆم. هەستە دەی. دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم. دەزانم شەوی فێنك و بێ تەپۆت بۆ هەڵکەوتووە و نوقمی خەوی. وەك منداڵێك نووستووی. دەی باشە ئێستا هەستە دەی. بزانە مام خەلیل قسەی پێتە. دەیەوێ ڕێیەك نیشان بدات، ئەویش چ ڕێیەك... هەستە، هەستە دەی کوڕم.

هەر وا دەستی بە سەری عەلیدا دێنا و دڵیشی نەدەهات بەخەبەری بێنێ. دەنگەکەشی لاواندنەوە بوو، وەك لایی لایی. کە عەلی نووزەیەکی لێوە هات و لە لاتەنیشتێکەوە خۆی سووڕاندە سەر لاتەنیشتەکەی دیکەی، مام خەلیل چاوی پڕ بوون لە فرمێسك. بەخۆی گوت:"سەیر کە. هەر دەڵێی منداڵە. باشە بنیادەم چۆن دەتوانێ ئەوەندە زوڵم لە ئەو "عەلی"یە درێژە لێقەوماوە بکا."؟

ـ هەستە. کوڕە دڵپاکە ئازاکەم. دوو قسەم پێتە. لەو مەملەکەتە پڕ لە بەڵایەی چوکووراوادا، بەو شەوە جوانە و لە بەر تریفەی ئەو مانگە شەوە پیرۆزە... هەستە، وەرە بزانە مام خەلیلەکەی تۆ دەیەوێ چ بڵێ....

لەو جەنگەیەدا ئەلیف وەخەبەر هات. هەستا و دانیشتت. چاوە خەواڵووەکانی خۆی لە مام خەلیل بڕی و هەر وا مایەوە.

مام خەلیل دەستی ئەلیفی گرت و گوتی:

ـ مەترسە کچم. منم، مام خەلیلم.

ئەلیف هەستا و گوتی:

ـ ئەتۆی مام خەلیل؟ بەخێر بێی.

مام خەلیلیش هەستا و گوتی:

ـ دەی باشە عەلی هەستێنە کچم. دەمەوێ قسەیەکی لەگەڵ بکەم. ڕێگەیەکی باشم دۆزیوەتەوە.

ئەلیف داهاتەوە و دەسبەجێ عەلیی لە خەو هەستاند.

ـ عەلی، هەستە. مام خەلیل لەبەر تۆ هاتووە. هەستە.

عەلی بە دەم هەڵگلۆفینی چاوەکانییەوە، باوێکشی دەدا و گوتی:

ـ بەخێر بێی مام خەلیل. خێر و بەرەکەتت هێنا.

مام خەلیل لێی نزیك بۆوە و بە لەبزێكی دڵنیاییەوە گوتتی:
ـ هەستە عەلی، رێگە چارەیەكی ماقوولم بۆ دۆزیوێتەوە و ئەگەر پێتی بڵێم هەر لە خۆشیان دەفڕی. هەستە وەرە بە دوومدا. با بچینە دەم جەیحان. ئامان، دەنگت دەر نەیە. وریا بە، وریا بە كەس لە خەو هەڵنەستێ. لەوانەیە یەكێك لەو سەگانە هەستێ و گوێی لە قسەكانمان بێ. زۆر وریا بە.
جا بەرەو لای جەیحان وەڕێ كەوت. بەبێ دەنگ، خێرا و بێ هەست و خۆست. ئەلیف و عەلیش بە دوایەوە. لە دوورەوە و لە داوێنی ئاناوەرزاوە، چەند چەقەڵێك لووراندیان.
مام خەلیل لە پشت پنچكێكەوە خۆی مات كردبوو و لەوێوە بەسپایی بانگی كردن:
ـ وەرن. وەرەنە ئێرە. خۆ كەس نەیدیتن؟ دەی باشە، خێرا بكەن.
كە عەلی لێی نزیك بۆوە دەستی گرت و بەرەو لای خۆی كێشای و گوتی:
ـ لێرە دانیشە. دانیشە ئەلیف، ئەتۆش بڕوانە بزانە كەس بەرەو ئێرە نایە؟
ئەلیف لە تەنیشتیانەوە دانیشت و گوتی:
ـ كەس نەیدیتین. كەسیش گوێی لە هیچ نەبووە. خەڵك وەك مردووان نووستوون. ئەوە یەكەم شەوێكە بای دێ و تەپۆی نەهێشتووە. وەك مردوو كەوتوون.
ترۆمبێلێك بە رێگەكەی ئەو بەری چۆمەكەدا تێپەڕی. تیشكی چرای ترۆمبێلەكە ماوەیەك بە سەریان كشا و مام خەلیل گوتی:
ـ ئەها گیراین.
عەلی گوتی:
ـ مامە خەلیل، ترۆمبیلەكە لەو بەری رووبارەكەیە. ئەتۆ مەترسە.
لەگەڵ ئەوەشدا هەتا تیشكی ترۆمبێلەكە تێنەپەڕیبوو، مام خەلیل هەر نەبزووت.
دوای ئەوە، مام خەلیل هەستا، سەیرێكی دەوروبەری خۆی كرد و دەستی پێ كرد:
ـ تەمەنی پیرەكان لە تاڵی لۆكەكە و لەو تیشكەش ناسكترە. جوان ئەوە بزانە عەلییەكەی خۆم. ئەوجار بەڵێنت بە من داوە بە مرێمۆكیش ئەڵێی ئەمن بۆی گریاوم و پێشی ناڵێی ها برالە. ئەمن بڕوام بە گفتی تۆ هەیە. كوڕم عەلی. تەمەنی پیرەكان بە ترێك بەندە و پێیان لە سەر لێوی گۆڕە. ئەگەر چەند رۆژێكی دیكە نەگەیەوە دایكت، دایكت بە تاقی تەیێ لەو گوندەدا ئاژێ و دەمرێ. بۆیە مشوورێكم لێ خواردووی عەلی گیان. دەزانم ئەتۆ تا بەشی قەرزەكانی عادیل ئەفەنی لۆكە خڕ نەكەیتەوە، دایكت بشرێ ناتوانی بچییەوە لای. بۆیە گوتم دەبێ كارێكی وا بكەین ئەتۆ خێراتر

بەشی خۆت لۆکە بڕنیتەوە و زووتر خۆت بگەیێنیتەوە لای دایکت. بۆ ئەوەی هەم مریەمۆکیش لە مەرگ نەجات بدەیت و هەمیش گەردنی خۆت لە پەتی سێدارە. ئەو ڕێگەیەی پێم شك هاتووە، ئەوەیە:"ئێستا هەمووان نووستوون. ئەمن و ئەتۆ و ئەلیف، بەر لەوەی ئەوان وەخەبەر بێن، واتە تۆزێك دوای نیوەی شەوێ کە هەمووان بە قووڵایی خەوێدا ڕۆچوون، سێ کەسی، هەڵدەستین و دەچین بزانین کوێی مەزراکە لۆکەی باشی هەیە، لەوێ دەڕنینەوە. هەر دەڕنینەوە و دەڕنینەوە... و بە لەوەی خەڵك لە خەوێ هەستن، دەهێنینەوە و دەیخەینە سەر لۆکەکەی خۆمان. بەیانی زوو دیسان وێڕای خەلکەکە دەچینەوە لۆکە رنینەوە و دوو هێندە، سێ هێندە و چوار هێندە...."

مام خەلیل هەژابوو. یەك پشووقسەی دەکرد. هەڵدەستا و دادەنیشتەوە، قسەی دەکرد و لە خۆیەوە تاریفی دەکرد، قسەی دەکرد و بەسەرهاتی پیریی دەگێڕایەوە و قسەی دەکرد. ئاخرییەکەی وەخۆ هاتەوە ولە عەلیی پرسی:

- دەی دەڵێی چی عەلی؟

عەلی گوتی:

- زۆر باشە مام خەلیل. بەڵام ناکرێ. بێت و گوندی بزاننەوە ئێمە شەوانە لۆکە خڕ دەکەینەوە، ئەوەندەمان لێدەدەن پشتمان لە زگمان نەرمتر دەکەن.

مام خەلیل هیچ چاوەڕێی ئەو جوابە نەبوو. پێی وابوو عەلی هەر ئەو قسەیەی لە زاری ببیستێ، لە باوەشی دەگرێ و بە دەست و پێیدا دەنووسێ. زۆر تووڕە بوو و گوتی:

- ئەتۆ شێت بووی عەلی؟ چما ئەقڵت لە دەست داوە؟ کێ دەمانبینێ؟ کێ دەزانێ و تێمان هەڵدەدا؟ کێ؟ مەترسە عەلی مەترسە.

عەلی یەك پشوو دەیگوت:

- وایە، بەڵام ئەوە گوناحە. گوندیش هەقیانە ئەگەر خۆ ئەگەر نەشمانکوژن ئەو کارە وەك دزیکردن وایە...

مام خەلیل زۆری چەنە لێ دا، ئەوجار چیی بە زەینیدا هات بە عەلی و گوندییەکانی گوت، بەڵام هەر نەیتوانی عەلی قایل بکا بەوەی شەوانە بیباتە لۆکە رنینەوە. دەیگوت:

- مەترسە، مەترسە. کەس نامانبینێ. کاتێ هەمووان وەك مردوو نووستوون، شەوانە هەر لەو گوێچکەیەی مەزراکەوە لۆکە دەڕنینەوە.

نەدەکرا. ئەو تووتکە سەگەر قایل نەدەبوو:

ـ جا باشه مادام وایه، تا ئێمه دەگەینەوە، دایکت دەمرێ، دیارە ئەگەر تۆ نەتکوشتبێ، گوندییەکانیش نەتۆ... ئەوە دەبینی... لەتوپەتت دەکەن. دایکت دەمرێ، دەمرێ، دەمرێ...

هەستا و بە پەلە وەڕێ کەوت. دەیبۆڵاند:

ـ لێی گەڕێ با بمرێ... با بمرێ، ئەو کات دەبینی چیت بە سەر دێ "عەلی"یە مل درێژ. بەو مەرجەی هەر خۆت نەتکوشتبێ.

لە لای کەپرەکان رقەکەی نیشتەوە و گەڕایەوە. عەلی و ئەلیف هێشتا هەر وا بە سەرسووڕمانەوە لە پەنا پنچکەکە دانیشتبوون. ئەلیف دەیگوت:"مام خەلیل راست دەکا." و دەیویست عەلی قایل بکا.

مام خەلیل گەڕایەوە و مەچەکی عەلیی گرت و کەوتە پاڕانەوە. عەلی بێدەنگ بوو. ئەلیفیش دەنگی خۆی خستە پاڵ دەنگی مام خەلیل. بەڵام عەلی پاشگەز هەر نەبۆوە...

ئاخرییەکەی مام خەلیل سەیری کرد مەحاڵە و تفێکی خستی لە دەموچاوی عەلی کرد و گەڕایەوە و کەوتە ڕێ

ـ چ چاوەڕوانییەکت لە پیاوێك هەیە دایکی خۆی کوشتبێ... سەگ....

مریمۆك لە گوندی "یالاك" تەنیایە. چۆلەكۆژ لە دێدا نییە. لە كوڕەكەی و گوندییەكان تووڕە دەبێ و خاو دەبێتەوە، خاو دەبێتەوەو تووڕە دەبێتەوە. لەو حاڵەدا چاوی لە ڕێیەكەی چوكووراوا بڕیوە و چاوەڕێی هاتنەوەی كەسێكە. لە لایەكی دیكەشەوە چاوەڕێی تاشباش ئۆغلۆ و ئەحە شێت و پەرییەكانە.

## ١٩

لە بەربەڕۆچكەكە دانیشت. پاڵی بە دیوارەكەوە دا و لاقی ڕاستەی ڕاكێشا و لاقی چەپەی لە بن خۆی نا. شنەیەكی فێنكی دەهات. مریمۆك چاوەكانی لێك نا. تاوە پاییزییەكە لە ئامێزی گرتبوو و گەرمی دەكردەوە و خوێنی دەجماند. لێوڕێژ بوو لە سۆز و دڵۆڤانی. زۆربەی جاران لە بن تیشكی خۆرەتاوی بەیانیاندا وای لێ دەهات.

بیری لە لۆكەجاڕەكان دەكردەوە. چوكووراوای دەهاتە پێش چاوی، خۆش و سیحراوی. جۆرێكی دیكە. ڕەوەزە ڕەشەكانی ئاناوەرزا و لە سەر ئەوانەوە، ئەو كاولانەی بە لێڵی دەبینران و رووبارەكەی جەیحان، كەسك و مەند، وردە شت بە سەر ئاوەكەیەوە و دەریای سپی بە لرفە بە شەپۆلی شینەوە، بەخرۆش و شێت، كە یەكپارچە دەبووە كەفێكی سپی. تاوێكی پڕشنگدار...

شێت و سەركەش... و خۆڵەكەی چوكووراوا لە بن تیشكی هەتاوەكەدا سپی دەچۆوە... تراكتۆرە چەورەكان، كامیۆنەكان و ڕێگەوبانە پڕ لە خۆڵ و خاكەكان وەك داوی جاڵجاڵۆكە تێك تەنرابوون و گەردەلولولەكانی بەر رووناكایی كە جار بە جار بەرزتر و گەورەتر دەبوونەوە و بەرەو تۆرووس دەڕۆیشتن... و مەزرا و ڕێگە پڕ لە كرێكارەكان... كرێكارە برسی و هەژارەكان بە چاوی خەفەتبار و دەستە زلەكانیانەوە كە وەك مێروو بە دەشتەكەی چوكووراوا وەربببوون...

عەلیی هاتەوە پێش چاوی. بە روخسارێکی تێکسمڕاو لە بن باری کوێرەوەریدا و چاوەکانی لێك ناوە و دەستی ناوەتە کەلەکەیەوە و برێك بەرەو پێشەوە نووشتاوەتەوە و دەڵێ:"خۆ رابگرە دایە، بە قوربانت بم سەبرت بێ. هەتا لە چوکووراواوە دێینەوە خۆ رابگرە و مەمرە. ئەو گوندییە هیچ و پووچانە بێت و بگەڕێنەوە و بە تۆ بە مردوویی ببینن، خوا بزانێ چیم بە سەر دێنن. خۆت دەزانی دایە... مەمرە دایە، کوڕە بە نۆکەرت بم مەمرە. بەتەنێ و لە بێکەسیدا زۆر ئەستەمە گیاندان. کەس نییە چۆڕێ ئاوت بە زارییەوە بکا. لە بەرت دەپاڕێمەوە دایە..."

مرێمۆك دەستی راستەی بەرەو لای عەلی درێژ کرد:

"نامرم کوڕم، نامرم پاڵەوانەکەم، تا نەگەڕێیتەوە نامرم. لە تۆ باشتر ئەو گوندییانە دەناسم. دەزانم ئەگەر بە مردوویی بەسەرمدا بکەون، چ بە سەر تۆ دێنن. باشە رۆڵە بۆ بمرم. چما بەبێ ئاو و نان کەوتوومەوە، بمرم؟ ئەو نانەی بۆت بەجێ هێشتبووم هەر ماوە. هەموو شتێك زۆرە. پێخۆر و خواردن هەیە، تەنیا رۆڵە، خودا هیچ گیانلەبەرێك تووشی تەنیایی نەکا. خۆ هەر یەك بنیادەمم لێرە لەگەڵ بوایە، ئەگەر تەنیا حەسەنەکەم، ئۆمەخانەکەمم لە لا بوایە، سالێك سەهلە، دە سالیش بە تەنێ هەڵمدەکرد و چاوەڕێ دەمامەوە. باشە بۆ ئەقڵت پێی نەشکا یەکێك لەو منداڵانەم لەلا بەجێ بێڵی، هەقتە کوڕم، منداڵێکیش رۆژێ بیست کیلۆ لۆکە خڕ دەکاتەوە. بەڵام ئێستا خۆ ئەگەر هەر یەك بنیادەم لێرە بوایە، ئەمن بەتەنێ نەدەبووم. تاشباش ئۆغلۆش نەهات. چووم بە چیاکەم گوت:"تاشباشەکەم، مەمەدەکەم، رۆڵە، ئەی وەلیی وەلییەکان، سۆمای چاوی چل سوارەکە." گوتم:"وەرە و هەتا گوندی لە چوکوور نەهاتوونەوە، لام بمێنەوە." نازانم بۆ گوێی نەدامێ. نە هات و نە خۆی نیشان دام. دەی با نەیە، ئاخری رۆژێك هەر بەو چاوانەم دەیبینمەوە، ئاخری رۆژێك تووشی دەبەم. ئەو کات دەزانم چۆن خزمەتی بکەم و چیی پێ بڵێم."

هەستا و تێلاکەی هەڵگرت:

"خەمت نەبێ عەلی، نامرم. ناهێڵم لای ئەو گوندییە هیچ و پووچانە ریسوا بیت و ئابڕووت بچێ. ئەگەر بشمرم، لە بەر چاوی ئەو گوندییانە دەمرم، با هەردووچاویان کوێر بێ و بزانن مرێمۆك ئەو کوڕەی لە گیانی خۆی خۆشتر دەوێ. ئاخ، ئاخ، ئەگەر تاقە یەك کەس لێرە دەبوو.... یەك کەس، جا ئەگەر کوێخا سەفەریش بوایە، تەنانەت ئەو سەردەستەی دز و رێگرانەش بوایە، ئەو راکردووەی یەمەنیش بوایە، ئەو لە خودا و حوکمەت یاغییەی بە چوار مەزەب خوێنی حەلاڵە، ئەو پیسترین بنیادەمەی رۆژگار مام خەلیلیش بوایە. قوفڵی زارم

دەشکێنم و وەقسە دێم. تەنانەت ئەگەر باب کوشتەشم بێ. هیچ شتێك لە تەنیایی خراتر نییە هیچ شتێك. عەلی لێگەڕێ با گوندی لە شوکوور بێنەوە، لێگەڕێ با بگەڕێنەوە، دەچم یەك بە یەکیان دەدوێنم. لەگەڵ چاك و خراپیان قسان دەکەم، تەنانەت سەگەکەشیان دەدوێنم. لەوە خراپتر نییە، نا، لەوە خراپتر نییە....

لە تەنیایی خراپتر... خراپتر لە تەنیایی... لێگەڕێ با گوندی لە چوکوور بێنەوە. دەست دەکەمە ئەستۆی هەمووان، ماچیان دەکەم و بۆنیان پێوە دەکەم تا تێر دەبم. بنیادەم دەبێ بەتەنێ بمێنێتەوە بۆ ئەوەی بزانێ تەنیایی یانی چی؟ تەنیایی چ بەڵایەکە عەلییەکەی خۆم."

تێلاکەی راوەشاند:

"دەی بچۆ کاری خۆت بکە عەلی، برۆ بۆ دەشتی چوکوور و بە کارەکەت را بگە. خۆ ئەتۆ خۆت نیت، تۆ خەیاڵەکەی عەلیی، تارماییەکەی عەلیی..."

"گوندی کە بگەڕێنەوە، ئیتر مرێمۆك دڵی کەس لە خۆی نایەشێنێ، هەر هەمووان، تەنانەت مام خەلیلیشی وەك حەسەنی خۆی خۆش دەوێ. باشە قسەنەکردن و نەدواندنی گوندی و نێوچاوان تێکنان لێیان یانی چی؟ کە ئەتۆ ئاوا لەگەڵ بنیادەمەکان دەجوولێیەوە، خوداش ئاوا تاسەباری بنیادەمەکانت دەکات. تەنانەت چرا هەڵدەگری و دەکەویتە شوێن سێبەرەکەی مام خەلیلیش. ئەوە ئەو خودایە، ئەو خودا چاوشینە ریش درێژەکە".

لە سەر ئاگردانەکە، ترخێنەکە دەکوڵێ، لەبەر گەرماکە هەڵمی مەنجەڵە دووکەڵاوێکە هەڵدەستێ و تێکەڵ تیشکی خۆرەکە دەبێ، مرێمۆك چاوەڕێی ترخێنەکەتی زوو بکوڵێ وبیخوات و وەشوێن کارەکەی بکەوێ. کاتی نییە.

مەنجەڵەکەی لە ئاگرەکە داگرت و گوتی:"بەسیەتی، بەسە ئیتر، کوڵی، خۆ زگم کون ناکا."

ترخێنەی لە قاپێکی گەورە کرد، بە دەستێکی سفرەکەی راخست و قاپەکەی لە سەر دانا. کەوچکە چێوییەکەی لە ترخێنەکە نا. چەند فوویەکی لە شۆرباوەکەی کرد، کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، جا خواردی، کەچی ئاواش زاری سووتا. دەی با بسووتێ. مرێمۆك زۆر بە پەلەیە.

زاری هەر وا دەسووتایەوە کە پڕی دایە تێلاکەی و کەوتە رێ. چووە ماڵەکەی کۆستوئۆغلۆ و لە بەر دەم ئاخوڕخانەکەوە راوەستا. بەسپایی و لەسەرخۆ وەك بلێی پێ لە سەر عەرزەکە دانانێ... گوێی بە دەرگاکەوە نا و ماوەیەك هەر وا گوێی هەڵخست. لە ژوورەوە هیچ دەنگێك نەدەهات. بەخۆی گوت:"خەوتووە. ئەو کافرە، ئەو لارییە، خەوتوە. ئەوجار بە ئاسانی دەگیرێ. چونکە نوقمی خەوە. دوێ شەوێ تا بەیانی نەحەجمێ و تا بەیانی خوێندی." کەڵەشێرە

لارییەکەی کۆستونۆغلو ئەو رۆژەی گوندییەکان کۆچیان دەکرد، لە دەرەوەی دێ، لە کاروانێ رایکردبوو. چەندی کەوتبوونە سەری، بۆیان نەگیرابۆوە. بۆیە وازیان لێ هێنابوو و رۆیبوون. بۆ سبەی بەیانی مرێمۆك بە دەنگی کەڵەشێرەکە لە خەوێ هەڵدەستێ و دڵی زۆر خۆش دەبێ. لەو رۆژەوە تا ئێستا مرێمۆك هەر دەیویست کەڵەشێرەکە بگرێ و چیی فرت و فێڵ بوو دەکاری هێنابوو. شەو و رۆژ بە شوێنییەوە بوو. چەند جاریش لە خەوێدا بەسەر کەڵەشێرەکەی دادابوو، بەڵام بۆی نەچووبووە سەر. دیارە دووجاران توانیبووی بیگرێ، بەڵام کەڵەبابەکە زۆر بەهێز و گورج ببوو و لە چنگی رای کردبوو. ئەوجارەیان ئەگەر وەچنگی کەوتبایە، دەیزانی چۆن توند بیگرێ. ئەزموونی وەرگرتبوو. ئیتر نەیدەهێشت را بکا. کەڵەبابەکەش زۆر پیر نەبوو. چەور و قەڵە و بوو. گۆشتەکەی بەشی حەوتووەکی مرێمۆکی دەکرد... وەك بەخۆڵەیەك...

بەبێ دەنگی دەرگاکەی کردەوە و وەك سێبەر خوشییە ژوورەوە. هەوڵی دا هیچ خشپەی نەیە. چەند ساتێك لە نێوەڕاستی ئاخوڕەکە چاوی لە سەر یەك دانا و راوەستا، بۆ ئەوەی لەگەڵ تاریکاییەکە رابێ. ئەوجار چاوی کردەوە. کەڵەبابەکە، لە لای راستەوە، لە سەر شوێنی تفاقەکە کرووشمەی کردبوو و وەنەوزی دەدا. مرێمۆك دڵی داخورپا و زۆر بە ئەسپایی بەرەو کەڵەبابەکە چوو. سێ هەنگاوی مابوو بیگاتێ. ئەو کافرە لارییەی باش دەناسی. دەیزانی لێ دەگەڕێ بنیادەم تەواو لێی بچێتە پێشێ، بەڵام هەر دەستت بۆ دەبرد، دەردەچوو.

مرێمۆك خۆی کێشا. بەهەموو تینی خۆی هەنگاوێکی دیکەی نا. کەڵەبابەکە هێشتا وەنەوزی دەدا، مرێمۆك وەك فەنەرێکی لە نەکاو رەوییێتەوە، خۆی بە سەر کەڵەشێرەکە دادا. دەستی وێی کەوت. کەڵەبابەکە لە چاوترووکانێکدا بە باڵەپڕژە دەرچوو. پەڕ و خۆڵی هەستاند. کەڵەبابە لارییەکە نەجاتی بوو. لە دەرگا کراوەکەوە دەرچوو و مرێمۆك یەك بە مەیدانێ درێژ بوو. دەستی راستەی وا دێشا دەتگوت شکاوە. چیی جنێوی دەیزانی بە کەڵەبابەکەی دا. بە زۆری لە جێی خۆی هەستایەوە و تێلاکەی دۆزییەوە و وەدەر کەوت:

بڕیاری دا بەیانی یان هەر ئەو شەوەی کەڵەشێرەکە دەنوێ، لێی بچێتە پێشێ و تا دەست دەگرێ تێلایەکی لە سەری راکێشێ. جا کاتێ کەڵەبابەکە وەپەلەقاژە دەکەوێ، دەمودەست بیگرێ و سەری ببڕێ، ئینجا دایماڵێ و جوان بیشواتەوە و خوێی بکا. دوای ئەوە ئاگرێکی ئەوەندە باش بکاتەوە کە کۆگایەك رەژووی لێ بکەوێتەوە و کەڵەشێرەکەی بخاتە سەری تا ببرژێ. گۆشتی برژاوی کەڵەشێر وەك رەنگی هەنار، چەور چەور... مرێمۆك ئاخێکی هەڵکێشا و لە دڵی خۆیدا گوتی:"یاخودا بە قوزەڵقۆرتم بێ، وەختێك منداڵەکانم لەبەر گەرمای چوکوور

ئەوە دەسووتێن، گیانی خۆیان دەخۆنەوە، ئەمن لێرە لە فێنکایی کوێستانێدا، کەبابی چەور و گۆشتی کەڵەباب بخۆم. یاخوا بە ژەهرم بێ، بە زووخاوم بێ."

زاری ئاوی کرد و دەم و لیچی خۆی لستەوە. سەیری خۆری کرد. هێشتا زۆری مابوو بۆ ئێواریێ. بەخۆی گوت:"با هەستم و برۆم، بچمە دۆڵی پەرییەکان و بانگی ئەحە شێتۆکە بکەم، بەشکم ئەمرۆ هاتبێ و گوێی لە دەنگم بێ."

بەرەو شیوەکە وەرێ کەوت.

"سبەی نا، دوو سبەی پێنجشەممەیە، پێنجشەممە شەوەکەی رۆحی مردووان ئازادن، رۆحە پاکەکان، چل سوارەکە، لەو شەوەدا، لە سەر چیاکە لە دەوری یەك کۆ دەبنەوە. تاشباشیش کە بەملی شکاوی بووەتە وەلی، بلێی و نەلێی پاوێکی باشە، ئەویش دیارە لە سەر لووتکەی چیایەك لەگەڵ هاورێیەکانی خۆی کۆدەبێتەوە بۆ را و تەگبیر، بەڵام لە سەر کام کێو؟ مرێمۆك نەیدەزانی کامە کێو. هەر رۆژە و لووتکەی چیایەکی دێنا پێش چاوانی خۆی و بەیانی پاشگەز دەبۆوە. بیری دەکردەوە و لە مێشکی خۆی دەنووسا بەشکم وەبیری بێتەوە کە تاشباش کاتێ بەشەر بوو، یانی هێشتا نەببووە وەلی، حەزی لە کام کێو و گرد بوو. چیی هەوڵی دا، هیچی وەبیر نەهاتەوە. ئەگەر ئەو چیایەی دۆزیبایەوە و تاشباشی وەچنگ کەوتبایە.. دوو قسەی پێی بوو. هەر ئەوەندە.

لێورێژ و هیوادار بوو. کە گەیشتە شیوی پەرییان، چیی وای نەمابوو بۆ ئێواریێ. لە بەر رەوەزێك کە هەمیشە لەوێ دادەنیشت، هەڵترووشکا. پاڵی بە رەوەزەکەوە دا، چاوەکانی لێك نا. گوێی دایە دەنگی ئەو ئاوەی لە چەقی شیوەکەوە دەرۆیشت. شیوەکە بۆنی لێڕ و بۆنی کاژ و سنەوبەر و پنگەی دەدا. بۆنی نەرمی خۆڵیش تێکەڵی بۆنی دارستان ببوو. مرێمۆك لە دنیادا ئەو بۆنەی پێ لە هەموو شتێك جوانتر بوو و بۆیە ئێرەیی بەو پەرییانە دەبرد کە لە دارستانەکەدا دەژیا. دوای ئەوەی تۆزێك پشووی دا، چاوی هەڵێنا، هەستا و بەرەو شیوەکە هەرای کرد:

"ئەحە شێتەکەی خۆم، کورە ئەمنیان بە تەنێ لەو گوندەدا بەجێ هێشت و رۆیشتن. نەنە مرێمۆکت چاوەڕێتە. کورە وەرە کارم پێتە. وەرە ئەحەی خۆم وەرە. وەرە و بمبە کۆشکەکەی خەزوورت. بۆ کۆشکی پەرییان. ناهێڵم ئابڕووت بچێ. ریسوات ناکەم نا. ئەمن لە بنیادەمەکانی تر ناچم. ... نا.... هەتا ئەو گوندییانە لە چوکووریێ دێنەوە، ئاگام لە منداڵەکانت دەبێ، مەترسە، ئەمن دەزانم چۆن لەگەڵ پەرییان بجووڵێمەوە. ئەمن وەك بنیادەمەکانی دی نیم. ئەو قسەیە بۆیە دەکەم پادشای پەرییەکانیش گوێی لێ بێ. ئەویش با

بزانیێ نەنە مریێمۆك لە بنیادەمەكانی دی ناچیێ. وەڵامم بدەوە ئەحەی خۆم. وەڵامم بدەوە، ئەحە، ئەحە ئە ئ...

گوێی هەڵسخت. دەنگی چەند جاران لە شیوەكەدا دەنگی دایەوە و ئیتر بێدەنگییەكە باڵی كێشایەوە. خوڕەی ئاو نەبیێ و خشە خشی گەڵاكانیش، هیچ دەنگێكی دی نەدەهات.

مریێمۆك بە دەنگێكی نزمتر و زیرەكانە بزەیەكی هاتیێ:

ـ سەیركە كوڕم، ئەحەی خۆم، ئەتۆ پێت خۆشە بێیتە لای من، بەڵام پەرییەكان ناهێڵن. بە دزییەوە وەرە... شەوێكیان، كاتیێ ئەوان نووستوون، بەسپایی وەرە. زۆرم غەریبی كردووی ئەحە گیان. ئەوە باش بزانە. زۆرم غەریبی كردووی.

گوێی هەڵخست. ماوەیەكی زۆر چاوەڕیێ ما، سەیری كرد ئەحە سۆراغی نییە. خۆی دایە سەر تێڵاكەی و لە شیوەكە وەسەر كەوت. مژی دەمەوئێواریێ وردە وردە دەنیشتە ناخی شیوەكەوە و خۆرەتاو بەرەو ئاوابوون دەكشا.

**مەمی دیك مردووەكەی لێ بووەتە بەڵا و لە بیرەكەشدا بۆی ناشاردرێتەوە. خۆ ئاوا بڕواتە پێشەوە، هەرچی هەڵۆی دنیایە دێن و ئاسمانەكەی چوكووراوا دادەپۆشن و پێشی خۆرەكە دەگرن. كوڕە خۆ ئەو خەڵكەش هەمووی هەر كەر نین، ئاخرییەكەی یەكێك لەو بیرە هەر دڕدۆنگ دەبێ كە هەڵۆكان لە سەری دەگەڕێن و مردووەكەش بە چاوە زەقەكانییەوە لە بەختی بنەكەی دایە و دەیدۆزنەوە.**

## ٢٠

مەمی دیك هاتە نزیك تەرمەكە* گەنمەكان، كە لە بن تریفەی مانگەشەوەكەدا لە تەپۆڵكێكی گەورە دەچوون و شوێنێكی هێندەی سێ چوار جێ خەرمانیان داگرتبوو. مەمی دیك بە خۆی گوت:

ـ ئەوە خەرمانی گەنمە یان گیشە و تەرمەكی قەرسیلەكەیەتی؟ جا خۆ دروێنە لە مێژە تەواو بووە. لەوانەشە هەر قەرسیل و كڵۆشەكەی بێ و بیانەوێ بیكەنە كا.

یەك دوو مەڵۆی دەركێشا و لە بن تریفەی مانگەكەدا رایخست. گوڵە گەنمە قاوەییەكانی چوكووراوا بوون بە قەڵچغ و داسووەكانیانەوە. مەمی دیك لە دڵی خۆیدا گوتی، ئەو خەرمانە بەشی خەڵكی دێیەك دەكا.

ئەوجار لە بن لێوییەوە گوتی:"حەیف بۆ ئەو خەرمانە." بە هەر فرت و فێڵێك ببوو، شقارتەیەكی لە گیرفانی حەسەن دەرهێنابوو. زۆر بەو تەڕدەستییەی خۆی دەنازی. دەستی لە گیرفانی پانتۆڵەكەی نا و دەستی بە شەمچەكەیدا هێنا.

---

* تەرمەك ، گیشە، یەعنی: كاتێك گەنم دەدووردرێتەوە و كۆگا كۆگا دەكرێ و هێشتا هەمووی نەخراوەتەوە سەر یەك و نەكراوەتە خەرمان. كۆگای بچووكی گەنم و جۆ دوای دروونەوەی.

لە نەکاو راچڵەکی و لەرزی. سەیری ئاسمانیی کرد. هەڵۆکان وەك پەردەیەکی رەش بەری ئاسمانەکەیان داپۆشیبوو و دەنگی وێککەوتنی باڵەکانیان لە ناخی شەوەکەدا دەبیسترا. دەنگی جۆش و خرۆشێکی نامۆ و سیحراوی ئاسمانەکەی داگرتبوو و دەتگوت ئاسمان بە هەزار باڵی پێکەوە لکاو بە شەپۆلانەوە دەفڕی.

مەمی دیك غاری دا. کاتێ بە هانکەهانك گەیشتە سەر بیرەکە، نوێژی شێوان لای دابوو، گورج خۆی رووت کردەوە و چووە سەر بیرەکە و راوەستا. دەیویست خۆی بهاوێتە نێو بیرەکە، بەڵام لە ترسان دەست و پێی لەرزین و شل بوون و هەر لەوێ دانیشت. سەری لە گێژەوە هات، دەتگوت ئیفلیج بووە. هانکەهانکی بوو. ماوەیەك هەر وا مایەوە و ئەوجار وەخۆ هاتەوە و دەسبەجێ خۆی لە بیرەکە هاویشت. بەبێ ئەوەی دەرفەتی ترس و دوودڵی بە خۆی بدا، خۆی گەیاندە مردووەکە، کە لە تەختی بنی بیرەکەدا کەوتبوو. مردووەکە هەڵمسابوو و گەورەتر ببۆوە. مەمی دیك دەستی لە بن پیلی مردووەکە نا و هەڵیستاند و لە سەر پێیان رایگرت. مردووەکە بە پێوە، هەموو بیرەکەی پڕ کرد. مەمی دیك شوێنی نەمابوو بجووڵێ. لاقەکانی مردووەکەی گرت، هەر دە پەنجەکەی بە گۆشتی مردووەکەدا رۆچوون. مەمی دیك هێڵنجی هات و رشایەوە. هێشتاش پەنجەکانی لە گۆشتی مردووەکەدا بوون. مەمی دیك ماوەیەك هەر نەیتوانی پەنجەی لە گۆشتە رزیوەکەی مردووەکە بێنێتە دەرەوە. داهاتەوە، چووە نێو ئاوەکە و مردووەکەی لە قەڵاندۆش کرد و بەو جۆرە دەستی لە دیوارەکەی بیرەکە دەگرت و خۆی راکێش دەکرد بۆ دەرەوە. مردووەکە زۆر قورس بوو. مەمی دیك زۆر بە سەختی دەیتوانی خۆی بکێشێتە سەرێ. لە پێشدا پێیەکی و دواتر و پێیەکەی دیکەی لە کونێکی قەدی دیواری بیرەکە گیر دەکرد. ئەوجار بە دەستەکانی خۆی توند دەکرد و خۆی هەڵدەکێشایە سەرەوە. بەو جۆرە لە بیرەکە دەهاتە دەرێ. لە دەرەوەی بیرەکە قاووقیژێکی سەیر بوو. دەنگی وێککەوتنی باڵەکانیش قیامەتێکی بەرپا کردبوو. چیی لە لێواری بیرەکە نزیکتر دەبۆوە، ئەو قاووقیژە پتر دەبوو.

کە گەیشتنە سەر لێواری بیرەکە و هەر ئەوەندەی سەری مردووەکە لە بیرەکە هاتە دەرێ، دەنگی سامناکی هەزاران باڵ وەك گرمەی هەورەتریشقە هات. وەك کێوێك برمێ، هەموو وڵات لەرزی. تەرمەکە خلیسکا و بە تەنیشت مەمی دیکدا کەوتەوە نێو بیرەکە. ئاوەکە هێندەی بەژنی پیاوێك شڵپەی کرد و هەستا. مەمی دیك سەدان دەندووکی رەشی هەڵۆی دی کە بەرەو ئەو لوور ببوون و دەهاتنە خوارێ، و سەدان باڵ رەشیش بە ئاسمانەوە. هەڵۆکان نیشتبوونەوە و پاڵەوپەستۆیان بوو کە خۆیان بگەیێننە سەر بیرەکە. سواری سەری یەکتری

دەبوون، ئەگەر رێك لەو كاتەدا بێت و مەمی دیك خۆی نەخستبایەتەوە نێو بیرەكە، دندووكی هەڵۆكان لە چاوترووكانێكا سەریان هەڵدەقەند.

دیسان چۆوە خوارێ و سەری مردووەكەی لە سەر شانی دانا و بە زەحمەت و كوێرەوەری و ئارەق رشتنەوە هەتا لێواری بیرەكەی هێنایەوە. دیسان هەڵۆكان هێرشیان هێنایەوە. جارێكی دیكەش مردووەكە خلیسكایەوە و كەوتەوە تەختی بنی بیرەكە و ئاوەكە شڵپ بەرز بۆوە و لە بیرەكە هاتە دەرێ و هەڵۆ چاوەڕوانەكانی تەڕ كرد.

مەمی دیك سێ جاران مردووەكەی هێنایە سەر لێواری بیرەكە و هەر سێ جارەكەش لێی هەڵخلیسكایەوە و كەوتەوە خوارێ.

هەڵۆكان خووسابوون.

ئاخرییەكەی مەمی دیك هەر هێنایە دەرێ. مردووەكەی لە سەر شانی دانابوو، دەستەیەك هەڵۆ بە شوێنییەوە بوون و ئەو بە غاردان خۆی گەیاندە جێ خەرمانەكە. گورج تەرمەكەی وەبن مەڵۆ گەنمەكان دا. وش وشی باڵەكان ئاسمانی جێ خەرمانەكەی پڕ كردبوو. بە هەزاران هەڵۆ پێش تریفەی مانگەكەیان گرت و مانگ ون بوو.

مەمی دیك بە غاردان خۆی گەیاندەوە سەر بیرەكە و جلوبەرگەكانی لەبەر كردن و گەڕایەوە جێ خەرمانەكە. كە گەیشتەوە سەیری كرد ئەوە هەزاران هەڵۆ لە سەر خەرمانەكە نیشتوون و بە دەندووكان دەیكۆڵن و بە هەزارانی دیكەش بە ئاسمانەوە دەسووڕێنەوە. جۆش و خرش و هەڵلایەكی سەیریان لە زەوی و ئاسماندا نابۆوە.

مەمی دیك قوتوە شقارتەكەی لە گیرفانی دەرێنا و چڵێكی داگیرساند و لە خەرمانەكەی نزیك كردەوە. كلۆشە وشكەكە دەمودەست گڕی گرت و بڵێسەی كێشا. هەڵۆكان بێت و خێرا هەڵنەفڕیبایەن، دەسووتان. هەموو رایان كرد. هەر هێندەی چاوترووكانێك خەرمانەكە گری گرت و كێوێك بڵێسە، هێندەی دوو منارە لە دەشتەكەی چوكووراوادا هەستا. مەمی دیك بەخۆی گوت:"ئەوە دەسووتێ، خەریكە دەسووتێ، ئۆخەیش نەجاتم بوو." بەڵام لە نەكاو لە ناخی خۆیدا هەستی بە تەنیایی و بۆشاییەكی تاقەتپڕووكێن كرد. خۆی بە نێو بڵێسەكاندا كرد تەرمەكەی كێشایە دەرەوە و بەكۆڵی خۆی دادا و بەرەو رووبارەكەی جەیحان كەوتە غاری دا. گەیشتە قوولكەیەكی دەم ئاوەكە. ئاگری خەرمانەكە هەموو دەوروبەری وەك رۆژ رووناك كردبۆوە. مەمی دیك ساتێك دەموچاوی مردووەكەی دی. دەموچاوەكەی گەورەتر ببۆوە و چاوەكانیشی دوو ئەوەندە گەورەتر. دەموچاوی وەك مسی سووری لێ هاتبوو. تەرمەكەی لە

قوولکەکەدا درێژ کرد. باوەشێك مێکووك و گژ و گیای هەڵکەند و داپۆشی و بە پەلەپەل خۆڵی بەسەردا کرد.

لە سەر بەدێکی تەنیشت گۆڕەکە دانیشت. هەموو دەوروبەرەکە رووناك ببۆوە و هەموو شتێك جوان دیار بوو. کە بە وردی روانیی، لینگە پێڵاوێکی مردووەکەی دی کە برێك لەولاترەوە کەوتبوو. هەستا و پێڵاوەکەی هەڵگرت و دەویست بە ئاوەکەیدا بدات، پاشگەز بۆوە و خوار گۆڕەکەی هەڵکەند و پێڵاوەکەی لە پێی مردووەکە کردەوە و دیسان داپۆشییەوە.

لە سەر بەردەکە دانیشتەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:"چیی وای نەمابوو مردووەکەم بسووتێنم. چیی وای نەمابوو. ئای لەو کەرێتییە، لەو گەوجێتییە. باشە مردووەکەم سووتابایە چیم لێ کردبا...."

شەکەتییەکی شیرین دایگرت، هەستا و بە دەرم رووبارەکەدا تێهەڵبوو. ئاگری خەرمانەکە هەر دەهات و گەورەتر دەبۆوە. بڵێسە سەریان لە ئاسمانێ دەسووی و پاناوکی دەشتەکەیان هەتا داوێنی ئاناوەرزا وەك رۆژ، رووناك دەکردەوە.

کە گەیشتەوە لۆکەجارەکە، چیی نەمابوو رۆژ بێتەوە. سەیری کرد گوندی هەموو بەخەبەرن. بەسپایی وەك هیچ رووی نەدابێ، بە دەم هەڵکێشانەوەی پانتۆڵەکەیەوە، خۆی خزاندەوە نێو گوندییەکان و ئەویش وەك ئەوان سەیری لای سووتمانەکەی کرد. هیچ کەس قسەی نەدەکرد. هەمووان چاویان لەو بڵێسانە بڕیبوو کە جار بە جار بەرزتر دەبوونەوە و تێکەڵاوی شەو دەبوون.

ـ ئەمشەو هیچ نەنووستین. کەس نەنووست، منداڵەکانیش...

لـەو ڕۆژەوە مـام خـەلیل هـەموو بـەیانیان دێ و "عەلی"یە دریژ لـە خـەوێ هەڵدەستێنێ و ناچاری دەکا بچن لە باشترین شوێنی مەزراکە لۆکە بڕننـەوە. عـەلی بـە قسەی ناکـا. گـوێ ناداتـە قسەکانی مـام خـەلیل... لـەو جێیەدا کە مام خەلیل جارێکی دیکەش "عەلی"یە درێژ لە خەوێ هەڵدەستێنێ.

## ٢١

مام خەلیل گوتی:

ـ هەستە عەلی، هەستە، بەرۆکت بەر نادەم.

عەلی وای لێ هاتبوو کاتی هاتنی مام خەلیل لەخۆوە لە خەوێ هەڵدەستا. ڕاهاتبوو. هەسـتا و دانیـشت. چـاوەکانی هـەڵگلۆفین. لـەو جەنگەیـەدا، ئـەلیف و منداڵـەکانیش هەستان... چەند ڕۆژێك بوو ئەوە دووپاتە دەبۆوە. مام خەلیل دیسان دەستی پێ کردەوە:

ـ دایکت ئێستا لە ئاواییەکە، لە گیانەڵڵا دایە. هەستە با لۆکە خڕ بکەینەوە بشکم بتوانی خـۆت بەگەیێنیتەوە لای مرێمۆکە گوڵەکە. خۆت بەگەیەنە و ئەو مرێمۆکە نازەنینە ڕزگار بکە.

وەك منداڵان چڵمی هەڵدەلووشییەوە و دەگریا:

ـ کوڕە لەو سووچەی مەزراکەوە، لۆکەیەکی لێیە لە بەرداشیش قورسترە. بنیـادەم دەتـوانێ سەعاتی پازدە کیلـۆ بڕنێتـەوە. پێکـەوە هـەموو شـەوێ ئەودەمانـە لێـی هەڵدەسـتین. گونـدی ڕۆحیشیان ئاگای لێ نابێ. بەسـپایی دەچـینە ئـەو سووچـە و جـا دەڕنینـەوە ئـەمان ڕنینـەوە. ئەتۆش جگە لەوەی قەرز و قۆڵەت هەموو دەدەیەوە، شتێکیشت بۆ دەمێنێتـەوە. چـوار پێـنج ڕۆژی دیکـەش وەڕێ دەکـەوی و ڕاسـتە ڕێ خـۆت دەگەیێنیتـەوە ئـاوایی و لای دایکـت، لای مرێمۆکە گوڵەکە و ناهێڵی بمرێ. کـوڕە نـەجوولێی، ئـاوا نـاتوانی پـێش خەڵکەکـە بگەیێتـەوە

ناوایی. قەرزەکەت زۆرە. دەگەڕێیتەوە و سەیر دەکەی ئەوە مریشکە گوڵەکە هەر ئێسک و پرووسکی ماوەتەوە. ئەو کات چیت پێ دەڵێن؟ ها، دەی بڵێ بزانم، دەی... چیت پێ دەڵێن؟ دەی بڵێ بزانم، "عەلی"یە درێژە بێ مێشکەکە، دەی...

ئەلیف:

ـ کوڕە مام خەلیل راست دەکا. ئەو لۆکەیە ئەوەتا لێرەیە. ئەمن خۆم دیتم. قۆزاخەی پڕ بە چنگن.

عەلی بە ناڵەیەکەوە گوتی:

ـ ناتوانم بچم.

هەر وەك جاران، لە سەر گازەرای پشت راکشا و ئەوجار خۆی خستەوە سەر زگ. مانگ ناوا ببوو. هەواکەی بوولێڵ بوو. وەك تاریکاییەکی کە رووناکییەك لە پشتییەوە بێ. هێشتا ئەو هێڵە دیار نەبوو کە لە سەر ئاسۆوە شەو و رۆژی لێك جوێ دەکردەوە. لە سەر لووتکەی چیای گاوران ئەستێرە کلکدارەکە وەك خەرمانەیەکی نوور دەدرەوشایەوە و پڕشنگی داویشت. شەو، دەتگوت بە سەر سپایی و رووناکاییدات دەڕوات و لە سروە نەرمەکەی بەیانیدا لە هەڵکشان و داکشانێدا بوو. سریوەی هیچ شتێك نەدەهات. هەموو وڵات بێدەنگ و کپ بوو. ئەوەندە کپ و بێدەنگ، کە دەنگی کۆخەی مام خەلیل لە دەشتەکەدا وەك گرمەی تۆپ دەنگی دەدایەوە. سپیایی گەواڵە هەورە بێجووڵەکان لە شەوەکەدا دیار بوون.

مام خەلیل مەچەکی دەستی عەلیی گرت و بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ هەستە، هەستە، کوڕی سەی.

کەوتبۆوە بیر باوکی عەلی. ئەوە خەیاڵەش دڵی خۆش کردبوو. هەر بە راستی عەلییش نەچووبۆوە سەر بابی خۆی؟ بەو پێیە ئەویش لێی تووڕە بی، دەسڵەمێتەوە.

ـ هەستە هەتیو، بێ مێشکی کەر، هەستە بزانم. ئەگەر هەڵنەستی، دەیکەمە قیامەت. بەو نیوە شەوە ئەو خەڵکەت بەسەر وەردەکەم.

عەلی دیسان هەستا و دانیشتەوە و گوتی:

ـ بەڵام... بەڵام مامە خەلیل... ئەو کارەی ئێمە وەك دزیێ وایە.

مام خەلیل گرماندی:

ـ دایکت ئەوە لەوێ دەمرێ. مریشکە گوڵەکە دەمرێ. بە من چی دزییە یان نییە. چ باشتر دەزییکردن بێ. ئەتۆ وای دانێ دزییە.

هەستا. مەچەکی عەلیی هەر بە دەستەوە بوو. عەلیش لەگەڵی هەستا. مام خەلیل بەسپایی بەرەو سووچی مەزراکە چوو. بەسپایی و بەبێ هیچ دەنگێك. وەك مار دەخوشی.

- بە ئەلیفی گوت، بە دوایاندا دەهات:

- لە سەرەخۆتر، لە سەرەخۆتر. جەواڵ و سەبەتەکانیش هەڵگرن... لە سەرەخۆتر... جەواڵ و سەوەتەکان...

ئەلیف لە پێشدا دەستی دابووە سەوەتە و جەواڵەکان. منداڵەکانیش هەر کام سەوەتەیەکیان پێ بوو.

بەبێ ئەوەی مام خەلیل مەچەکی عەلی بەربدا- هەر دووکیان بە کۆمەکۆم گەیشتنە دەم جەیحان. مام خەلیل گوتی:

- جا ئەو جار کەیفی خۆتانە.

ئیتر سەیرێکی چیای گاورانی کرد و لە سەری ڕۆیشت:

- هێشتا زۆری ماوە رووناکی بکاتەوە. ئەگەر چوار پێنج ڕۆژان ئاوا لۆکە بڕنینەوە، هەر ئەوەندەی دەمێنێ ماڵاوایی لە تۆ بکەین... هەتیو، ئەتۆ بابی منت گا... دزی... دزی... چما لەو دنیایە کەس هەیە دز نەبێ؟ دزییش خۆی دنیایەکی هەیە... تاشباشی سەروەرمان خۆی لەو دزە گورج و گۆڵانەی رۆژگارە. هەر ئێمە ناومان بە خراپە رۆیوە. مێش و مەگەز و ماسی و کرم و هەڵۆ و مامزە چاو گەورەکان و گورگ و مێروولە، هەموو شتێك و هەموو کەس لەم دنیایەدا دزن، ئەدی "عەلی"یە درێژە بێ ئەقڵەکە، جا کاتێ هەرچی گیانلەبەرە دزن، کەوابوو دزیی کارێکی پیرۆز و متفەڕکە... کەوابوو دەی دوودڵ مەبە عەلی... چونکە ئەو دزییەی دەمانەوێ بیکەین، پێی دەچییە بەهەشتێ. زوو بە دەی هێندەی نەماوە رووناکی بکاتەوە. زۆرم قسە پێ بوو بەڵام وا خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە.

خێرا هاتنە سووچی مەزراکە و خۆیان تێ خست. ئەلیف پەلاماری لاسکە لۆکەی دا. گیانی بەخاو کەوتبوو بەڵام کە ئارەقەی کرد، توندوتۆڵ بۆوە. عەلی شەڵاڵی ئارەقە بوو. ئەوە یەکەم جاری بوو دزیی دەکرد. دیارە ئەگەر ئەو لۆکە رنینەوەیە بە دزیی دابنرێ. بەخۆی گوت:"تازە ئەو کارەم هەر کردووە، لانیکەم با باشی بکەم. مام خەلیلیش هەقیەتی. پیاوێکی بە فرت و فێڵە بەڵام ژیرە. باشی بیر لە چاکە و خراپەی ئەم دنیایە کردۆتەوە. چ خێرا خێراش دەرنێتەوە. کوڕە سەیر کە لەو تاریکییەدا دەستەکان چەندە گورج و خێران. ئەویش بەو تەمەنە، سەد ساڵ دەبێ یان دووسەد ساڵ...."

مام خەلیل گوتی:

ئەو لۆکەیەی رنیوتانەتەوە، بیکەنە جەوالێکەوە. ئەمن هەلێدەگرم و دەیبەمەوە سەر کۆگاکەمان. بەبێ ئەوەی کەس سۆسەی بکا، بەتالّی دەکەم و دێمەوە. گوندییەکان ئێوە ببینن دەتانکوژن. بۆیە هەر بۆ خۆم...

ـ ئەو قۆزاخەیەی بە هەر پێنج کەسیان رنیبوویانەوە، لە جەوالێکیان کرد. مام خەلیل بە کۆلّی خۆی دادا و بردییەوە بەرەو کەپرەکان. لە خۆشیان بالّی گرتبوو.

ئەلیف لە نەکاو دەستی رەق بوون. قیت بۆوە و باسکی عەلیی گرت و گوتی:"سەیرکە، سەیر کە." و ئاماژەی بۆ ئەو سێبەرانە کرد کە برێك لەولای خۆیانەوە دەجوولانەوە:"ئەوانیش وەك ئێمە...."

جلوبەرگەکانیان بە خوناوکە خووسابوو. لە نێوەراستی لاسکەکاندا دوو شووتیی گەورە و گەیوو و شیرینیان دۆزیبۆوە. یەکێکیانیان هەر لەوێ قاش کردبوو و خواردبوویان. بۆنی شووتییەکە هەر وا لە مێشکیاندا بوو و فێنکی دەکردنەوە. بۆنێکی خۆش و فێنك و شیرین.

مام خەلیل ناوە ناوە دەیگوت:

ـ خێراکەن دەی دەست ببزێون. چیی نەماوە رۆژ بێتەوە. سبەینێ و دوو سبەییش دێینەوە ئێرە.

دیسان تۆزێکی دیکە روون بۆوە.

ـ بەسە. دەست هەلگرن تەماح باش نییە. دەی خێرا، تا گوندی وەخەبەر نەهاتوون، با برۆین. برۆین و برێك دواتر لەگەلّ ئەو گوندییە کەرانە هەستین و بێینەوە بۆ لۆکە رنینەوە. باشە، با جارێ بنووین و پشوویەك بدەین. باشە، بنیادەم و هەموو بوونەوەرەکانی دنیایە و بە تایبەتی سەرکردەی دزەکانیش پێویستیان بە تۆزە حەسانەوەیەك هەیە. ئێستا ئەمن جەوالّە پرەکە هەلّدەگرم و وەپێشتان دەکەوم. ئەگەر من بگرن، هیچم لێ ناکەن، شتێکیشم لێ بکەن چش...

جەوالّەکەی لە کۆلّی خۆی داگرت و گوتی:

ـ ئێوە لێرە دانیشن. ئەمن با برۆم و سەرێك بکێشم بزانم چ باسە. لە خۆرا قوت بووم.

رۆیشت و دەمودەست گەرایەوە و گوتی:

ـ هەی هاوار. ئەی خوایەگیان، ئۆککەش داغ قۆردوو و ژن و منداڵەکەی، برێك لە پێش ئەوانیشەوە کوێخا سەفەر و منداڵەکانی، کورە خۆ نیوە گوندی بە خەبەرن و لۆکە لە نیوەکەی

دیکە دەدزن. ئۆککەش داغ قۆردوو خۆی بە سەر پێڵاوەکانم کێشا و گوتی:"بەزەییت پێمدا بێتەوە مام خەلیل، ئەمن ئەو دزییە لە ڕێی خوادا دەکەم." و گریا و گوتی:"ئەمساڵیش ئەگەر نەچمە حەجێ، ئیتر تا مردن بە نەسیبم نابێ و بە گوناحباری دەمرم." دەگریا و دەیگوت:"کوڕە ئامانە، بە کەس نەڵێی ها." و هەر وا دەگریا. مەگری ئۆککەش، ئەتۆ بچیتە حەجێ و نەچی، لە بەهەشتێ کۆشکێکت لە ئەڵماس و مەرجان و بلوور بۆ ئامادە کراوە و حەفتا حۆرییشت بەناو کراوە. هەر هەمووشیان بەژن و باڵا جوان... ئەتۆ دزیی خۆت بکە. کوێخا سەفەریش ئەوە سەرقاڵە. ئێمە تا ئێستا ئەومان نەدیتبوو لۆکە خڕ بکاتەوە." دیتبوومان عەلی؟

- نا، نەماندیتبوو.

- یانی، دیارە ئەو فێڵبازە سەگبابە چەندی چەند ساڵە بە ڕۆژ خەوتووە و شەوانە لۆکەی خڕ کردووەتەوە. ئێمەش پێمان وابوو ئەو دەست لە ڕەش و سپی نادا. ئەو سینگی دەردەپەڕاند و دەیگوت:"ئەمن وەك ئێوەی نەدی و بدی کار ناکەم." دیارە ئەو کارەکەی لە کاری ئێمە قورستر بووە، ئەویش لە تاریکانی شەودا.

عەلی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

- ئەویش لە تاریکانی شەوێدا.

- دەی، یائەڵڵا، دەی گورج بن...

بەرەو کەپرەکان وەڕێ کەوت و جەواڵەکەی لە سەر کۆگاکەی عەلی هەڵڕشت. ئەوجار تۆزێك دوور کەوتەوە و سەیرێکی کۆگاکەی عەلیی کرد. ئەو کۆگا لۆکەیە دوو هێندەی کۆگای ئەوانی دیکە بوو.

بە دەنگێکی بەرز گوتی:

- زۆر باش بوو، زۆر...

ئیتر خۆی خزاندە جێوبانەکەیەوە و جاجمەکەی بە سەر خۆیدا کێشا: هەر بە ڕاستی مرێمۆك مردبوو، یان بەم زووانە دەمرد؟ یان ئێستا لە سەر کانییە فێنکەکان و لە نێو عەتری پنگەکانیاندا دەگەڕا؟ بەو جۆرە عەلی دەیتوانی خۆی بگەیەنێتەوە مرێمکە گوڵ ڕوومەتەکەمان... لە نەکاو بیرێك وەك بریسکە بە مێشکیدا هات. "ئەگەر مرێمۆك بمرێ، ئەمنیش ناژیم." بزەیەکی هاتێ. سەری لە سەر باسکی ڕاستەی دانابوو. سووڕایە سەر کەلەکەی چەپی. "ئەگەر من بمرم، مرێمۆکیش دوای من ڕۆژێك ناژیێ. دەمرێ. ئەگەر مرێمۆك

نەمریّ، ئەمن کەڵەبابێکی پۆپەلاریی گەورە دەکەمە قوربانی. خوایە گیان کارێکی وا بکە نەمریّ و ئەمن جارێکی دیکە لەو دنیایەدا ببینمەوە...."

عەلی لە سەر پشت درێژ ببوو و خەوی لیّ نەدەکەوت. سەیری ئەستێرەکانی دەکرد. هەموو گیانی نوقمی خوناوکە بوو. دەلەرزی. سەرمای بوو. مووچڕکە و تەزوویەك بە هەموو گیانیدا هات. خۆ ئەگەر نیوەی گوندەکەش دزییان کردبایە، دیسان ئەو هەر پێی عەیب بوو دزییّ بکا. لە لایەکیشەوە دڵی خۆش بوو. ئەگەر ئاوا رۆیبا، لەگەڵ تەواوبوونی کاری مەزراکە، ئەو وەڕیّ دەکەوت و دەچوو قەرزەکانی دەدایەوە.

ئەلیف و منداڵەکانیش حزیبوونە جێوبانەکەیانەوە و خەویان لیّ کەوتبوو.

عەلی دایکیی بە شپرزەییەوە دێنایە پێش چاوی خۆی. مرێمۆك پێی دەگوت:"باشە ئەوە دڵت چۆن بەرایی دا؟ چما شتی وا دەبیّ، پیاو پیرەژنێك لە دێیەکی چۆڵدا و لە نێو حەیوانە دڕندەکاندا بەتەنیّ بەجیّ بێڵیّ و لێدا بڕوات؟ بەتاقی تەنیّ و بەبیّ هیچ شتێك؟ نە ئاورگەیەك هەیە و نە ئاگرێك."

"ئاخ خۆزگە پێش ئەوەی بمریّ یان نەخۆش بکەویّ، بتوانم بگەمەوە لای... ئەو کاتە مرێمۆك، ئەو دایکی هەموو دایکانەم لە سەر چاوەکانم دادەنا. ئەو باشترینی دایکەی دنیایە، ئەو دایکەی نەمهێشت ئاوێکی خۆشی لە گەرووی بچێتە خواریّ. باشە ئەو کارەم چۆن کرد؟ چۆن؟..."

خۆی دایە سەر ئانیشکی و هەستا و سەیری گوندییەکانی کرد کە لە تاریك و روونەکەی بەیانیدا وەخەبەر دەهاتن و باوێکشیان دەدا یان چاوەکانیان هەڵدەگلۆفی. هێڵە روناکەکەی سەر لوتکەی چیای گاوران کەسك دەچۆوە و هەر دەهات و پان و بەرینتر دەبۆوە.

"بەڵام هیچی دیکەم لە دەست نەدەهات. خۆ لەگەڵ ئەو مابامەوە لە ئاوایی، ئەویش و ئێمەش هەر هەموومان لە برسان دەمردین."

گوندی بێدەنگ و خەواڵوو، سەوەتە و جەواڵ بە دەستەوە بەرە و مەزرایە دەچوون...

عەلی سیخورمەیەکی سووکی لە کەلەکەی ئەلیف وتا و گوتی:

ـ هەستە ئەلیف.

ئەلیف راپەڕی. عەلی:

ـ خەڵك ئەوە دەچنە سەر کاریّ.

ئەلیفیش ویستی منداڵەکان هەستێنیّ.

عەلی دەستە زلەکانی بە سەری منداڵەکاندا هێنا و گوتی:
ـ لە منداڵەکان گەڕێ.
ئەلیف گوێی نەدایێ و گوتی:
ـ ناکرێ. ئەگەر ئێستا یارمەتیمان نەدەن، ئەی کەنگێ بە کارمان دێن؟
بۆیە بە توندی رایوەشاندن:
ـ حەسەن، ئۆمەخان.
منداڵ هەستان.
ئەلیف ئاگری لە جەرگی بەربوو.

گوندی هەموو لێیان سوور بوو کە "عەلی"یە درێژ شەوانە هەڵدەستێ و دەچێتە باشترین شوێنی مەزراکە و لۆکە دەڕنێتەوە. دیارە لە نێو کرێکارەکاندا دەگەمەن کەسێك هەبوو شەوانە هەڵنەستێ و بە دزییەوە لۆکە نەڕنێتەوە، چەند پیر و پەککەوتە و منداڵ نەبێ هەمووی هەڵدەستانەوە. گوندی زۆر زۆر تووڕە بوون لەوەی عەلی بە دزییەوە لۆکە دڕنێتەوە. هەر کەس ئەوەی بیر دەکەوتەوە، زۆر زۆر تووڕە دەبوو و کەف هەڵدەخڕاند. سەبارەت بەوەی کە گوندی دەیانەوێ بەبێ ئەوەی عەلی بزانێ، لە سەر تاوانەکە بیگرن...

## ٢٢

ژنەکەی بەکرە شێت گوتی:

ـ دیتم. چووبوومە سەر پێشاوێ. دەزانن چیم دی؟ مام خەلیل و "عەلی"یە درێژ لەگەڵ ئەلیف و منداڵەکانی. چوبوونە باشترین شوێنی مەزراکە و هەر مەپرسە چۆنیان لۆکە دەڕنییەوە... "عەلی"یە درێژ دەتگوت دەیەوێ هەموو مەزراکە هەڵلووشێ... ئەی ئاوا... ئەوەتا کۆگا لۆکەکەی هێندەی بەژنی بنیادەمێکە. دەی باشە، ئەگەر ئەو بە شەوانە لۆکەی نەڕنیبایەتەوە، چما کۆگاکەی ئەوەندە گەورە دەبۆوە؟

زەلەجە گوتی: کۆگاکەی هێندەی باڵای پیاوێکە... سەگبابی دز...

گۆملیکسیز ئۆغلو گرماندی:

ـ خەرمانەکەی شەوکەت بەگیشیان سووتاندووە. ئەوە دەرکەوت کێیە شەوانە دەگەڕێ. کێیە بووەتە بەڵای گیانی ئاواییەکە. ئێمەش ژن و منداڵمان هەیە. ئێمەش قەرز و قۆڵەمان

هەیە. جگە لەوەش، ئێمە داکی خۆشمان نەکوشتووە و تەرمەکەشیمان بە رەوەزەکانی یالاکدا نەکردووە کە وشك هەڵبێ. کەس نییە لەو گوندەدا پێشی ئەو پیاوە بگرێ؟ کەس نییە پێی بڵێ پووتێك چەند کیلۆیە؟

کوێخا سەفەر بە ئاماژەی دەستی بانگی "عەبدییە خوار"ی کرد. دوای ئەویش بانگی گزیرەکەی. هەر دووکیان وەشوێنی کەوتن و رۆیشتن. کوێخا سەفەر کە گەیشتە لای پنچکە گەزەکانی دەم جەیحان راوەستا:

ـ چاوی چاوم، برادەرینە، دەزانم تاشباش ئەمری پێ کردوون من نەدوێنن، بەڵام بەخۆم گوت با هەستم و پیاسەیەك بکەم. جا چم دی؟ سەیر دەکەم، "عەلی"یە درێژ، برادەرە گیانی بە گیانییەکەی ئەو تاشباشە چڵمنە، خۆی بە مەزراکەدا کردووە و هەر مەپرسن چۆن دەرنێتەوە... بەخۆم گوت، هەی بێ ویژدان، ئای ئای ی ... هەی بێ ویژدان، ئای ی ئای ی ... چما پیاوی دایکی خۆ کوژ، خێری بۆ بنیادەمان دەبێ؟ یەکێکی دایکی خۆی بکوژێ، لە هەرچی بوونەوەرە چەپەڵتر و پیسترە. سەیر کەن، ئەمشەو دەچن و هەر لەو شوێنەی من پێتان دەڵێم، دەیگرن. ئەوجار بە هەموو گوندی بڵێن، زاڵمێکی بێ ویژدان، ئەو لۆکەیەی مافی ئێمەیە، دەرنێتەوە. دەی باشە، سزای ئەو کارە چییە؟ ئەو هەموو شەوێ ئەوە کارێتی. وریا بن با بەگوێی نەگاتەوە، ئەگینا دەترسێ و ئیتر شەوانە ناچێتەوە لۆکە رنین. دەبێ لە سەر لۆکەرنینێ بیگرن. بەڵام ئەنگۆ پێشی مەڵێن پشتی چاوت برۆیە. لە لاوە راوەستن. گوندی بۆخۆیان تەمبێی دەکەن. ئەنگۆ هەر دێهاتییەکانی لێ تیژ بکەن بەسیەتی. تێگەیشتن؟

هەر دوو کیان، سەریان بۆ لەقاند، ئەوە کاریان بوو. دەیانزانی چۆن چۆن گوندی لە یەکێك تیژ بکەن و بیانکەنە ئاسنی سووورەوەکراو و بەگڕیی داکەن. گوندی "عەلی"یە درێژیان لەمردنێ دەکرد. بە جووڵەی دەست و سەر و ئاماژەی چاو سەفەریان تێگەیاند و گوتیان:"لەوەی بە دواوە لە ئەستۆی ئێمە، کوێخای ئازیز، ئەتۆ کارت نەبێ."

سەفەر گوتی:

ـ براله عەبدی، هیوام بە تۆیە. ئەو دوو چاوە رەشەت ماچ دەکەم گزیر گیان. ئەتۆ گەورەترین گزیری تۆرووسی. شان و شکۆ و ناوبانگت تا ئەو پەڕی دنیا رۆیشوە و لە بەریتانیا و هەروەها لە چینی سووریش و هەروەها لە وڵاتەکی "کاسترۆی" بەناوبانگیش ناوت رۆیوە. ئەنگۆ ئەمن نادوێنن، قەیناکا مەمدوێنن. بەڵام ئەنگۆ گلێنەی چاوی منن. دەی باشە، خواتان لەگەڵ، بە هیوای سەرکەوتن. ئەمڕۆ دەچم و سەر و سوێسکەیەکی چەور و قەڵەو بۆ هەر

کامێکتان راو دەکەم و بۆ خۆتان لە سەر ئاوریّ بیبرژێنن با گوندی لیکاویان بە زاریدا شۆڕ بێتەوە و لە بەر چاویان ملچە ملچ بیخۆن... دەی باشە، بەخێر چن...

عەبدی و گزیرباشی، دەسبەجێ وەخۆ کەوتن. کرێکار ریزیان گرتبوو و یەك پشوو لە سەر ئەو مەسەلەیە سرت و خورتیان بوو. "عەبدییە خوار" بەردەوام دەیگوت:"وریا بن، وریا بن با سۆسەی نەکا، با لەسەر دزییەکە بیگرین. عەلی دردۆنگ بوو بەڵام گوێی نەدایێ، چونکە لەوەتەی هاتبووە ئێرە، هەر هەمووان وەك دوژمن سەیریان دەکرد. بۆڵەبۆڵ و سەیرکردنی دوژمنانە و تف کردنەوەی بە بێزارییەوە ئەو کاتەی تووشی دەبوون، ئیتر هەمووی ئەوانەی بۆ ئاسایی ببۆوە.

گەرم بوو. مات بوو و تیشکی خۆرەکە چاوی لەبەر هەڵنەدەهات. هەموو کرێکارەکان دەتگوت جەستەیەکی بیّ ئۆقرە و بەجووڵەن. چاوەڕێی پزیسکێك بوون، پزیسکێك، بۆ ئەوەی عەلی لەتوپەت بکەن. هیچ پەڵە هەورێك بە ئاسمانەوە نەبوو. ئاسمان گڕی گرتبوو و لە نێو تۆزێکی سووربادا گڕەی دەهات. کرێکار، وڕ و کاس و نوقمی ئارەقەی بوون. "عەبدییە خواروخێچ" لە بن گوێی هەمووان دەیگوت:"تۆ خودا پەلە مەکەن. هەر ئەمشەو دەیگرین و تەمبێی دەکیەن. جاریّ مەیکەنە هەرا، تۆ خودا..." سرتە سرتەکە زار بە زار گەڕا:

ـ دان بە خۆتاندا بگرن...

ـ بێدەنگ بن.

ـ ئەمشەو، ئەو وەختەی ئەو کافرە لۆکەی دەڕنێتەوە...

لە دوورەوە دەنگی سیّ تەقە هات. دووکەڵە خۆڵەمێشییەکەی باروت، وەك سیّ پەڵە هەور، لە بن میچی ئاسمانە داغەکەدا مایەوە. جموجۆڵ و تووڕەییەکی نائاسایی لە نێو کرێکارەکاندا پەرەی دەگرت.

بۆڵەبۆڵ و گرمەگرمی کرێکارەکان تا گەیشتنەوە کەپرەکانیان هەر بەردەوام بوو. کە گەرماکە بەتەوژمتر بوو و کرێکار پەنایان بردەوە بەر کەپرەکانیان و هاموشۆیان دەستی پێکرد و لە کەپرەکانەوە دەنگی هات و هاوار و جنێو و قسەی تاڵ بەرز بۆوە.

لەو جەنگەیەکدا سەفەر کە دوو سوێسکەی بە لاقەدەوە بوو، گەیشتەوە. پێکەنینی سەر لێوانی نەدەڕەوییەوە. سەری بە کەپرەکاندا دەکرد و هەر ئەوەندەی دەگوت:"ماندوو نەبن." و پێدەکەنی و ددانە سپییەکانی وەدەر دەخست.

بە ژوور سەریانەوە، ئەو جێتە ئەمریکیانەی لە بنکەی ئەنجیرلیکەوە هەستابوون، ئەوی نەوی تێپەڕین. ئەوە جاری جاران بوایە، هەر هەموو غاریان دەدایە دەریّ و هەتا فرۆکە لە

چاوان ون دەبوون، هەر سەیریان دەکردن، بەڵام ئەمجارە کەس سەریشی هەڵنەهێنا. سێبەری فڕۆکەکان بە خێرایی بە سەر زەوییەکەی چوکووراوادا خوشین و چەند هێڵێکی ڕەشیان بە سەر خۆڵ و خاکە روونەکەدا کێشا...

مەمی دیك چاوی بڕیبووە ئاسمانی ژوور بیرەکە و سەیری هەڵۆکانی دەکرد. هەڵۆکانیش تێك دەچرژان و لە ئاسماندا دەبوونە گەواڵەیەك و دەچوون لەبەر یەکەوە و ئەوجار وەك مێگەلێکی گورگ لێی دابێ، لێك بڵاو دەبوون و یەك بە یەك بە ئاسمانە بێ سنوورەکەی ئاناوەرزادا بڵاو دەبوون. ئەو کۆبوونەوە و لێك بڵاوبوونەوەیە ماوەیەك هەر بەردەوام بوو.

مەمی دیك راوەستابوو و دەستی بۆ هیچ کارێك نەدەچوو و ئەو یاریی کۆبوونەوە و لێك بڵاوبوونەوەیەی هەڵۆکانی سەیر دەکرد و بەبێ ئۆقرەیی و کۆنجکۆڵیەکی نامۆوە چاوەڕێی کۆتایی ئەو گەمەیە بوو. چ دەقەوما؟ ئاخۆ هەڵۆکان ئاسمانی سەر بیرەکەیان بەر دەدا و دەڕۆیشتن؟ پۆلی هەڵۆیان جارێکیان ئەوەندە نەوی بوونەوە کە چیی نەمابوو باڵیان وەعەرزی بکەوێ. تاوێك هەر ئاوا نەوی فڕین، دەتگوت دەیانەوێ بنیشنەوە. یەك دوو هەڵۆ نیشتیشنەوە و بە لارە لار و باڵی کراوەوە چوونە سەر بیرەکە و لە پاشان بەبێ ئەوەی باڵەکانیان وێك بێننەوە، هەڵفڕینەوە. لە سەرەخۆ بەرەو ئاسمان هەڵکشان و تێکەڵی پۆلی هەڵۆیان بوونەوە و ئەوجار بڵاوەیان کرد و بەرەو رەوەزەکانی ئاناوەرزا رۆیشتن. بەشی لای چەپی پۆلی هەڵۆکان لە لای رۆژاواوە وەك ئاڵایەکی رەش شەکایەوە، بەشێکی لێ دابڕا. وێك دەهاتنەوە و بڵاو دەبوونەوە، بەو جۆرە بەرەو سەرووی "دۆملو" رۆیشتن و وەك پەڵەیەکی رەش لە نێوان رووناکاییە ئاگرین و تەماوییەکەدا لە چاوان ون بوون.

شەپۆلێکی خۆشی لە دڵی مەمی دیك گەڕا. بەخۆی گوت:"خەریکن دەڕۆن. ئیتر ناگەڕێنەوە سەر ئەو شوێنەی مردووەکەم لێ ناشتووە."

لە نەکاو دڵی توند بوو. هەر بە راستی مردووەکە چیی بە سەر هاتبوو؟ دوێ شەوێ چۆنی ناشتبوو؟ بەحاڵ رووداوەکەی دوێ شەوێی وەبیر دەهاتەوە:"بیرەکە، مردووەکە، خەرمانە سووتاوەکە و ئەوەی کە چۆن گیانی خۆی خستبووە مەترسییەوە و مردووەکەی لەو ئاگرە دەرکێشابووە دەرێ، دەتگوت خەونی دیتووە. خەرمانەکە ئێستاش لە بنەوە هەر دەسووتا و ئەو دووکەڵەی لێی هەڵدەستا، راستەوخۆ بەرەو دڵی ئاسمان دەچوو و لەو سەرەوە سەرچڵۆوکی دووکەڵەکە دەشکایەوە و وەك هەورێکی کاڵ بڵاو دەبۆوە و لەگەڵ ئاسمان تێکەڵ دەبوو.

"نەکا مردووەکە بەڵایەکی بەسەر هاتبێ. نەکا کۆگا گڵەکەی گۆڕەکە، شوێنی مردووەکەی لەقاو دابێ."

هەڵۆکان... مردوو.... و گوندییە تووڕەکان کە بە شوێن نانەوەی داوێکەوە بوون... هەر هەمووی ئەوانە ئەمڕۆ مەمی دیکیان خستبووە نێو چنگی جۆرە بێ ئۆقرەییەکی سیحراوییەوە...

"هەر بە ڕاستی... بە ڕاستی ئەگەر مردووەکە لەو گۆڕە تازەیەدا بدۆزنەوە چ دەقەومێ؟ یان ئەگەر هەڵۆکان لە سەر گۆڕە تازەکە بنیشنەوە و مردووەکە لە گۆڕەکەی دەرکێشن؟ مردووەکە... مردووەکە... باشە بۆچی لە خۆڕایی ئەو مردووەی لە ئاگرەکە هێنابووە دەرێ؟ ئەگەر هەر لەوێ مابایەوە، هەتا ئێستا دەسووتا و دەبووە خۆڵەمێش. ئای چ بەڵایەکت بە سەر خۆت هێنا مەمی دیك. ئێستا ئیتر تاشباشی سەروەریشمان ناتوانێ نەجاتت بدا. خۆ ئەگەر هەر لەو دەم و ساتەدا مردووەکە یان لانیکەم گۆڕەکەی نەدیتبایە، شێت دەبوو. با کەفوکولێکی شێتانەوە باوێشکی دا و ئێسکەکانی قرچەیان هات. جینگڵی دا.

هەڵۆکان لە ئاناوەرزاوە وەك پەتێکی ڕەشی درێژ بەرەو باشوور و دەریای سپی بەڕێوە بوون. مەمی دیك لە بن لێوانەوە گرماندی:

"کوڕە خۆ ئەو هەڵۆیانە یەکسەر شێت بوون. لەوەتەی دنیا دنیایە، کەس نەیدیوە هەڵۆکان ئاوا وەك پەتێك ریز بن و بڕۆن."

لە بن گوێیان، دەنگێکی بیست و ئاوڕی دایەوە. مام خەلیل قسەکەی ئەوی دووپاتە کردەوە:

ـ کەس نەیدیوە. ئەمنیش لەوەتەی خۆم ناسیوە، نەمدیوە پۆلێك هەڵۆ ئاوا وەك پەتێك هەڵفڕن. دوڕناکان ئاوا هەڵدەفڕن، قاز و قورینگیش، بەڵام هەڵۆ هەر یەك پشوو لە سەر شوێنێك لەنگەر دەگرن و دەسووڕێنەوە.

مەمی دیك گوتی:

ـ ئەمن ئەو هەڵۆیانەم زۆر پێ سەیرە مامە خەلیل.

مام خەلیل:

ـ ئەمنیش....

پەتی هەڵۆکان لە نێوەندەوە پسا. ئەو نیوەیەی وا لە دەریاوە نزیك بوو، وێك هاتەوە و خڕ بۆوە و هەورە سپیە تازە هەستاوەکانی خاڵ و بەڵەك کرد. نیوەکەی دیکە بەرەو لووتکەی ئاناوەرزا فڕی. مەمی دیك دیتی ئەو پۆلە هەڵۆیە یەك یەك و دوو دوو، لەسەرخۆ بەرەو ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا کشان و نیشتنەوە.

ئاسمانەکەی روون و زولاڵ بوو. پەڵەیەکی بچووك بچووکیش نەبوو کە ئەو ئاسمانە ساو و سامالە پیس بکا.

مەمی دیك کە بەلای راستیدا ئاوڕی دایەوە، هەڵۆیەکی دیت کە لە لای چیاکەوە لوور ببوو و بەرەو لای ئەو دەهات. دیار بوو هەڵۆیەکی زۆر گەورە و پیر و قورسە.

هەڵۆکە بەرەو رۆژاوا هات، زۆر زۆر نزم، بە سەر سەریاندا تێپەڕی. بە سێبەرە رەشەکەیدا کە لە تەنیشتیانەوە رەت بوو، دیار بوو هەڵۆکە زۆر گەورەیە. کە گەیشتە سەر لووتکەی دۆملو، سووڕێکی دا و گەڕایەوە. ئەوجار بەرەو دەریای سپی دەڕۆیشت.

مام خەلیل گوتی:

ـ ئەو هەڵۆیە، هەڵۆیەکی سەرگەردانە، کوڕم مەمی دیك، هەڵۆ هەزار ساڵەکان هەر هەموویان ئاوا سەرگەردان دەبن.

دەستێکی بە ردێنیدا هێنا و چاوی لە رەوگەی هەڵۆکان بڕی لە ئاسماندا و لە سەر قسەی خۆی رۆیشت:

ـ ئەو هەڵۆ تەنیایە، لە هەرچی هەڵۆی دنیایە، لەخۆباییترە. ئەو هەڵۆ تەریك کەوتە پیر و گەورەیە، ئیتر تێکەڵی پۆلی هەڵۆیان نابێتەوە و تا ئەو کاتەی دەمرێ، هەر بە تەنێ بە ئاسمانەوە دەسووڕێتەوە. ئیتر هیچ گیانلەبەرێك لەو هەڵۆ گەورەیە نزیك نابێتەوە... ئەو هەڵۆ گەورەیە ئیتر لە هیچ کوێ نانیشێتەوە. نە لە سەر دارێك و نە لە سەر بەردێك و نە لە سەر عەرزیش... ئەمن زۆر رێز لە هەڵۆ سەرگەردانەکان دەگرم. تێگەیشتی کوڕم مەمی دیك؟ ئەو هەڵۆ گەورانە هەر بە ئاسمانەوە دەمرن. کە وەختی مردنیان دێ، باڵەکانیان لێك دەکەنەوە و لەسەرخۆ و گران و سەنگین بەرەو حەوێقی ئاسمانێ دڕۆن. هەتا ئاسمانی حەوتەم هەڵدەکشێن و لەوێوە لە تەشقی ئاسمان گیان دەدەن. لەشە بێ گیانەکەیان لە تەشقی ئاسمانەوە دەکەوێتە خوارەوە و لە سەر خاکەکەی چوکووراوا پان دەبێتەوە. ئەدی، ئەو هەڵۆ گەورانە هەتا نەگەنە تەشقی ئاسمانێ، بەبێ راوەستان هەر دەفڕن و دڵیان بە خۆشییە بێسنوورەکەی ئاسمانێ دەسپێرن و ئەوەندە دەفڕن و دەفڕن کە باڵەکانیان لەوپەڕی ئاسمانەکاندا و لە تاریکترین تاریکییەکاندا لە لێدان دەکەون. سەرانسەری ئاسمانیش لە رۆژهەڵاتەوە تا رۆژاوا دەبڕن. هەڵۆ پیرەکان لە دوورترین ئاسمانەکاندا دەمرن مەمی دیکی خۆم. لە نێو ئەستێرەکاندا. بنیادەم چەندی پیریش بێ وەك کرم دەخزێ و دەمرێ. مەمی دیك، دەخزێ. هەڵۆ هەر دەبێ ئاوا بمرێ، نەك لە سەر زەوی، بەڵکو لە تەشقی ئاسمان دەبێ بمرێ، بە ئاسمانەوە. خواش کەیفی بە مردنێکی وەك کرم

نایە، ئەدی، نە خوا مەرگی وای پێ خۆشە و نە زەوی و نە ئاسمان و نە ئینسان و نە بوونەوەرەکانی دی. جوان سەیری ئەو هەڵۆیانە بکە کورم مەمی دیك، چاویان لێ هەڵمەگرە، ئەو بوونەوەرانە رەسەنن.

لە مەمی دیك دوور کەوتەوە و لەو سەری مەزراکە، چووە لای گۆملیکسیز و لە نێوان ئەو و زەڵەجەدا راوەستا. گۆملیکسیز ئۆغلۆ پشتی تێ کرد و زەڵەجەش هەر وای کرد.

مام خەلیل تووڕە بوو و پێیاندا هات:

ـ هەی دایك و خوشك و ژن و تایەفە و تۆرەمەتان بە نەحلەت بن... باشە ئەمن چم لێ کردوون کافرینە؟

سەوەتە و جەواڵەکەی هەڵگرت و چووە ئەو سەری مەزراکە و لەوێ دوور لە کرێکارەکان ملی نا لە لۆکە رنینەوە.

مەمی دیك لەهەڵسوکەوتی گوندییەکان دڕدۆنگ ببوو. دیار بوو شتێك دەشارنەوە و چاوەڕێن. مەمی دیك لە دڵی خۆیدا گوتی:"دڵنیام، لێم سوورە مردووەکەیان دۆزیوەتەوە. هەر لە یەکەم رۆژیشەوە دەیانزانی. لەو دەمەوە راوەستان و خەریکن بە شوێن منەوەن. ئەدی، ئەمن.... و خەریکن پێم پێدەکەنن. ئێستاش دەزانن مردووەکەم بردووەتە کوێ. مام خەلیل چۆنی دەزانی ئەمن بۆچی سەیری ئەو هەڵۆیانە دەکەم؟ خۆ ئەوانە کەر نین، دیارە دەزانن. ئاخ، ئاخ، ئەو مردووە ئەگەر کوێخا سەفەر دەبوو، بەخوای تا دەمردم هەر بە کۆڵم دا دەدا و دامنەدەنا، ئاخ، جا لێ دەگەڕام گوندییەکان هەر ئاوا سەیرم بکەن...

گوندییەکان شتێکیان لەبن سەریدا بوو، بەڵام مەمی دیك بۆی هەڵنەدەدرا. جاری وابوو دەیهێنایەوە سەر خۆی و جاری واش بوو دەیبردەوە سەر "عەلی"یە درێژ کە دایکیی کوشتبوو. بەخوای شتێکیان بە دەمەوە بوو. بەڵام چ بوو؟

ئێستا مردووەکە لەوێ بوو و خۆشی لێرە. نە ئەو دەیتوانی بچێتەوە لای مردووەکە و نە مردووەکەی دەیتوانی بێتە لای ئەو. وا هەژابوو چیی وای نەمابوو دڵی لە لێدان بکەوێ. تۆ بڵێی مردووەکە چیی لێ هاتبێ؟ سەوەتەکەی دەستی دانا. روخسارە خەفەتبار و هەڵبزڕکاو و تووڕەکەی دایکی تەزووی بە گیانیدا هێنا. هەر جار نە جارێ دەستی لە لۆکە رنینەوە هەڵدەگرت و دەڕۆیشت و دایکیی بە تەنێ بەجێ دەهێشت. چەند رۆژێك بوو سەیری چاوەکانی دایکیی نەکردبوو، نەیدەتوانی سەیری چاوی بکا. نیگاکانی لە زولەیخاش دەدزییەوە. لە هەر شوێنێکی تووشی دەبوو، لای دەدا. شەوێکیان زولەیخا چوبووە سەر جێیەکەی مەمی دیك و

هەوڵی دابوو بەخەبەری بێنێ، بەڵام هەرچی کردبووی، نەیتوانیبوو لەخەوێی هەستێنێ. خۆی دەخەوێ کردبوو*.... باشە ئەگەر هەستابایە زولەیخا چیی دەگوت؟ ئاخۆ دەیگوت لە جیاتی سەفەر، لە جێی ئەو سەفەرەی ئێسك و پرووسكی هاڕیوم و بووەتە هۆی ئەوەی شەش مانگان خوێن بمیزم و سووكایەتیی پێ كردووم و تەفر و توونای كردووم، لە جێی ئەوكەسێكم كوشتووە كە هەر ناشزانم كێیە؟ زولەیخا لە نیوەی شەوێوە تا بەیانی زۆر هەوڵدابوو و لە بەری پاڕابۆوە و مەمكە خڕ و گەرم و تورتەكانی لە سەر دەموچاوی مەمی دیك دانابوو و مەمی دیكی شێت كردبوو، مەمی دیك جینگڵی دابوو و لە تاوان و لە حەژمەتیانی چیی وای نەمابوو هەلا هەلا بێ و ئێسك و پرووسكی داوەشێ، بەڵام هەر بەخەبەر نەهاتبوو. كە وڵات رووناكی كردبۆوە، زولەیخا بە شێواوییەوە رۆیشتبوو. مەمی دیك لە دواوە تەنیا سەیرێكی كردبوو. لە بوولێڵی بەیانیدا، زولەیخا وردیلە دیار بوو. شان و شەپیلكی هەڵدەبەزینەوە، بێ و نەبێ دەگریا. ئەو حاڵەتەی زەڵەیخا وەك خەنجەرێك دڵی مەمی دیكی شەق كرد. جارێكی دیكە ئاد و بەڵێنی بەخۆی دا "سەفەر دەكوژم، جا زولەیخا دێنم و دەیبەم و دەڕۆم بۆ وڵاتێكی دوور دوور."

كرێكارەكان، هێندێكیان بە سێرەی چاوان و هێندێكیشان بە ئاشكرایی چاویان لە عەلی بڕیبوو و سەیریان دەكرد. عەلی نیگەران بوو و نەیدەتوانی بە سەر پەرۆشی و نیگەرانییەكەیدا زاڵ بێ. منداڵەكانی و ئەلیفیش لەو پتر نیگەران بوون. هەر كەس سەیری عەلیی كردبایە، دەتگوت سەیری قوربانی یان مردوویەك دەكا. كەس سریوە و متەقی لێوە نەدەهات. بێدەنگییەكی قورس زاڵ بوو، قورس وەك بەرد... كەس تەنانەت نەشدەكۆخی. تەنیا دەستەكان بە خێرایی كاریان دەكرد و لە دەستی هەمووانیش خێراتر دەستی عەلی. نیگای دوژمنانەیان وەك تیر لە دەستەكانی عەلی و لە خۆی بڕیبوو.

دەمەدەمی ئێوارێ حەسەن گوتی:

- دایە باش نیم. ئیزن بدە تا دەم جەیحان بچین.

ئەلیف ئاخێكی هەڵكێشا و گوتی: دەی باشە بڕۆن.

منداڵەكان بە غاردان بەرەو لای رووبارەكە و نێو پنچكە گەزەكان چوون. حەسەن چاوەكانی زەق ببوون. گوتی:

---

* دەخەوكردن: بۆیە نەمنووسیوە لەخەوكردن، چونكە لە موكریان ئەگەر بڵێی "لەخەوم كرد" بەو مانایەیە كە نەمهێشت بخەوێ. وەك بڵێی "ئەو هەتیوە لە خەوی كردم" یان دوێنێ خەریكی كارێ بووم كەچی میوان هاتن و "لە كاریان كردم" واتە نەیانهێشت كرا بكەم. لە كاریان دابڕیم. بۆیە "دەخەوكردن"ـەكەم پێ دروستتر بوو.

- بابم دەکوژن.
ئۆمەخان لە بانگی دا.
ئەو شەوە زۆربەی گوندییەکان خەویان لێ نەکەوت. چاوەڕێی ساتێك بوون کە عەلی هەستێ و دەست بکا بە لۆکە ڕنینەوە.
مام خەلیل بەر لە کازیوە و ڕێك لە کاتە دیاریکراوەکەیاندا بەسپایی خۆی گەیاندە عـەلی. لەو نێوەدا ئەو گوندیانەی وەخەبەریش نەهاتبوون، هەستان و چاوێکیان کردبووە چوار چاو و لە سەر هەست بوون بزانن عەلی کەی دەچێتە لۆکـە ڕنینـەوە. ئـەو شـەوە بـە هـەمووان خراپـەی عەلییان دەگوت، کەس نەچووبووە لۆکە ڕنینەوەی شەوان.
مام خەلیل گوتی:
- ئەمن هاتم عەلی، داوای لێ بوردنت لێ دەکەم وەدرەنگـی کـەوتم. گوندییـەکان چـاوەڕێی ئێمەن. چاوەڕێن ئێمە هەستین و بچینە لۆکە ڕنینەوە... دەیانەوێ بمانگرن، تێگەیشتی؟
عەلی:
- تێگەیشتم.
- دەزانی بێت و بمانگرن چیمان لێ دەکەن؟
- دەزانم، پەلامارمان دەدەن و لەتوپەتمان دەکەن.
مام خەلیل ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:
- هار بوون. بەڵام مام خەلیل، هەڵۆی شاخان، ناخەڵەتێ. ئەمن هەر لە نیگایانەوە زانیم بە تەمای چین. هاتم پێت بڵێم عەلی، لە جێی خۆت نەبزووی ها. ئەمن دەڕۆم. تۆ بنـوو. ئەوەنـدە بە جوانی بنوو، هەتا ئەو سەگە دێهاتییانە دەتەقن. خوا حافیز. سبەی شەوێ، ئەگەر نەشکرا، دووسبەری شەو...
مام خەلیل دیسان لە تاریکاییەکەدا بەرەو جێو بانەکەی خۆی خوشی.
گوندی یەکسەر دەتگوت بوونەتە یەك جەستە و گوێیان هەڵخستووە و چـاویان زەق کـردووە و چاوەڕێی جووڵەیەکی عەلین. هەموو هەناسەیان لە سینگیاندا قەتیس کردبوو.
هەتا تاو هەڵات و لافاوی تیشك، لە چیای گاورانەوە ڕژایە خوارێ، هەر وا چـاوەڕێ بـوون. نە کەس دەیار بوو و نە کەسیش بە دزییەوە چووە لۆکە ڕنینەوە.
"خوار و خێچ" بە داخ و کەسەرەوە گوتی:
- سۆسەی کردووە. دەڵێی گورگە. ئەگەر وەك گورگ نەبوایە، چما دایکی خـۆی دەکوشـت؟ ئەی بۆ ئێمە دایکی خۆمان ناکوژین؟ ئەو ئیتر بە دزییەوە ناچێتە لۆکە ڕنینەوە.

کۆگای لۆکەی رنراو و پاکراو لە بەری دەست لێنەدراوی مەزراکەوە لە بن ئەو تیشکە تەماوییەوە کە لە شاخەکانەوە دەهات، سپیاییەکی مات و تەماویی هەبوو. بۆنی تازە و گەرم و خەستی گیای سووتاو ئاسمان و زەویی داگرتبوو.

کرێکارەکان تا ئەو ساتە بە دڵەکوتەوە چاوەڕوان ببوون، شەکەت ببوون و تیریان بەردی ئەنگاوتبێ، دامابوون و وەنەوزیان دەدا.

دەنگی گۆملکسیز ئۆغلۆ هات:

ـ یاڵڵا دەی کرێکارەکان، با بچینە سەر کارێ. دەی تەمبەڵێ مەکەن...

ئەوانەی گورج و بە دەستوبردتر بوون، دەمودەست چوونە نێو مەزراکان. عەلییش خێرا گۆرەوی و پێڵاوی لە پێ کرد و یەك دوو لوێچ ئاوی بە سەر و چاوی دا کرد و گوتی:

ـ هەستە ئەلیف. منداڵەکان، هەستاون؟

ئەو شەوە نە ئۆمەخان نووستبوو و نە حەسەنیش. هیچ کام خەو بە چاویاندا نەهاتبوو و چاوەڕوان ببوون بزانن بابیان چۆن دەکوژرێ.

کە "عەلی"یە درێژ بەرەو مەزراکە وەڕێ کەوت، گوندی دەستیان لە کار هەڵگرت و قیت ڕاوەستان، دەتگوت بوونەوەرێکی نامۆ و سەیر و سەمەرەیان دیتووە. ماوەیەك هەر لێی وردبوونەوە.

گەرماکە توندی کرد. کرێکار بە ریز، لە تەنیشت یەکترییەوە، ریزێکی درێژیان پێك هێنابوو. ئەوەندە تووڕە بوون وەخت بوو بتەقن. بچووکترین جووڵە بەس بوو بۆ ئەوەی عەلی لەتوپەت بکەن. عەلی بە سپایی و بە ترسەوە، هەستی بە نیگا ترسناکەکانیان دەکرد و نەشیدەزانی چ بکا و بچێتە کوێ. هەر دەترسا. لە ترسان هۆشی نەدەما و دەستەکان بەس کاریان دەکرد. ئەو کارەی ئەو گوندییەکان تووڕەتر و شێتتر دەکرد.

مام خەلیل خۆی گەیاندە تەنیشت عەلی و گوتی:

ـ عەلی هەستە، هەستە و بچۆوە کەپرەکەت. ئەمرۆ لۆکە مەرنەوە. گوندی شێت بوون. شێتکت بە سەر دێنن.

بن پیلی عەلیی گرت و گوتی:

ـ نەخۆش کەوتووە.

بە راکێش راکێش عەلیی هەتا بن کەپرەکان برد. ماوەیەکی زۆر گوندی دەستیان نەچووە کار و چاویان بڕیبووە ئەو کەپرەی وا عەلی چوبووە ناوییەوە.

مەمی دیك ڕێی شاری دەگرێتە بەر، جارێ بە ڕۆیشتن و جارێ بە غاردان لە شار نزیك دەبێتەوە. بۆ ڕزگاربوونی لە دەست مردووەکە هیچ چارێکی دیکەی نییە جگە لەوەی بچێ و خۆی بداتە دەست حوکمەتەوە. دەیەوێ بچێ و بە حوکمەت بڵێ:"ئەمن مردووەکم دۆزیوەتەوە، وەرن وەریگرنەوە. نازانم کارێکی باشەم کردووە یان نا، بەڵام بە جوانی بۆم ڕاگرتوون و پاراستوومە." هەم بەرەو شاری غار دەدات و هەمیش نیگەرانی مردووەکەیە شتێکی بەسەر نەیە. ئاخۆ هەتا دەگەڕێتەوە چیی لێ دێ؟ بەو بڕیارەی داویێتی، بارێکی قورسی لە سەر شانی لاچووە. مەمی دیك وەك باڵندە سووك بووە.

## ٢٣

شەوکەت بەگ، خەوگەڕ بوو، بێ زیان و بێفەڕ بوو. سێ ژنی هەبوو. ڕۆژێکیان هاتە سەری و ژنێکیانی تەڵاق دا. شەش منداڵی هەیە، چواریانی لە ئیستانبۆل، لە مەدرەسەیەکی تایبەتی دەرس دەخوێنن. لە شاری خانووی نییە و کرێ چییە. خانووەکەی گوندییشی هەر دەڵێی عەمبارە. هۆدەکانی زۆر گەورەن. مەزراکەی لە دەشتی ئاناوەرزایە. لەو شوێنەوە کە جەیحان دەڕژێتە نێو دەریای سپییەوە. دەڵێن شەوکەت بەگ بە گەنجێتی سێ کەسی کوشتووە. گراوییەکەی و نۆکەرێکی و دوڕنا، ئەو خزمەتکارە کوردەی کە ئاگای لە کوشتنەکانی ببوو. کوڕەکەی دوڕنا کە دایکی کوژرا، لە سەربازی بوو. هەر هەواڵی مەرگی دایکی دەبیستێتەوە، چەکەکەی هەڵدەگرێ و ڕوو دەکاتە شاخ. دوو سێ ڕۆژ دواتر، لە جێی ئەوەی شەوکەت بەگ بکوژێتەوە، خەڵکی دیکە ئەویان کوشت. شەوکەت بەگ سێ برا و دوو خوشکی هەیە. یەکێك

لە خوشکەکانی، دەوڵەمەندترین ئافرەتی چوکووراوایە. مێردی بە بەگزادەیەکی دەستڕۆیشتوو کردووە و ژنێکی زۆر دەستڕۆیشتووە. خوشکەکەی دیکە و براکانیشی کۆمەڵێك مەزرای بچووك و گەورەیان هەیە. شەوکەت بەگ، دوای ئەوەی ئەو سێ کەسە دەوژێ، بوو بە خەوگەڕ و بە دەم خەوەوە دەگەڕا. رووبەری مەزراکەی ئەو دە هەزار دۆنمە و زۆریش بە پیتە. لە باوکییەوە بە میرات بۆی ماوەتەوە. ئەوکەت بەگ شەوانە بەو مەزرا پان و بەرینەی چوکووراوادا دەسووڕایەوە و رۆژانەش یەك پشوو درۆی دەکرد و خۆی هەڵدەکێشا. نە خۆی دەیزانی تەمەنی چەندە و نە هیچ کەسی دی. زۆر گەنج دیار بوو. زۆریش دەست و دڵ ئاوا بوو. کەس نەیدەزانی پارەی خۆی لە کوێ خەرج دەکا، بۆخۆشی نەیدەزانی. هەر جارێکی بەر و بووی مەزراکەی هەڵدەگرتەوە، پارەیەکی زۆری دەست دەکەوت، بەڵام زۆر زوو تەواو دەبوو. زۆریش لەبەر دڵان و جوانچاك بوو و کە بە دەم خەوەوە دەگەڕا لەبەر دڵانتریش دەبوو و دەموچاوی دەدرەوشایەوە. حەوت هەشت رۆژان کەس هەستی نەکرد کە دیار نییە. ئاخرییەکەی یەکێك لە نۆکەرەکانی دەپرسێ:

- ئەرێ شەوکەت بەگ لە کوێیە؟

ئەوجار ئەوانی دیکەش پرسییان:

- ئەری هەر بەراست، کوا شەوکەت بەگ؟

پیاوەکانی، براکانی، خزم و کەس و برازاکانی وەدەشتێ کەوتن و سەر و سۆراغیان کرد. لە سەرانسەری ئاناوەرزادا شوێن نەما نەیپشکنن و نەچن و کەس نەما لێی نەپرسن. شەوکەت بەگ نەدۆزرایەوە. پۆلیس و ژەندەرمەیان تێ گەیاند. رۆژنامەکانیش نووسیان:"ملکدارێکی گەورە بێ سەر و شوێن بووە. پێدەچێ شەوکەت بەگ بە جەنایەتێك تێداچووبێ." و گەلێك وێنەیان لێ بڵاو کردەوە. خۆ ئەگەر شەوکەت بەگ زیندوو بوایە و وێنەکانی خۆی لە رۆژنامەکاندا دیتبایەوە، لە خۆشیان شاگەشکە دەبوو.

هێشتاش بە سواری و بە پیادە، پۆلیس و ژەندەرمە هەر لە شەوکەت بەگ دەگەڕان و هیچ شوێنێکیان لێ نەدەدۆزییەوە.

سووتانی خەرمانەکەش، مەسەلەکەی ئاڵۆزتر کرد.

بزربوونی شەوکەت بەگیان بە سەر "نەوزاد" شاگرد شۆفێری تەراکتۆرەکەیدا، دێنا. هەمووان گومانیان لەو بوو. نەوزاد کوڕێکی مل باریکی ریوەڵە بوو. کە دەیڕوانی دەتگوت قازە. چوار پێنج مانگ لەوە پێش شەوکەت بەگ تێهەڵدانێکی وای لێ دابوو، نەوزاد خوێن میزتبوو. کە خەرمانەکە سووتا، شتەکە گۆڕا. ئیتر شك و گومانەکان لە سەر نەوزاد رەوینەوە و لە کۆڵی بوونەوە. بێ و

نەبێ، ئەوە کاری ئەو خەڵکە بێ زوی و زار و هەژار و رقهەڵگرتووەی گوندەکانی دراوسێیە. ئێستا ئەو گوندە بەردەوام پڕ دەبێ لە پۆلیس و ژەندەرمە و خزم و کەس و نۆکەر و منداڵەکانی شەوکەت بەگ... بە تایبەتی منداڵەکانی دەتگوت کەوتوونەتە نێو شەپۆلی چیرۆك و بەسەرهاتێکی پیاوکوژییەوە و بەردەوام بە شوێن رووداوی بزربوونی باوکیانەوە بوون.

ـ ماڵەکەی شەوکەت بەگ لە کوێیە؟ ژن و منداڵی نییە؟ دەمەوێ بچم بیانبینم.

وەڵامی مەمی دیکیان دایەوە:

ـ شەوکەت بەگ مردووە.

لە سەر پردەکەی شاری راوەستابوو و لە سەرەوە سەیری ئاوەکەی دەکرد. وێنەکەی ئەو لە ئاوەکەدا برێك دیار بوو و دەلەرزییەوە. پنچکە دڕووەکان گوڵیان دەرکردبوو. گوڵی سوور و پەمەیی. لە دەم رووبارەکەوە، لە نێو چەو و وردکە بەردە سپییەکاندا بە سەدان پنچکە دڕوو شین ببوونەوە. دەتگوت مێشەڵانێکی بچووکە.

کۆمەڵێك مێش هەنگوینی زەردباوی وەك کارەبا، بە چڵە دارێکی تووەوە نووسابوون. ئاوەکە دەدرەوشایەوە و ریسکانەوەکەی دەکەوتە سەر بەردە سپییەکانی پردەکە.

ـ ماڵی شەوکەت بەگ؟

ـ دیارە کارێکی باشیان کرد. لە ئیستانبۆل، سێ ئەپارتمانی هەیە. رەوەیەك ئەسپی هەیە. لە بانکدا پارەی هەیە و لە حوکمەتیش دەستی دەڕوا. هەشت گراوی (مەعشووق"ی هەیە و "شیری مریشك"یشی لە سەر سفرەکەی دەست دەکەوێ. دۆستی هەیە و دوژمنیش. خەرمانەکەی هێشتاش دووکەڵی لێ هەڵدەستێ... هەموو رۆژێ جووتێ کەوش "پێڵاو"ی نوێ لە پێ دەکا. ئەو کەوشەی جارێك لە پێ دەکا، ئیتر لە پێی ناکاتەوە. خەوتبوو کاتێ کوشتبوویان. ئەو خۆ هەر بە شەو و بە رۆژ نووستبوو. بنیادەم کە لە خەوێدا بکوژرێ، خۆی هیچ نازانێ. ئەوانەی کوشتوویانە خەڵکێکی باش بوون. کاری باشیشیان هەر ئەوە بووە. دەستیان خۆش بێ.

سەیری ئاوەکەی کرد. لە تەختی بنی ئاوەکەدا، ماسییەکان دەتگوت لە رووناکاییەکی زیویندا خۆ هەڵداوێن. ماسییەکی گەورە هێندەی مەچەکی دەستێك، سێ جاران خۆی هەڵاویشت و لە ئاوەکە هاتە دەرێ. بریقەی ماسییەکە لە چاوی مەمی دیکی دا. کۆمەڵێك تارمایی وەك ماسی بە بەرچاویدا هەڵفڕین.

گەرماکەی بەتەوژم بوو. بەردەکانی پردەکە، دەستیان دەسووتاندەوە. سێبەرەکەی تۆخ بوو. سێ گوێدرێژ لە کۆنە باخەکەی بەرانبەریدا دەلەوەڕین. شارەکە نوقمی تەپوتۆز بوو. کەس دیار نەبوو، کۆڵانەکانی شار چۆڵ بوون.

گەڵای دار هەنجیرەکە نوقمی تۆز و خۆڵ بوون. سێبەر و بۆنەکەی قورسە. گەرماکە زۆر بەتین و خنکێنەرە.

ـ ئێرە ماڵی شەوکەت بەگە؟

ـ شەوکەت بەگ لە ماڵێ نییە، دوێ شەوێ خەرمانەکەیان سووتاندووە.

ـ خوا نەکا یەکێك لێی بقەومێ. خۆ هەر قۆرتێکی بە سەر نایە.

ـ یانی کەسی لە ماڵێ نییە؟

ـ چوونە سەر خەرمانەکە. خەرمانەکەی خەریکە دەسووتێ. دەیانەوێ بیکوژێننەوە.

باغەکە پڕپڕ بوو لە گوڵی سیس و هەر کامەیان هێندەی چنگێك. ئەو گوڵچە درشت و ژاکاوانە هەر کامەیان هێندەی دێوەزمەیەك بوون. کاریگەرییەکی سەیریان لە سەر ناخی بنیادەم هەبوو.

ـ سڵاوم هەیە بۆ شەوکەت بەگ.

بۆنێکی تاڵ لە گوڵەکان هەڵدەستا. قورس. گەرم. توێژە خۆڵ و تۆزێك لە سەر دیوارێکی بە گڵ سواخدراو و لە سەر شووشەی پەنجەرەکان و دیواری حەوشەیەك کە وردە شووشەی لە کەلێنەکانی گیرابوو، نیشتبوو.

بنکەی پۆلیسەکە، دوو نهۆمە و دیوارەکەکانی بە گڵ سواخ نەدراون. بەردەکان، کۆڵەکە و پلیکانەکان هەموو لە دەرەوەن. سەرانسەری حەوشە گەورەکە پڕە لە داری هەنجیر و بڕکە هاروێ (خیار)ـەکان رەش داگەڕابوون. لەو سەرییەوە مریشك و جووچکەکانی سەرۆکی بنکەی پۆلیسەکە چینەیان دەکرد. بەردە مەڕمەڕێکی زۆر کۆن و پڕ لە نەخش و نیگار لە نێوەڕاستەکەی... و کۆمەڵێك روخساری لێ کێشراوە: بنیادەمی نیوە رووت و قەڵغان بە دەست. بەردەکە سپی سپییە، بەبێ پەڵە. لەوەتەی دنیا دنیایە لەوە سپیتر نەبووە و نەبینراوە.

مەمی دیك لە سەر بەردەکە دانیشت. لە پەنجەرەوە ئەفسەرێکی چوار شانە و چوختی دی کە پشتی لەوە. ئەفسەرەکە هیچ ناجووڵێ و دەڵێی بەردە و لەوێ چەقیوە. گوێچکەکانی تۆزاوین. تۆزێك شانی راستەی جووڵاند. مەمی دیك دڵی داخورپا. ژاندارمێك لە غاردان لە پلیکانە چێوییەکانەوە هاتە خوارێ، دەتگوت پلیکانەکان لە بن پێیدا دەشکێن. پلیکانە کۆن و خۆڵڕەنگەکە، کە تەختەکانی قەڵشیبوون، لە بن لاقەکانیدا جووڵایەوە.

ژەندەرمەکە بە غاردان لە دەرگاکە چووە دەرێ و تۆزێك دواتر هەر بە غاردان لەگەڵ دوو کەس گەڕایەوە ژوورێ. هەر سیانیان هانکەهانکیان بوو. مەمی دیك لە پەنجەرەکەی دیکەوە، واتە لە پەنجەرەکەی تەنیشتییەوە دیتی کە ئەوان چوونە ئەو ژوورەی وا ئەفسەرەکەی تێدا بوو.

مەمی دیك لە بەر گەرمای خۆرەکە وەك مێژۆکە دەلەرزی. دڵۆپەی ئارەقە لە نووکی پەنجە و سەری لووتی دەچۆڕایەوە. لاقەکانی لە نێو پێڵاوەکانیدا خووسابوون. لەو دیو پەنجەرەکەوە شانی ئەفسەرەکە شانی چەپیشی لەرزی. دیسان مەمی دیك دڵی داخورپا. کابرایەکی کەلەپچەکراویان هێنا. هەر دوو پەنجە گەورەکەی دەستیان پێکەوە بەستبوو. کابرا پشتی کۆمابۆوە و پانتۆڵە فشەکەی تیتۆڵ تیتۆڵ ببوو و بن دەرپێ سپییەکەی لە بنییەوە دیار بوو. سەرتاپێی تۆز و خۆڵ بوو و خوێن بە سەر و دەموچاوییەوە قەتماغەی بەستبوو. بێ پسانەوە چاوی دەترووکاند.

ـ ئەمن بە شوێنی شەوکەت بەگ دەزانم. دەڵێی بۆچی لێرە دانیشتووم؟ بۆ جێی کەسێکم گرتووە؟ ئەی دانیشتووم ئیتر. لە هەر جێیەکی حەزم لێ بێ دادەنیشم. جگە لەوەش ئەمن کارم بە بەرپرسەکەتانە. بە بەرپرسی گشتی."

"ئەتۆ سەربازیت کردووە؟ ئەگەر سەربازیت کردووە، لە کوێی و پلەت چییە؟ ناو و ناوبانگت چییە دەیزانی؟"

"چوومەتە سەربازی قوربان، لە بەشی قایمکارییەکاندا خزمەتم کردووە... و ناویشم.... مەمی دیك دێلی باشە. کوڕی "عوسمان دێلی باش" لە دایکبووی ١٩٤٠. بۆچی دێلی باش؟ ئەرێوەڵڵا، جا هەمووان ئەو پرسیارە دەکەن... مچە دووکاندار ئەو ناوەی لە بابم ناوە. گوتبووی:"عوسمان ئەتۆ خۆت دێلی باشی، (واتە شێتۆکە)، لێ گەڕێ با لای حوکمەتیش هەر ئەو ناوەت هەبێ. ئەتاتۆرك زۆر گەورەیە و خۆی فەرمانی داوە هەمووان دەبێ شۆرەتیان هەبێ. شۆرەتێکیان بۆ "مەلا کوێرە" داناوە ئەمن بۆخۆم لێرە تەریق دەبمەوە و پێم شەرمە بیڵێم. لە داخان چیی وای نەمابوو کوێخا سەفەر بکوژێ. بەردەوام دەیگوت:"باشە، یانی ئەمن ئەو ناوەم لێ دەوەشاوە؟" ناوی شەوکەت بەگە دەفەرمووی؟ بەڵێ "چلیك ئۆز"... ناوێکی بە هەیبەتە.

ژنێك بە مەمکی رووت و جلوبەرگی تیتۆڵ تیتۆڵەوە، یەك پشوو دەموچاوی خۆی بە چنجرووك دەڕنێتەوە. دەقیژێنێ. پێخاوسە. هەر هەنگاوێکی هەڵیدێنێتەوە، لە شوێن پێیەکانی خوێن بەجێ دەمێنێ. ژنەکەش چووە نێو ژووری سەرۆکی بنکەکەوە. شانی راستەی سەرۆك جارێکی دیکەش جووڵا. هیچ جووڵەیەکی دیکەی لێ نەبینرا.

برێك دواتر، ژنە بە هاوار و قیژە قیژ فڕێ درایە سەر پلیکانەکان و نەیتوانی خۆی بگرێتەوە و لەوێوە بەربۆوە خوارێ و دەنگی لێ برا.

"نازانم. شەوکەت بەگم نەدیوە. کێ؟ ئەمن چووزانم؟ بۆچی؟ نازانم. وەڵڵا نازانم جەناب... چیی پێتان خۆشە لێمی بکەن... بمکوژن، لە دارم بدەن. بەڵام ئەوەی دەیزانم هەر ئەوەیە. ئەمن بە پێی خۆم هاتوومە ئێرە. ئەگینا ئێوە چۆن دەتانزانی؟"

دەرگایەك کرایەوە. نزیك بە پانزە پیاوی پەڕپووت کە باسکیان لێك شەتەك درابوو، هاتنە دەرێ. دەرگاکەی تەنیشتیان کردەوە کە پەرژینی ئاسنی پێوە بوو. پیاوەکانیان لەوێ کرد. دوو پاسەوان لە سەر دیوارێك کە بە سەر دەرگا ئاسنییەکەوە بوو، دەهاتن و دەچوون. هەر دووکیان لە بەر گەرماکە ئارەقەیان کردبوو و ئارەقەکەش لە پشتەوەی جلوبەرگەکانیان هاتبووە دەرێ. دەموچاوی هەردووکیان وەك قولە رەشان رەش ببوو و لە ئارەقەدا دەبریسکایەوە.

مەمی دیك لە سەر بەردەکە هەستا و بەرەو بنکەی پۆلیسەکە وەڕێ کەوت. چاوی لە ئەفسەرەکەی پشت پەنجەرەکەوە بڕیبوو. بەسپایی و بە ترسەوە هەنگاوی دەنا.

لە نەکاو بایەکی فێنك هەڵی کرد و چیی تۆز و خۆڵی سەر عەرزەکە بوو هەڵیگرت. مەمی دیك لە بەر تۆز و خۆڵەکە نەیتوانی دەور و بەری خۆی ببینێ و ناچار لە سەر جێیەکەی خۆی راوەستا. بایەکە، توندتر و فێنکتر بۆوە و مەمی دیك سەرمای بوو. لەو جەنگەیەدا لە دوورەوە و لە لووتکەی چیاکانی تۆرووسەوە، گەواڵە هەورێکی هێندەی دێوەزمەیەك هەستا و ئاسمانەکەی چوکووراوای داپۆشی. هەموو وڵات تاریك داهات. کە با و بۆرانەکە نیشتەوە، چەند دڵۆپەی درشت و قورس کەوتە سەر زەوییەکە و تلپەیان لە عەرزی هەستاند. بارانێکی بە غوڕەم دایکرد وەك گۆزەی سەرەوژێر.

مەمی دیك لە جێی خۆی وشك بوو. نەیدەتوانی هەنگاو هەڵێنێتەوە. قەڵافەتە زەبەلاحەکەی سەرۆك جووڵا. مەمی دیك دڵی داخورپا. سەرۆك هەستا و بەرەو پەنجەرەکە چۆوە. مەمی دیك پشووی لە سینەیدا قەتیس ما. دەست و پێی شل بوونەوە. پشتی لە سەرۆك کرد و بەو پێیانەی کە لە بن بارستایی جەستەیدا دەنووشتانەوە، وەك بنیادەمێکی ئیفلیج کە رێگە رۆیشتنی لە بیر چووبێتەوە، بە هەزار زەحمەت لە پۆلیسخانەکە دوور کەوتەوە. کە لە حەوشەکە چووە دەرێ، وەخۆ هاتەوە. سەیرێکی پەنجەرەکەی کرد. سەرۆك لە پەنجەرەکەوە داهاتبۆوە و سەیری حەوشەکەی دەکرد. مەمی دیك رای کرد. باران وەك گۆزەی سەروبن دەهاتە خوارێ.

"شەوکەت بەگ، شەوکەت بەگ... شەوکەت، شەوکەت بەگ..."

گوێی هەڵخست.

مەمی دیك بەخۆی دەگوت:"مردووەكە، مردووەكە... داماوە لە بەر ئەو بارانە هیچی بەسەر نەیە... بەیانی دێمەوە و هەرچیی دەیزانم بۆ سەرۆكی دەگێڕمەوە. ئەگەر ئەمنیش نەیگێڕمەوە، ئەوان خۆیان هەموو شتێك دەزانن، دەزانن. ئاگایان لێمە و دەیانەوێ بزانن چ دەكەم... هەر بە راستی، بڵێی مردووەكە لە بەر ئەو بارانە چیی بەسەر هاتبێ؟ لێقەوماوە، گلێكی زۆریشی بە سەرەوە نییە. ئەی لەو بارانەی....

بارانێكی بە غوڕەم دایكردبوو. مەمی دیك لە شارەكە چووە دەرێ.

عومەر وەڕێ کەوت، تاوێك دەبوو کانیی "ساروون"ی بەجێ هێشتبوو و بەرەو "چامورلو" ڕۆیبوو. لە کاتی تێپەڕینی بە نێو دارستانێکی چڕدا کە ئاسمانی لێ دیار نەبوو، باران دایکرد. بەڵێنی دابوو زۆر زوو خۆی بگەیەنێتەوە ئاوایی و مرێمۆك بکوژێ و خێرا بگەڕێتەوە. بۆیە هەوڵی نەدا هیچ پەنا و پەسیوێك بدۆزێتەوە و چاوەڕێش نەما تا بارانەکە خۆشی بکاتەوە. بێ راوەستان هەر ڕۆیشت.

## ٢٤

لافاو شیوەکەی پڕ کردبوو. دار و بەرد و هەرشتێکی لە پێشی بوو رای دەدا و دەیبرد. ئاو بە دار و ڕەوەزەکاندا دەهاتە خوارێ. چیاکان دەتگوت وەبن دەریایەکی گەورە کەوتوون. هەورەتریشقە، پەتا پەیتا و لە هەموو لایەکەوە لە سەری ڕەوەزەکان و چڵوکی دارە بەرزەکانی دەدا. جلوبەرگەکانی عومەر بە گیانییەوە نووسابوون. لاقەکانی خووسابوون. پێڵاوەکەی لە پێی دادەماڵکا و بەجێ دەما. عومەر دیسان لە پێی دەکردنەوە و توند دەیبەستنەوە. پشتی هەڵاوی لێ هەڵدەستا. باران خۆشی نەدەکردەوە.

لافاوەکە شیو و دۆڵەکەی پڕ پڕ کردبوو و کەس نەیدەتوانی لێی بپەڕێتەوە. بەڵام عومەر دەبوو لە کاتی خۆیدا بگاتێ. خۆی بە ئاوە خوڕێنەکەدا دا. ئەگەر عومەر ئاوا بەهێز نەبوایە و لە رادەبەدەر بە تین و گوڕ نەبوایە، لافاوەکە دەیبرد. کە گەیشتە ئەوبەری شیوەکە، بەحاڵ گیانی لەبەردا مابوو، لە سەر ڕەوەزەکان تخێڵ بوو. تاوێك هەر وا مایەوە و ئەوجار سەرمای بوو. لەوە پتر ومابایەوە، ڕەقهەڵدەهات. هەواکەی زۆر سارد بوو. لێڕەوارەکە دەیگرماند. دەنگێکی ناخۆش لە لێڕەوارەکەوە دەهات. دەتگوت لێڕەوارەکە بە هەموو دار و بەردەکەیەوە

بەرەو دەریا دەخوشێ. عومەر هەستا و خۆی راوەشاند. جلوبەرگەکانی قورس ببوون، ئاوەکە بە هەموو گیانیدا دەچۆڕایەوە. زۆر نەڕۆیشتبوو کە جلوبەرگەکانی بە لەشییەوە نووسان.

چاوی هیچ کوێی نەدەدی. لە ئاسمانەوە، باران نا، بەڵکو لافاو دایکردبوو. ئاوەکە لە بەردەمی ببووە دیوار. عومەر دوو هەنگاو پێشی خۆی نەدەدی و وەك کەسێکی دەست بە دیوارێکەوە بگرێ و بەرەو پێشەوە بڕوات، دەستی بە بارانەکەدا دەکێشا. بارانەکە تێکەڵاوی تەمێکی خەست و سپی ببوو. دەتگوت عومەر بە شەوێکی تاریك، بەڕێوەیە. ئەگەر هەورەتریشقە و بریسکە پەیتا پەیتاکان نەبوایەن، ئەو تاریکاییە هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ شەو.

بیری کردەوە پەنا بەرێتە بەر ئەشکەوتێك. دوایی، بەخۆی گوت کە تەنانەت نابێ سەعاتێکیش ماتڵ بێ و فکرەکەی گۆڕی: "دەبێ خێراتر کارەکەمان راپەڕێنین و بگەڕێینەوە چوکوور. بۆ چوکوورە پڕ لە بەڵا و تەپۆ و مەرگاوییەکە."

بێت و ئەو کارەی سەری نەگرتبایە، تا هەتایە بێ ژن دەبوو. کام لاوی ئاوایی توانیبووی ژن بێنێ، تا ئەو بتوانێ؟: "ئەوی کچی هەیە، میراتی باوکی دەوێ بۆ شیربایی و مارەیی. هەقیشیانە. بۆ نەیانەوێ؟ ئەو کچەیان لە خۆڕا گەورە نەکردووە، پارەی تێچووە. کوێخا سەفەر، باشە سەد لیرە دەدا. دوو سەر مانگاش... بەڵام بەخوای جێی باوەڕ نییە. کوا مانگای بیهێنێ و بیداتە من؟ خۆ بۆخۆی جووتە گایەکی نییە. ئەوەتا نیروناموورەکەی لە گوێدرێژ دەکا. گای لە کوێ بوو بیداتە من؟ دەی باشە، با گا و مانگا نەدا. خۆ سەد لیرەم دەداتێ. کچەکەشم بۆ دەستێنێ. پارە دەدا و دەیستێنێ. بە هەڕەشە دەیستێنێ. گوندییەکان لە تاشباش ئۆغلو دەترسن، چونکە وەلییە. بەڵام بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆیانی بێنن، لە کوێخا سەفەریش دەترسن. قسەی لە قسەیدا ناکەنەوە. گوندییەکان هیچ کەیفیان بە کوێخا سەفەر نایە، ئەگەر وەدەستیان بکەوێ لەتوکوتی دەکەن، بەڵام لێشی دەترسن. تاشباش ئەو رۆژەی چووە گەڵ چل پیاوچاکەکە، گوتی مەیدوێنن. گوندیش نایدوێنن، بەڵام زراویان چووە لەوەی نەکا گێچەڵێکیان تووش بکا و سەرئێشەیان بۆ بنێتەوە. هەر کات پێی خۆش بێ و چۆنی پێ خۆش بێ، گوندییەکان هەڵدەسووڕێنێ. جارێ ئەوە لە "عەلی"یە درێژی هەڵکێڵاوە و درەنگ یان زوو بەڵایەکی بە سەر دێنێ.

"ئەو شاییەکەش ساز دەکا. سەفەر ئاغا شایی گەورە ساز دەکا. کەس لە شایی کردندا نایگاتێ... پەنجا لیرەش لەو سەد لیرەیە دەدەم بە چوار بزن... چوار بزنی قاوەیی. بزنی قاوەیی

شیریان زۆره. کەرێك و مانگایەکیشم پێویستە و یەك... سەد لیرە بەشی هەموو ئەو شتانەش ناکا. نابێ قەرزباریش دەرچم. باشە ئەو پارەیەشم هەیە کە لە لۆکەڕنینەوە پەیدای دەکەم. ئیشەڵڵا ئەو جارەیان لە چوکووراوا نەباریوە نەگینا لۆکەی هیچ نەهێشتووە و لە قوڕ و لیتەی وەرداوە. دیارە ئاواش، لۆکە چاك قورس دەبێ، ئەوانیش هەقی ڕنینەوەکەی دەشکێنن.

"ئاشقە کەچەڵە و کوڕەکانی کەیفیان بە من نایە. نازانم بۆ ئەوەندەیان ناخۆش دەوێم. نابێ بە تەمای ئەوان بم، ئەوان لە زەماوەندی مندا گۆرانی نالێن. گۆرانی نەگوتنی بنەماڵەی ئاشقە کەچەڵەش لە زەماوەنددا فەڕ و شوومی خراپە. کوڕە لێی گەڕێ با هەر نەیلێن. وەڵڵاهی ماڵەکەیانیان بە سەردا وێران دەکەم. بەڵام سەفەر فەرمان دەدا و دەڵێ:"لێی دە، کەچەڵە، لە زەماوەندی عومەری برازامدا سازەکەت لێ بدە. تێگەیشتی کەچەڵی کافر." جا ئەو دەم ئەگەر پیاوە با لێی نەدا. ئەگەر ئازایە با...."

لە مەزرایە، بەدرییە لە ژوور سەرییەوە نووستبوو. عومەر وا دەنوێنێ نووستووە و بە دەستی بۆ دەبا و بە ئانقەست لاقی بەدرییە دەگرێ. لاقی بەدرییە وەك ئاگر داییسا. هەموو گیانی لەرزی. ئەو شەوە تا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. لەوێ بە دواوە، تا چاوی بە بەدرییە دەکەوێ ئەژنۆی شل دەبن و گیانی وەلەرزین دەکەوێ. هەر هەموو ئاوایی دەزانن ئەو بەدرییەی خۆش دەوێ، هەموو. تەنانەت باڵندەی ئاسمانیش دەزانن. بۆیە قەت ناتوانێ لە بەدرییە بچێتە پێشێ و بە تەنیا لەگەڵی بێ. هەر بە ڕاستی ئەو گوندییانە چۆنیان زانی ئەو شێت و شەیدای بەدرییەیەی؟ خۆ ئەو بە کەسی نەگوتبوو. بەڵام گوندی زۆر زیت و وریان. دەشزانن و وەڕووی بنیادەمیشی نادەنەوە. یانی نازاننەوە کێ مریمۆکی کوشتووە؟ بە دڵنیاییەوە دەزانن، بەڵام نایدرکێنن. گوندی تەنیا باسی ئەو شتانە دەکەن کە ئاشکرا بوون. ئەوی دی، هەر قسەیەکی هەیانبێ لە دڵیاندا دەیهێڵنەوە و ڕایدەگرن. چما نازانن عەلی دایکیی نەکوشتووە؟ دەزانن. بەڵام ئەی ئەگەر دەزانن، بۆچی ئاوا ڕقیان لێ هەڵگرتووە و خەریکن خوێنی بخۆنەوە؟ ئەگەر دایکەکەی خۆی کوشتبایە، تەنانەت لە بەر چاوی ئەوانیش کوشتبای، ئاخۆ دیسان ئاوا لێی بە ڕقدا دەچوون؟ نا، مێشێکیشیان لێ میوان نەدەبوو. عەلی هەر بیانووەك بوو بۆ ئەوەی داخی دڵیان بڕێژن. خۆ ئەویش نەبوایە، یەکێکی دیکەیان دەدۆزییەوە. ئەگەر کەسیشیان دەست نەکەوتبایە، پێك وەردەبوون و تێك بەردەبوون.

عومەر لە بن لێوانەوە بزەیەکی هاتێ. ئەو ئاوەی بە سەر و چاویدا دەهاتە خوارێ، بە دەستی سڕییەوە. ئاوەکە لە چاویدا کۆ دەبۆوە.

زۆر کەس دێنە زەماوەندەکەم. بەدرییە کچێکی نەرم و نۆڵ بوو. وردیلە بوو. دایکی گوتبوو، بە خوڵای بشمرم، نایدەمە ئەو هەتیوە سەر کەڵیچەیە. جا ئەو جار ئەگەر ئازایە با نەیدا. کوێخا سەفەر لە حەوت کێوانی دەتەقێنێ.

"لەشی دەڵێی کولووی بەفرە. نەرم و ناسك. جا کچێکی بەلەکی ئەوەندە گەرم بێ، دەبێ جێی دیکەی چۆن بێ؟" موچڕکەیەك بە هەموو لەشە خووساوەکەی عومەردا هات. بەدرییە لە پا و پووزی رووتەوە هاتە پێش چاوی و ئیتر لا نەچوو. وردە وردە شەهوەتێکی بەتین گیانی دادەگرت. ئیتر چیی وای نەمابوو. هەر لە لۆکەڕنینەوەی گەڕابایەوە، زەماوەندەکەی دەکرد.

عومەر بەخۆی گوت:

- هەر بژیی نەنە مرێمۆك. خۆ ئەو نەبوایە، سەد ساڵی دیکەش، ژنم لە دەرکی خۆم نەدەدی. بەو ئاخری پیرییەشی خێرێکی بۆ ئێمە هەبوو. ئەویش چ خێرێك. بنیادەمی باش، مردنەکەشیان خێر و بێری پێوەیە. نەنە مرێمۆك لە هەموو بنیادەمی سەر ئەو دنیایە باشتر و میهرەبانترە. تۆزێك لاسارە. ژنێکی سەربزێوە و قسە لەگەڵ کەس ناکا، بەڵام بە راستی ئازایە. هەتا ئێستا خراپەی بۆ کەس نەبووە. دەستی هەموو کەس دەگرێ تەنانەت یارمەتیی باڵندە و دەعبای کێوی و مێرووڵەش دەکا. ئێستاش ئەوە یارمەتیدەری منە، ئەویش بە مردنەکەی خۆی. دەمرێ بۆ ئەوەی یارمەتیی مرۆڤێك بدات. گاڵتەی پێ ناکرێ... هەر بژی نەنە مرێمۆك... بنیادەمی وا پەیدا نابێ.

" ئێستاش دەچی و دەرگا دەکەیتەوە و سەیر دەکەی ئەوە نەنە مرێمۆك راکشاوە و مردووە. مێش و مەگەزی شین و کەسکی لێ نیشتوون. نە دانەیەك و نە پێنج دانە. دەموچاوی لە بن مێشی کەسکدا دیار نییە. مێرووڵەش چاوەکانیان کۆڵیوە. لەشیشی وەك دەهۆڵ بای کردووە. مێرووڵەی زەرد زەرد. جرجە مشك... مێرووڵەی زەرد بە زمانییەوە نووساون. زاری مردوو دادەپچڕێ. مێروو گوێچکەیشیان خواردوو. لە سەر عەرزەکە، خوێن قەتماغەی بەستووە. خۆڵەکە خوێنەکەی مشتووە و قەڵش قەڵش بووە. جاڵجاڵۆکەیەکی گەورە لە نێوان دیوارەکە و قژە خەنەلێدراوەکانی ئەودا تانوپۆی هەڵبەستووە. بە سەدان مێشکی کەسك و شین و هەزاران مێرووی زەرد بە داوی جاڵجاڵۆکەکەوە بوون. جاڵجاڵۆکەیەکی گەورە و خاڵ خاڵ.

"هەر چاوت پێی دەکەوێ، دەرگاکە پێوە دەدەی. هیچ دەستی بۆ نابەی، دیارە بۆگەنەکەی هەموو گوندەکەی داگرتووە. هەر پێ دەنێیتە ئاوایی، دەزانی."

بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ کوڕە خۆزگە وا بوایە...

دەبێ تا زووە خۆی بگەیێنێتە ئەوێ و زووش بگەڕێتەوە. نابێ ماتڵ بێ. لە بەرانبەر خۆیەوە، ڕێك دە هەنگاو ئەولاترەوە، بریسکەیەك لە ڕەوەزەکەی دا و تیشکێکی توند هەموو ولاتی ڕووناك کردەوە. ساتێك، چاوەکانی عومەر هیچ کوێیان نەدی. ئەژنۆی نووشتانەوە و لە سەر جێیەکەی خۆی دانیشت. پەیتا پەیتا برووسکە لە دەور و پشتی دەدا و دەنگی هەورە تریشقەکە دەتگوت دەیەوێ هەموو لێڕەکە هەڵگرێ و بیبا.

عومەر بە ترسەوە چاوی هەڵێنا و دیسان لێکی نانەوە. بڕێکی هەڵگلۆفین و دیسان کردنییەوە. باران دەتگوت گۆزەی سەرەوژێرە. لەو تەمە خەستە و بارانە توندەدا، دارە لێك نزیکەکان بە زەحمەت دەبینران... خۆزگە هەتا بارانەکە خۆشی دەکردەوە، لە شوێنێك مات دەبوو... جا ئەو بارانە کەی لێی دەکردەوە؟ وا دەباری، دەتگوت نایەوێ قەت خۆشی بکاتەوە.

"ئەگەر نەنە مریەمۆك مردبێ، کە گوندی لە چوکووراوا گەڕانەوە و هەمووان تەرمەکەی ئەویان دی، دەبێ مەرقەدێکی بۆ ساز بکەن. مەرقەدێکی وەك ئەوی "حەسەن دەدە". لەویش باشتر. ئەوجار دەبێ خەونێك ببینن. خەونێك کە نەنە مریەمۆك ڕۆیشتووە و چووەتە گەڵ چل سوارەی غەیبی، بۆ ئەوەی خەڵك بچنە سەر گۆڕەکەی و بپاڕێنەوە و کەڵەباب بکوژنەوە."

نەیزانی چۆناو چۆن بوو، لافاوێك هات و بردی و بە دار و بەردەکانیدا دەدا. خۆی بە ڕەگی دارەکان و بە ڕەوەزەکانەوە دەگرتەوە، بەڵام لافاوەکە ئەوەندە بەهێز بوو، دیسان هەڵیدەقەندەوە و دیسان دەیبرد و رایدەدا.

هاواری دەکرد:

ـ ئەی هاوار مردم، بمگەنێ.

و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"دەی ئەتۆ کە دەچێ بنیادەمێکی بێ تاوان بکوژی، خوداش ناوات لێ دەکا."

ـ ئەی هاوار خەریکە دەمرم... ئەوە دەمرم... بمگەنێ...

دەیزانی دەنگی بە هیچ کوێ ڕاناگا. لافاوەکە شێتانە لە بەردێکەوە بە بەردێکی دیکە و لە دارێکەوە بە دارێکی دیکەیدا دەکێشا. لە ناکاو لاقی لە نێوان ڕەگی دارێکی گەورە گیرا. ئێستا لافاوەکە بەسەریدا دەکشا. چیی نەمابوو بخنکێ کە توانیی دەستی بگەیەنێتە یەکێك لە لقەکانی دارەکە. عومەر خۆی هەڵکێشایە سەرێ و خۆی بە لقێکەوە هەڵواسی. دەلەرزی و شەقەی ددانی دەهات. هەرچۆنێك بێ، دەبوو ئەشکەوتێك بدۆزێتەوە. ئەی چۆن خۆی لەو دارە

کردبایەوە؟ لافاوەکە لە بنەوە شێتانە دەڕۆیشت و دار و بەردی لەگەڵ خۆی رادەدا. بە زەحمەت دەیتوانی دەور و بەری خۆی ببینێ. برێك لەولاترەوە، تاتە بەردێك لە بن دوا لکی دارەکەوە بوو. خۆ ئەگەر توانیبایەی خۆی بهاوێتە سەری، ئەوە رزگاریی دەبوو، ئەی چۆن خۆی بگەیەنێتە چلووکی لکە دارەکە؟ ئەی ئەگەر پێش ئەوەی بگاتە چلووکەکەی و دارەکە بشکێ؟ لە سەر لکەکە درێژ بوو و بەرەو سەری چلووکەکەی خزی. لکی دارەکە بەهێز و توند بوو و توانیی عومەر رابگرێ. عومەر کە لە چلووکی دارەکەوە خۆی شۆڕ کردەوە، چلێکی باریك شکایەوە و عومەر کەوتە سەر بەردەکە. بۆنێکی خۆش لە چلکە شکاوەکە دارەکە هەستا.

وەك مێژۆکە دەلەرزی. بە شوێن کون و کاژێرێکدا دەگەڕا و برێك لەو لاترەوە دۆزییەوە. بە هەر زەحمەتێك بوو خۆی تێ خزاند. ئەو شقارتەیەی لە لایلۆنەکەیەوە پێچابوو، دەریهێنا. شقارتەکەی تەڕ نەببوو. ئەو چڵ و چێو و پووش و دڕکەی لە بنەبانی کاژێرەکەدا بوون، خڕی کردنەوە ئاگری دان. دڕووە وشکەکە دەمودەست گڕی گرت. عومەر هەر تۆزێك گەرم بۆوە، ترسێك لە دڵی نیشت. هەر بە راستی کاری خودا بوو؟.... دەمودەست ئەو خەیاڵەی لە مێشکی دەرهاویشت. چووە دەرێ و لە بەر بارانەکە هێندێ پووشکەی کۆ کردەوە و هێنای و خستییە سەر ئاگرەکە. ئاگرەکە بلێسەی کێشا. عومەر خۆی رووت کردەوە و شمەکەکانی لە سەر بەردەکە هەڵخست. جلەکانی هەڵمیان لێ هەڵدەستا.

بارانەکە هەر دەهات و توندتر دایدەکرد و هەورە تریشقەش لە راست و چەپ و لێڕەوار و رەوەزەکانی دەدا. عومەر گەرم بۆوە. کە گەرم بۆوە خەیاڵ هەڵیگرت و بردییە دنیایەکی سیحراوی.

نەنە مرێمۆك نەمردبوو. ئەوە نەهاتی بوو. دەبوو بیکوژێ.

عومەر بە خۆشییەوە بزەیەکی هاتێ و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"چەندە باش دەبوو ئەگەر بۆخۆت بمردبای نەنە مرێمۆك. ئەگەر مردبایەی، ئەمنیش مەرقەدێکم بۆ هەڵدەبەستی و لە جوابی ئەو چاکەیتدا، موقبەرەیەکم بە گوڵ و کۆتەڵەوە بۆ دەڕازاندییەوە. ئاخر دایە گیان بۆ نامری؟ باشە ئەو "عەلی"یە درێژە بۆ نەیکوشتی؟" بنیادەمی باش دەبێ لە خەوێدا بیکوژی. لە خەوێکی قورسدا... دەبێ پڕ بدەیتە قوڕگی و رێکی بگوشی هەتا لە چاوتروکانێکدا گیانی دەربچێ... ئەو کاتە خۆیشی نازانێ مردووە، یان لە خەو دایە. تا رۆژی قیامەتێش هەر نازانێ و هەر پێی وایە هێشتا خەوتووە. ئای لەو مەرگە جوانە، چەنێ شیاوی نەنە مرێمۆکە باش و نازدارەکەیە. نەنە مرێمۆك لە بری ئەوەی بمرێ، هەر وا لە خەودا بمێنێتەوە."

بەو خەیاڵە، تۆزێك ئەهوەن بۆوە.

هەواکەی زۆر گەرم بوو. هەتا ئێستا گەرمای ئاوا نەبینرابوو. لە چوکوور لە نێوان یەك دوو ساڵدا جارێك گـەرمای ئـاوا دادێ. گەرمایـەکی وەك گـەرمای جەحەندەم کە پشوو لە پیاو دەبڕێ. "عەلی"یە درێژ ئـەمڕۆ تـرس هـەڵیگرتبوو و دەسـت و دڵـی بـۆ کـار نەدەچوو. چەند چاوێکی دەدی کە ڕق و تووڕەییـەوە سـەیری دەکـەن. تـووڕەتر و بێزارتـر لـە ڕۆژەکـانی پێشوو.

## ٢٥

مام خەلیل جارێ لۆکەی دەڕنییـەوە و جـارێ سـەری هەڵـدێنا و سـەیری دەوروبـەری خـۆی دەکرد. دەترسا و لە بەر خۆیەوە دەیگوت:" ئەمڕۆ ئەوانە گوویەك هەر دەخۆن." کەس سریوەی لەبەر نەدەهات. کەشێکی مـات و قـورس بـوو کـە لـە ناخـەوە دەکـوڵی. هـەموو شـتێك وەك خۆرەتاوەکەی ئەو ڕۆژە قورس بوو. گوندی کە بە حاستەم دەجووڵانەوە، نێو زاریان تاڵ تاڵ بوو. لە ڕۆژی ئاوا گەرم و ماتدا، زاری بنیادەم وا تاڵ دەبێ دەڵێـی کـەکرە*ی خـواردووە و بنیـادەم ئیتر هیوای بە هیچ شتێك نامێنێ.

مام خەلیل لە فکردا بوو. بـەخۆی دەگـوت:" ئـەو هـەتیوە دەکـوژن. نـەیانتوانی لـە سـەر کارەکە (تاوانەکە) بیگرن و دەشزانن ئیتر بۆیان نـاگیرێ. ژەندەرمەکـەش عـەلیی لەگـەڵ خـۆی نەبرد. چونکە بەبێ هۆ ناتوانن بـەرۆکی بگـرن و بیبـەن. سـات بـە سـات دڕنـدەتر دەبـن. ئـەو هەتیوە دەکوژن."

---

*کەکرە: گیایەکی تاڵە. کە بە تۆزێکی کە لێشی بەرزدەبێتەوە هەر تاڵە. دەستت وێی کەوێ تاڵ دەبێ. چەندی هەڵیشی بکێشی و لە ڕەگیشەوە دەریبێنی هەر دەڕوێتەوە.

ورده ورده خۆی بەرەو لای عەلی راکێش دەکا. ئەمڕۆ عەلی دەستی بۆ کار نەدەچوو و دەکرێ بڵێی لۆکەی نەدەڕنییەوە. دەستی گوندییش نەدەجووڵان. ئەو گوندییانە کاتێ دەستی عەلی بەخێراییەوە کاری دەکرد، لەو خێرایی و دەستوبردەی ئەو تووڕە دەبوون، ئێستا دەستەکانی خۆشیان لە خۆڕا لە کار ببوون. خێرایی دەستی گوندییەکان، هەر لە خۆوە بە خێرایی دەستەکانی عەلییەوە بەند بوون. کە سەیرت دەکردن، دەتگوت کەس ناجووڵێ. بنیادەمەکان لە مردوو دەچوون. هیچ تەیر و جرِ و جانەوەرێکیش دەنگی نەدەهات. تاوەکە وەك بەرد قورس ببوو دەتگوت هەموو دەنگەکانی لە عەرزی رۆکردووە. چوکووراوا حاڵەتێکی رێکتری بەخۆوە گرتبوو. هیچ شتێکیش نەدەدرەوشایەوە. رۆژەکانی دیکەی چوکووراوا نوقمی بریسکانەوە بوو و وەك توێژێکی رەنگاڵەیی و رەق و پڕ لە نەخش و نیگاری جانەوەرێك دەدرەوشایەوە. تەنانەت گەڵایەکیش نەدەلەرییەوە و ئەو چیایانەی دەشتەکەیان داگرتبوو، نەدەبینران. هەر دەتگوت دەستێکی گەورەی سیحراوی دابەزیوە و چیاکانی هەڵکەندووە و بردوونی. دەشتەکە هەتا بیابانەکەی ئەنەدۆلی ناوەڕات رێك و یەکدەست ببوو.

تەنیا گیانلەبەرێك بە ئاسمانەوە بوو، ئەویش هەڵۆ گەورەکە بوو. بەرەو رۆژهەڵات باڵەکانی لێك کردبۆوە و هەر وا لە ئاسمان لەنگەری گرتبوو. پیاو کە لە سەر عەرزەکە سەیری سێبەری ئەو هەڵۆیەی دەکرد کە هێندەی بنیادەمێك دەبوو، جا دەیزانی ئەو لەحاڵی فڕیندایە. سێبەرەکە بە جووڵەیەکی لە سەرخۆ و هەست پێ نەکراو بەرە و رۆژهەڵات دەخوشی، دوایی بە بێ ئەوەی جووڵەیەکی وا بکا هەستی پێ بکرێ، جەغزێکی گەورەی بە سەر عەرزەکەدا دەکێشا. هەڵۆکە هێندەی دوو یان سێ داری سپیندار بەرز ببۆوە. دەتگوت لە جێی خۆی چەقیوە یان چەقاندوویانە.

مام خەلیل بەبێ ئەوەی سەرنجی کەس راکێشێ، خۆی گەیاندە تەنیشت عەلی و ماوەیەك بەبێ ئەوەی ورتەی بێ، هەر لەوێ ملی لە لۆکە رنینەوە نا.

ـ عەلی، عەلی، گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. گوێ بدەیە. دەتکوژن. لێرە رابکە. رێگەیەك بدۆزەرەوە و رابکە. دەتکوژن. ئەمن ئەوانە باش دەناسم. کوڕە بڕوام پێ بکە. بەبێ ئەوەی هەست پێ بکەن، فیزماڵکی بدەیە.

ئیتر لە عەلی دوور کەوتەوە.

عەلی گیانی کەوتە لەرزین. ئەویش دەیزانی ئەو بێدەنگییە لە رقێکەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەویان هەڵگرتووە. دەیزانی و دەشترسا. لە بن لێوەوە گوتی:

"بچمە کویێ؟ بچمە کویێ؟ دەمکوژن با بمکوژن."
بە زراوچوویی و ترسەوە لە سەر عەرزەکە هەڵترووشکا.
ئەلیف بە دەنگێکی کزەوە، زۆر لەسەرخۆ و بە ترسەوە پرسی:
ـ چتە عەلی؟
عەلی وەك وەخۆ هاتبێتەوە گوتی:
ـ دەمکوژن با بمکوژن. لە جێی خۆم نابزووم. لێ گەڕێ با بمکوژن و لە کۆڵم کەنەوە.
شەکەت و تۆقیو بوو.

بە پەنجە لەرزۆکەکانی، قۆزاخەیەکی گرت و بە دوو پەنجە لۆکەکەی دەرکێشا. لە نەکاو لە باکوورەوە کزەبایەکی سارد هەڵیکرد. لەشە ئارەقە کردووەکانی فێنك کردەوە. لەشە بێجووڵەکەی هەڵۆکە جووڵەیەکی کرد و لە جێی خۆی ترازا و زوو خۆی گرتەوە و بە پێچەوانەی بایەکە، وردە وردە بەرەو رۆژهەڵات خوشی. بایەکە هەڵیکرد و لە چەپ و راست و رۆژهەڵات و رۆژاواوە. لە هەموو لایەکەوە تێکەڵ دەبۆوە و توند دەبوو. بایەکی سارد بە شەپۆلی سەهۆڵینەوە دەهات و دەشتەکەی فێنك دەکردەوە و با گەرمەکەش لە لایەکی دیکەوە وەك بڵێسەی گڕ هەموو وڵاتی دەسووتاند. برێك دواتر، لە بەر تەپوتۆز، چاو چاوی نەدەدی. هەڵۆ گەورەکە هەر بە ئاسمانەوە بوو و دەچووە نێو تەپوتۆزەکەوە و دەهاتەوە دەرێ.

بایەکە توندی کرد. لەچکەی لە سەر ژنەکان هەڵگرت و هێندێ کەپر و خێوەتیشی تێك دا وبردنی. لك و پۆی دارانی شکاندەوە. رووباری جەیحان کە لە دەریاچەیەکی مەند دەچوو، شەپۆلی دا و خرۆشا و شەپۆلەکانی باڵیان هاویشت. بایەکە، کۆڵەکەیەکی لە ئاوەکە هەستاند و لە کەندەکە سەری خست و بە کەنارەکەی وەرکرد. چوکووراوا شێت بوو و باڵی دەرکرد و لە شەقەی باڵی دا. خەرمان و گوڵە گەنم و کۆگا لۆکەی لێك دا. هەرچیی لە دەشتەکەدا بوو، هەمووی تێکوەردا. لە بەر تۆز و خۆڵەکە وڵات وا تاریك داهاتبوو چاو چاوی نەدەدی. کرێکارەکان لە جێی خۆیان وشك بوون. کەس سریوەی لێ نەدەهات. هەر کەسە و لە جێی خۆی دانیشت.

لە دوورەوە، لە باکوورەوە و لە سەر تۆرووسەوە، هەورێکی رەشی وەك شەو، هات. هەورەکە هەموو ئاسمانەکەی داپۆشیبوو و بەرەو دەریای سپیی دەڕۆیشت. یەکەم دڵۆپە درشت و گەرمەکان، تلپ تلپ کەوتنە سەر عەرزەکەی چوکووراوا. هەر دڵۆپەیەکی دەکەوت، قولکەیەکی دروست دەکرد. ئەوجار بایەکی گەرمی وەك بڵێسەی گڕ هەڵی کرد و بە دوای ئەودا کزەیەکی ساردی وەك سەهۆڵ... لە ناکاو و لە چاوترووکانێکدا لافاوێك لە ئاسمانەوە بە

سەر زەوییەکەدا هەڵڕژا. نێوان ئاسمان و زەوی دەبووە دیوار. کرێکار نە رایان دەکرد و نە دەشجوولاّن. هەر هەموو لە جێی خۆیان و لە بەر بارانەکە مانەوە. ئەو بارانە مەرگی ئەو کرێکارانە بوو کە بە پارەی رۆژ کاریان دەکرد. هیچ شتێك لەوە بۆ کرێکاری لۆکە رنینەوە خراپتر نەبوو. ئێستا بارانەکە لۆکەکەی هەموو لە عەرزی دەکرد و لە قوڕی وەردەدا. لۆکە، چەندی خاوێنیشیان دەکردەوە، هەر قورس ببوو. راستە، قورستر دەبوو، بەلاّم ئاخر رنینەوەشی ناخۆش ببوو و لە لایەکی دیکەشەوە، خاوەنی مەزراکە ئیتر بۆ هەر کیلۆیەکی "بیست قرۆش"ی نەدەدانێ، بەلکو دە یان پانزدە قرۆشی لێ دەشکاندن. ئیتر خۆی و خودای خۆی. نیدی مەزرا پڕ پیت و بەرەکەتەکانی لۆکە هیچیان لێ نەمابۆوە. کەس متەقی لێوە نەدەهات. کەس بەبیریشیدا نەدەهات بجوولێ. لە چاوترووکانێکدا هەموویان خووسابوون و دەتگوت خۆیان لە رووبارێك هەلکێشاوە و هاتوونەوە دەرێ.

هەلۆ گەورەکە، لە سەر جێی خۆی، بە باڵە لێك کراوە و خووساوەکانییەوە، هەر وا بەردەوام بوو. هیچ گوێی بەو بارانە بەغوڕەمە نەدەبزووت.

لە ماوەیەکی کەمدا، کە بارانەکە هەرچی چاڵ و قووڵکە بوون، پڕی کردن، لە بن هەر بڕکەیەکیشەوە جۆگەلەیەك وەڕێ کەوتبوو. بەرەبەری عەسرێ بوو کە خەرەند و زەوییە نزمەکان و چاڵ و قووڵ و ئاودڕەکان، لێوڕێژ بوون لە ئاو. لاقاو هەتا داوێنی گردۆلکەکان و دارەکان هەستا. لە سەر گردەکان و رەوەزەکانی ئاناوەرزاشەوە لافاوەکە بەخوڕ دەهاتە خوارێ. دەمەدەمی عەسرێ، ئیتر عەرز لە هیچ کوێ بەدەرەوە نەمابوو، بارانەکەش هەر دەهات و بە تەوژمتر دەبوو و چاو چاوی نەدەدی. یەکێك لەو بارانە بەخوڕ و درێژماوەکانی پاییزێ بوو.

"عەلی"یە درێژ، باسکە درێژەکانی لێك کردنەوە و باوێشکێکی دا و ئێسقانەکانی قرچەیان لێوە هات. ویستی لەشە سڕ بووەکە بجوولێنێ بۆ ئەوەی لەو بارانەدا را بکا و بەرۆکی خۆی لە چنگی ئەوانە راپسکێنێ. هەستی دەکرد ئەو بارانە و ئەو بۆشایی و بێکارییەی دوای ئەو بارانە بە سەریاندا دێ، دەبنە بەلاّی گیانی.

سێبەرە رەشەکان کەوتبووە سەر بارانەکە. هەواکەی هەر دەهات و تاریکدا دەهات. هەر کەسە و سەری لەبەرخۆیدا بوو. عەلی دەیزانی لەو ساتەدا هەر هەموان بیر لەو دەکەنەوە و بیر دەکەنەوەو تووڕەتر دەبن. عەلی دەیزانی ئەو تووڕەیی و رقە کپە چیی تێدایە. ئەو رقە ئەگەر یەکێکی وەچنگ کەوتبایە، بە هەق یان بە ناهەق، ورد و خاشی دەکرد.

مام خەلیل کە دیتی عەلی ئاوا باسکەکانی لێك کردوونەتـەوە، لـە ترسـان هـەموو گیـانی لەرزی و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئاخ، کورە ئامانـە، باسـکەکانت بێنـە خـوارێ. ئیـشەڵڵا کەسـیان نەیانـدیتووە... ئـەوان چاوەڕێن تۆ بەحاڵ بجووڵێی کە ئاوقات بن... یەك جووڵەی تۆ بەسە."

عەلی رێك لەو کاتەدا ەستا و بەرەو جەیحان کەوتە رێ. لە ناکاو دەنگێك هات:

ـ ئەها رای کرد.

گوندی هەر گوێیان لەو دەنگە بوو، وەك تیری کی لە کەوان دەرچووبێ، دەرپەڕین. عەلییش بەرەو جەیحان رای کرد. دەمودەست پێشیان گرت و خۆیـان پێـدا دا. گونـدی وەك تـەپۆڵکێکی رەش، چەند جار خۆیان بەسەردا کێشا و لێك بوونەوە. دەنگی باران نەبێ، سریوەی هـیچ شـتێ نـەدەهات. ئـەوجار دەسـبەجێ حەشـیمەتەکە بـڵاوەی کـرد و لـە سـەر زەوییەکـە، رەشـایی بنیادەمێکی لەقوڕ وەردراو کـە، بـەرەودەم کـەوتبوو، بـەجێ مـا. ئـەو هـەمووە بنیادەمـە لـە چاوترووکانێکا چییان لێ هات و چوونە کوێ؟ مام خەلیلیش پێی سەیر بوو. بە پەلەپەل بە سەر عەلیدا نوشتایەوە و سەری بە سنیگییەوە نا. بە خۆشییەوە لە بن گوێی ئەلیف گوتی:

ـ نەیانکوشتووە. ماوە.

حەسەن و ئۆمەخان ترس و گریانیان لەبیر چوبۆوە. وشك ببوون و سەیری باوکیان دەکرد کـە ببووە پەیکەرەیەکی قوڕ و لە سەر عەرزەکە کەوتبوو.

ـ ئەیف، عەلی هەستێنەوە. ئەتۆ پیلێکی بگرە و ئەمنیش پیلەکەی دیکـە. بـا بیبەینـەوە کەپرەکە. خاوێن و وشکی بکەینەوە.

عەلییان هەستاندەوە. عەلی شل ببۆوە. هیچ جیاوازییەکی لە مردووان نەبوو. قورس ببوو. وەختێکی بە راکێش راکێش دەیانبردەوە، گۆملیکسیز ئۆغلۆ گەیشتێ. ئەلیفی لادا و چووە بن باڵی عەلی. بە رواڵەتێکی خەمبارەوە پرسیی:

ـ مردووە، مام خەلیل؟ بە خوای پیاوێکی چاك بوو... چارەنووس...

کەچی، یەکەم کەسێکی کەوتە شوێن عـەلی و بـە مـست لـە سەروچـاوی دا، گۆملکـسیز ئۆغلۆ بوو. ئێستاش خەرکی بوو بە سوێیان شێت دەبوو. وەك سەگ پەشیمان ببۆوە.

مام خەلیل گوتی:

ـ ئەتۆش باش بەرۆکی عەلیت گرت و مستێکی چاکت لە سەری دا. قاتڵی عەلی تۆی.

عەلییان بردەوە کەپرەکە، بەڵام با، کەپرەکەی بردبوو. گۆملیکسیز ئۆغلۆ گوتی:

ـ ئاوا نابێ. با بچینە بن ئەو چنارە و لەوێ خێوەتێك هەڵدەین و ئاگرێك بکەینەوە.

عەلی بەو شەوە، لە بەر بارانەکە تەخت کەوتبوو. لە چوکووراوا گرمە و هاژەی ئەو لافاوانە دەهات کە بەوپەڕی خێراییەوە بە خوڕ دەڕژانە جەیحانەوە.

لە بن دار چنارەکەوە، گۆملیکسیز ئۆغلۆ بە چەند سەعاتێك، خێوەتێکی هەڵدا. لە بن خێوەتەکە ئاگرێکیان کردەوە. عەلی بەحاستەم پشووی دەهات و قسەی پێ نەدەکرا.

گۆملیکسیز ئۆغلۆ هەتا بەیانی بە ژوور سەرییەوە دانیشت و نەنووست. بارانەکەش تا بەیانی، شێتانە و وەك گۆزەی سەرەوژێر دەهاتە خوارێ و خوڕە و هاژەی لافاو دەهات.

مەمی دیك لە بەر لێزمەی بارانەکە، بێ راوەستان غار دەدا. بە غاردان دێ و سەیر دەکا جەیحان هەستاوە و مەزرا و شیو و دۆڵی پڕ کردووە. بارانەکە بەخوڕ دەبارێ و هەڵمێکی وەك هەور لە عەرزییەوە هەڵدەستێ... و گەڕانەکەی مەمی دیك لەو بەر بارانەدا.

## ٢٦

لە نێو قوڕ و لیتەکەدا هەڵترووشکا.

بەخۆی گوت:

- دەبێ ئەلێرە بێ.

- سەیری دەوروپشتی خۆی کرد. لە بەر لێزمەی بارانەکە هەنگاوێك پێش خۆی نەدەدی. لە بن لێوانەوە گرماندی:

- ئای چ مەزرایەکی باشمان دۆزیبۆوە و چ لۆکەیەکمان دەڕنییەوە. هەم قەرزەکانی عادیل ئەفەنیمان پاك دەکرد و هەم بەشی خۆشمان پاشکەوت دەکرد. پازدە ساڵ دەبێ مەزرای ئاوامان گیر نەکەوتووە. ئێستا، ئەو بارانە مالۆێرانی کردین... ئەوجار تەرمی مردووکەشمان پێ نادۆزرێتەوە. جا ئەمن چ بکەم؟

هەستا. هەوڵی دا بچێتەوە سەر ئەو شوێنەی مردووەکەی لێ ناشتبوو. دار توویەکی باریك لە سەر مردووەکە بوو. کۆمەڵێك پنچکە تووترکی کێوی دەوری دارەکەیان دابوو. ماوەیەك زۆر، بە غاردان سەری ئەم پنچك و ئەو پنچکی دا. ئەو پنچکەی نەدۆزییەوە کە لێی دەگەڕا. کەوتە نێو ئاودڕێکەوە. ئاودڕکەکە پڕ پڕ بوو. بە دەم ئاودڕەکەدا رۆیشت و کەوتە قامیشەڵانێکەوە، ئەوجار گەیشتە لێڕێکی دارە گەز و ئاخرییەکەی گەیشتە شوێنێکی پڕ لە

داری "بابادەم". ئەو پنچکە تووترکە کێوییانەی لێیان دەگەڕا، تۆزێك لە پێشترەوە بـوو. یـەك دوو تیتۆڵی قوماشی ڕەنگاوڕەنگیان لە پنچکەکان ئاڵاندبوو. بە پەلەپەل خۆی گەیاندە سەر ئەو شوێنەی تەرمەکەی تێدا ناشتبوو. لافاو ئەوێی ڕادابوو. تەرمەکە نەمابوو و قوڵکەکەش هـەتا نیوەی پڕ ببوو لە ئاو. مەمی دیك خۆی لە قوڵکەکە هاویشت. بـە دەسـت هـەمووی پـشکنی. تەرمەکە نەمابوو.

لە نەکاو شەپۆلێکی خۆشی و شادی دڵی داگرت. لە خۆشیان نەیدەزانی چ بکا. کـوڕە هـەر باش بوو ئەو بارانە دایکرد. باری و نەمتوانی بچمە لای فەرمانده‌کـە. نـەمتوانی بـچم و بڵـێم ئەمن شەوکەت بەگم کوشتووە. وەرن مردووەکەتان وەرگرنەوە. ئەو کات باشە ئەی نەیاندەگوت کوا مردووەکە مەمی دیك؟"

لە دەم قوولکەکە دانیشت. بارێکی قورسی لە سەر شانی لاچووبوو. کەوتەوە بیری زولەیخا. لە خەیاڵی خۆیدا دەسبازی و دڵداریی لەگەڵ دەکرد... ئافەرین مەمی دیك کە لە چـنگی ئـەو تەرمە نەجاتی ببوو... ئەگەر ئەو باران و لافاوە نەدەبوو، مەمی دیك تا مردن لـە چـنگ ئـەو تەرمە و ئەو شـەوکەت بەگـە دامـاوە ڕزگـار نـەدەبوو. ئـەو بارانـە، خـۆ ئەگـەر گوندییـەکانی ماڵوێران کردبوو، بەڵام خۆ مەمی دیکی نەجات دابوو.

هەر بە ڕاستی ئەگەر لافاوەکە فریای نەدەکەوت، چیی لەگەڵ ئەو تەرمە کردبا. کە لە لۆکە ڕنینێ دەبوونەوە و دەیانویست بگەڕێنەوە ئاوایی، ئەو دەبوو مردووەکە بە کێ بسپێرێ؟

مەمی دیك لەبەرخۆیەوە بزەیەکی هـاتێ:"چـیم لـە تەرمەکـە دەکـرد؟ بـە کـێم دەسـپارد؟ دەمخستە بەر دەمی سەگەل... خۆ کوڕی باوکم نەبوو. هەر بە ڕاسـتی مردووەکـە ڕۆیـشتووە... ئەو بەڵایەی گیانی من. لەوانەشە تۆزێك لەو خوارترەوە لە پنچکێك گیرساوەتەوە و ماوەتەوە و چاوەڕێی منە. بینایی چاوەکانم، گیانی دڵم، شەوکەت بەگە ئازیزەکەم، ئاخۆ دەکرێ دەست لـە بەرۆکی من بەردەی؟

دەستی لە سەر عەرزەکە دانا. دەستەکانی ڕۆچوون. هەسـتایە سـەر پێـز دەتگـوت هـەموو گیانی کوتراوە. پشتیشی دەیزیڕاند. بارانەکە هەر دەهات و تونـدتری دەکـرد. لـە سەرانـسەری لافاوەکەی بەرەو جەیحانـدا، چـاوی بـە بـن هـەموو پنـچك و دار و کـون و کاژێرێـکدا دەگێـڕا. ئاخرییەکەی گەیشتە جەیحان. جەیحان سوور دەچۆوە. ئاوەکە، ئەو لك و پۆپ و گـەڵا و کۆتـەرە دار و توێکڵە کاژ و دارە پڕ لە چڵ و چێو و گەڵایەی لە ڕەگەوە هەڵکەنرابوون، ڕاپێچ کردبوو و دەیبرد... لە بەر چاوی ئەو، ڕووبارە بە لرفە و بەخرۆشەکەی جەیحان دنیایەکی بە بەرد و دارەوە

دەبرد. بۆنی تاڵ و کاریگەری قوڕ و لیتەی بۆ هات. ڕووبارەکەی جەیحان هەر جارێکی هەڵدەستا، ئەو بۆنەی لێ دەهات. بۆنی زەلکاو و ئاو و هەروەها بۆنی داری رزیویش.

چەند کەلاکی مانگا و مەڕ هاتن رابردن، لە سەر پشت کەوتبوون و بایان کردبوو و لاقەکانیان لێك رەویبوونەوە. توێکڵە کاژ و پووش و پەڵاش و کەفاوی سوور دەوریان گرتبوون. لووزەوی ئاوەکە دەیبردن.

مەمی دیك لە بن لێوەوە گوتی:"شەوکەت بەگیش ئاوا بای کردبووە و دەست و پێیەکانی لێك رەویونەتەوە و بە دەریادا رۆیوە."

جەیحان وردە وردە هەڵدەستا و کەنارەکانی دادەگرت. مەمی دیك لە بەر ئەو بارانەی کە هەر دەهات و توندتر دەبوو، سەیری جەیحانی دەکرد کە سات بە سات پتر هەڵدەچوو. خۆ بێت و ئاوا بەردەوام بوایە، ئەمشەو هەموو مەزرا و کێڵگەی گوندەکانی دەوروبەرمان و بەشی هەرە زۆری دەشتەکە بن ئاو دەکەوت.

تنۆکە باران دەکەوتنە سەر ئاوە سوورەکەی جەیحان و تۆقلەیان لە ئاوەکە دروست دەکرد و روخساری ڕووبارەکە بەو تۆقلە ئاوانەی بەردەوام هەڵدەدران و دەتەقینەوە، نەخشابوو.

مەمی دیك دەستەکانی لێك کردنەوە و گوتی:

- ئەوەش تەواو بوو. مردووەکەمان وازی لە ئێمە هێنا و لێی دا رۆیشت.

بەو قسەیە، خەمێکی خەست ناخی تەنییەوە. لە بەر بارانەکە، لە دەشتەکەی چوکووراوادا و لە چەقی دنیادا، بەبێ کەسی مایەوە. بۆشاییەکی وەك ژەهر لە دڵیدا نیشتەوە. لە دەوروبەری خۆی بە شوێن شتێکدا گەڕا. دەتگوت شتێکی لێ ون بووە. باشە ئەو شتە چ بوو؟ چەندی گەڕا نەیدۆزییەوە. لاقەکانی بەبێ ئیختیاری خۆی، ئەویان بەرەو خوارووی ڕووبارەکەی جەیحان راکێش دەکرد. چاوی لە ناوەکە بڕیبوو و لەو لەو کەنارە و ئەو کەنار، شێلگیرانە بە شوێن شتێکدا دەگەڕا. لە نەکاو زانیی شتێکی بزر کردووە و بۆشاییەکەی ناخیشی، مردووەکەیەتی. ئێستاش، تا چاوی بە رەشایی و تارماییەك دەکەوت کە لە پنچکێك یان دارێك یان لە کونێك گیر بووە، بە پرتاو خۆی دەگەیاندێ و سەیری دەکرد تەرمی مردووەکە نییە، بەڵکو کۆتەرە دارێکە یان کەلاکی مانگایەك بزنێك یان بارگینێك.

شەو داهات. تاریکییەکە شیر نەیدەبڕی. لە برسان زگی دێشا. مەمی دیك لە دوور کەنارەکە و لە نێو مەزراکاندا گوێی دابووە لوورە و خرمەی سامناکی باران و ئاو و بەرەو خوار دەچوو.

رووباری جەیحان دەڕژێتە نێو دەریای سپییەوە، ئەگەر لە شوێنێك تەرمەكە نەخاتەوە وشكانی و كەنار، ئەوە دەیبا و بە دەریای سپیی دادەدا. لە دەریاش ماسییەكان ئەوەندەی یەك و دوو ئێسكیشی دەخۆن. ئەو وەختەیە كە مردووەكە هەر بە راستی دەمرێ و تێدا دەچێ....

كە بەیان ئەنگوت، هێشتا باران خۆشی نەكردبۆوە. گەیشتە گوندێك. گوندەكە چۆڵ بوو و لافاو نیوەی داگرتبوو و گوندییەكان رایان كردبووە سەر گردەكەی بەرانبەری. ماڵ بە ماڵی گوندەكە گەرا. لە ماڵێك وەژوور كەوت، نان و قابڵەمەیەكی گەورەی ماست دۆزییەوە. دەمودەست ماستەكەی بە سەرییەوە نا و خواردی. ئاگرێكی كردەوە و خۆی وشك كردەوە. ئەوەندەی خەو دەهات، لێی سوور بوو خۆی بۆ شل بكا، سێ شەو و رۆژان هەڵناستێ و سەر هەڵناهێنێ. نەنووست. كە وەدەر كەوت، بارانەكە هەر دەباری و ئاوە سوورەكەی جەیحان كە پڕ بوو لە كەل و پەلی ماڵ، قەرتاڵە و توێكڵە دار و پووش و پەڵاش و داری لە رەگەوە هەڵكەنراو، دیسان هەڵچوبوو و دەشتەكەی داگرتبوو و دەتگوت دەویایەكی پان و بەرینە.

ئەو رۆژە هەتا شەوێ بە دەم رووبارەكەدا رۆیشتە خوارێ. دەمە دەمی ئێوارە بوو كە بارانەكە لێی كردەوە و تاو هەڵات. كۆلكە زێرینەیەكی حەوت رەنگ، لە چیای گاورانەوە هەتا زاركی "گولەك" كێشرا. ئەو چیایانەی دەشتەكەیان گرتبووە ئامێز، نزیكتر بوونەوە دەتگوت ئەگەر دەستیان بۆ بەری دەتوانی دەستیان لێ بدەی. ساتێك دوای ئەوە چوكووراوا لە تەمدا نوقم بوو.

مەمی دیك هەتا ئەژنۆی لە قوڕەكە رۆدەچوو. باش بوو قوڕ و لیتەكەی وەك ئاوەكە شل بوو و مەمی دیك دەیتوانی بە ئاسانی پێیدا بڕوات.

كیلۆمەترێك رۆیشت و گەیشتە گوندێك. لەوێ شتێكی بۆ خواردن پەیدا كرد و ئاگرێكی كردەوە. ماڵێكی دوو نهۆم و پتەوی هەڵبژارد كە لە چیمەنتۆ ساز كرابوو. ئاو هەتا مەترێكی دیواری خانووەكەی گرتبوو. مەمی دیك بە خۆی گوت:"بارانەكە خۆشی كردووەتەوە و ئەو لافاوەش ئەو خانووەی پێ ناڕووخێ." ترخێنەیەكی لێ نا و هێشتا هەڵمی لێ هەڵدەستا، بە گەرمی هەڵی قوڕاند. شمەكەكانی داكەندن و لە بەر ئاگرەكە وشكی كردنەوە. لە نێو نوێن و بانەكەدا، دۆشەگێكی ئەستوور و لێفەیەكی گوڵدار و سەرینێكی گوڵداری دەرهێنا و رایخستن. هەواكەش فێنك بوو. بەو بۆشاییەی ناخییەوە كە خەریك بوو شێتی بكا، خەوت.

بەیانی، لەگەڵ تاوهەڵاتێ بەخەبەر هات و هەر هەستا دیسان ئەو بۆشاییە ناخی داگرتەوە و وەڕێ كەوتەوە. ئاوەكە تۆزێك نیشتبۆوە و دەشتە رێكەكە بە گوڵی سوور داپۆشرابوو و

دەبریسکایەوە. ئاوڕێکی لە سەرووی رووبارەکە دایەوە بەو هیوایەی بەشکم تەرمەکە لە شوێنێك، بە شتێکەوە گیرسابێتەوە. بۆشاییەکەی ناخی هەر دەهات و پتر دەبوو. ئەو رۆژە زۆر زۆر گەرم بوو. هەوا شێدار و هەڵماوییەکەی دوای بارانی چوکووراوا، نوقی قوڕ و لیتە، پیاوی دادەهێزراند و هێڵنجی پێ دەدا.

لەو هەوا گەرم و هەڵماوی و تارەدا کە دەتگوت تەم و مژە، دەڕۆیشت. ماندوو و شەکەت بوو. دەتگوت جەستەی هی خۆی نییە. وەك بە دەم خەوەوە بڕوات وا بوو. دیسان تاشباش ئۆغلوی دیت. دیسان حەوت تۆپەڵە نووری بە دواوە بوو هەر یەکەی بە بەرزایی سپیندارێك. بە سەر ئاوە روونەکەی جەیحاندا کە سەرانسەری دەشتەکەی داگرتبوو، دەڕۆیشت. بە هەزاران ئاسکی چاو درشتی نوقم لە نوور و تیشکدا بە شوێنییەوە بوون و بە هەزاران کۆتری سپی و لەگ لەگ و هەڵۆ و کاشەڵە شینکە و ریشۆڵە و کۆتری کێوی و باڵندەی جۆراوجۆری دیکەش بە سەر سەرییەوە دەفڕین... شان بە شانی ئاسکەکان، گەلە گورگ و چەقەڵ و ورچ و گا کێوی و پڵینگ و جانەوەری دیکە و ئەسپ و ئەسپی عارەبی بەڵەك و کوێت و رەش... بێ سوار و جوان... و هەر هەموویان نوقمی نوور. جرِوجانەوەری پێست رەنگاو رەنگ، پەپوولەی گەورەی رەنگاو رەنگ هێندەی بنیادەمێك کە باڵە پان و گەورەکانیان لە ئاسماندا لێك ئاوەڵا کردووە، زەرد، کەسك، شین و پرتەقاڵی و سوور و سپی... ئاسمانیان لە هەزاران رەنگ و بریسکانەوە وەرداوە.

تاشباشی مەزنمان لە نێو ئەو قەرەباڵغییەدا بە دەشتەکەی چوکووراوادا دەڕوات، وەك تیشك پێ دەکەنێ. خەون نییە، راستییە... دێ و لە بەر دەم مەمی دیك رادەوەستێ. پێکەنینەکەی وەك رووناکایی دەدرەوشێتەوە.

ـ مەمی دیك!

ـ فەرموو سەروەرم.

ـ ماڵی گوندییەکان ئاوەدان بێ کە قسەیان لەگەڵ نەکرد. بە گوندییەکان بڵێ. مردووەکەش چووە دەریای سپی و ماسییەکان خواردیان. شەوکەت بەگ هەر دەبوو بمرێ. بنیادەمێك کە لە خەودا دەژیێ، چ فەرقێکی هەیە لەگەڵ مردووان؟ ئەتۆ هیچ خەمی ئەوەت نەبێ.

ـ خەمی لێ ناخۆم تاشباشی مەزن.

ـ لە خزمەتت دام.

ـ ئەتۆ دەبێ ئەو کافرە هەر بکوژی. هەتا ئەو زیندووە، تۆ مردووی و ئەمنیش...

ـ بە سەر چاوان.

- ئەوە بە تەمای تۆم. دەستی تۆ لە جێی دەستی منە. دەستت بدە دەستی من.
مەمی دیك دەستی درێژ کرد.
- کوشتنی شەوکەت بەگیش بەجێ بوو. ئەوە من ناردمە سەر رێت. سەفەر بکوژە. تەرمەکەی بخە نێو بیرەکەوە. وەختێك کە لە چوکوور دەگەڕێنەوە... دوایین رۆژ. کەس ناتبینێ. کەسیش گومانت لێ ناکا.
- بە سەر چاوەکانم.
- دەستی خۆم دا بە تۆ مەمی دیك. بە دەستی سەفەر دەکوژی. ئەو دەستەی دەیکوژێ، دەستی منە.
- دەستی تۆیە تاشباشی مەزن.
- زولەیخا شێت و شەیدای تۆیە. پێی سەیرە کە بۆچی ئەتۆ ئاوڕی لێ نادەیەوە. نازانێ، هەتا سەفەر زیندووە، ئەتۆ نە لە لای ئەو سەرت هەڵدێ و نە لە لای خەڵکیش. سەفەر بکوژە. دەستی زولەیخا بگرە و بیبەوە ماڵی خۆت. ئەمساڵ زستانێ، سمۆرە راو دەکەی و پارەیەکی زۆرت دەست دەکەوێ. دەستی تۆ دەستی منە.
مەمی دیك دیسانیش دەستی درێژ کرد و دەستی تاشباشی گرت.
- دشتوانی بە هەموان بڵێی منت دیتووە. بەڵام بە کەس مەڵێ سەفەر دەکوژی و ئەمنیش بۆیە دەستی خۆم بە تۆ داوە. بە گوندییەکانیشم بڵێ، رۆژێك هەر دێمەوە ئاوەدانی و خێر و بەرەکەت دێنمەوە. ئیتر ژان و ئازار و نەخۆشی نامێنێ. هەژاری و لێك دابڕان نامێنێ. زوڵم و ناهەقی نامێنێ. هیچ کەس ناتوانێ سووکایەتی بە کەس بکا. دۆستی و برایەتی دێنمەوە. بە گوندییەکانم بڵێ هەر دێمەوە. رۆژێك لە رۆژان دێمەوە. جارێ دان بە جەرگتاندا بگرن.
دەتگوت یەکەم رۆژی خولقاندنی جیهانە. قیامەتێك بەرپا دەبێ. دەتگوت هەرچی بوونەوەری سەر زەوییە جێژنەیانە. تاشباش ئۆغلو بزەیەکی شیرینی لە لێوی گەڕا و لەگەڵ هەموو بوونەوەرە بە جۆش و خرۆشەکانییەوە بە باڵەفڕە و بە بریسکەبریسك و بە حەوت گلۆڵە نوورەوە، چووە سەر دەریای سپی و دوور کەوتەوە. جلوبەرگێکی کەسکی لە بەردا بوو. کەسکێکی وا، کەس نەیدیبێ.
- تەبایی و رەبایی دێنمەوە. ئیتر کەس برسی و نەدار نابێ. کەس رووت و قووت نابێ. خێر و بەرکەتی ئیبراهیمی خەلیل دێنمەوە. بەرەکەتی ئیبراهیمی خەلیل....
لە سەر دەریای سپی نوورێك درەوشایەوە. هەورە سپیەکانی سەر دەریاکە بۆ ساتێك لەو نوورەدا سەمایان کرد.

مەمی دیك كە لە شەكەتی و ماندوویەتییان وەك سەرخۆشان بە لادا دەهات، هاتەوە مەزراكە. هەر كەسە و لە بەر دەم كەپرەكەی خۆی دانیشتبوو. نە كەس دەجوولا و نە كەسیش قسەی لەگەڵ كەسی دیكە دەكرد. مەمی دیك سیری كرد هەمووان بە سەرسوورِمانەوە سەیری دەكەن. چاویان لەو بڕیبوو و چاویان نەدەترووكاند. مەمی دیك بزەیەكی هاتێ. هیچ جووڵەیەك لە روخساریاندا بەدی نەكرا. هەر هەموویان خووسابوون و جلوبەرگەكانیان بە لەشیانەوە نووسابوو. لە بەر تاوەكە خۆیان هەڵخستبوو وشك ببنەوە. سەر و قژیان ئاڵۆز ببوو. بۆنێكی شێداری تیژی وەك بۆنی ئارەقە دەهات. لۆكەكەیان لە بەر تاوەكە هەڵخستبوو. زەوی و بنیادەمەكان و لۆكە و تاو و بركە لۆكە و رووباری جەیحان، هەر هەمووی هەڵمیان لێ هەڵدەستا. هەورێك سەر جەیحانی داگرتبوو كە هەتا دەریای سپی رۆیبوو.

دایكی، ئەم جارە، زۆر خراپ پێشوازیی لێ كرد. بەسەریدا نەڕاندی:

ـ بۆ كوێ چووبووی؟ راوی چی بەرەڵلا؟ چووبوویە كوێ بەچكە بەراز؟ لەو باران و لافاوەدا، چما بنیادەم دایكە پیرەكەی خۆی لەو نێوەڕاستی چوكووراوایەدا بەتەنێ بەجێ دێڵێ؟

مەمی دیك بە دڵێكی خۆشەوە وەڵامی دایەوە:

ـ دیتم. دیسان دیتمەوە. وەك نوور دەدرەوشایەوە.

ئەویش بزەیەكی خۆشیی لە سەر لێوان بوو. بزەی یەكێك كە نهێنییەكی گەورە دەزانێ و نایدركێنێ.

دایكی گوتی:

ـ دەی، دیارە برسیشتە پاڵەوان فس فس. وەرە ئەو شلەیە بخۆ.

مەمی دیك لە بزەوە كەوچكەكەی لە شلەكە وەردا و گوتی:

ـ دیتم.

دەر و جیران لە دەوری كۆ ببوونەوە.

دایكی پرسیی:

ـ كێت دی؟

ـ مەمی دیك بزەی هاتێ و وەڵامی نەدایەوە. خەڵكەكە بۆ یەكەم جار لە بن لێوانەوە ورتاندی:

ـ كێی دیوە؟...

دایكی دیسان پرسییەوە:

- کێت دی؟

خەڵکەکە چاوەڕێ مان بزانن کێ. مەمی دیک دیسان گوتی:

- دیتم.

بە پەلەپەل شلەکەی خوارد. جەواڵێك هەڵگرت و لە بن سەری نا و لێی راکشا. راکشا و رانەکشا، خەوی لێ کەوت.

وردە وردە خەڵکێکی پتر کۆ دەبوونەوە هەر کەس دەهات دەیپرسی:

- چ بووە؟

وەڵامیان دەدایەوە:

- مەمی دیک دیوێتی. دیوێتی.

وەك یەکێکی نهێنییەکی گەورە بزانێ و نەیدرکێنێ، بە پۆزێکەوە وەك مەمی دیك بزەیەکیان هاتێ.

**بەر لە تاوهەڵاتێ، گوندی لە دەوری مەمی دیك كۆ دەبنەوە و بەبێ ئەوەی كاریان پێی بێ، چاوەڕێ دەبن وەخەبەر بێ. جلوبەرگەكانیان چرچ و لۆچ بووە. هێشتا بە جوڵنی وشك نەبووەتەوە و قوڕاوین. بێهیواییەكی لە رادەبەدەر بە روخساریانەوە دیارە. كپ و بێدەنگ، دەست لە باخەڵدا، وەك تازیەباران راوەستاون. هیوادارن مەمی دیك هەستێ و یارمەتییەكیان بكا.**

## ٢٧

ئاشقەكەچەڵ، كابرایەك قووڵ و مەند بوو. كاری بە كاری كەس نەبوو و خۆی تێ هەڵنەدەقورتاندن. هەر بە گۆرانییەكانییەوە لە نێو خەڵكەكە دا بوو. ئەمڕۆ بە سەرسووڕمانەوە چاوی زەق ببوون و دەلەرزی. ئەویش بە سەر سەری مەمی دیكەوە كە هێشتا نووستبوو، راوەستابوو. دەهات و دەچوو، دەستی لێك دەخشاندن، بە سەر مەمی دیكدا دەنوشتایەوە كە هەناسەی قووڵی دەكێشا و گوێی هەڵدەخست. بێ ئۆقرە بوو. ئاخرییەكەی هەر خۆی پێ نەگیرا و لە بن سەری مەمی دیك چۆكی دادا و گوتی:

- كوڕم، مەمی دیك، بەندە باشەكەی خودا، كوڕە رەشیدەكەم، هەستە. هەواڵێكی ئەو پیاوچاكە، ئاشباشی مەزنمانمان پێ بدە كە حەوت تۆپەڵە نووری بە دواوەیە. دەی هەستە كوڕە ئازاكەم هەستە.

بەسپایی، دەستی راستەی بە سەر و قژی مەمی دیكدا دەهێنا. مەمی دیك ساتێك چاوی هەڵێنا و دیسان لێكی نانەوە و نووستەوە. جلوبەرگی هەموو ئەوانە بەبێ جووڵە بە سەر سەری مەمی دیكەوە راوەستابوون و چاوەڕێ بوون، چرچ لۆچ و قوڕاوی بوو. سەر و قژ و مێزەر و

لەچکەکانیان هەموو قوڕاوی بوو. زۆربەیان جلوبەرگەکانیان هێشتا وشك نەببوونەوە و هەر وا خاو بوون. کروشمەیان کردبوو و دەستیان لە سینگیان هەڵپێکابوو. کەس قسەی نەدەکرد. چاویان بڕیبووە مەمی دیك و تەمێکی خەستی وەك هەوری سپی سەرانسەری چوکووراوای داگرتبوو و جار بە جار هەڵدەکشا. سەر چڵووکی دارەکان مژەکەی بڕیبوو و لێی دەرچووبوو. لێڕەکەش لە دوورەوە دەتگوت پنچکێکە و وەسەر ئاوەکە کەوتووە.

مەمی دیك لە ناکاو چاوی هەڵێنا و بە سەر سووڕمانەوە، وڕ و کاس سەیری دەوروبەری خۆی کرد و ئەوجار بە ترسەوە وەك فیشەك لە جێی خۆی دەرپەڕی و ویستی را بکا و خۆی نەجات بدا. گوندی دەوریان گرتبوو و چاویان تێ بڕیبوو. زانیی ڕێگەی راکردنی نییە. بە سەر سووڕمانەوە سەیری کردن و بزەیەکی هاتێ و بەرەو بەرمیلە ئاوەکەی سەر عارەبانەکە چوو و ئاوێکی بە دەستو چاویدا کرد. دەسرۆکە چڵکنەکەی دەرهێنا و دەموچاوی وشك کردەوە. دەسرۆکەکەی خاو بوو و دەموچاوی جوان وشك نەبۆوە.

چیی لۆکە بوو بە گۆڕێ وەرببوو. ئەو تاك لۆ قۆزاخانەش کە بە سەر چڵەکانەوە مابوونەوە لە قوڕێ هەڵکێشرابوون. ئیتر لەمەودوا لۆکەڕنینەوە لە چوکووراوا گیانکێشان بوو. دەبوو لۆکە قوڕاوییەکە هەڵگرنەوە و خاوێنی بکەنەوە و لە قەرتاڵەی بکەن و دوای ئەو هەمووە کوێرەوەرییەش بۆ هەر کێلۆیەکی نیوەی پارەی جارانیان پێ دەردا. هەوڵێکی هیواکوژ بوو. ئەمڕ و سبەینێش بۆ لۆکە ڕنینەوە نەدەبوو، چونکە دوو ڕۆژی دەخایاند تا قوڕەکەی وشك بێتەوە. تاوەکە، با تاوی چوکووراواش بێ، دوای وەها بارانێك، دوو ڕۆژی هەر دەبرد تا ئەو قوڕە وشك بکاتەوە.

مەمی دیك جوان تێ گەیبوو و خەریك بوو کەیفی دەهاتێ. گوندییەکان شەوێ تا بەیانی بە ژوور سەرییەوە ببوون و چاوێکیان کردبووە چوار چاو و چاوەڕێی ببوون. چ لەوە باشتر. هەقی خۆی بوو سێ چوار ڕۆژ هەر ئاوا لە چاوەڕوانیدا رایانگرێ، بەڵام حەیفێ کە خۆی تاقەتی نەبوو. خۆزگە تاقەتی بوایە. ئای کە باش دەبوو، ئای، کوڕە ئەوەندەش هەر باشە.

لە سەر حەسیرێك چوارمەشقی لێی دانیشت. کەوچکەکەی لەو ترخێنەیە وەردا کە دایکی بۆی لێ نابوو و هەڵمی لێ هەڵدەستا. بەبێ ئەوەی خەڵکەکە بە هەند وەربگرێ، لە سەرەخۆ خواردی و تەواوی کرد. وەك کەسێکی نازانێ چ بکا، خەڵکەکە سەیری ئەویان دەکرد و ئەویش سەیری خەڵکەکە.

ئاشقەکەچەڵە لە خەڵکەکە جوێ بۆوە و سێ هەنگاو لە مەمی دیك هاتە پێشێ. مەمی دیك سەری هەڵێنا و چاوی بەو هەڵۆیە کەوت کە باڵەکانی بە ئاسمانەوە دەبریسکانەوە. ئەی لەو هەڵۆ گەورە و بە هەیبەتەی. ڕەنگی بە ڕوخسارییەوە نەما.

ئاشقەکەچەڵە:

ـ کاکی راوچی. دەی بڵێ بزانین چیت دیوە؟ ئەو خەڵکە لە دوێ شەوێوە چاوەڕێی تۆیە و چاویان لە دەمی تۆیە و ئەتۆش بێ خەم و خەیاڵ لێی نووستووی و مێشێکیشت لێ میوان نییە. دەی بڵێ چیت دی؟...

مەمی دیك چاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا. کوێخا سەفەر دوورتر راوەستابوو و چاوەڕێ بوو قسە بکا. لە داخان ددانی لەچیڕەوە بردبوو. مەمی دیك کە دیتی نێوچاوانی گرژە، زانیی. هەر لە داخی سەفەر، وەقسە هات. زۆری پێ خۆش بوو ئاوا دەست پێ بکا: "ئەی کوێخا سەفەری هیچ و پووچ و خوێڕی." گوتی:

ـ سەروەری خۆمانم دی.

قوڕگی خاوێن کردەوە. تفێکی گەورەی فڕێ دایە سەر قوڕە تەمگرتووەکە، کە هەڵمی لێ هەڵدەستا و لە سەر قسەکەی رۆیشت:

ـ لە هەر دوو چاوان کۆرە بم ئەگەر درۆیان بکەم. بەو چاوانەی خۆم، تاشباش ئۆغڵوی مەزنمان، وەلیی وەلییەکان و پادشای پادشاکانم دی.

که دەیگوت: "پادشای پادشاکان" نیگاکانی وەك بزمار لە چاوی سەفەر هەڵدەچەقین:

ـ وەڕێ کەوتم بەرەو دەریای سپی. ئەوە باران وەك گۆزەی سەروبن دێتە خوارێ و ئەمنیش هەر دەڕۆم. بۆخۆشم نازانم لاقەکانم بەرەو کوێ راکێشم دەکەن. بەبێ راوەستان، بەبێ ئەوەی ماندوو بم، بە خێرایی، وەك ئەوەی هەڵفڕم، پێم عەرزی ناگرێ و بە دەم جەیحاندا دەچمە خوارێ. باران دەبارێ. جەیحان هەستاوە و رەنگەکەی سوور بووە. شەو داهات. لە نەکاو گرمەیەکم گوێ لێ بوو کە زەوی و ئاسمانی لەرزاندەوە. سەیرم کرد و بە بەرانبەرمەوە، شەپۆلەکانی دەریای سپیی دی هێندەی منارەیەك بەرز. شەپۆلەکان خۆی لە کەنارەکان دەکوتن. بایەکی سوێر لە دەریاوە هەڵیکردووە و پەیتا پەیتا دێن. هەر شەپۆلێکی سەر لە کەنارەکە دەکوتێ، دڵێ بوومەلەرزەیە. رێك بوومەلەرزە. باران خۆشی دەکاتەوە. لە ناکاو گژە بایەکەش کەوت. شەپۆلەکانی دەریای سپییش دامرکانەوە. دەریا روون و بەرین هێور بۆوە. لە ناکاو دنیا ئاوای لێ هات. سەیرم کرد و دیتم لە بەرانبەرمەوە، لە نێوەڕاستی دەریاکەوە نوورەکان بەرەو من دێن. بژاردمن. چل تۆپەڵە نوور بوون و هەر کام هێندەی سپیندارێك. بە سەر دەریای سپیدا دەخوشین و دەهاتن. سەیری ئاسمانم کرد. لە ئاسمان هەڵلایەك بوو هەر مەپرسن." هەزار، دوو هەزار، دەهەزار پاڵندە. هەرچی دەتبژارد تەواو نەدەبوو. لەگەڵ نوورەکە

دەهاتن. دیسان سەیرم کرد، دیسان ژمارەیەکی لە بێ ئەژمار بوونەوەری سەر دنیایێ: گورگ و ئاسک و بزنە کێوی و چەقەڵ و ئەسپ و وشتر و چیی جڕ و جانەوەر و دەعای کێوی... دنیا بە هەموو بوونەوەرەکانییەوە کۆ ببووەوە و هاتبووە تەنیشت چل تۆپەڵە نوورەکە. نوورەکان بە بەرزایی سپینداریێك بە سەر دەریای سپیدا دەخوشین و دەهاتن. نوورەکان نزیك بوونەوە و لە کەناری دەریاکە بە ریز وێستان. دنیا وەك رۆژ رووناك بۆوە. دەتگوت چل خۆر پێکەوە هەڵاتوون. ئاسمان دەنگێکی لێوە هات و شەق بوو. دەریاش لێك بۆوە. تیرێژێکی باریك زەوی و ئاسمانی دوولەت کرد. ئەمن خۆم بە عەرزەوە مەلاس دابوو. سەیرم کرد و دیتم ئەوە چل تۆپەڵە نوورەکەش وەعەرزی کەوتوون. باڵندەکان و هەموو بوونەوەرەکانیش کڕنۆشیان بردووە. هیچ کەس و هیچ شتێك بچووکترین دەنگی لێوە نەدەهات. لە ناکاو دیتم، لەو شوێنەوە وا زەوی و ئاسمان درزی دابوو، تاشباشی مەزنمان بە ریشێکی سپیی درێژەوە و بە جلوبەرگێك لە تیشکی کەسك، دەرکەوت. دەستی بە سەری مندا هێنا. وەك نوور پێدەکەنی. پێی گوتم:"هەستە مەمی دیك." دەستی گرتم و هەڵیستاندمەوە. چل تۆپەڵە نوورەکەش کە هێندەی سپیدارێك بەرز بوون و لە سەر زەوییەکە درێژ ببوون، هەستانە پێ. باڵندەکان فڕین و جانەوەرەکانی دیکەش هەستان:"بچۆ بە گوندییەکانم بڵێ مەمی دیك، ئەمن بەرەکەتی ئیبراهیمی خەلیلیان بۆ دەنێرم. ئیتر هەژار و نەدار نابن. پێ بنێمە هەر کوێیەك، کەس هاوڕەگەزی خۆی ناکوژێ... مرۆڤ... ئەمن ئەو دنیایەیان بۆ دەکەمە بەهەشت. برۆ بە گوندییەکانم بڵێ رۆژێك لە رۆژان دێمەوە و پاش هاتنەوەم، بنیادەم ئیتر رووی هەژاری نابینێتەوە...." لە پڕێکا دیم تاشباشی سەروەرمان منی هێناوەتەوە نێوەڕاستی چوکووراوا و بەجێی هێشتووم و دەڕوات. دەستم درێژ کرد، نەیگەیشتێ. گوتی:"چاوەڕێم بن، رۆژێك دێمەوە لاتان مەمی دیك." و رۆیشت. دیتم کە چل تۆپەڵە نوورەکە گەیشتوونەتە داوێنی چیای گاوران. لە پێش هەموانەوە تاشباشی مەزنمان، سێ هێندە، پێند هێندە، سەد هێندە و پتریش دەدرەوشایەوە.

لە داوێنی چیای گاورانەوە، چل ئەستێرە دەدرەوشانەوە. بەو چاوانەی خۆم دیتم... گوتی:"چاوەڕێم بن. رۆژێك لە رۆژان دێمەوە."

ئاشقەکەچەڵ بە ئیمان و باوەڕەوە گوتی:

- دێتەوە. رۆژێك دێتەوە... دەرمانی دەرد و ئازار و هەتوانی برینەکانمان دێتەوە... ئای ی ی... وەلیی وەلییەکان... پادشای پادشاکان... تاشباشە مەزنەکەمان.

ئەو خەڵکەی باران بێهیواو شەکەت و شێواوی کردبوو، نۆخژنێکیان لە دڵی گەڕا.

ئۆککەش داغ قۆردوو بۆڵاندی:
- پەرجۆ لە گۆڕێ نییە. تاشباش ئۆغڵوش یەکێکە وەك خۆمان. وەلی نییە. بەڵام ئەو برایەمان، مەمی دیك جوان قسە دەکا. هەقایەتی خۆشیش دەهۆنێتەوە. تاشباش ئۆغڵو مەحاڵە وەلی بێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە منیش چاوەڕێیم.
کەس گوێی لە قسەکەی ئۆککەش داغ قۆردوو نەبوو. ئەوانەی بیستیشیان بە سەرسووڕمانەوە سەیریان کرد و لە خۆیان پرسی، ئەرێ ئەو کابرایە دەڵێ چی؟
گۆملکسیز ئۆغڵو بە خۆ هەڵکێشان و بە ئیمانێکی پتەوەوە هەڵی دایە:
- ئەمگوت تاشباشی مەزنمان لە بەر ئەو بارانەیە و لە هرووژمی تەپۆ و مێشوولانەدا بەجێمان ناهێڵێ؟ ئەو وەلیی رۆژانی تەنگانەیە. لە گوندەکەی ئێمە لە دایك بووە و هەر لەوێش بووەتە وەلی و هەر لەوێشەوە چووەتە گەڵ چل پیاوچاکەکەوە. تاشباش دێتەوە. جارێکی دیکەش بەرەو چوکووراوا دادەگەڕێینەوە و لۆکەکان سێ هێندەی ئێستا بەپیت و بەرەکەت دەبنەوە. ناوچەی چوکووراوا ئیتر تەپۆی نامێنێ. تاشباشی مەزنمان کاتێ دەبینێ ئێمە چ زەجرێك دەکێشین بە دەست تەپۆوە، تەپۆ ناهێڵێ و لەناویان دەبا.
کە خەڵکەکە کۆزیلکەیان بەست و پۆل پۆل بوون، دیسان چوونەوە سەر باسی تاشباش. مەمی دیك وەك فەرماندەیەکی سەرکەوتوو، بە هەنگاوی پتەوەوە بە رێیەدا دەڕۆیشت. لە نێو حەشیمەتەکە هاتە دەرێ و رێك بەرەو ئەو کەپرە چوو کە عەلی لێی خەوتبوو. عەلی، کەوتبوو و بەتانییەکی قوڕاوییان پێدا دابوو. دەستەکانی لە سەر بەتانییەکەوە زەرد زەرد بوون وەك کارەبا. چاوێکیان بە دەسرۆکەیەك بەستبوو، چاوەکەی دیکەیان نەبەستبوو، بەڵام ئەستوور ببوو. چاوە ئەستوور بووەکەی بە زەحمەت هەڵێنا و سەیری مەمی دیکی کرد:
مەمی دیك گوتی:
- خوا بەخێری بگێڕێ کاکە عەلی. دیار بوو ئەو دڕندانە ئاخرییەکەی ئاوات لێ دەکەن. دەستەکانی ئەتۆ شێتی دەکردن. چما ئەو گوندییانە نازانن کە ئەتۆ مەحاڵە دایکی خۆت بکوژی؟ چما نازانن هەموو کەس، تەنانەت تاشباشی مەزنیشمان لەوانەیە دایکی خۆی بکوژێ، بەڵام ئەتۆ کاری وا ناکەی؟ ئەوان تاقەتی ئەوەیان نەبوو سەیری خێرایی دەستەکانی تۆ بکەن. ئەوە بۆیە ئاوایان لێ کردی.
ئەوجار لە تەنیشت عەلییەوە دانیشت و بە وردی بۆی گێڕایەوە کە تاشباشی چۆن دیوە. هەزرا هێندە بە ئاو و تامتر لەوەی لە دەرەوە بۆ خەڵکەکەی گێڕابۆوە.

لەو جەنگەیەدا، گوندی لە دەوری کەپرەکە کۆ ببوونەوە. ژنەکان لە سەر عەرزەکە دانیشتبوون و پیاوەکان بە پێوە بوون. کە مەمی دیك هاتە دەرێ، زەڵەجە پرسیی
- عەلی چۆنە؟
مەمی دیك گوتی:
- هیچ باش نییە.
زەڵەجە:
- ئەمن ئاوام بەسەر هێنا. ئەمن بەو دەستە گۆج و نقوستانانەم ئێسك و پرووسکیم هاڕی.
ئیتر خۆی بە کەپرەکەدا کرد.
- خوا نەکا، براکەم کاکە عەلی، گوندیی لە گیانی خۆیان وەڕەز ببوون، رقەکەی خۆیان بەتۆ هەڵڕشت. بیانبووره.
سێویێکی چرچ بەڵام بۆنخۆشی لە ژوور سەری دانا. عەلی بە دەنگێکی کزەڵۆکەوە کە بەحاڵ دەبیسترا گوتی:
- بیێ وەی بی خوشکەکەم. بزەیەکی هاتێ.
بە دوای ئەودا، ئەوانەی بە قەستی کوشتنێ لێیان دابوو، یەك یەك و دوو دوو وەژوور کەوتن و لە ژوور سەری دانیشتن و گوتیان:"خوا نەکا، کارێکە و کراوە، لێمان مەگرە ...."
هەر کەسە و دیارییەکی بچووکی بۆ عەلی دێنا و دەستە زەردهەڵگەڕاوەکانی ئەوی دەگرت و چاوێکی لە چاوەکانی دەکرد و دەیگوت: "خودا شیفات بدا، لێمان مەگرە." و داوای لێبوردنی دەکرد.
ئێستا عەلی دڵی خۆش بوو. نەیدەزانی گوندی بۆچی وا گۆڕاون. چیی دەیهێنا و دەیبرد بۆی نەدەچۆوە سەر یەك و نەیدەزانی بۆ؟ بەخۆی دەگوت: لەوانەیە بیانەوێ دوای ئەوە بێن و بمکوژن، بۆیە ئاوا دەکەن. دەترسا.
مام خەلیل هاتە کەپرەکەی و بە دەنگێکی بەرز گوتی:
- هەی دایك و خوشکتان بگێم. لە دەنکە هەرزن بچووکترتان بگێم و ئەوی لە چیای تۆرووی گەورەتریشتان بگێم... ئەو شیرە بگێم کە خواردووتان... هەر دێهاتیی بێناموس. بە قەستی کوشتن لە کابرا دەدەن، پشتی لە زگی نەرمتر دەکەن، نقوستانی دەکەن، دوایش دێن و لێی دەپرسن و دڵخۆشیی دەدەنەوە؟ کوڕم، عەلی، ئەمن دەڕۆم و چەند رۆژێکی دیکە دەگەڕێمەوە. ئەگەر نەگەڕامەوە، بزانە دیدار ئاخر بووم. ئەو کاتە گەردنم ئازا بکە. نە ماڵاوایی لەو گوندییە

چەپەڵانە دەکەم و نە گەردن ئازاییان لێ دەخوازم. چاویان دەرێ با گەردنم هەر ئازا نەکەن. ئەمنیش ئازادیان ناکەم. بێ وەی بی... خودا شیفات بدا. ئیشەڵڵا چاك دەبیتەوە. هەستا و لە کەپرەکە چووە دەرێ. بە خێرایی لە مەزراکە چووە دەرێ و چووە سەر ڕێگەکەی دەم جەیحان. پێخاوس بوو و پێڵاوەکانی بە دەستییەوە بوون. کە ڕۆیبوو، چ بە تووڕەیی و چ بە خۆمانە. سەیری چاوی هیچ کام لە گوندییەکانی نەکردبوو.

هەڵۆ قورس و داهێزراوەکە وردە وردە و نەرم نەرم بە ئاسمانەکەوە دەسووڕایەوە و سێبەرە ڕەش و زەلەکەی دەکەوتە سەر زەوییە هەڵماوییەکە.

ماوەیـەك ئەحـە شـێت دێ و وەك برووسـكەیەك بـە گوندەكەدا تێدەپـەڕێ و بـەرەو چیاكان دەكشێ. هـەموو جـارێ مرێمـۆك بـانگی دەكـا و لـە بـەری دەپاڕێتـەوە كـە ڕاوەستێ و بێتە لای نەنە مرێمۆكی خۆی. نەنـە مرێمـۆكی كـارێكی پێیـەتی... ئەحـە شـێت گـوێی نـاداتێ، هــەر ئـاوڕێكیش ناداتــەوە. بـە شمەكـە دڕاوەكانییـەوە بـە دەشتەكەدا دەسووڕێتەوە.

## ٢٨

ڕۆژێكی جوان بوو. پەڵە هەورێكیش چییە بە ئاسمانەوە نەبوو. ئاسمانەكە سـاو و سـامـاڵ بـوو. بایەكی گەرم و نەرم لە دەشتەكەوە هەڵی كردبوو. كەڵەبابەكە لە گۆشەی كادێنەكەی "عەلی چـل درۆ" بەبێ جووڵە ڕاوەستابوو و كلكە درێژ و شـۆڕ و ڕەنگـا و ڕەنگەكـەی دەبریـسكایەوە. سـەری قیت ڕاگرتبوو و سەیری هیچ كوێی نـەدەكرد. مرێمـۆك لـە پـشت كۆخەكـەوە، بەسـپایی و بـەبێ دەنگ دەهاتە پێشێ و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"ئەوجار دەتگرم كەڵەشێرە خاڵخاڵەكە، هەر بتگرم سـەرت هەڵدەقەنم. ئەو تووكە جوانانەت دادەڕنم و وەك هەنار سوورت دەكەمـەوە... دوو ڕۆژان لـە سەر یەك دەتخۆم و تێر تێر دەبم، كەڵەشـێرە خاڵخاڵەكـە، ئـەتۆ هـەر یـەك چـركە لـە جێـی خـۆت مەبزوو." و وردە وردە لێی دەچووە پێشێ. چیی پتر دەچووە پێشێ، كەڵەشێرەكە هەر گوێشی پێ نەدەبزووت و نەدەجووڵا. مرێمۆك لە گۆشەی خانووەكە وەرسووڕایەوە. نێوانیان سێ هەنگاو دەبوو و نەدەبوو. مرێمۆك بەسپایی هەنگاوێكی دیكەشـی نـا. كەڵەشـێرەكە ئەوەشـی نـەدی. مرێمـۆك بەخۆی گوت:"وەیش، ئەو داماوە لە گیانی خۆی وەڕەز بووە، لەوەیكە هەموو ڕۆژێ ڕاوی دەنـێن، ئیتر وەڕەز بووە و دەیەوێ خۆی بە دەستەوە بدات و گیان بدات."

هـەنگاوێكی دیكەشـی نـا و پـەلاماری دا. هــەر دەستیــشی وێـی نەكـەوت. كەڵەشـێرەكە دەمودەست دەرەپەڕی و مرێمۆك چۆنی خۆی بۆ هاویشتبوو، ئاوا وەعـەرزی كەوت. كەڵەشێرەكە

ڕۆیشت و تۆزێك لەو لاترەوە، لە گۆشەی ماڵەکەی "بایرام" ڕاوەستا. دیسان نەدەبزووت و وەك بەردێکی بێجوولە ڕاوەستابوو.

"فێڵ لە من دەکەی؟ گاڵتە بە من دەکەی؟ کەڵە شێرە پیسەی گوندیسە چەپەڵەکە؟ پێت دەڵێم. وەختێك کە لە سەر ئاگرێکی خۆش خۆش، بەزەکانت چزەیان لێ هەڵدەستێ و دووکەڵیان لێ بەرز دەبێتەوە، جا دەزانی قەشمەری کردن بە من یانی چی. پێت وایە ئیتر ناتگرم؟ باشە گەمەم پێ بکە، با بزانی چۆن گاڵتەت پێ دەکەمەوە."

لەوانەبوو ئەوجارە کەڵەبابەکە نەیبینێ. دوای ئەوەی دوو هەنگاوی لێ چووە پێشێ، ئەوجارەیان زۆر خێرا خۆی پێدادا. کەڵەبابی تووك لێکراو، دەتگوت لە شوان خەڵەتێنەوە فێر بووە.

"کەڵەشێری گڵاو، جارێ ڕاوەستە، ڕاوەستە با پێت بڵێم."

دیسان بەسپایی، پشووی لە سینگیدا ڕاگرتبوو و لە کەڵەبابەکە چووە پێشێ. کە لە گۆشەی ماڵەکەی بایرامەوە سووڕایەوە، لە ناکاو کەڵەبابەکەی دی و دەمودەست خۆی بەسەردا دا. وەعەرزەکە کەوت و کەڵەشێرەکە دەرپەڕی. مرێمۆك چۆنی بە توندی وەعەرزەکە کەوتبوو، هەر وا بێجوولە مایەوە. لە کەوتنی ئەمجارەیدا باسکی وەبن خۆی کەوت و ئانیشکی وەبەردێك کەوت و زۆر ئازاری پێ گەیی. مرێمۆك چەندی تینی تێدابوو هاواری کرد. تووك و هاوارەکانی هەموو گوند و دەشت و شیو و دۆڵەکانی داگرت.

بە تووڕەییەوە هەستایەوە. بەردێکی گەورەی هەڵگرت و بە کەڵەبابەکەی دادا کە بەرانبەری ڕاوەستابوو. بەردەکە ئەوەندە گەورە بوو هەر نەیگەیشتێ. بەردێکی دیکە و دیسانیش بەردێکی دیکە.. بەردەکان لەولا و لای کەڵەبابە وەعەرزی دەکەوتن. مرێمۆك لە داخان شێت ببوو. پەلاماری کەڵەبابەکەی دەدا و جنێوی دەدا و کەڵەبابەکەش لە جێی خۆی نەدەبزووت. هەتا بەردێك لە تەنیشتی وەعەرزی نەکەوتبوو، هەر وا نەبزووت. ئەوجار جوولەیەکی کرد و بەسپایی و لەسەرەخۆ دوور کەوتەوە و لەولاترەوە چووە سەر کۆتەرە دارێك و ڕاوەستا. مرێمۆك بە غاردان بۆی چوو. بەردی هەڵدەگرت و تێی دەگرت و غاری دەدا. کەڵەشێرەکە دەرپەڕی و ئەویش وەشوێنی کەوت. کەڵەشێرەکە ڕایدەکرد و ئەویش بە شوێنیدا. هەتا پشووی لێ بڕا و وەعەرزی کەوت، هەم کەڵەشێرەکەی ڕاو دەنا و هەمیش بەردی تێدەگرت.

لە بەردەم ماڵەکەی ئۆککەش داغ قۆردوو شەلاڵی ئارەقە وەعەرزی کەوتبوو و تۆزاوی و خۆڵاوی ببوو و پشووی دەرنەدەهات. ماوەیەکی زۆر وەخۆ نەهاتەوە. لەوێ لە بەر تاوەکە کەوت و جوولەی نەکرد. کەڵەشێرەکەش بڕێك لەولاترەوە ڕاوەستابوو و دەتگوت سەیری دەکا.

چەند هەنگاوێك دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە و سەیری مریشۆکی دەکرد کە لە سەر عەرزەکە کەوتبوو. مریشۆك بەوەی شێت دەبوو.

"ئاوای ئاخۆی، هەی کەڵەبابی گلاو، بەو دندووکە ناشیرنەتەوە. ئەو تاشباش ئۆغلوەش، خودا بیباتەوە. تووتکە سەگی چڵمن، بووەتە وەلی، ئیتر سەرێك لێرە هەڵناهێنێتەوە. ئاخر رۆڵە تاشباش ئێستا کە بوویەتە وەلی، دەی وەرە بزانە ئەو کەڵەبابە گلاوە چ دەردێکم دەداتێ. ئێستا کە لێم بوویەتە وەلی، دەبێ ئاگات لە حاڵی من بێ. لە چیای چل سوارە بێیتە خوارێ و ئەو کەڵەشێرەم بۆ بگری کە قەلسەم لێ دەگێڕێ و کەڵەگاییم لێ دەکا. باشە رۆڵە بۆ نایەی، وەلییە سەگبابەکە بۆ نایەی. بە خوای ئەگەر بێی و ئەو کەڵەبابەم بۆ بگری، ئاگرێکی خۆشت بۆ دەکەمەوە، ئاگرێکی پڕ بە ئاگردانەکە. کەڵەشێرە خاڵخاڵەکەشت وەك دەنکی هەنار بۆ سوور دەکەمەوە. تاشباشەکەی خۆم وەك دەنکی هەنا. وەڵڵا، بیللا، بە سەری تۆ کە وەلیی هەموو وەلییەکانی، بە سەری تۆ دەمی لێ نادەم، زەوادم لێی ناشکێ ئەگەر بێی. هەر هەموو ئەو کەڵەبابە دەرخواردی خۆت دەدەم. راستە بوویەتە وەلی، راستە هاودەم و ئاواڵی چل سوارەی غەیبیی، بەڵام ئەتۆ بنیادەمێکی نەرم و نیانی. داتدەپلۆسن و پاروەکەت لە زاری دەردێنن. لەوێ لەو چیاوچۆڵە برسی و بێ کەس کەوتوویەتەوە. وەرە، تاشباشەکە خۆم وەرە. وەرە وەلییەکەی خۆم، وەرە با تێر تێرت بکەم. وەرە و بزانە مریشۆك چیها شتی هەیە بۆتی بگێڕێتەوە. یانی لە نێو ئەو چل بزووت و بڵێسە ئاگرەی نەمردوون و ناشیانەوێ هیچ کات بمرن، وەڕەز نەبووی؟ خوا دەزانێ ئەو چل برادەرەی تۆ لەوەی کە نەمردوون و نامرن، چەندە بەخۆیان دەنازن. ئاخۆ ئەتۆش لەخۆ بایی بووی؟ دیارە ئەتۆش بەفیز بووی بۆیە ئاگەڕێیتەوە ئەحواڵێکی ئەو نەنە مریشۆکەت بپرسی. بنیادەم کە بوو بە وەلی، تاشباش بوونەکەی خۆی وەلاوە دەنێ؟ بنیادەمبوونی لەبیر دەچێتەوە؟

بەڵام لە نەکاو، بەزەیی بە تاشباشدا هاتەوە. تاشباشی هێنایەوە پێش چاوی خۆی کە لە پێش ژەندەرمەکانەوە بە دەستی بەستراو و کەلەپچەکراو (هەر بە راستی کەلەپچەیان لە مەچەکی دابوو؟) سەری بەردابۆوە و رەنگی بە روویەوە نەمابوو. زەرد زەرد هەڵگەڕابوو. لەوانە دەچوو کە بەرەو سێدارەیان دەبەن. هیچ لە وەلییان نەدەچوو. وەك منداڵێکی کەتنێکی کردبێ، ئاوا لیچی هەڵقرچاندبوو. تەنیا کاتێ بەرەو لای سەفەر گەڕایەوە و ئەمری کرد بە گوندییەکان کە:"ئەو پیاوە مەکوژن، موویەکیشی لە سەری کەم مەکەنەوە، هەر لێی گەڕێن و تا دەمرێ مەیدوێنن." لەو دەمەدا شان و شکۆیەکی هەبوو و قەڵافەتی گەورەتر بۆوە و ئەو کاتە بوو کە

هەر بە راستی لە وەلییەکان دەچوو. ئیتر ژەندەرمەکان وەپێش خۆیانیان دا و بردیان. گوندییەکان بە دوایدا گریان و لە خۆیان دا، ئیتر کەس بە سەر و شوێنی نەزانییەوە. هێندێ گوتیان رەق هەڵاتووە و لە سەرمان مردووە. هێندێکیش دەڵێن چووەتە لای چل پیاوچاکەکە و لە چیاکەی ئەوان رایدەبوێرێ.

"سەراپای کەسکی پۆشیوە و بووەتە سەرۆکی وەلییەکان. ردێنێکی سپیی هەیە تاشباش هەر مەپرسە. وەك تاڤگە لە سەرەوە بەرەو خوار گەیشتووەتە سەر ئەژنۆی. پێی لە هەر جێیەك دادەنێ، شینکەی لێ دەڕوێ. و سەیری هەر جێیەك دەکا، گوڵی درشتی "شەفەق"ی لێ دەپشکوێ. دیارە گوڵی "شەفەق" تایبەتیی وەلییەکانە. هاوین و زستان پەڵە هەورێکی سپی بە سەر سەرییەوەیە و بچێتە هەر شوێنێك ئەو هەورەی لەگەڵە و ناهێڵێ نە تاو لێی بدات و نە بارانیش."

ئەگەر ئێستا، تاشباش بەو حەوت قولانج ردێنە چەرمووە و بەو هەورەی سەر سەری و بەو جلوبەرگە کەسکانەیەوە بێ و لە پێش مرێمۆك راوەستێ، مرێمۆك لە بەر پێکەنینان دەمرێ. تۆ خودا تاشباشێکی ئاوای لێ هاتبێ، بۆ پێکەنین نابێ؟ خۆی تاشباشیش ئەگەر خۆی ئاوا ببینێتەوە، لە بەر پێکەنینێ ژانە زگ دەگرێ. ئەگەر هاتبایە و بەرانبەری یەکتری راوەستابایەن، لە ناخی دڵیانەوە قاقایان دەکێشا. کەس لە گوندیدا نەبوو کە ببینێ و وەلییایەتییەکەی تاشباش خەشی تێکەوێ.

"وەرە تاشباش کوڕی خۆم، وەرە وەلییە بێ دەسەڵاتەکەم."

"حەوت تۆپەڵە نوور بە دواتەوەن. حەوت تۆپەڵە نووری هێندەی منارەیەك. ئەو شەوانە بچێتە هەر کوێ، نوورەکانیشی وەك سەگی پەتکراو، بە شوێنییەوەن... ئەدی..."

باسکی زۆر دێشا. بە زەحمەت لە جێی خۆی هەستا. بە خۆی گوت، بێت و شکابێ، هەڵی دەبەستمەوە و مەڵحەمێکی باشیشی بۆ دروست دەکەم. ئەگەر نەشکابێ، خۆی چاك دەبێتەوە. ژانەکەی کەمتر بۆتەوە.

بەرەو ئەو رێگەیەی رۆیشت کە لە چوکووراوەوە دەهات. بڕیاری دابوو لەوێ خۆی مات بکا و هەر کات ئەحە شێت بەوێدا هات، خۆی پێدابدا و بیگرێ. ئەو شوێنەی خۆی تێدا ماتدابوو، رێچکەیەکی قووڵ و تەنگەبەر بوو. ئەحە شێت چ لە سەرەوە هاتبایە و چ لە خوارەوە هاتبا، هەر ناچار بوو بەوێدا بڕوات.

لە دەم قووڵکاییەکەی رێگەکەوە، دارچنارێکی لێ بوو ناوەکە هولّوڵ ببوو. بەرماوەی پیرەچنارێکی کۆن. چنارەکە نەمابوو و تەنیا بەشێك لە کۆتەرە نێو بەتاڵەکە لەوێ مابۆوە.

هەموو بەهاران لەو بنەدارە غەلفێکی نوێ شین دەبۆوە و زستانان وشك دەبۆوە. هەموو بەهاران چلێکی کەسك.... مریمۆك چۆوە ماڵێ. بابۆڵە پەنیرێکی هەڵگرت و بە دەم ڕێگەوە بە چێژ و حەزەوە خواردی تا گەیشتە بن دارەکە. ئاوێکیشی بە سەر بابۆڵەکەیدا کرد. ئەوجار چووە نێو کەلێنی دارەکەوە و لەوێدا دانیشت:"ئیتر ئەمجارە لە چنگم قوتار نابی، هەی زاوای سەر ماڵێی پادشای پەرییەکان. ئەگەر پیاوی ئەمجارەیان خۆت لە دەستم ڕاپسکێنە."

پاڵی وە کۆتەرە چنارەکە دا. نێو کەلێنی دارەکە، بۆنێکی تیژی داری تەڕ و ڕزیوی لێ دەهات. بڕێکی پێچوو و لەگەڵ بۆنەکە ڕاهات و پێی خۆش بوو.

"شێتە دەگرم. دەبێ هەر بیگرم."

هێنایە پێش چاوی خۆی کە چۆناوچۆن ئەحە شێتەی ڕازیی کردووە و دەچێتە کۆشکی پەرییان و چۆن لەگەڵ کچی پادشا و ژنەکەی چەحە شێت کە نوورانین، ئاشنا دەبێ و چۆن منداڵەکانیان بۆ دەحاوێنێتەوە.

ڕۆژێکیش لەگەڵ پادشای پەرییەکان ئاشنا دەبوو. پادشا دەیزانی کە بنیادەمێك هاتووەتە وڵاتی پەرییان و ئەو بنیادەمەش دایکی ئەحە شێتە. دیارە دایکی خۆی نییە، بەڵام چونکە شێرە ژنێکە، هەر هەموو خەڵکی گوندەکانی تۆرووس و سەرانسەری چوکووراوا پێی دەڵێن دایە. پادشا بە ئەحە دەڵێ:"ئەحە، منیش ناو و ناوبانگی مریمۆکم بیستۆتەوە." جا پادشاش بە مریمۆك دەڵێ دایە. ئەدی، ئەویش پێی دەڵێ دایە. دەڵێ:"جسناتی بنیادەم بۆ هیچ نابن. ئەوان پێکەوە بەشەڕ دێن و یەکتری دەکوژن. چاوی یەکتری دەردێنن و یەکتری بەدیل دەگرن و کۆیلەی دەکەن و یەکتری هەژار و برسی دەکەن. ترسنۆکن، بۆیە ئەوەندەیان کەیف بە پیاوی ئازا و ڕەشید و بەجەرگ دێژ ئەدی، وەچەی بنیادەم، تووڕێك نازین، بەڵام بنیادەمی شەریف و مەزنی وەك نەنە مریمۆکیشیان تێدا هەڵدەکەوێ. ئەحە، ئەو مریمۆکە بێنە لای خۆم، با ئێمەش بزانین چ دایکێکە؟ ئەگەر پێی خۆش بێ، ئەوا لە تەنیشت کۆشکەکەی خۆمان، با کۆشکێکیش بەو بدەین. ڕێزی بگرین. هەر دوو دەستە موبارەکەکەی ماچ بکەین."

ئاخری تووشی پادشای پەرییان بوو. پادشا نوورانی بوو. لە هەموو ڕوویەکەوە لە بنیادەم دەچوو. پیاوێکی کەڵەگەت و لە بەر دڵان. دەموچاوی وەك ڕوخساری برایمۆکی مێردی، جوان و نەرم و نیانە. پادشای پەرییەکان، هەر ئەوەندەیە لووتی ئێسقانی نییە. ئەویش زۆر دیار نیچە. ئەگەر پیاو زۆری لێ ورد نەبێتەوە نازانێ. پادشای پەرییەکان لە تەنیشت خۆیەوە دایدەنێ. قەرەوێڵە زێڕینەکەی، دەستی دەگرێ و ماچی دەکا. دەڵێ:"ئەتۆ جێی سەربەرزی و شانازیی

تۆرەمەی بنیادەمی. ئەتۆ لە بەرانبەر خراپەدا رادەپەڕی. بۆیە ئەمن لە نێو بنیادەماندا تەنیا ڕێز لە تۆ دەگرم دایە." تاوێك دواتر، سفرەیەك رادەخەن کە بەشی سەد میوانە. سوێسکە و قاز و مراویی سووروەوەکراو کە هەڵمیان لێ هەڵدەستێ، دێنن. دۆڵمەی تەماتە... و هەڵواشەکەری... سەر سفرەکە پڕە لە هەڵوا. نانەکان وەك بەفر سپیین. نانی شاری. شیری مریشك نەبێ، هەرچیت بوێ، لێیەتی. بە تایبەتی نان و هەڵوا...

مرێمۆك ئەوەندەی حەز چووە هەڵوا، ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا. پادشا ئەموستیلەکەی لستەوە و لە چاوترووکانێکا لە سەر سفرەکە نەدیو بوو. قولە ڕەشێك دەرکەوت کە لێوی سەرەوەی ئاسمان و لێوی خوارەوەی زەویی دەماڵی و گسکی دەدا. پادشای پەرییان ئەمری بە قولە ڕەشەکە کرد...

لە نەکاو ئەحە شێت لە ڕێگەکەی خوارەوە دەرکەوت. سەر و ردێنی ئاڵۆز بوو. دەشەلی. وردە وردە هاتە پێشێ و لە سەر بەردێکی دەم کانییەکە دانیشت. مرێمۆك دڵی داخورپا. پانتۆڵەکەی ئەحە شێت لە ئەژنۆی بۆ خوارەوە دڕابوو و تیتۆڵ تیتۆڵ ببوو. لاقەکانی رووشاو و چڵکن بوون. کراسەکەی ئەوەندە کۆن و دڕاو بوو کە شتێکی وای پێوە نەمابوو. چەند تیتۆڵێك لەولا و ئەولایەوە شۆڕ ببۆوە. مرێمۆك بەزەیی پێیدا هات. بۆی ساغ نەدەبۆوە باشە زاوای سەر ماڵێی پادشای پەرییان چۆن دەبێ ئاوا بێ. لەوانەشە زاواکانی سەر ماڵێی پادشای پەرییان هەر شەکی ئاوا لەبەر بکەن. لەوانەشە جلوبەرگی وەهایان هەبێ، کە چاوی بنیادەم نەیانبینێ.

بە دڵێکی تەنگەوە لە جێی خۆی هەستا. ئەحە پشتی لەو بوو. خەریك بوو سەیری لاق و لەتەرە بریندارەکەی خۆی دەکرد. مرێمۆك لەسەرخۆ و بە سپایی لێی چووە پێشێ و پیلی ئەحەی گرت:

ـ راوەستە ئەحەی خۆم، کوڕی من، ئەمن دایکتم.

ئەحە هیچ نەبزووت. بە سەر سووڕمانەوە زەق زەق لێی ڕوانی. ئەوجار بزەیەکی هاتێ. دوایی ترسێك لە روخساریدا دەرکەوت. دیسان بزەی هاتێ. دیسان ترسا. لە ترسانا لەرزی. ئەوجار لە پڕ گریا.

ـ دایە، باشە ئەمن چم لێ کردووی ئاوام لێ دەکەی، بۆ ئاوام لێ دەکەی بۆ...

زۆڕ زۆڕ دەگریا و چڵمی هەڵدەلووشی و دیسان دەگریا. مرێمۆك دەستی بە سەری دادێنا و دڵخۆشیی دەدایەوە. وەك ئەوەی قسە لەگەڵ منداڵێکی پێنج ساڵانە بکا، دەیگوت:

ـ مەگری رۆڵە گیان، مەگری. چارەنووسمان وا بوو. سەیر کە ئەمنیان بەتەنێ لێرە بەجێ هێشتووە و رۆیون. ئەو "عەلی"یە درێژە هیچ و پووچە، بەتەنێ لێرە بەجێی هێشتم و رۆیشت بۆ ئەوەی بمرم و دەعبا بمخۆن. مەگری کورم. نەکا پەرییەکان ئەزیەتیان کردبێی؟ لەگەڵ خەزوورت، پادشای پەرییان بەشەڕ هاتووی؟

مرێمۆك کە قسەی دەکرد و دەیلاواندەوە، وردە وردە ئەحە هێورتر دەبۆوە. ئاخرییەکەی ژێر بۆوە. ئەحە بە خۆشییەوە، بزەیەك منداڵانەی بێ خەوشی هاتە سەر لێو. مرێمۆك دڵی خۆش بوو:

ـ بڕوانە رۆڵە، ئەگەر خەزوورت شتێکی پێ گوتووی، خەمت نەبێ. خەزوورتە ئیدی. پادشای پەرییانیش بێ، هەر خەزوورتە. خەفەت مەخۆ. ئەی منداڵەکانت چۆنن؟ گەورە بوون؟ ژنەکەت باشە؟ هەر ئەوەندە بەسە خۆشیت بوێ. بیر لە هیچ شتێکی دی مەکەوە.

ئەحە شل ببۆوە و خۆی دابووە دەست نەرم و نیانییەکەیەوە. قسەکانی مرێمۆك وەك لایە لایە وابوون بۆی.

ـ هەڵمگرە و ببە بۆ وڵاتی پەرییان، بۆ کۆشکی خەزوورت. با ژن و منداڵەکەت ببینم. خەزوورت ببینم. لە من مەترسە، ئەمن نەنە مرێمۆکم. هەم لە کۆشکی پەرییان و هەم لە ئاواییش دەزانم چۆن هەستم و دانیشم. ئەو دەمەی لاو بووم، لە مەزرایەکی چوکووراوا بووم. لەوێ دەزانی "خوشکێ" چیی پێ گوتم؟ گوتی ئەتۆ دەتوانی لە کۆشکی پادشاکانیشدا قەدر و حورمەتی خۆت راگری. مەترسە، لە بەر چاوی ن و منداڵەکەت و پەرییەکان تەریقت ناکەمەوە. هەر بە دوو رۆژان هەموو دەمودەستوور و رێوشوێنەکانیان فێر دەبم. منداڵەکانتان فێری مرۆڤبوون دەکەم. ئاخری، ئەگەر رۆژێك خەزوورەکەت مرد، باشە ئەتۆ دەرناکەن بەو بیانووەی کە بنیادەمی؟ بڵێ بزانم، ئەی ئەو کات چیت بەسەر دێ؟

دەنگی هەڵێنا و سیخورمەیەکی لە ئەحە کوتا. هەژابوو.

ـ دەی بڵێ چیت لێ بەسەر دێ؟ ها؟ ها؟ چی؟

سیخورمەیەکی دیکەشی تێ کوتا. ئەحە موچڕکەی پێدا هات.

ـ دەی بڵێ بزانم.

ئەحە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ چیم بە سەر دێ؟

مرێمۆك گوتی:

ـ بێدەنگ. ئەگەر یەکێك گوێی لێ بێ، پێی وادەبێ گونت دەکێشن. دەزانی چیت بەسەر دێ؟ ژن و منداڵەکەت ئاوارەی نێو بنیادەمان دەبن و جا چونکە هیچ شتێك نازانن، لە برسان دەمرین.

ئەحە بە هێمنی گوتی:

ـ دەمرن؟

مرێمۆك مەچەکی گرت:

ـ ئەدی رۆڵە ئەحە گیان، دەمرن. بۆیە بە خاتری منداڵەکانیشت بێ، ئەنە مرێمۆکت بەرە بۆ کۆشکی خەزوورت. با هەتا خەڵکی لە چوکووراوا دێنەوە، هەر لەوێ بمێنینەوە.

ئەحە چاوەکانی زەق زەق ببوون.

ـ بمبە بۆ ئەوێ.

لە نەکاو ئەحە شێت زەرد هەڵگەڕا. دەست و پێی لەرزین. لێوەکانی رەش داگەڕان. دەرپەڕ و دەستی دایەوە تێلاکەی. لێی سواری ئەسپە چێوییەکەی بوو و سەری قیت راگرت و بە قەمچی لێی دا. وەك ئەسپان چەند جارێك حیلاندی. دەشتەکە دەنگی دایەوە. ئەوجار بە دەنگێ بەرز دەیگوڕاند:

ـ هەی ی ی ها.... هەی ی ی ها...

ئەسپەکەی بەرەو ئاوایی لێ خوڕی.

مرێمۆك بە دوایدا بانگی کرد:

ـ ئەحە گیان، کوڕم، ئەو کەڵەبابە خاڵخاڵەم بۆ بگرە، جا دوایی کوێت پێ خۆشە بڕۆ. ئەحە گیان، کوڕم راوەستە. دوو قسەم پێتە. نیوەی گۆشتەکەی دەدەمە تۆ. پەڕ و باڵەکەشی بەرە بۆ حەزوورت با سەرینی لێ دروست بکا. پادشاکان کەیفیان بە سەرینی پەڕ دێ.

ئەحە رایدەکرد و مرێمۆکیش بە شوێنیدا. دەکەوت و هەڵدەستایەوە، دەپاڕایەوە و هەوڵی دەدا بیگاتێ.

ئەحە شێت لە سەر ئەسپە دارینەکەیەوە، بە حیلاندن، ماوەیەك بە نێو دێیەکەدا سووڕایەوە. ئەوجار قەمچیی لە ئەسپەکەی دا و بە غار لە گوندەکە وەدەر کەوت و لە چاوان ون بوو و مرێمۆك کە تینی لە ئەژنۆیدا نەمابوو و لە ئارەقەدا خووسابوو، بە هانکەهانك لە سەر بەردێکی بەر دەرگاکەی سەفەر دانیشتبوو.

ـ لە جیاتی کەڵەشێر قوزەڵقۆرت بخۆ تووتکی سەگ. ئەو تاشباش ئۆغڵوە، ئەو بەرازە وەلییەش با لەبری کەڵەباب ژەهر و ژەقنەمووت بخوات. ژەهری هەلا خوات. خەزوورت، ئەو

گووەی پەرییانیش لە بری ئەوەی لە سەر سەرینی پەڕ بنوێ، با سەر وە تەپاڵەیەك بكا و بنوێ.
وەختێك پەرییەكی گەند و گوو، تووتكە سەیەكی وەك تۆ بكاتە زاوای خۆی، هەر وای لێ دێ.
ئەگەر جارێكی دی وە چنگم بكەوی بەرازی چڵمن، ئەگەر جارێكی دی...

هەتا دەدەمە دەمی ئێوارێ ئاوا لە سەر بەردەكە دانیشت و پرتاندی.

**"جلوبەرگـــەکانی خووســـابوون. ئـــیتر پێـــی هەڵنەدەهاتنەوە و لـە نێوقـەدی بۆ خـوارەوەی سڕ ببـوو. سڕبوونەکەی وردە وردە هەڵدەکشا بـەرەو زگـی. خـەویش زۆری بۆ هێنابوو. تاشباش ئۆغڵو کـە زانیـی خـەو خەریکـە گیـانی دادەگرێ، ترسـا. مـەرگ چاوەڕێی بـوو. کـە زانیـی بەفرەکە لەسەری کەوتووە، خۆی راوەشاند. هەرچـی تـینی هـەیبوو، کـۆی کـردەوە و بـەرەو دەرەوەی ئەشـکەوتەکە خزی. سەگەکە لە تەنیشتییەوە بوو و وەك خـۆی بەسپایی دەخری. تاشباش لەو جەنگەیەدا دەستێکی بۆ گیرفانی برد و سـەیری کـرد شـقارتەکەی هـەر وا پێیـە. گـوتی:"ئـەو شقارتەیە، شەمچەی حەسەنی خۆمە. دیاریی ئەوە بۆ من." گەرمای خۆشەویستی ناخی داگرت."**

## ٢٩

تاشباش ئۆغڵو هەر کات چاوی لێك دەنا و ئەو شەوە مەرگاوییـەی دێنایـەوە پـێش چـاوی خۆی، هەموو گیانی دەلەرزی. شەوێکی دۆزەخییانە بوو. ئەوێ شەوێ، مردبوو و ژیابۆوە. هەر ئەو ساتەی لەبیر مابوو کە گەیشتبووە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە و کەوتبوو. دوای ئـەوە جگـە لە کاژێر(کونەڕەش)ێکی تاریك هیچی لە بیر نەمابوو. ئەو رۆژەی دێنایەوە پێش چـاوی خـۆی. گوندییەکان کە رێزیـان دەگـرت و بـە دڵـی پـڕ لـە گریـان و بـە هـەوڵ و دەوڵ و بێدەنگییـەوە، مەودایەکی زۆر لەگەڵی هاتبوون، کوێخا سەفەر و ئەو قوونە تفەنگانەی نایب عەریف جۆماڵی بۆیەی لێ دابوو ئێسکی بشکێنێ، روخسارە فێڵاوییەکەی کوێخا سەفەر کە وەك دەمـامکێکی پـیس دەچـوو، حەسـەن کـە شـقارتەکەی دابـوویێ، بـزووتنی هەسـتی خـۆی و دڕدۆنگبـوون و دوودڵییەکانی لە وەلیبوونی خۆی، پەلەقاژەکانی لە نێو هەست و بیرە ناتەباکاندا کـە دەتگـوت

لە دۆزەخێکدا وەرگێر داگیر دەکرێ، دوودڵییەکانی کە ئاخۆ دەبێ چ بە مولازمەکە بڵێ و مولازم چیی لێ دەکا، راکردنی تاشباش لەو ئەشکەوتەی پەنایان بۆ بردبوو، ئەوییش کاتێ ئۆنباشی (نایب عەریف) نووستبوو و هەروەها پەنابردنە بەر بەفر و تۆفان و بارن و مەرگەکەی دێنایەوە پێش چاوی خۆی... رێ لێ ونبوونەکەی لە نێو بۆران و تۆفان و زەمهەریرەکەدا و سەگە زەردەکە و راکردنی بەرەو سەر و خوار و بە هەموو لایەکدا و هەوڵی تاقەتپڕووکێنی بۆ دۆزینەوەی ئەشکەوتی سەرمابردووان، کەوتنی لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە، ملی کەچکردنی بۆ خەو و مەرگ... یەك بە یەکی بە بەرچاویدا دەهاتنەوە. دوای ئەوە ئیتر جگە لە کاژێرێکی تاریك هیچ لە گۆڕێ نەبوو.

دوای ئەوە، میچێکی قورماوی* دێتە پێش چاوی کە داوە جاڵجاڵۆکە پێیدا شۆڕ بوونەتەوە و کۆڵەکەیەکی هێندەی بنیادەمێك ئەستوور. کۆڵەکەیەکی پڕ لە نەخش و نیگار و زۆر کۆن، نەخش و نیگارەکان جێ جێ، مۆرکە لێی داوە. کوانوویەکی گەورە کە ئاگرێکی گەورەی تێدا دایسێ. پیاوێکی ریش چەرموو، کەڵەگەت، بە روخسارێکی نوورانی و نیگای پڕ لە بەزەیی. کچێکی گەنج و جوان... لاوەکان و منداڵەکان... منداڵێکیان لە حەسەن دەچێ. چاوەکانی وەك چاوی حەسەن گەورە و خەفەتبارن و نیگاکانی پڕن لە سەرسووڕمان.

ناتوانێ لەو گەنجە دەموچاو درێژووکەیەی بەسەریدا نوشتاوەتەوە بپرسێ، لەکوێ منتان دۆزییەوە.

زارکی ئەشکەوتی سەرمابردووانی هاتەوە پێش چاو.

یەك دوو مانگ لەوێ کەوت. باشی پێ رادەگەیشتن. نەك هەر ماڵەکە، بەڵکو هەموو گوندەکە خواردنیان بۆ دێنا. رۆژێك سەیر دەکا ئەوە هەرچی دێتە لای، دادێتەوە و بەردەرگاکە ماچ دەکا. لە بەرانبەریشییەوە، لە سەر ئەژنۆ دادەنیشن. لە بەر ئەوەی رەق هەڵاتووە لە سەرمان، تۆزێك کەمتر رێزی دەگرن، بەڵام دیسانیش هەر چاویان پێی دەکەوێ، چۆنی دەبێ رێز لە وەلییەك بگرن، ئاوا رێزی دەگرن.

لەو کاتەدا کە ئەو لە زارکی ئەشکەوتەکەی سەرمابردوواندا تین و هێزی لێ دەبڕێ و خۆی بە دەست مەرگەوە دەدا، سەگەکە دەچێتە نێو ئەشکەوتەکەوە. لە نێو ئەشکەوتەکەدا، لە بەر ئاگرێکی گەورەدا، ئێسێ شوان کە لە بەیانییەوە هانای بردبووە بەر ئەشکەوتەکە، ئەوە لاقەکانی لێك کردوونەوە و ئاگرەکەی خستووەتە نێو هەر دوو قاچییەوە و دەیەوێ دەست بکا

---

*قورم: ئەو دووکەڵەی بە بنی میچی ژوورەوە دەنووسێ.

بە شمشاڵ لێدان. سەگەکە دێ و قۆڵی ئێسێ شوان دەگرێ و دەیکێشێ. ئێسێ دواتر بە هەزار سوێند و قورئانەوە ئاوا دەیگێڕێتەوە. لە پێشدا پێی وادەبێ ئەو سەگە زەردە زلە سەهۆڵاوییە ورچە، بەڵام دوایی دەزانێ ئەوە سەگێکی دەستەمۆ و هێدییە. بەخۆی دەڵێ، بەخوای ئەویش وەك من پەنای هێناوەتە بەر ئەو ئەشکەوتە، وا باشترە لێی گەڕێم لێرەدا بمێنێتەوە. بەڵام سەگەکە ئۆقرەی نابێ و هەر وا کەڵبەی لە قۆڵی گیر کردووە و بەرەو دەرەوە دەیکێشێ. ئێسێ بیری بۆ ئەوە دەچێ و دەڵێ، بێ و نەبێ یەکێك لە دەرەوەیە. کەپەنەك بە سەر شانیدا دەدا و دەچێتە دەرێ و سەیر دەکا ئەوە لە زارکی ئەشکەوتەکەدا پیاوێك کەوتووە و خەوی لێ کەوتووە. ئێسێ کابراکە دەکێشێتە نێو ئەشکەوتەکەوە و سەیر دەکا هێشتا زیندووە و پشوویەکی دێ. کابرا کە تۆزێك گەرم دادێتەوە و دێتەوە سەر خۆ. بەڵام دیسانیش ناتوانێ چاو هەڵێنێ. ئێسێ بەخۆی دەڵێ، ئەو پیاوە دەناسم، بەڵام لە کوێم دیوە؟ بیر دەکاتەوە و بیر دەکاتەوە و دوایی وەبیری دێتەوە ئەوە کێیە؟ بریسکەی شمشێر چۆنە، بەردەوام تیشکێکی ئاوا لە روخساری کابرا هەڵدەستێ. ئێسێ دەست و پێی دەلەرزن. یانی ئەوە تاشباشی سەروەرمان، وەلیی وەلییەکان، خەڵکی یالاك نییە؟ ئەو سەگە زەردەش هەر "قەتمیر" نییە؟ تاوێك دواتر دەست و پێی تاشباشی مەزن کەسك دەبێ و نوورێکی کەسك نێو ئەشکەوتەکەشی پڕ کردبوو. ئێستێ داهاتبۆوە و دەست و پێی تاشباشی ماچ کردبوو.

بەیانە و تاو هەڵاتووە. هیچ شوێنەوارێك لە تۆفان و بارانەکەی دوێ شەوێ نەماوەتەوە. ئێسێ تاشباش ئۆغڵو بە کۆڵی خۆیدا دەدات و وەڕێ دەکەوێ و سەگەکەش بە دوایاندا. دەگەنەوە ئاوەدانی و ئێسێ بانگ دێڵێ*:"هۆی خەڵکی "یەرلیجیك" وەرن. چاکەیەکم لەگەڵ کردوون، هەتا رۆژێ قیامەتێ لە بیرتان نەچمەوە. "تاشباش ئۆغڵو"ی وەلیم بۆ هێناون."
گوندی بوو بە مشتومڕیان لە سەر ئەوەی کێهەیان میوانداریی لە تاشباش بکەن. تاخرییەکەم لە بەر ئەوەی ماڵەکەی "ئۆمەت ئاغا" لە ماڵی هەمووان فرەوانتر و گەورەترە، ساغ دەبنەوە وەلییەکە لەوێ بمێنێتەوە. کامە نەشتەرگەر و حەکیم لە دەرمانکردن و چارەسەرکردنی جەستەی سەرمابردوو لە هەمووان شارەزاترە، دەچن لە دوورترین ئاواییەکانەوە دەیهێنن. تاشباش ئۆغڵو دوای سێ رۆژان چاوی هەڵدێنێ، بەڵام یەك دوو مانگی پێ دەچێ هەتا وەخۆ دێتەوە و خۆ دەگرێتەوە. تاشباش ئۆغڵو هەر چاك دەبێتەوە، ئەوجار نەخۆش و پیر و پەککەوتە هرووژمی بۆ دێنن. تاشباش ئۆغڵو دەسەڵاتی چییە؟ ئیتر خۆشی بڕوای بەوە هێناوە کە وەلییە.

---

*بانگ دێلێ: واتە بانگ دەکا. هەرا دەکا. لە فۆلکلۆردا دەڵێ:"یارم ئێواران بانگ دێلێ.... بۆخۆی دێ، دایکی ناهێلێ."

بنیادەمێکی هەموو گیانی بەستبێی و ڕەق هەڵاتبێ، هەر خودا دەتوانێ لەفریای بێ و هەر وەلییەکانیش ئاوا دەکەونە بەر ڕەحمەت و کەرەمی خودا.

بەهار داهاتووە. تاشباش ئۆغڵو هیچ چاری نییە. گوندی ئیتر بێتامیان کردووە. خەڵکی گوندە دوور و نزیکەکانیش بیستوویانەتەوە کە وەلی هاتووە و بێ پسانەوە هەر دێن. نەخۆش و دەردەدار و ئیماندار و ئەوانەی هەر بۆ ئەوە دێن چاوێکیان پێی بکەوێ. گوندی "یەلیجیك" بەردەوام پڕ دەبێ و چۆڵ دەبێتەوە و دیسان تاشباش ترس هەڵی دەگرێتەوە. هەم ڕاکردووە و هەم دیسانیش بووەتەوە وەلی... خۆ مولازم ببیستێتەوە... وەلی نا، بووبێتە پێغەمبەریش، نیتر ئەمجارەیان لە چنگ ئەو مولازمە ڕزگاریی نایە.

تاشباش ئۆغڵو، شەوێکیان، چلۆچێوی داری کاژ لە دەوری قەرەوێڵەی خەوەکەی هەڵدەچنێ و ئاگری پێوە دەنێ و ڕادەکا. ئۆمەت ئاغا کە سەیر دەکا قەرەوێڵە و نوێن و بانەکەی (تاشباش) نوقمی نوور و ڕووناکییە، دەچێتە پێشێ و سەیر دەکا کەی لە جێوبانەکەیدا نییە.

هەر ئەو ساتە، هەواڵی ڕووداوەکە بە گوندێدا بڵاو دەبێتەوە و دەمودەست بەسەرهات و هەقایەتی جۆراوجۆر سەبارەت بە تاشباش و نوور و بڵێسەکان دەم بە دەم دەگەڕێ.

"وەلییە کەچەڵ" دەڵێ:" ئەگەر درۆ بکەم، لە هەر دوو چاوان کوێرە بم. لە دەشتەکە، لە خوار ئاوەدانی، لە گوێدرێژەکەم دەگەڕام، ون ببوو. سەیری خوارووی دەشتەکەم کرد و بە هەزاران گورگی نوورانیم دی کە بەرەو چیایەکی نوور غاریان دەدا. لە داوێنی چیای نوورەکەوە، پیاوێکی کەسکی نوورانی دەدرەوشایەوە. لێی چوومە پێشێ و سەیرم کرد ئەوە تاشباشی مەزنمانە. تێڵایەکی بە دەستەوە بوو و سەگە زەردەکەشی لە تەنیشتی بوو. گورگە نوورانییەکان دەهاتن و لمبۆزیان لە لاقی دەخشاند. تاشباشی مەزنمان بووەتە شوان. شوانی گورگە نوورانییەکان. بە سەدان و هەزاران گورگی نوورانی لە ناخی تاریکە شەوەکەدا هەموو دەشتەکەیان داگرتووە. شوانەکەشیان تاشباشی مەزنمانە.

"نەنە تەلی" دەیگێڕاوە و دوای هەر قسەیەك دەیگوت:"بە هەقی هەرچی نابینرێ." و لەسەر قسەکەی دەڕۆیی:"هێشتا بەیانی دابوو و نەدابوو. لە زینوێیەکە وەسەر دەکەوتم، خشەخشێکم لە ئاسمانەوە گوێ لێ بوو. کە سەرم هەڵێنا چ ببینم، سەیر دەکەم ئەوە هەژدیهایەك، لە ئاسمانێوە بەرەو لای من دەهات. بە هەقی نەبینراو و نەبەدییەکان، هات و لە بەرانبەرم کەوتە عەرزی. هێندێ جێ خەرمانێکی گرتبوو. بەندی جەرگ و دڵم پسا. سەیر دەکەم و دەبینم ئەوە هەژدیهاکە توێژ داوێ. چاوی لێ هەڵنەدەگرتم. بەهەقی نەبینراو و

نەبەدییەکان، دیتم ئەوە کابرایەکی کەسك لە هەناوی هەژدیهاکەوە هاتە دەرێ. خۆم بە سەر پێیاندا دا. کە سەرم هەڵێنا دەبینم تاشباشی سەروەرمان لەوێ نەماوە. بزر ببوو..."

مچەبچکۆڵ دەیگێڕاوە:"دەستی منی گرت. دەزانن کێ؟ تاشباشی وەلی. هەڵیهاویشتم بەرەو ئاسمان و گوتی:"هەڵفڕە مچە، هەڵفڕە بزانم." هەڵفڕیم، فڕیم فڕیم تا کەوتمە نێوهێلانە هەڵۆیەك. سەیرم کرد هەمووە دەوروپشتم ڕەوەزە. هەڵۆکە سواری ملی خۆی کردم. سەیرم کرد و دیتم ئەوە کابرا سەوزەکە لە تەنیشتمە. دە دانە گوێزی دامێ. گوێزەکانم شکاند و خواردمن. دە گوێزی دیکەشی وێ دام. ئەوانیشم شکاندن و خواردمن. دە گوێزی دیکەو... چەندی داوام دەکرد، گوێزی دەدامێ..."

مەلا ئەحە دەیگێڕایەوە:"دوێ شەوێ، لە چیا، تەڵەم بۆ سمۆرە نابۆوە و دەگەڕامەوە. لە ناکاو لە بەرانبەرم قوت بۆوە. وەك با دەشنایەوە. گوتم:"خێرە؟ ئەوە بۆ کوێ؟" گوتی:"خوا خێرت وەرێ بێنێ، ئەحە. وا دەڕۆم. بانگیان کردووم. ئیتر ناتوانم لێرە وەمێنم." و دەسبەجێ لە چاوان ون بوو. تاوێك دواتر بینیم ئەوە دیسان لە پێشمە. دەنگ و ڕوخساری هەر ئەوی پێشوو بوو، بەڵام شمەکەکانی گۆڕابوون. سەرتاپێی سپیی پۆشیبوو. دیسان پێکەوە قسەمان کرد، بزەیەکی هاتێ. وەك با دەشنییەوە. لە چاوترووکانێکا دیتم، لە گردەکەی بەرانبەرمان ئاودیو بوو. تاوێك دواتر بە شمەکێکی دیکەوە لە پێشم قوت بۆوە. وەك با دەشنییەوە. دیسان لە پشت گردەکە لە چاوان ون بوو. دواجار بلێسەی سووری پۆشیبوو. دیسان قسەی لەگەڵ کردم. وەك با دەشنییەوە. ئەو کاتە دیتم چل کۆتری سپی هەڵفڕین و تاشباشی مەزنمان دیار نەما. هۆشم لێ بڕابوو. کە وەهۆش خۆم هاتمەوە دیتم سێ سمۆرە بە داوەکەمەوە بوون. ئەوەش هەر سیانیان."

تاشباش ئۆغڵو ڕای کرد و گوێی لە هیچ کام لەو قسانە نەبوو. ئەو هەر لە زستانێوە مێشکی ئاڵۆز بوو.

لە چیاکانەوە بەرەو دەشتێ داگەڕا. بەرەو چوکووراوا. ناوبانگی ئەو گەیشتبووە ئەوێش. هەمووان زانیبوویان کە وەلییەك لە تۆرووس پەیدا بووە و پەرجۆ (موعجیزە) دەنوێنێ. سەیر ئەوەیە ئەگەر تاشباش ئۆغڵو خۆی گوتبایەی ئەو وەلییە ئەمنم، قەشمەرییان پێ دەکرد و بە شێتیان دەزانی. لە کەناری دەریای سپی لە لای ئاغایەك بوو بە مەیتەر. تۆزێك سەرەدەری لە ئەسپ بەخێوکردن دەردەکرد. ئاغاکەش مانگێ حەوت لیرە و نیوی دەدایێ بۆ بەخێوکردنی ئەسپەکانی، کە هەر بەشی جگەرەکەی دەکرد. لەو گوندەش هەموو ڕۆژێ باس باسی ئەو وەلییە بوو کە چووەتە گەڵ چل سوارەی

غەيبييەوە. وردە وردە تاشباش خۆيشی خەريك بوو بڕوا بكا بەوەی وەلييەكی وا لە تۆرووس هەيە. بەلاّم كەيفی دەكرد لەوەيكە ئەو وەلييە هەر خۆيەتی. ئەفسانەی سەير و سەمەرە و جۆراوجۆری دەبيستەوە. هەموو شەویّ كە دەنووست، ئەو ئەفسانانەی دێنانەوە بەر چاوی خۆی و بەخۆی دەنازی و لەبەر خۆيەوە دەيگوت:"ئەو وەلييە ئەمنم." و بە خەياڵێكی خۆشەوە دەنووست.

كە وەرزی لۆكە رنينەوە هات و خەڵك لە گوندەكانی تۆرووسەوە بەرەو چوكوور داگەڕان، ئاگرێك لە دڵيدا بڵێسەی سەند. ئيتر ئۆقرەی نەما. حەزی لێ بوو خەڵكی گوندەكەی خۆيان ببينێ. بەلاّم دەشيزانی چيی بە سەر دێ. مولازمەكە لێرە نەبوو، بەلاّم مولازمی ديكەی زۆر لێ بوو. سەيريش نەبوو كە هەر گونديیەكان خۆيان تووشی گێچەڵ و چەرمەسەريی بكەن و نەهێڵن بحەسێتەوە. چوونەوەی بۆ لای گونديیەكان، لەوانەبوو سەری بە فەتەرات بدات. بەلاّم نارا و قاراشی نەبوو. دەستێك گرتبووی و بەرەو لای گونديیەكانی دەبرد. شێتانە بيری ژنەكەی كردبوو. جار و بارە تەواو باوەڕی دەكرد كە بووەتە وەلی و خودا ئەوی ناردووە بۆ لای خەڵكی، كەوابوو دەبووە وەلی و سينگی دەردەپەڕاند و بەخۆی دەنازی.

سەرنجی دابوو و دەيدی كە لەو ساتانەدا خەڵكەكەش جۆرێكی ديكە لەگەڵی دەجووڵێنەوە. دوای ئەوە لە پڕ لەو حاڵەتی وەلييايەتييەی دەهاتە دەرێ و دەبووەوە گونديیەكی ترسنۆك و رەوەك و لاواز. ئيتر گونديیەكانيش بەو چاوە سەيريان دەكرد.

شەوێكيان لە گەورەكەی ئاغا هاتە دەرێ و بەرەو نێوەڕاستی كێڵگەی لۆكەجارەكان وەڕێی كەوت. مەزرا بە مەزرا بە شوێن خەڵكی گوندەكەی خۆيدا دەگەڕا. سێ رۆژ لە سەر يەك گەڕا. لەو ماوەيەدا هەر دوو ژەمی نان خوارد. زۆر لەڕ و لاواز ببوو. دوو جار رەق هەڵاتنی لە سەر يەك، لەڕ و بنێسی كردبوو. جلوبەرگەكەی كۆنە و دڕاو بوون. دەموژاوی تێكسمڕاو و زەرد ببوو و روومەتەكانی قوپيبوون. كافر بەزەيی پێيدا دەهات، پير و زورهان ببوو. هەر كەس يەكەم جاری چاوی پێی كەوتبايە، بڕوای نەدەكرد ئەوە تاشباش ئۆغلو بێ.

تاشباش ئۆغلو لە شەوی رابردووەوە، خۆی لە نێو لك و پۆی دارێكدا شاردبۆوە و چاوەڕوان بوو... لە برسان گەدەی دەبرژايەوە و هێڵنجی دەدا. نەيدەوێرا پێ بنێتە نێو مەزراكەوە. بيری دەكردەوە و هەڵدەستا و دەچووە تەنيشت مەزراكە و هەر لەوێ رادەوەستا. نەيدەتوانی پەل ببزێوێ. سەعاتێك، دووان، لەوێ وەك دارێكی چەقيو بەبێ جووڵە رادەوەستا و دەچووە فكرەوە و خەياڵ دەيبرد. كە دەدی خۆی بە سەر پێوە راناگرێ، خۆی دەخزاندەوە نێو پنچكەكان و لەوێ نوقمی خەياڵەكانی خۆی دەبۆوە.

ساتێك ڕووناكاییەكی لە دڵی دەگەڕا و غیرەتی وەبەر خۆی دەنا. بەخۆی دەگوت:"ئێستا كە بچمەوە لایان، گوندی ئەوەندەیان پێ سەیر دەبێ، زاریان گەزێك دادەپچڕن، هەر لە حەوت ساڵەیانەوە هەتا حەفتا ساڵەیان هەر هەموو لە خۆشیان هاوار دەكەن و دەورم دەگرن. دەست و پێم ماچ دەكەن، وەك پێغەمبەر و ڕزگاریدەرێك پێشوازیم لێ دەكەن و بەپیرمەوە دێن. ئەوان كە پێیان وایە من مردووم، ئەوەندەیان پێ سەیر دەبێ، نەبێتەوە. لەوانەیە لەبەر سەرسووڕمانیان هەر قسەیان پێ نەكرێ و لەجێی خۆیان وشك بن. دوایی وردە وردە وەخۆ بێنەوە. هەر بە ڕاستی ئەمن وەلیم؟ لەوانەشە وەلی بم. ئەگەر وەلی نەبوومایە، چۆن لە ئەشكەوتی سەرمابردووواندا تووشی ئەو شوانە دەبووم كە لەوێدا ئاگری كردبۆوە؟ شوانە چیی دەگوت؟ دەیگوت:"لە ژیانمدا ئەوە یەكەم جارم بوو بچمە ئەو ئەشكەوتە و پێش هەموو شتێك ئاگرێكم كردەوە. لە نەكاو سەیرم كرد تۆف و باڕنەكەی دامركایەوە و خۆشی كردەوە. وڵات سەیر ئەهوە بووەوە. هەوایەكی بەهارانە لێرەكەی داگرت. لە پڕ سەیرم كرد نوورێك هەستا و شەوەكەی كردە ڕۆژ." دەیگوت:"كە هاتمە دەرێ، سەیر دەكەم ئەوە تاشباشی مەزنمان لە سەر بەفرەكە كەوتووە. ئەی پیاوی ئاوا وەلی نییە؟ چما پیاوی ئاوا دەیبەستێ؟ ئەوانەی ڕەق هەڵدێن، وەلی نین. چما ئەشكەوتی چل پیاوچاكە نەمرەكە لە لووتكەی چیا بەرزەكان نییە؟"

باشە ئەمن كارێكی خراپم كردووە؟ چما لە خودا یاخی بووم كە ئەو هەمووە نەهامەتی و بەڵایەم بەسەر دێ؟ دەمكەنە گاڵتەجاڕ و قەشمەری خۆیان. بەبێ ئەوەی وەلی بم، وەك وەلییان دەمپەرستن. ئەوەش جۆرە عەزابێكی خودایییە. لێم قەوما و دەربەدەر بووم، برسێتیم چێشت و دیسان ڕەق هەڵاتمەوە، بە حاڵی سەگ گیانی شیرینم ڕزگار كرد، خەڵك لە گەوڕیشدا ڕایاننەگرتم و وەدەریان نام. ئاغای بێناموس لە بەیانییەوە هەتا شەوێ، چیی جنێو بوو بە نامووس و دین و ئیمانی دا. ئێستا خۆ ناوێرم بچمە نێو مەزراكەوە. گوندی كە ئاقڵ بوون، بێت و قەشمەریم پێ بكەن و بڵێن ئەوەتا ئەو تاشباشە چڵمنەی خۆی لێ كردبووینە وەلی، هیچ سەیر نییە لێیان دەم و بیانكوژم. چۆنە سەری خۆم هەڵگرم و لێدەم بڕۆم؟ چار نییە. ئیتر با گوندی چاویان پێم نەكەوێتەوە... ئەگەر دیسان بچمەوە ئەو گوندە و دیسان بكەومەوە چنگ مولازم، یان دەمبەنە شێتخانە یان لە زیندانم توند دەكەن. یەكێك لەو دووانە. ئای چەندەم غەریبیی دایكی منداڵان كردووە... بەڵام بێت و قەشمەریم پێ بكەن و بڵێن ئەتۆ وەختایەكی خۆت لێ كردبووینە وەلی... تاشباش ئۆغڵۆ، وەلیی وەلییەكان... ئەگەر چاو لە چاوانم بڕن و پێم پێ بكەن و وەدووم بكەون و لێم بقوولێنن... ئەو كاتە یان یەكێكیان لێ دەكوژم، یان خۆم.

ئەمن نە دەتوانم وەلی بم و نە ترەماشیش... بەڵام نوورەکەم دی، داری چاکیم دی هاتبوە سەربانی ماڵەکەم و لەوێ راوەستابوو و لە ئەنگوستەچاوەکەی شەوێدا، ماڵەکەمی نووربـاران دەرکد...

چما هەر هەمووی ئەوانەم بەو دوو چاوەی خۆم نەدی؟ چما گوندی هەر هەموویان و نەنە مرێمۆکیش نەیاندی؟ کەسێکی وەلی نەبێ، چما شەوانە ماڵەکەی نوورباران دەکرێ؟ ئەویش هەموو شەوێ... ئەوە عەزابی منە... وەلییایەتی عەزابی منە. دیارە گوناحێکم کردووە کە خودا ئەو هەمووە بەڵایەم بە سەر دێنێ... سووك و ریسوای ئەم دنیایە بووم. ئاخر تۆ خوا ئەوەش وەلییایەتییە؟... وەلییایەتی لە کوێ و ئەمن لە کوێ؟... خوایە گیان لەو ریسواییە رزگارم بکە. ئەمن وەلیم، وەلی... با بچم وەلییایەتییەکەم بە جوانی رابگەیێنم و لە سەر تەختی وەلییایەتیم پالی لێ بدەمەوە. بەڵام بەو سەر و قەد وگیپاڵەمەوە چۆن دەبێ بچمەوە نێو گوندی؟ بەو سەر و گوێلاکەمەوە کەس نامناسێتەوە، هەر هیچ کەس... ژنەکەشم. هیچ کەس نامناسێتەوە.

پەشیمان بۆوە و نەچووە مەزراکە. بە دەم جەیحاندا بەرەو خوار دەکشا، نیو سەعات، سەعاتێك دەرۆیشت و رادەوەستایەوە. ئیتر نەیدەتوانی بڕوات. لەوێ، لە بەر تاوە بەتینەکە، بەبێ جووڵە رادەوەستا و ئەو جار دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی دیسان خۆی لە پنچکەکەیدا بشارێتەوە.

دەنگە دەنگ لە مەزراکەوە دەهات. لە هەمووان پتر گوێی لە دەنگی سەفەر دەبوو. پەشیمانی بەرۆکی دەگرتەوە. بەخۆی دەگوت:"ئەی لەو هەڵەیەی کردم کە نەمگوت بەو گوندییانە ئەو سەگبابە لەتوپەت بکەن." و ئاخی هەڵدەکێشا. دەنگێکی دیکەش دەهات. دەنگی زەڵەجە بوو کە پەیتا پەیتا قسەی دەکرد. لە نێو قسەکانی ئەودا بەردەوام گوێی لە ناوی "تاشباش" دەبوو. تاشباش جوان گوێی لێ نەدەبوو کە ئەوان دەڵێن چی. گوێ هەڵدەخست و حەزی لێ بوو لە نێو ئەو دەنگانەدا گوێی لە دەنگی ژنەکەی خۆی بێ، کە زۆری بیر کردبوو، بەڵام نەیدەبیست. لە نەکاو شادییەکی قووڵ بە دڵیدا هات. گوێی لە دەنگی ژنەکەی ببوو. دەنگێکی خەفەتبار و ماندوو.

هەستا. بە هەشتاو بەرەو مەزراکە رۆیشت. هەڵلایەکی سەیر لە مەزراکە هەبوو. هاوار و گریان.

هەواکەی گەرم بوو. تاشباش ئۆغڵو خەریك بوو دەپیشا. هیچ ئارەقەی نەدەکرد. گەدە (مێعدە)ی دێشا و دەڕشایەوە. دەستی بە زگییەوە گرت و نووشتایەوە و لە تەنیشت مەزراکە هەر وا بە نووشتاوییەوە مایەوە. گەرما و تاوە بەتینەکە لە تاقەتدا نەبوو. نەیدەتوانی ببزوێ. گەڕایەوە و خۆی خزاندەوە نێو پنچکەکە.

بایەکی بەتەپوتۆزەوە هەڵیکرد، وەك بڵێسەی ئاگر وابوو. دوای ئەوە، ئەو هەورانەی لە سەر تۆرووسەوە دەهاتن، هەر ئەوەندە یەك و دوو سەر چوکووراوایان داپۆشی. بە دوای ئەوەدا بایەکی سارد هەڵیکرد و تەپوتۆزی هەستاند. دوای ئەوە دەنکی درشت و قورسی باران کەوتە سەر زەوی و بە خۆڵەکەدا رۆچوو.

تاشباش ئۆغڵو هەر لەوێ بەبێ جوولە راوەستابوو. دیسانیش لە مەزراکەوە دەنگی هاواری بیست و دەنگ و هەرایەکی زۆر هەستا. دەنگەکە لە ناکاو کپ بوو. بارانێکی وەك لافاو دەستی دایکردبوو. دەشتەکەی چوکوور لە چاوترووکانێکا بوو بە دەریاچە.

لە ئاسمان، پیرە هەڵۆیەك، لە نێو باو بارانە بەهێزەکەدا، هەوڵی دەدا، بەڵام هیچ لە بیری ئەوەدا نەبوو لە شوێنێك بنیشێتەوە و ئۆقرە بگرێ.

بارانەکە تا کەی خۆشی نەدەکردەوە؟ تاشباش ئاگای لێ نەبوو. چەندە لەوێ ئاوا بێ جوولە راوەستا؟ بارانەکە چەندی خایاند و کەی خۆشی کردەوە؟ هیچ ئاگاشی لێ نەبوو. ئەو هەر یەك شتی دەزانی. دەیزانی خەریك بەرەو لای مەزراکە دەچێ.

دەڕۆیشت و هەتا گوێزینگانی لە قوڕەکە رۆدەچوو. جلوبەرگەکەی بە لەشییەوە نووسابوون و ئێستاقی زەق وەدەر کەوتبوون. ئێسك و پرووسكێکی کە دەتگوت ئەگەر دەستی بۆ بەری هەڵدەوەرێ. چووە نێو کرێکارەکانەوە. بزەی دەهاتێ. تووشی هەر کەس دەبوو بزەیەکی دەهاتە سەر لێوی و خۆی وەك ئاشنا نیشان دەدا و کەسیش بەهێندی نەدەگرت. چووە لای زەڵەجە و بەرانبەری راوەستا و بزەیەکی هاتێ و چاوەڕێ ما ئەو بڵێ:"بەخێر هاتییەوە." زەڵەجە بە سەر سووڕمانەوە سەیرێکی کرد و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، پشتی تێ کرد. کوێخا سەفەر دیتی و هەر ئەوەندەی و چاوی پێی کەوت، بە خۆبەزلزانی و رقەوە بە دەمییەوە پێکەنی. دەتگوت لە دڵی خۆیدا دەڵێ:"ئەوە تۆی تاشباشی وەلی؟" تاشباش ئۆغڵو چووە لای چەند کەسی دیکەش و بزەی سەر لێوی سارد بۆوە و بوو بە سەهۆڵ. چاوی لە ژنەکەی دەگێڕا. ژنەکەی لەو سەری مەزراکەوە بوو و سەیری دەکرد. تاشباش چووە لای و لێی چووە پێشێ. ژنە هیچ نەبزووت. تاشباش ویستی شتێکی پێ بڵێ. قسەکانی لە قوڕگی گیران. بێدەنگ بوو. ژنەکەی سەیری نەدەکرد. کەسی دیکەش سەیریان نەدەکرد. تاشباش هاتە سەر ئەوەی لەو مەزرایە بڕوات و ئیتر نەگەڕێتەوە و سوێندیش بخوات پێی نەنێتەوە گوندەکەشیان. بەڵام نەیدەتوانی بڕوات و مەزراکە جێ بێڵێ. پێی خۆش بوو هاوار بکا:"هەی کەر و گەمژەینە، نەتانناسیمەوە؟ ئەمنم تاشباش. وەلیی وەلییەکانم. هاتوومەتە لاتان. لە ئەشکەوتی چل سوارە هاتمە دەرێ و گەڕامەوە. دیتم حاڵتان، حاڵی سەگە، خۆم گەیاندەوە لاتان." بەڵام نەیتوانی.

تاریك داهات. لە بەر دەم هەر کەپرێك ئاگرێکیان کردەوە و مەنجەڵی دووکەڵاوییان وەسەر ئاگرەکان نا بۆ ترخێنە لێنانێ.

ژنەکەی ئاشباشیش لە بەر کەپرەکەی هەوڵی دەدا ئاگرێك بکاتەوە و نەیدەتوانی. چیی دار و ئاوردوو بوو تەڕ بوون. ئاشباش ئۆغلۆ چلۆچێو و دەستەچیلەکەی لە ژنەکەی وەرگرت و ئەوەندەی یەك و دوو ئاگرەکەی کردەوە. ژنە مەنجەڵەکەی وەسەر نا و ترخێنەکەی لێنا. سفەریان لەسەرخۆڵ و خاکەکە راسخت. نانەکەش تەڕ ببوو. ترخێنە داغەکەیان خوارد. ئاشباش ئۆغلۆ برێك هاتەوە سەر خۆ. گوتی:

- ژنەکە نەتناسیمەوە؟ ئەمنم مەمەد. زۆرم بەڵا و نەگبەتی بەسەر هات، بەڵام ئاخری زانیم ئەمن وەلیم. بوومەتە وەلی.

ژنەکەی هەر سەیریشی نەکرد. متەقیشی لەبەر نەهات.

نوێن و بانەکەش تەڕ ببوو. نێو کەپرەکەش تەڕ بوو. ئاشباش قوڕ و لیتەی نێو کەپرەکەی دەردایە دەرێ هەتا گەیاندییە سەر وشکایی. ئەوجار گوتی:

- جێوبانەکە تەڕە؟ ئەگەر تەڕ نەبوو بیهێنە و لە سەر ئەو وشکاییە رایخە.

ژنەکەی لە بن حەسیرەکە بەتانییەك و دۆشەگەڵەیەکی دەرهێنا. سەرێکی بالیفەکە تەڕ ببوو. جێوبانەکەی لە سەر عەرزە وشکەکە راخست. ئاشباش ئۆغلۆ رووت بۆوە. لە سەر دۆشەگەڵەکە راکشا و بەتانییەکەی بە سەر خۆی کێشا و دەمودەست خەوی لێ کەوت. ژنەکەی ئاگری لە دارێك بەردا و هەتا کوژایەوە هەر لە دەموچاوە رەق تەق و باریك و بنێس بووەکەی ئاشباش ورد بۆوە کە ردێنی وەك دڕکە ژوشکی لێهاتبوو. لووتی باریك ببووەوە. ملیشی هەروەتر. ژنە ترسا. ئەو دەموچاوانە داغی مەرگیان پێوە نراوە.

سێ مناڵەکە، لەوەتەی باوکیان هاتبۆوە، هەر سێکیان لە قوژبنێك وەك سیحر لێکراوان دانیشتبوون و نەدەبزووتن و چاوە سەرسوورماوەکانیان کە زەقتریش ببوونەوە، لە باوکیان نەدەترووکاند. ئاشباش هەر گەیشتبۆوە، دەستی بە سەریاندا هێنابوو و هەر سێکیانی لە ئامێز گرتبوو. مناڵ وەك سیحر لێکراوان سەیریان کردبوو و نەبزووتبوون. دوای ئەوەی باوکیان نووت، ئەوانیش هەر چۆنی دانیشتبوون، ئاوا خەویان لێ کرد و بە سەر یەکتریدا کەوتن. دایکیان جلوبەرگی لە بەرداکەندن و لە تەنیشت باوکیانەوە نواندنی.

زۆر زۆر ماندوو و سەر سووڕ ماو بوو. لەوەیکە پیاوێکی ئاوا لەڕ و لاواز و نیوەزیندوو خۆی کردبووە ئاشباش و لە سەر سفرە لەگەڵیان دانیشتبوو، تینی لەبەردا نەهێشتبوو.

نەیدەتوانی ئەو پیاوە دەربکا و بلێ:"ئەتۆ تاشباش ئۆغلو نی و ئەمنیش ژنی تۆ نیم و ئەوانەی منداڵی تۆ نین." نەیدەتوانی بلێ:"ئاخ، تاشباش ئۆغلو لە کوێ و تۆ لە کوێ؟ تاشباشی سەروەرمان ئێستا لە چیای چل پیاوچاکەکە، لە دەم ئەو کانییە فێنکانەی وەنەوشە بۆنخۆشەکان تا ئەژنۆ هەستاون، لە شوێنێك کە دەستی کەسی پێ ناگا، لە نێو چل پیاوە نەمرەکەدا دانیشتووە. سواڵکەری چڵمن، ئەتۆ چی و تاشباش چی؟" نەیتوانیبوو بەو پیاوەی کە لە تاشباش دەچوو، بلێ:"کە نانەکەت خوارد، هەستە و برۆ، ئەمن بێوەژنم، بچۆ لە شوێنێکی دی بنوو." باشە بۆ زمانی نەگەڕابوو؟ بۆچی لە سەر جێویانەکەی خۆی نواندبووی؟ هەر لە بەر ئەوەی زۆر لە مەمەد دەچوو؟ دەتگوت سێوێکن لەتت کردوون، بەڵام ئاخر تاشباشی مەزنمان لە کوێ و ئەو مردەلۆخەیە لە کوێ؟...

"داماوە زۆر ماندوو بوو.... ئای ئەو ترخێنەی چۆن بە تام چێژەوە دەخوارد. وەك بنیادەمێکی چل شەو ورۆژان هیچی نەخواردبێ. بەیانی کە رۆژ بۆوە، پێی دەڵێم، براله، ئەمن مێردەکەم لێرە نییە، بچۆ شوێنێکی دیکە. ئەتۆ لە تاشباشی مەزنمان دەچی، بەڵام ناتوانم بێڵم لە جێویانی مندا بنووی. ناتوانم. سەروەرەکەمان غەززەبم لێ دەگرێ. کێ چووزانێ ئەتۆی بۆ تاقیکردنەوەی من، نەهێنابێتە سەر شکڵ و بیچمی خۆی و نەیناردووی بۆ لام؟ سبەی کە رۆژ بۆوە پێی دەڵێم هەستە براله. ئەمن ژنێکم کە مێردەکەی لە لای نییە. بچۆ میوانی یەکێکی دیکە بە.

ئەو قەسانەی لە دڵیدا دووپاتە دەکردەوە.

لە هەستێکی ئاڵۆز و قورس و سامناك و پڕ لە دوودڵیدا نوقم ببوو. هەتا بەیانی نوقمی خەیاڵی ناخۆش و ورێنەی ترسناکەوە، بە سەر سەری تاشباشەوە بەخەبەر مایەوە و جینگڵی دا.

**منداڵـەکان پیرەهەڵۆیـەکیان گرتبـوو و پەتێکیان لە ملی کردبوو و هێنابوویانە نێو کرێکارەکان. پیرەهەڵۆکە تەڕ بوو و باڵە شۆڕ و قوڕاوییەکانی بە سەر عەرزیدا دەخشاند.**

## ٣٠

حەسەن:

ـ بابم لە هەموویان زیاتری دەڕنییەوە. ئێرەییان پێ برد و چاویان دیتنیان نەبوو. بۆیـە چـیی وای نەمابوو بیکوژن. راوەستە با بۆخۆم گەورە بم، لێگەڕێ با گەورە بم، ئەو کات یەك بە یـەك دەیـانگرم و دەیانکوژم. لێگەڕێ با گەورە بم جا دەبینی. با گەورە بم، جا پێیان دەڵێم چۆن پیاو دەکوژن.

ئۆمەخان گوتی:

ـ سەیر کە حەسەن، ئۆککەش داغ قۆردوو مەکوژە. هەمووان لە بابمیان دا، بـەڵام ئـەو نـا. هەر ئەو لێی نەدا.

حەسەن سوور بۆوە. لە تووڕەییان جینگلی دەدا. چـاوەکانی سـوور هەڵگـەڕابوون و گریـان ئەوکی گرتبوو. گوتی:

ـ ئۆککەش ناکوژم. با ئەو زیندوو بێ.

ـ زەڵەجە بکوژە. قەپی بە گوێی بابمدا کردبوو و دەیگەست.

ئۆمەخان:

ـ ئەمنیش پێم وایە. لەوانەشە ئەمنیش مشوورێکی باشی لێ بخۆم بۆ کوشتنەکەی.

حەسەن ئیزنی دا و گوتی:

ـ ئەتۆش بیر بکەرەوە. چەپڵە بە دەستێك لێ نادرێ.

جلوبەرگەکانیان وشك ببۆوە. ئەو جلوبەرگە چڵکن و قوڕاوی و خۆڵاوییەیان وشك هەڵاتبوو. لە قوڵکایی دەم رووبارەکە، لە تەنیشت پنچکەکان دانیشتبوون. بۆ ئەوەی خۆیان بپـارێزن لـەو

تەپۆ و مێشوولانەی کە دوای بارانەکە هەموو وڵاتیان داگرتبوو. رووباری جەیحان سوور و قوڕاو بوو. توێکڵە کاژێك لە ناوەکەدا جارێك سەری وەدەر دەنا و جارێك نوقم دەبۆوە. رووبارەکە بۆنی جۆرە گوڵێکی ترشاوی لێ دەهات کە هیچ خوویان پێوە نەگرتبوو. تەمێکی تار، خەست و گەرم، دەوری گرتبوون. تەمە سپییە خەستەکە بە سەر دەشتەکەوە نیشتبوو و دەتگوت نایەوێ بڕەوێتەوە. سریوەی هیچ شتێك نەدەهات. گەرما شێدارەکە جار بە جار بە تینتر دەبوو و لەگەڵ تەوژمی گەرماکەدا زەوییە رێك و تەڕەکە هاڵاوی لێ هەڵدەستا. ئاسمان ساو بوو و رەنگێکی شینی مەیلە و سپی و خۆڵەمێشیی هەبوو. چیاکانی تۆرووس و چیا بەهەیبەتەکەی گاورانیش کە لە دوورەوە بەحاڵ دەبینران، هەر ئەو رەنگەیان هەبوو. چیاکان و ئاسمانەکەش نوقمی هەڵمێکی خەست بوون. ئاوە بەتینەکە چیتر لە ئاگر نەدەچوو و لەو دیو تەم و هەڵمەکەوە بەحاڵ دەبینرا.

ئۆمەخان سەری بردە بن گوێی حەسەن و لێی پرسی:

ـ ئەو پیاوەی دوێنێ هات ناسیت؟ هەمووان ناسیویانە، بەڵام وەڕووی نادەن. دەترسن. چما لە تاشباشی مەزنمان ناچێ؟ یانی وەك ئەو کاتەی ردێنی درێژ و سپی نەببوو و قژیشی کەسك نەببوو... و نەچووبووە ریزی چل پیاوچاکەکەوە. ئەو پیاوەی هاتووە، تۆزێك شێوەی ئەوکاتی تاشباشی سەروەرمان دەدا. وا نییە؟ دواییش کە چووەتە ماڵی تاشباشی مەزنمان. دەڵێن لە کەپرەی ژنەکەی تاشباشی سەروەرماندا نوستووە. نەتبیست؟ هەمووان دەڵێن، ئەی قوڕ بە سەر ژنەکەی تاشباشی سەروەرمان. کابرایەکی نەدیو و نەناسی راگرتووە. تاشباشی سەروەرمان ئەو کابرایەی بۆیە ناردووە تا ژنەکەی پێ تاقی بکاتەوە بزانێ ئاخۆ هەر چاوەڕێیەتی یان نا. ئەو کابرایەی هێناوەتە سەر شکڵ و بیچمی خۆی و ناردوویەتی. هێندێکیش دەڵێن، چل پیاوچاکەکە لە کن خۆیان رایاننەگرتووە و وەریاننەگرتووە و گوتیانە ئەتۆ هەر بنیادەمەکان کردوویانی بە وەلی. ئێمە وەرتناگرین و ئیتر وەدەریان ناوە... ئەویش لە خەفەتان ئاوا نەخۆش کەوتووە... خوێن میزتووە و ئاوای لێ هاتووە. سەرۆکی چل پیاوچاکەکە ئەوەندەی بە دار لێ داوە، هەتا خوێن میزتووە. ویستوویەتی بیکوژێ، بەڵام نەیانهێشتووە. مەمی دیك دەڵێ:"خوێنی داناوە."

حەسەن خەیاڵ بردبوویەوە. لە نەکاو قسەکەی بە ئۆمەخان بڕی و بە باوەڕەوە گوتی:

ـ ئەو پیاوە هەم تاشباشی سەروەرمانە و هەمیش مامە تاشباشی خۆم. مامە تاشباش ئۆغڵووەکەی خۆم. تێگەیشتی؟ ئەو لەوێ، لە نێو چل پیاوچاکەکەشدا لە لۆکە رنینەوە ئازا بووە.... ئەوانیش لە داخان لە مامە تاشباشیان داوە. ئەویشیان بە مەرەدی بابم بردووە. کە

گەورە بووم، شوێن و مەکانی ئەو چل وەلییە لە مامە تاشباشم دەپرسم. دەچم و دارستانەکەیان دەسووتێنم. جا لە نێو لێڕەوارەکەدا چزە چز دەسووتێن. لە مامە تاشباشی من دەدەن؟... ئەو پیاوە تاشباشی سەروەرمانە. وەلییەکانی دیکە ئێرەییان پێ بردووە. دوێ شەوێ تاشباش هات و لە خەوی هەستاندم. گوتی:"ئەمنم، حەسەن. لێیان گەڕێ با بە کەیفی خۆیان چییان پێ خۆشە بیلێن. ئەمن خۆمم. بڕوا بە قسەی کەس مەکە. من ، خۆمم." هەتا بەیان ئەنگووت، هەموو سەربردەکەی خۆی بۆ گێڕامەوە. ئەو کاتەی تەپکە و داومان بۆ ریشۆڵەکان نابۆوە، یەکێك لە تەپکەکان سێ ریشۆڵەی یەك جێ پێوە ببوو. باسی ئەو رۆژەمان کردەوە. هەر لە بیری مابوو. ئەو پیاوە ئەگەر تاشباشی سەروەرمان نەبێ، چۆن لەبیری دەبوو پێکەوە ریشۆڵەمان گرتووە، ها؟ چۆنی دەزانی؟ بۆیە دەڵێم ئۆمەخان، خۆت گوناحبار مەکە، ئەو گوندییانە هەر هەموویان کافر بوون، ئەتۆ خۆت گوناحبار مەکە. باشە؟...

ئۆمەخان بە پەلەپەل گوتی:

ـ ناکەم.

رۆژی هاتنەوەی تاشباش حەسەن زۆری پێ خۆش بوو بچێتە لای و دەستی ماچ بکا و چیی بەڵا و نەهامەتیی بە سەریان هاتبوو، هەمووی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام نەیوێرابوو بچێتە کەپرەکەیان. جا چونکە نەیتوانیبوو، بە ئاواتەوە بوو تاشباش بێتە لای و هەتا کازیوەی بەیانی چاوی لێك نەنابوو و هەر چاوەڕێی ببوو و لە خەیاڵی ئەودا ببوو.

لە لای سەرووەوە، دەنگە دەنگێك هەستا. هەستان و بەرەو شیوەکەی دەم رووبارەکە رایان کرد. منداڵەکان پیرە هەڵۆیەکیان گرتبوو و پەتێکیان لە ملی کردبوو و بە هات و هاوار ئەو باڵندە زلەیانی بەولا و لادا دەکێشا. باڵەکانی هەڵۆکە شۆڕ ببوونەوە و لە عەرزی دەخشکان. دندوکی بەسەر یەکدا دابوو و هەڵنەدەپچڕا. سەری هێندەی سەری منداڵێك بوو. چاوە درشتەکانی تار و تەماوی بوون ، دەتگوت چاوی رەش و خەفەتباری ئاسکێکی نیوەزیندووی دەمی مەرگن. پیرە هەڵۆکە دەتگوت دەگریێ. منداڵەکان کل و باڵەکانیان دەکێشا و سواری پشتی دەبوون. پیرە هەڵۆ گوێی بە هیچ کام لەو سووکایەتییانە نەدەبزووت و هەر دەتگوت هیچ پێوەندییەکیشیان بەوەوە نییە و بەو پەڕی گران و سەنگینییەوە لە نێو قوڕ و لیتەکەدا هەر وا چاوەڕوانی فڕینەوە و رۆیشتن، یان مردن بوو. هەڵۆکە، وەك بەردێك بێ جوولە وبێدەنگ بوو... بێدەنگی و هێمنیی هەڵۆیەکە تا ئەو کاتە بوو کە منداڵێك شوولێکی لە چاوەی رۆکرد. لەو کاتەدا خۆی راپسکاند و باڵەکانی لە چنگیان دەرێنا و ملە درێژەکەکەی کێشا و پەتەکەی

پساند و بە نێو هەڵڵای منداڵەکاندا سێ جاران باڵی لێک دان، بەڵام نەیتوانی هەڵفڕێتەوە و بەلادا هات و لە سەر عەرزەکە کەوت و منداڵ دیسان لە دەوری کۆ بوونەوە و پەتەکەیان خستەوە ملی. هەڵیانستاند و بە راکێش راکێش بەرەو کەپرەکانیان برد.

مەمی دیك کە چاوی لە کەپرەکەی تاشباش بڕیبوو و خەیاڵی بردبووی، لە ناکاو سەیری کرد و هەڵۆکەی نەدی. کەوتەوە بیر قسەکەی مام خەلیل:"پیرە هەڵۆ لە سەر زەوی نامرن." ترسەکەی مەمی دیك زیاتر بوو. زۆریش لە منداڵەکان تووڕە بوو. چاوی بە ئاسمانەکەدا گێڕا. ئاسمانە چۆڵ و بێ هەورەکە، رەنگێکی شینی تەماویی هەبوو. جار بە جار تووڕەتر دەبوو. لە تووڕەییان دەست و پێی دەلەرزین. بەرەو منداڵەکان غاری دا و بە هەموو هێزی خۆیەوە هەرای کرد:"بەری دەن... دەڵێم بەری دەن." منداڵ دەمودەست هەڵۆکەیان بەردا و رایان کرد. هەڵۆکە هەر لەوێ لە قوڕ و خۆڵەکەدا، هەر وا سەری بەسەر پێیەکانیدا شۆڕ ببۆوە و باڵەکانی شۆڕ ببوونەوە، لەوێ بەجێ ما. مەمی دیك سەیرێکی ئاسمان و سەیرێکی هەڵۆکەی دەکرد. چیی سەیری باکوور و باشوور و رۆژهەڵات و رۆژاوای ئاسمانەکەی دەکرد،هیوابڕاوتر دەبوو. لە بەر دەمی، پیرەهەڵۆیەکی گەورەی تەڕ و قوڕاوی و پەڕ و پۆ وەریو، کەوتبوو. چیی وای نەمابوو لە تەنیشت هەڵۆکە دابنیشێ و دەست بکا بە گریان. منداڵی لاساری شەیتان و شەکەت و بزۆز، برێك لەولاترەوە راوەستابوون و چاوەڕێ بوون بزانن چ لە هەڵۆکە دەکا. کە سەری بەرز کردەوە، تینێکی لە گیانی گەڕایەوە و تیشکی هیوا و شادی گیانی تەنییەوە. لە لای ئاناوەرزاوە، هەڵۆیەکی گەورە دەهات. مەمی دیك هەڵۆکەی کن خۆی لە بیر چۆوە و هەتا هەڵۆکە بە سەر ئاناوەرزادا تێنەپەڕی و نەگەیشتە قەڵای "حەمیدە"، چاوی لێ نەترووکاند و ئەوجار بە ئاسوودەیی و خاترجەمی بەرەو کەپرەکان وەڕێ کەوت. ژنەکان پۆل پۆل لە بەردەم کەپرەکانیان ئاگریان کردبۆوە و خەریکی نان کردن بوون. بۆنی نان دەشتە تەماوییەکەی تەنیبۆوە. نانی گەرم و خۆش.

منداڵ هەر ئەوەندەی دیتیان مەمی دیك لەوێ دوور کەوتەوە، خۆیان گەیاندەوە هەڵۆکە و دیسان بە راکێش راکێش وەشوێن خۆیان دایەوە.

مەمی دیك بە "ئاشقە کەچەڵ"ی گوت:

"ئەرێ کاك ئاشق، تۆ بڵێ، تۆ بڵێ. ئاخۆ دەکرێ دوو کەس ئەوەندە لێك بچن وەك سێوێکی لەتت کردبێ؟ لەدنیایەدا لە هەر بنیادەمێك، جووتێك دروست کراوە. خوای گەورە هیچ کات بنیادەمێکی تاکی دروست نەکردووە، بەڵکو لە هەر کامە و جووتێکی خولقاندووە.

جووتێکی وەك یەك دروست دەکا. چونکە خودا خۆی تاك و تەنیایە و کەس لەو ناچێ. بەڵام ... ئەو کابرایەی هاتووە بڕێك لە تاشباش دەچێ... ئەمن دوێنێ سەرەوەرمانم دی. خۆزگە ئەتۆش دەتدی. دەتدی و هەزرا گۆرانیت بۆ دەهۆندەوە و دەکەوتنە سەر زاری خەڵکی و دەیانگوتنەوە. ئەگەر سەروەرمانت دەدی، دەتگوت ئەو چلمنە لەکوێ و تاشباشی مەزنمان لە کوێ... دەڵێن سەروەرمان یەکێکی هێناوەتە سەر بیچم و شکڵی خۆی و ناردوویەتی بەشکم ژنەکەی پێ تاقی بکاتەوە... ئەتۆ بڵێ کاکە ئاشق، ئەتۆ بڵێ..."

ئاشقەکەچەڵ دەستی لە سەر سینگی خۆی کە بەهۆی پیرییەوە بەقووڵدا چووبوو، دانا و گوتی:

ـ ئەو قسەیە راسترە. وەلییەکان دەچنە شکڵ و قاڵبی جۆراوجۆرەوە بۆ ئەوەی بنیادەمەکان تاقی بکەنەوە. دەبێ خەڵێك گوندی یالاك چاو و گوێیان بکەنەوە و لەو تاقیکردنەوەیە، سەربەرزانە دەربچن. تاشباشی سەروەرمان زۆرمان تاقی دەکاتەوە. دوای ئەوە پیت و بەرەکەتمان بەسەر دا دەرژێ. دەبێ بە ژنەکەی پێشووی سەروەرمان ـ کە ئیتر دیارە وەلییەکان ژنیان نییە ـ بڵێین قورس و قایم خۆ راگرێ و خۆ نەدا بە دەست ئەو کەسەوە کە لە سەروەرمان دەچێ، ئەگینا سەروەرمان ماڵوێرانمان دەکا.

خۆی بە دەستەوە نەدا و لە میوانداریتییەکەشی غافڵ نەبێ. چونکە ئاغامان ئەوی هێناوەتە سەر شێوە و شکڵی خۆی و وەك میوانی ناردوویەتییە ماڵەکەی.

مەمی دیك کە زانیی ئاشقەکەچەڵیش وەك ئەو بیر دەکاتەوە، دڵی خۆش بوو و گوتی:

ـ راست دەکەی. هەر ئێستا دەچمە لای ژنەکەی پێشووی سەروەرمان و هەموو ئەو قسانەی پێ دەڵێم. ئەرێ هەر بە راستی ئەو کابرایە چیی پێ گوتووە؟ گوتوویەتی:"ئەمن تاشباشم؟ من وەلیم؟" چیی گوتووە؟

سەری هەڵێنا و سەیری ئاسمانی کرد. هەڵۆکە پتر هەڵکشابوو و لە لووتکەی چیاکە سەرکەوتبوو و خەریك بوو بەرەو لای ئەو دەهات. ئاسمانەکە ساو و ساماڵ بوو و خۆڵەمێشیی دەنواند. گەرماکە زۆر بەتین بوو.

ساجی نانکردن هێندەی قەڵغانێك دەبێ. لە سەر سێکوچکەیەکی دادەنێن و ئاگری لە بن دەکەنەوە. کە سوور بۆوە، هەویرەکەی لە سەر پنەیەك بۆ پان دەکەنەوە و ئەمدیو ئەودیوی دەکەن هەتا جوان دەبرژێ. بڵێسەی ئاگر لە بن ساجی ژنە نانکەرەکانەوە بەرز دەبۆوە و ژنەکانیش باسی ئەو پیاوەیان دەکرد کە هاتبووە سەر بیچم و شکڵی تاشباش. پێیان سەیر بوو.

نەیاندەزانی چ لەو پیاوە بکەن. دیارە ئەو کابرایەی لە شێوەی تاشباشدا بە میوانی هاتبووە ماڵی ژنەکەی خۆی، زۆریش لە تاشباش نەدەچوو.... بەڵام تۆزێکیش لەو دەچوو. روخساری هیچ ئاسەوارێکی نوورانیبوونی پێوە دیار نەبوو. روخسارێکی پڕ لە چرچ و لۆچ و رەش و وشک و رەق و تەق... رێك وەك دەموچاوی بۆر و خەمبار و پەرۆشی گوندییەك. هەر دەتگوت هەزار ساڵ لە بەر تاو ماوەتەوە.

ژنەکان دەیانویست بزانن ئاخۆ ژنەکەی پێشووی تاشباش لەگەڵ ئەو پیاوە نووستووە یان نا. هیچیان لەوبارەیەوە بە یەکتری نەدەگوت، بەڵام هەر هەموویان بیریان لێ دەکردەوە. چما دەکرێ رووت و قووت پێکەوە لە بن کەپرێکدا بووبێن و پێکەوە... ئەگەر دەستیان تێکەڵ کردبێ، بڵێی تاشباش لە چیای چل وەلییەکە، لە نێو چل وەلییە ردێن کەسکەکەدا چ بکا؟

لەوانەشە ئەو کابرایە هەر تاشباش خۆی بێ. تاشباشێکی ماندوو و شەکەت و تۆقیبوو، تێهەڵدراوی دەستی حوکمەت و ماندوو و برسی، کە ئاوای بەسەر هاتبێ. لە دڵەوە دەیانزانی ئەو کابرایە، تاشباش خۆیەتی. مەمەد تاشباشە خۆیەتی. هەر کام لە بەر خۆیەوە وای بیر دەکردەوە بەڵام هەوڵی دەدا رێك بڕوا بە پێچەوانەی ئەو شتە بکا. لەگەڵ ئەوەشدا سەریان لێ شێوابوو و نەشیاندەزانی چی بکەن. لەوانەشە، لەوانەشە، ئەو تاشباشە هەر وەلی نەبووبێ، ئەو نوورەش کە دەبارییە سەر ماڵەکەی، هەر قسەی پووچ و خۆڕایی بووە. کێ ئەو نوورەی دیتبوو؟ چما خۆی نەیدەگوت، بنیادەمێکی گوناحباری وەك من چۆن دەبێتە وەلی؟ چما وەلییەکان سەرما دەیانبا و رەق هەڵدێن؟ گوندی هەر چیی بە مێشکیاندا دەهات، دەمودەست بڕوایان پێ دەکرد.

ژنەکان کە ئاوایان بیر دەکردەوە، کەوابوو پیاوەکان کە دوو رۆژ بوو بێکار و بێ بار کەوتبوونەوە، چۆنیان بیر لێ دەکردەوە؟ ئەوانیش رێك وەك ژنەکان بیریان دەکردەوە. تەنیا کوێخا سەفەر جیاواز لەوان بیری دەکردەوە. ئەو زۆر دڵی بەوە خۆش بوو و دەیزانی ئەو کابرایە تاشباش خۆیەتی و ئاوا شەکەت و داماو بە داغێکی مەرگ بە نێوچاوانەوە گەڕاوەتەوە. تاشباش ئۆغڵو کە هاتەوە نێو گوندییەکان، هیچ پێی وانەبوو ئاوای لەگەڵ بجووڵێنەوە. ئەو کە بڕوای بە وەلییایەتییەکەی کردبوو، هاتبۆوە نێو گوندییەکان و چاوەڕێ بوو ئەوان هەزار جار پتر لە جاری جاران بیپەرستن و خۆی بە سەر پێڵاوەکانیدا بدەن. لە داخی بەهێند نەگرتنی گوندییەکان مردبوو.

سەفەر دەیزانی دوای ئەوە چ دەقەومێ. هێندێ لەو رووداوانە لە خۆوە و هێندێکیشیان بە فیتی ئەو دەقەومان و بڕێکیشیان سەفەر خۆی رێکی دەخستن.

"ئێستا له چنگی خۆم دای تاشباش ئۆغلو. پادشای پادشاکان. وەلیی وەلییەکان تاشباشی و سەروەرمان، ئێستا دایك و خوشکی خۆت و ئەو وەلییایەتییەشت دەگێم. جا دەبینی چۆن لە زارت دەڕیم، لێم دەبییە وەلی و حەرامی دەکەی خەڵك قسەم لەگەڵ بکەن... ها؟ گوندی ناچار دەکەی تۆ بپەرستن، ها؟ ئەتۆ گیانت لێ نەستاندم، ئەمنیش تۆ ناکوژم. بەڵام چارەڕەشت دەکەم. لە خۆمت خراپتر بە سەر دێنم. ریسوای عالەمت دەکەم. ئاخرییەکەی وەك مەلێکی بریندار کەوتیتە دەستم. هەر وەکی چۆن ئەو "عەلی"یە درێژە کەوتە دەستم."

وەك پشیلەیەکی نێچیرەکەی خۆی خواردبێ، لێوەکانی لستەوە:"دیارە عومەر تا ئێستا مرێمۆکی کوشتووە. عومەری جوامێر و ئازای مـن، کوڕم عومـەر. عومـەری عومـەرەکان. دەبێ زەماوەندێکت بۆ رێك بخەم هەموویان سەریان سوور بمێنێ. پێم گوت عومـەر سەری مرێمۆکم بۆ بڕە، سەری ئەو پیرەژنە گڵاوە. تەرمەکەی لە نێو مالچەکەی "عەلی"یە درێژی گەوواددا راکێشە و دەرگاکەش داخە با ژەندەرمە بیبەت لە داری بدەن. بەبێ ئەوەی سەیری فرمێسکی چاوی بکەن، بە پەتییەوە بکەن. وەختێکی "عەلی"یە درێژ لە سێدارە دەدەن دەچم سەیری دەکەم. دەبێ تاشباش و هەروەها "عەلی"یە درێژیش تێ بگەن کە دوژمنایەتیی من یانی چی...

دەبێ ئەو سەگبابانە بزانن... ئەو سەگی سەگبابانە."

ددانەکانی چیڕ کردنەوە:"سەگبابینە. ئاوا لە من دەکەن؟ ها؟"

پێی حەیف بوو بڕیاری دابوو تاشباش نەکوژن.

منداڵەکان کە بە هەڵڵا و هەنگەمەیەکی سەیر، هەڵۆ نیوەزیندووەکەیان بە راکێش راکێش دەبرد، بە بەردەمیدا تێپەڕین. هەڵۆکە هەوڵی دەدا بە شوێنیاندا غار بدا. دیار بوو بە هەموو تین و هێزەوە هەوڵ دەدا نەکەوێ و راینەکێشن. سەر و زاری نوقمی ئارەقە و خوێن بوو. هەموو گیانی قوڕ و لیتە بوو. منداڵەکان پەڕەکانیان هەڵکێشابوو و پێوەیان نەهێشتبوو. هیچ باڵندەیەك هێندەی هەڵۆی بێ پەڕ و پۆ لێقەوماو و داماو نییە.

سەفەر لە ناخی دڵەوە قاقایەکی کێشا.

"تاشباشی مـن، پادشاکەی مـن، ئاغای مـن، ئاوات لێ دەکەم، تێگەیشتی؟ تووشی گونڕەشی خۆت بووی؟... دایك و خوشکت بگێم... تێگەیشتی...."

منداڵەکان کە هەتا نێوقەدیان قوڕاوی ببوون، گەیشتنە کەنارە لەکەی جەیحان. یەکێکیان کە لە هەمووان گەورەتر بوو، هەڵۆکەی هەڵگرت و فڕێی دایە نێو ئاوە خۆڵەمێشی و قوڕاوییەکەی رووبارەکەوە. ئاوەکە هەڵۆکەی برد. ساتێك سەری هەڵۆکە چووە بن ئاوەکە و هاتەوە سەرێ.

سەفەر کە لە دوورەوە سەیری منداڵەکانی دەکرد. گوتی:

ـ بارەقەڵڵا منداڵ. دەبێ ئەو هەڵۆ گڵاوانە ئاوایان لێ بکەی.

حەسەن خەیاڵ هەڵیگرتبوو: "دوێ شەوێ بەبێ ئەوەی چاو لە سەر یەك دانێم، هەتا بەیانی هەر چاوەڕێی مامە تاشباشم بووم. نە هاتە لای من و نە لای بابیشم. سەیری هیچ کوێ ناکا. بەردەوام سەری بەرداوەتەوە. هەر بە راستی نازانێ بابمیان شڕ ودڕ کردووە؟ چما بابم برادەری ئەو نییە؟ گوندی لێی دەترسن و لێی ناچنە پێشێ. بەستەزمانە بەتەنێ ماوەتەوە. ئەو گوندییە فێڵبازانە خەریکن خۆیان دەخەڵەتێنن. هەی درۆزنانە. دەڵێن تاشباش هاوشێوەکەی خۆی ناردووەتە لای گوندییەکان. ئەمن ئەمشەو دەچمە لای تاشباشی مەزنمان، لای مامە تاشباشی خۆم. نیوەشەوێ کە هەموان خەوتن، دەچم و هەڵیدەستێنم. زۆرم بیر کردوو زۆر زۆر... چەندە باش بوو هاتەوە. ئاخر وەلییایەتی چیی لێ هەڵدەوەرێ؟ ژیان لەگەڵ چل پیاوچاکەکە چ سوودێکی بۆی هەیە، هەر ئاوای باشترە...."

**زولەیخا هەر دەتگوت سیحری لیّ کراوە. نەیدەزانی مەمی دیك بۆ وا دەکا. دڵی کەیلی خەم و ئازارە. هەر دیّ و مەمی دیکی پتر خۆش دەویّ. بەبیّ ئەوەی مەمی دیك بزانیّ، ئەو کون بە کون وەشوێن مەمی دیك دەکەویّ.**

## ۳۱

گەواڵ گەواڵ هەوری سپیی پەمەیی بە ئاسمانەوە دەخوشین. لە یەکێك لە گەرمترین ڕۆژەکاندا، بارانی بە غوڕەم هەواکەی گەرمتر کرد. گەرما، دەشتەکەی چوکووراوای کە سێبەرەکانی نوقمی تەم و مژ بوو و هەڵمی لیّ دەڵدەستا، دەستەوە و تێدەپەڕی. لەگ لەگە لۆق درێژەکان لەو ڕەزرا پڕ لە تەم و مژ و هەڵماوییانەدا ملیان دەکێشا و لە خۆڕا بەو لاو لادا دەسووڕانەوە. مارێکی ڕەش کە جار و بارە ڕەنگی پێستەکەی کەسك دەچۆوە، لە بن پنچکە درووەکی قوڕاویدا خۆی کێشابوو و خەونووچکە دەیبردەوە. تۆزێك دواتر لەگ لەگێك بەلارە لار دەگەیشتیّ و بە دندووکێك هەڵیدەگرت و هەڵدەفڕی. گەواڵە هەورەکان، گەرم و تار و قورس و تۆزێکیش فێنك، بە ئاسمانەکەدا دەخوشین و سێبەرەکەیان، دەشتە پان و بەرینەکەی خاڵ خاڵ دەکرد. سۆزەی بایەك چییە نەدەهات. خۆرەتاو لە ئاسماندا دەتگوت سینییەکی خڕی زیویینی درەوشاوەیە.

لە نێو گەواڵە هەورە سپییە لۆکەییەکاندا، هەڵۆیەکی گەورە باڵەکانی کردبوونەوە. هەورەکان بە بەردەمیدا تێدەپەڕین. سێبەرە درشت و ڕەشەکەی کەوتبووە سەر زەوی، لە سەر چڵ و لاسکە گەنمەکان و نەدەجوولا. ماوەیەك لە بن هەورە سپی و نوورانییەکەدا بەرەو باشوور دەڕی و تاوێك دواتر ڕێی دەگۆڕی و بەرەو دەریای سپی بای دەدایەوە و دەگەڕایەوە و لە سەر ئاناوەڕزا بەرەو باشوور باڵەکانی تەواو لێك دەکردەوە و بە هێوری بە ئاسمانەکەدا دەخوشی. جاری وابوو بازنەی گەورەی دروست دەکرد و بەرەو سەر هەڵدەکشا و لە پشت هەورەکانەوە لە

چاوان ون دەبوو و چەند سات دواتر دیسان دەردەکەوتەوە و بە سوورە سوورِ ملی لە هەلکشانێ دەنایەوە. رووناکی و سپیاییە زولاڵەکەی هەورەکان لە شینایییە تەرِ و تازە و بێگەردەکەی ئاسماندا دەدرەوشانەوە. هەلۆکە لە شینایی ئاسمانەکەدا بە سوورە سوورِ و بەسپایی هاتە خوارێ و بەرەو لۆکەجارەکە رۆیشت و لەسەر ئەوێ بێجوولە لەنگەری گرت.

گەرماکە تاڵ تاڵ ببوو. لە گەرما بەتینەکەدا، دەتگوت بە ملیۆنان داو و پۆ لە نێوان زەوی و ئاسماندا کێشراون. ئەوە هەرەتی گەرمایە.

کرێکارەکان لە تەنیشت یەکترەوە ریزیان بەستووە. ریزێکی درێژ، لەوانەیە بگاتە نیزك بە سێ سەت مەتر. چوار ریزی سێ سەت مەتری لە مەزراکەدا دەبینرێ. هەر هەموو خۆڵاوین و دەڵێی لە خۆڵەمێشت هەلکێشاون. وێدەچێ لە بەر ئەو تاوە قورسەدا بچووکترین جوولەیان نییە. لە ریزێکیاندا، لە نزیك رووبارەکەوە، تاشباش ئۆغلو و مەمی دیك و گوملکسیز ئۆغلو و زەڵەجە، خەریکی کارکردنن. کرێکارەکان ماندوون و برستیان لێ براوە و بە داهێزراوییەوە لە سەر زەوییە وشك و قەڵشت قەڵشتەکە، قۆزاخەی لۆکە باران لێدراوەکەی سەر عەرزی خڕ دەکەنەوە. لە پێشدا قۆزاخەکان دەتەکێنن و خۆڵە و قورەکەیان لێ دەکەنەوە و دوایش دەیخەنە نێو قەرتاڵەکانیانەوە. دوا نیوەرۆیە و پیاوەکانی ئاغا، لە پشتەوەیان چاویان بەسەریانەوەیە. بێت و قۆزاخەیەك بەر بێتەوە یان بەجێ بمێنێ، دەیکەنە قیامەت. چیی بە زاریاندا دێ نایگێرنەوە. لە پشتەوە گوندییە جلوبەرگ دراو و کۆنە و خۆڵاوی و ئارەقاوییەکەوە، کۆمەڵێك پیاوی پێڵاو سپیی جلوبەرگ ئۆتوو کراوی کڵاوی حەسیری لەسەر و چەتری رەش بە دەستەوە، هەر کامەیان وەك فەرماندەیەك و بەو جۆرەش لەخۆ بایی... بە بێزاری و تووڕەییەوە سەیری ئەو بنیادەمانەش دەکەن کە تاوا بە داماوییەوە لۆکە دەرِننەوە. هەر کەس قۆزاخەیەکی لە قورِ چەقیوی لێ بەجێ بمێنێ، شەقێکی توند دەخوا.

لاسکە لۆکەکان دوای بارانەکە هەڵەسوونیان هێناوەتەوە و گوڵیان کردۆتەوە. گوڵە زەرد و سوور و سپیی و مۆرەکان بە سەر لاسکە بەرزەکانی لۆکەکانەوە کە دەگەنە سەر نێوکی بنیادەم، پشکووتوون. مەزراکە نوقمی گوڵە.

ئەگەر کریچکارەکان ئەو جوولە لە سەرخۆیانەیان نەبێ، لەگەڵ کۆگا خۆڵی دەم خەرەندێك فەرقیان نابێ.

گۆملیکسیز ئۆغلو چلە لۆکەکەی پێش خۆی نیشانی "عەبدییە خوار" دا و گوتی:

ـ بروانە، بزانە خودا چ بەرەکەتێکی بەو چلە داوە.

چلێکی گەڵا کەسك بوو. لقە درێژەکانی لە بەر قورسایی ئەو قۆزاخانەی باران نەیتوانیبوو بە عەرزیان وەربکا، داهاتبۆوە و قۆزاخە سەوزە خەت سوورەکانی، تازە زاریان کردبۆوە و

خەریك بوون بپشکوێن... و گوڵە درشت و زەردەدان، زەردە روون و زولاڵەکان کە دەتگوت تیشکێکی نادیار لە پەلکەکانیانی داوە.

ـ لاسکە لۆکە، بۆ دووەمین جار بەر دەگرنەوە. ئاورێك لە دواوەت بدەوە. ئەو لقك و چلانەی رنیومانەتەوە، خەریکن دیسان گوڵ دەگرنەوە. ئێمە ئەمساڵ هەتا زستانێ لێرەین. دیارە سێ جار بەر دێننەوە. ئەوە بەرەکەتی خودایە. ئەمن لەوەتەی دێمە چوکووراوا، تا ئێستا مەزرای ئاوام نەدیبوو. ئەگەر ئەو بارانە نەدەباری... هەر بە راستی با لۆکە قوڕاوییەکان تێکەڵی ئەویتر نەکەین. لەوانەیە ئاغا بەو بیانووەی کە لۆکەی قوڕاوی قورستر دەبێ، پارەمان لێ بشکێنێ.

"عەبدییە خوار و خێچ" گوتی:

ـ ئەمن ئاغام دیت. پیاوێکی باشە. دەموچاوێکی نوورانیی هەیە. پێی گوتم قوڕاوییەکەشی وەك خاوێنەکەی هەر بە بیست قرۆش... هەمووی یەکێکە. گوتی بۆ پێت وایە ئەگەر هەژدە قرۆش بدەم بۆ کیلۆیەك لۆکەی قوڕاوی، پێی دەوڵەمەند دەبم؟ ها دەوڵەمەند دەبم؟ بڵێی و نەڵێی ئاغاکەمان پیاوێکی باشە.

گۆملکسیز ئۆغلۆ گوتی:

ـ هەی درۆزنانی... ئاخر ئەتۆ ئاغات لە کوێ دی؟ بۆچی درۆیان دەکەی ماڵ کاول. ئەتۆ لەوەتەی پێمان ناوەتە ئەو مەزرایەوە، قەنەکێشێکیش لە من دوور نەکەوتوویەتەوە. خۆ ئاغاش نەهاتووەتە ئێرە. دەی باشە ئەی ئەو قسانەت لە کوێ بیستووە؟

عەبدی گوتی:

ـ ئەمن بە راستمە، پیاوێکی مەزرایەکی ئاوا باشی هەبێ، ئەگەر لە سەر بیست قرۆش ساغ بووبێتەوە، دیارە بیست قرۆشەکە دەدا. ئەوجار چما باران خەتای ئێمە بوو؟ چما ئێمە لۆکەکەمان بە لە قوڕ و خۆڵ وەردا؟ ئەوەتا سەیر بکە چۆنی خاوێن دەکەمەوە.... دەی سەیر بکە...

"عەلی"یە درێژ لە کەپرەکەیدا نووستبوو. هەلا هەلایان کردبوو و نەیدەتوانی ببزوێ. کە پشووی دەکێشا، هەموو گیانی ژانی دەکرد. ماندوو و شەکەت بوو... ئۆمەخان بەسەر سەرییەوە دانیشتبوو. هەر تینووی دەبوو ئاوی بە دمەوە دەکرد و مێش و مەگەزە زل زلەکانی پاش بارانی لە دەموچاوی دەر دەکرد. دەستەکانی عەلی، لەگەڵ ئەوەدا کە ژانیان دەکرد، دیسان هەر لەکار نەکەوتبوون. لۆکەی ئەو قۆزاخانەی دەردەکێشا کە ئەلیف کۆی کردبوونەوە و

هێنابووی لە پێشی ڕۆی کردبوو. هەر جارێکی لۆکەی دەردەکێشا، لە بەر ئازار جینگڵی دەدا، بەڵام دیسانیش هەر ڕانەدەوەستا.

ئۆمەخان پێم وایە بۆ دەیەمین جاری بوو دەیگوت:

- تاشباشی سەروەرمان هاتووەتەوە.

بەڵام عەلی گوێی نەدەدایێ.

- وەلییەکەمان تواوەتەوە. هەر نەماوە. نەخۆشە. ئێستا ئەوە لە تەنیشت ژنەکەیەوە لۆکە دەڕنێتەوە. هیچ کەس تەنانەت ژنەکەشی بەهێندی وەرناگرێ. دەڵێن تاشباشی مەزن، پیاوێکی هێناوەتە سەر شکڵ و شێوەی خۆی و ناردوویەتە ئێرە بۆ ئەوەی هەم گوندی و هەمیش ژنەکەی پێ تاقی بکاتەوە.

کە ئۆمەخان باسی تاشباشی دەکرد، عەلی بزەی دەهاتێ بەڵام ئۆمەخان نەیدەدی.

تاشباش لە نێوان زەڵەجە و ژنەکەیدا لۆکەی دەڕنییەوە. جاری وابوو وا نوقمی بیر و خەیاڵ دەبوو، دەستەکانی لە جووڵە دەکەوتن و وەك بەردێك وشك دەبوو. لە پڕ وەخۆ دەهاتەوە و بە خێرایی لۆکەی لە عەرزی هەڵدەگرتەوە و فووی لێ دەکرد و دواییش لە دەستی خۆیدا لە بیری دەچووەوە و هەر وا لە جێی خۆی دەحەپەسا.

سەرسووڕمانەکەی یەکەمجاری گوندییەکان لە دیتنی تاشباش ڕەویبۆوە. ئێستا هەمووان لە بنەوە سەیریان دەکرد. چاویان بەسەر هەموو جووڵە و هەڵسوکەوتێکییەوە بوو و هەر جووڵەیەی بە شێوەیەك لێکیان دەدایەوە.

لەو نێوەدا کوێخا سەفەر هاتە لای گوندییەکان. جلوبەرگێکی جوان و خاوێنی لەبەر کردبوو. سمێڵە ڕەشەکانی بادابوو و وەبریقەی خستبوون. چەکمە بۆیاغکراوەکانی و پانتۆڵێکی ڕەشی لە پێ کردبوو و چاکەتێکی ئەستووری لە قوماشی ئینگلیزی کە لە قاچاغچییەکانی کڕیبوو، لە بەردابوو. کراسەکەی خەتخەتی و بۆینباغەکەی سوور بوو. جانتای ڕاوەکەی بە دەستی چەپییەوە و تفەنگەکەشی لە شانی کردبوو. ئارەقەی کردبوو. هات و لە بەر دەم گوندییەکان ڕاوەستا. لاقەکانی لێك ڕەواندەوە و دەستی ڕاستەی لە کەلەکەی نا و بە دەستی چەپەی جگەرەکەی بۆ لێوی برد و مژێکی لێ دا و دووکەڵەکەی بە بادا کرد. ماوەیەك هەر وا بەرانبەری گوندییەکان ڕاوەستا. ئەوجار وردە وردە بەرەو تاشباش ئۆغڵو وەڕێ کەوت و لە بەرانبەری ڕالوەستا و بە دەنگێکی وەك هەورەتریشقە و بە لەبزێکی گاڵتەجارانە و تۆڵە ئەستێنانەوە گوتی:

- بەخێر هاتییەوە، خێر و بەرەکەتت لەگەڵ خۆت هێنا، تاشباشی مەزن...

لەبز و دەنگەکەی کە نیشانەی تۆڵە ئەستاندنەوەیەکی سامناکی پێوە بوو، کاری لە سەر ناخی تاشباش کرد.

ـ یانی، دیسان هاتییەوە نێومان مەمەد ئەفەنی؟ دیسان دەتەوێ بڵێی وەلی و پیاوچاکی؟

پێکەنی و لە سەر قسەکەی ڕۆیشت:

ـ لە دوای تۆوە، گوندی هەتا ئێستا یەك قسەشیان لەگەڵ من نەکردووە. تەنانەت ژن و منداڵەکەشم. خراپەیەك لەگەڵ کردووم تاشباشی مەزن. بیستوومە مولازم زۆری تێهەڵداوی. حەوتوویەك لە سەر یەك بە پازدە ژەندەرمە لێیان داوی. بیستم شەش مانگ خوێن میزتووی. دوای ئەوە لە تەویلەیان کردووی و دوای ئەوێش بردوویانی بۆ شێتخانە. باشە چۆن لەوێ رات کرد و هاتییەوە؟ پێت وایە ژەندەرمەکان لێرە ناتدۆزنەوە و کەلەپچەت لە دەستی ناکەن؟ ئەوەش پەرجۆ و کەراماتی تۆ. هەر دەرقەت من دەهاتی. سەیر کە بزانە گوندییەکان هەر سەیرێکیشت دەکەن؟ تەنانەت ژنەکەشت پشتی تێ کردی و لە سەرت وەجواب نەهات. هەر یەك نەفەریش نەهات بڵێ کەرت بە چەند. چما پێشتر هەموو ئەو شتانەم پێ نەگوتبووی؟ چما لە یەك بە یەکی ئەو بەلاّ و نەگبەتییانە ئاگادارم نەکردبوویەوە؟ ئێستاش ئەگەر هەستی و بانگ بێڵی و بڵێی کوێخا سەفەر پیاوێکی چاکە و ئەمن خراپم ناسیبوو، پێت وایە بە قسەت دەکەن؟ ئەگەر ئەمریان پێ بکەی و بڵێ بچن کوێخا سەفەر بکوژن، پێت وایە چ دەکەن؟ هەر مێشێکیشیان لێ میوان نابێ. ئیتر سەردەمی ناغایەتی و مەزنایەتیی تۆ بەسەر چووە. دەزانی چیت پێ دەڵێن؟ دەڵێن ئەو کابرایە هاوشێوەی تاشباشە. دەڵێن، تاشباشی مەزن لە چیای چل سوارەی غەیبییە. دەی ئێستا ئەگەر پێیان دەوەستی و باشاریان دەکەی، کارێك بکە بڕوات پێ بکەن کە تۆ هەر مەمەد تاشباشەکەی جارانی. دەی باشە... خۆش بی. ئاوات بە سەرەوە ناچێ. لە چاوی منیشی مەبینە.

هەر هەموو ڕاوەستابوون و چاوێکیان لە کوێخا سەفەر و چاوێکشیان لە تاشباش بوو کە لە سەر جێی خۆی وشك ببوو و گوێی دابووە قسەکانی سەفەر.

سەفەر بە هەنگاوی بەرز و خێرا بەرەو کەناری ڕووبارەکە وەڕێ کەوت.

مەمی دیك کە دەیویست هەمووان گوێیان لە قسەکانی بێ، بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ خەریکن کڵاومان لە سەر دەنێن. ئەمن هەر دوێنێ، ناغاکەمانم دی. هیچ لەو پیاوەی ئێستێ نەدەچوو. بە خوای ئەو ماستە بێ موو نییە.

گوندی ئاوڕیان دایەوە و بە ترسەوە سەیرێکی تاشباشیان کرد. هەر هەموویان گوێیان لە قسەکانی کوێخا و مەمی دیك ببوو.

"عەبدییە خوار" قسەی پێ بڕی و چوو لە پێش تاشباشەوە راوەستا و بەسەریدا گوڕاندی:

- هۆی کابرا ریوەڵە، کە خۆت لێ کردووینەتە تاشباش، هیچ کوێت لە تاشباش ناچێ. ئەوە دامنا تاشباشیش بووی، چ دەبێ؟ ئەگەر ئـەتۆ وەلـی و پیاوچـاکی، دەی هـەر لێـرە وەك دار و بەرد وشكم بكە، ئیفلیجم بكە. دەی بمكوژە، دەی خێرابە دەی.

پێی چەقاندبوو كە ئەگەر لە دەستت دێ بمكوژە و لەو دەمەش دا لە دڵی خۆیدا لەوە دەترسا كە دەمێكی دی دەمرێ. رەنگی بە رووەوە نەمابوو و دەلەرزی. هۆشی بەخۆیەوە نەمابوو:

- ئەتۆی چڵمن پیاوچاكی؟ وەلییەكان چما دەهێڵن لە بەر چاوی ئەو هەمووە خەڵكە جنێویان بدەنێ و سووكایەتییان پێ بكەن؟ دەی بمكوژە دەی. زمانم لە زارمدا وشك بكە. دەی، دەی، زووبە دەی...

بە داهێزراوییەوە قاقایەكی كێشا و لە سەری رۆیشت:

- ئەتۆ كاری وات لە دەست نایە برالە. ئەتۆ تەنانەت بنیادەمێكی وەك منیشت پێ ناكوژرێ. ئەی كوانێن كەراماتەكانت؟

هەر گوتی و رستی... سات بە ساتیش چاوەڕوان بوو بكەوێ و بمرێ، یان زاری خوار بێ و یان دەست و پێی ئیفلیج بێ. لە ترسان شێت ببوو، ئەگینا یەكسەر تاشباشی هان دەدا. بەڵام هیچ شتێك نەدەقەوما. شەلاڵی نارەقە ببوو، لە ترسان دەنگی دەرنەدەهات. گەڕایەوە و تفێكی رۆكرد و بە غاردان وەشوێن سەفەر كەوت. سەفەر لە دەم چەمەكە چاوەڕێی بوو. سەفەر گوتی:

- ئەی بارەقەڵلا عەبدی ئاغا. هانێ ئەوەش پاكەتە جگەرەیەك یاخوا نۆشت بێ. بیكێشە و كەیفێ بكە.

"عەبدییە خوار" لە سەر تەپۆڵكێكی بچووك دانیشت. هانكە هانكی بوو. هەموو گیانی دەلەرزی. جگەرەیەكی لە پاكەتەكە دەرهێنا و دایگیرساند و مژی لێ دا.

سەفەر گوتی:

- زۆر ترساوی لەوەی نەكا ئەوە كابرایە وەلی و پیاوچاك دەربچێ.

لە مەزراكەوە دەنگی گۆملكسیز دەهات كە دەیگوت:

- كارێكی خراپیان كرد. ئەگەر ئەو پیاوە تاشباش ئۆغلو بێ، ئەوە هەم ئەوان قوڕیان وەسەر بووە و هەم ئێمەش كە راوەستاین و سەیرمان كردن. ئەگەر تاشباشی مەزنیش پیاوێكی هاوشێوەی خۆی ناردبێ بۆ تاقیكردنەوەمان، ئەوە هەر زۆر خراپتر. ئەگەر هیچ كام لەوانەش

نەبێ، خۆ ئەو کابرایە پیاوێکی لێقەوماوە و پەنای بۆ ئێمە هێناوە، بۆیە ئاواش هەر قورمان بە سەر. باشە بنیادەم چۆن دەتوانێ ئاوا لە پیاوێکی غەریب بکات کە هانای بۆ هێناوە ها؟ دەی بڵێن چۆن دەبێ ئەو دەردەی بدرێتێ؟

هات و لە بەرانبەر تاشباش کەوتە سەر چۆك:

ـ براڵە، هەر کەس هەی ببە. جا تاشباشی مەزغانی، یان هاوشێوەکەی، یان غەریب و بێکەسێك، لێمان خۆش بە، لەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ تۆ کرا.

تاشباش ئۆغلو بە نیشانەی سوپاس، سەیرێکی کرد. چاوەکانی نوقمی فرمێسك بوون.

گۆملکسیز هەستا و باسکەکانی لێك کردنەوە، بەرەو گوندییەکان چوو و گازی کرد:

ـ سەیر کەن. بڕوانن. ئەو داماوە ئەوە دەگری. حەقێتی بگری. ئەگەر ئەوەندەیان قسەی سووك و چرووك بە ئێوەش گوتبایە، دەگریان. خودا بکا، ئەو پیاوە وەلی بێ، جا ئەو دەم هەم سەفەر و هەم ئێوەش دەبینن چیتان بە سەر دێ.

سەیری ئاسمانی کرد. هەورێکی رەش لە سەر چیای تۆرووسەوە دەهاتە پێش. شنەیەکی فێنك هەڵی کرد و تۆزێك دواتر کەوتەوە.

ـ سەیر کەن، جوان سەیری کەن. ئێستا دەزانن قسەی سارد و سووك و جنێودان بە یەکێکی بێ کەس و غەریب یانی چی. باران خەریکە دایدەکا. لێگەڕێ با بارانە لافاوەکەی چوکووراوا بباری، جا ئەو دەم بزانم چۆن لۆکە دەڕننەوە. جا دەتانبینم چتان بە سەر دێ. دەی بڕۆن، دیسان چیتان بە مێشکیدا دێ، بەو غەریب و بێ ئەنوایەی بڵێن...

لە دڵی خۆیدا دەیگوت، کاری چاکم کرد. تاشباش ئۆغلو، منی زۆر خۆش دەویست، ئێستا لە جارانیشی خۆشتر دەوێم. دوای ئەوە چ بچێتە چیای چل سوارەی غەیبی و چ لێرە بمێنێتەوە، ئەمن پارووم لە رۆنێ دایە.

ئەو خەیاڵە پتری هەژاند و لەسەری رۆیشت:

ـ ئەنگۆ بەشەر نین. ئەگەر ئەنگۆ ئینسان بوایەن، ئاواتان لە وەلی و ئەو کەسانە نەدەکرد کە پەنایان بۆ ئێوە هێناوە. چما نابینن ئەو لێقەوماوە وەزعی چۆنە؟ هەر دەڵێی چل شەو و رۆژان نانی نەخواردووە. دەڵێی حەوت ساڵان نەخۆش بووە. ئەنگۆ قەت ئازا و رزگار نابن. لە بەر ئەوەی بەزەییتان نییە. ئێستا ئەگەر ئەو پیاوە تاشباش بێ، چ دەکەن؟ بەخوای بەردتان لێ دەبارێ. دەزانن بۆچی پێی دەڵێن تاشباش (سەر بەرد)؟ چونکە بەر دەبارێنێ بە سەر زاڵم و سپڵە و ئەو کەسانەدا کە ناهەقی لە خەڵکی دەکەن. نەك هەر خۆی، بەڵکو باو و باپیرەکانیشی وەلی بوون.

جارێکی دیش کڕنۆشی بۆ تاشباش بردەوە و گوتی:
ـ براله، برای ئازیز، له من و ماڵ و منداڵم خۆش به. سزامان مەدە. هەر کەسێکی کەیفی خۆتە.
بە قەڵافەتێکی گریاو و داماوانەوە، بە لارە لار هەستا و ئامـاژەی بـۆ لووتکـەی چـیاکانی باکوور کرد:
ـ سەیر کەن، بڕوانن، وا دێ. بارانێك دایدەکا، کە ئەگـەر بێـت و هـەر یـەك ڕێژنـەش بـێ، حەوتووەك لەکارمان دەکا. ئەو وەختە هەر هەمووتان تێدا دەچن. جا ئێستا بڕون و هەر قسەی سارد و سووك بەو کابرا داماوە بڵێن کە پەنای بۆ هێناون.
ئاشقە کەچەڵە دەستە گەورەکانی لە عەرەزەکە کوتا و نووزایەوە. ردێنە تەنکەکەی خۆڵاوی بوو. دەنگی بە حاڵ دەهاتە دەرێ:
ـ بارانەکە وا دێ و نزیك دەبێتەوە. بارانێکی دیکە ببـارێ، تێـدا دەچـین. دەی هەسـتن، بـە هەر هەموومان نزای باران نەبارینێ بکەین. دەی هەستن. بە هەموو تینی خۆیەوە گوڕاندی:
ـ بەرەو دەم جەیحان بڕۆن. هەر کەسە و بەردێك و گلمتکێك هەڵگرێ. ئەتۆ لە پێـشەوە بـڕۆ گۆملکسیز. ئەتۆش دەی هەستە هاوشێوەی وەلییەکە.
گۆملکسیز داهاتەوە و بەرد و گلمتکێکی هەڵگرت و رووی کردە ئاشقە کەچەڵە و گوتی:
ـ بەردەکان زۆر بچووکن و کلمتکەکانیش دەمودەست ورد دەبن.
ئاشقە کەچەڵ گوتی:
ـ دەی باشە، کەوابوو بڕۆن هەر کامە و قۆزاخەیەکی پشکووتوون لێ کەنەوە. گەورە بێ.
گوندییەکانی یەکەم ریز، هـەر کەسـە و قۆزاخەیـەکی درشـتیان لـێ کـردەوە و وەڕێ کـەوتن. سـێ ریزەکەی دیکەش وایان کرد. گۆملکسیز ئۆغلۆ و تاشباش لە تەنیشت یەکترییەوە دەڕۆیـشتن. تاشـباش لاقەکانی تێك دەهاڵان و لێك هەڵدەنگووتن. بە موو بەنـد بـوو. گەیـشتنە دەم چـەمەکە. تاشـباش لـە سەر پێیان خۆی پێ نەگیرا و بەلادا هات. گوندییەکان لە دەم چـەمەکە ریزێکـی دووردودرێـژیان بەسـت. بێدەنگ بوون و هیچیان نـەدەگوت. هـەر کەسـە و قۆزاخەیـەکی پـێ بـوو. جـەیحان بـە رەنگـە سـوورە تۆخەکەیەوە مەند و هێمن بە بەردەمیاندا دەڕۆیـشت. هەڵچوونەکەی نیشتبۆوە. کۆگـای تـوێکڵی دار کاژ و شووڵك و پووش و پەڵاش و کا و تەڵاشە دار، لە سەر لمی کەنارەکە بەجێ مابوون.
ئاشقە کەچەڵ سەیری باکووی و لای چیاکانی کرد. هەورێکی رەش لە لووتکـەی چـیاکانەوە هەڵدەقولێ و دەهات. لە باکوورەوە، نیوەی ئاسمانی چوکووراوای داپۆشـیبوو و سـات بـە سـات گەورەتر دەبۆوە و بریسکە پەیتا پەیتا ئەو گەواڵە هەورە رەشەی دەبڕی.

ئاشقە کەچەڵ گوتی:

ـ بارانێك دەبارێ، هەتا ئێستاش چوکووراوا بەخۆوەی نەدیبێ. باران، ئەویش چ بارانێك. خوایە خۆت فریامان کەوە. جا ئێستا کڕنۆش بەرن دەی. بەرەو ئەو هەورەی وا دێ و نزیك دەبێتەوە، وەرسووڕێن و دەستەکانتان بەرەو ئاسمانێ هەڵبڕن و چیی دووعای دەیزانن بیخوێنن و بپاڕێنەوە. ئەوانەش کە دووعا نازانن، بڵێن خوایە گیان پێشی ئەو بارانە بگرە و ئەو هەورەش بگێڕەوە پشت چیاکان.

ئاشقە کەچەڵ خۆیشی رووی کردە باکوور و دەستەکانی هەڵبڕی و چاوی بەو هەورە بڕی کە بەردەوام هەڵدەستا و گەورە دەبۆوە و بە دەنگێکی گڕ دەستی بە دووعا و پاڕانەوە کرد. ئاشقە کەچەڵە دووعاکانیشی وەك گۆرانییەکانی لە ناخی دڵییەوە و بە سۆزەوە دەخوێند و گوندییەکانی دەهەژاند. ئەوانیش لە ناخی دڵەوە دەپاڕانەوە. ئەگەر بارانەکە دایکردبایە، و دوو سێ رۆژان خۆشی نەکردبایەتەوە، هەر هەموویان نەخۆش دەکەوتن و دەمردن. نەخۆشیش نەکەوتبایەن، نەیاندەتوانی لۆکە بڕننەوە. جاری پێشوو بەشی هەرە زۆری قۆزاخەکان بە عەرزی وەربببوون. ئەو بارانەش کە پێوە بوو بباریٚ، ئیتر بێ ئەولا و ئەملا ماڵوێرانی دەکردن.

ئاشقە کەچەڵە کە پێدەچوو دووعاکانی هەر تەواو نەبن، تەواوی کردن و دەستێکی بە دەموچاویدا کێشا. گوندییەکانیش هەر وایان کرد.

ئاشقە کەچەڵ گرماندی:

ـ دەی هەستن و راوەستن. بزانن هەورەکە چۆن خێرا دێتە پێش. یەك دوو سەعاتی دیکە دەگاتە ئێرە. دەست هەڵبڕن و هەرچی من گوتم دووپاتەی بکەنەوە:

خوایە گیان!

حەشیمەتەکە لە پشت سەرییەوە هاواری کرد: خوایە گیان.

دەشتەکە دەنگی دایەوەو گەیشتە رەوەزەکانی ئاناوەرزا و ئەوێش دەنگی دایەوە.

ئاشقە کەچەڵ بە دەنگێك کە لە ناخییەوە هەڵدەستا و دڵەکانی دلەرەزاند، هاواری کرد:

ـ خوایە، خوایە ، خوایە گیان.

لە پشتەوە، دەنگی خەڵکەکە، گەیشتە گوێی گەردوون و رەوەزەکانی ئاناوەرزای وەلەرزین خست.

ـ تۆ و ئەشق و ناوە جوانەکەی محەمەد... تۆ و ئەشق و ناوە جوانەکە محەمەد... تۆ و ئەشق و ناوە جوانەکەی مەحەمەد...

حەشیمەتەکە، جۆش و خرشەوە و بە هەمووی تینی خۆی دەنگی هەڵێنا. لە مەزرا دوور و نزیکەکانەوە، کرێکارەکانی لۆکەڕنینەوە دەستیان لە کار هەڵگرتبوو و گوێیان دابووە نزا و پاڕانەوەی خەڵکی یالاك.

- تۆ و خۆشەویستیی هەموو پێغەمبەرەکان...

- ئەتۆ و خۆشەویستیی چل سوارەی غەیبی و پیر و پیاوچاکان، بۆ خاتری خدری زیندوو...

حەشیمەتەکە سێ جاران دووپاتەی کردەوە.

ئاشقە کەچەڵ بێدەنگ بوو و قوڕگی خاوێن کردەوە. دەستی هەر وا هەڵبڕیبوون و دەتگوت دەیەوێ ئەو هەورەی لە لای چیاکانەوە دەهات، لە ئامێز بگرێ. لە دوورەوە لە باڵندەیەکی گەورە دەچوو کە باڵی کردبێتەوە و ئامادەی هەڵفڕینە. گوندییش هەموو وەك ئەو بوون. تاشباش ئۆغلو نوشتابۆوە، بەڵام هەوڵیشی دەدا وەك ئەوان بکا. بەڵام نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر باسکەکانی ڕاگرێ. دەیهێنانەوە خوارێ و تۆزێ دەیحەساندنەوە و دیسان بەرزی دەکردنەوە. بە ترس و نیگەرانییەوە چاوی لە زاری ئاشقەکەچەڵ بڕیبوو.

ئاشق باسکی هێنایە خوارێ و دیسان لێکی کردنەوە و گوندیش وایان کردەوە. و تاشباشیش... جا بە جۆش و خرۆشێکی پترەوە لە سەری ڕۆیشت:

- هەروەها ئەو حەوت تۆپەڵە نوورەی بە شوێنیدا دەڕۆن... بە دوایدا... جەوت تۆپەڵە نوور...

حەشیمەتەکە بە خۆشی و ئۆگری و جەزبەیەکی سەیرەوە پێنج جاران گوتیانەوە:

- جا هەر تۆپەڵە نوورێکی هێندەی منارەیەك...

حەشیمەتەکە پێنج جاران گوتییەوە...

- هەروەها ئەو جلە کەسەکەی لەبەری دایە...

حەشیمەتەکە:

- هەروەها ئەو جلە کەسکەی لەبەری دایە....

حەشیمەتەکە هەژا و دە جاران گوتییەوە. تاشباشیش بە بێهێزییەوە هەر وا لەگەڵیان دەیگوتەوە و سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد بزانێ ئاخۆ کەس سەیری دەکا یان نا. بەڵام دیتی کەس سەیری ناکا. هیچ کەس بۆی گرنگ نییە ئاخۆ لەوێیە یان نا. خەڵکە تووڕە و هەژاوەکە، چاویان بڕیبووە ئەو هەورە ڕەشەی جار بە جار گەورەتر دەبۆوە و دەهاتە پێشێ.

- بۆ خاتری ئەوەی لە چیای چل پیاوچاکەکە، بووەتە سەرۆکی کۆڕی چل وەلییەکە... ئەوەی کە وا بەسەر دەریای سپیدا دەڕوا، دەڵێی بە سەر عەرزیدا دەڕوا. ئەوەی هەموو

بوونـەوەرەكانی عالـەم، هـەر لـە باڵنـدەوە بگـرە هـەتا دەعبـای كێـوی و جـڕ و جانـەوەر بـە شـوێنییەوەن و نـاوی رووبـار بـە ئـەمری ئـەو رادەوەسـتێ و دەرمـانی مـەرگی دۆزیوەتـەوە و جوانترین مـەخلوقی دنیایـە و هـەر نـەخۆش و دەردەدارێكـی گـوێی لـە نـاوی ئـەو بـێ، چاك دەبێتەوە. ئەوكەسەی كە نـەوەی پـیر لوقمانـە... بیكـە بـە خـاتری ئـەو، بـە خـاتری پادشـای پادشاكان و وەلیی وەلییەكان، تاشباشی مەزنمان... بۆ خاتری تاشباشی مەزن...

بە دوای دەنگەكەی ئاشقە كەچەڵدا، خەڵكەكە، هەر رستەیەكی ئەویان چەند جارێكی پێیان خۆش بوایە دووپاتە دەكردەوە. كە گەیشتە ناوی تاشباش، خەڵكەكە گەرم داهـاتن و دەنگەكـە ئاسمانی كەڕ دەكرد. رەوەزەكانی ئاناوەرزا لەوەتەی هەبوون گوێیان لە دەنگی ئاوا نەبیبوو.

ئاشقە كەچەڵە هەر وا لە سەری دەڕۆیشت:

ـ بیكە بۆ خاتری تاشباشی مەزنمان... بە خۆشەویستیی تاشباشی سـەروەرمان ئـەو هـەورە رەشە بگێڕەوە... بیگێڕەوە... بیگێڕەوە...

تاشباش ئۆغڵو سەری سوورِ مابوو. ئیتر خۆی پێ نەگیرا كە گوتیان:"تاشباشی مەزنمان" و بە هێمنی و نیوەزیندوو لە سەر عەرزەكە دانیشت. كەس ئاوڕیشی لێ نەدایەوە.

ئاشپە كەچەڵ و خەڵكەكە لە هاواركردن ماندوو ببـوون. كـەس خـۆی پـێ نـەدەگیرا. بـۆنی ئارەقە تاقەتبڕەكەیان دوور دەڕۆیشت. سروەی بایەك نەدەهات. گەرماكـە شـێدار و بـەتین بـوو. هەورە رەشەكە بە بریسكە و هەورەتریشقەوە خەریك بوو هەموو ئاسمانەكەی دادەگرت.

ـ بەرەو رووبارەكە راوەستن.

خەڵكەكە رووەو رووبارەكە راوەستان.

هەموو وێكرا بڵێن:"هەورەكەت وەرگرەوە". و قۆزاخەكان لە ئاوەكە بهاوێن.

ـ هەورەكەت وەرگرەوە.

سەدان قۆزاخە بە ئاوەكە دادرا.

رێك لەو كاتەدا دڵۆپە قورس و درشت و گەرمەكانی بارانەكە داباریـن.

ئاشقە كەچەڵ هەرای كرد:

ـ دەی خێرا بكەن. كاری نەكرد. درەنگ وەخۆ كەوتین. ئەگـەر ئـەمڕۆ بـەیانی پاڕابایینـەوە، تاشباشی مەزنمان جڵەوی هەورەكەی دەكێشا و دەیبرد. لەوانەشـە پاڕانەوەكـەمان بـەكار بـێ و بارانەكە بە رێژنەیەك داباریێ و تەواو بـێ. خێـرا بكـەن. بـچن سـەر كـەپرەكانتان بـە حەسـیر و تەلیس داپۆشن.

گوندییەکان پێشتر پێش بینیی ئەوەیان کردبوو و ئەوەندەی پێیان کرابوو سەر کەپرەکانیان داپۆشیبوو. بەڵام دیسانیش غاریان دا و گورج و خێرا ئەو شوێنانەیان داپۆشینەوە کە مابوون.

تاشباش ئۆغلۆ نەیتوانیبوو لە جێی خۆی هەستێ و هەر لەوێ بەجێ مابوو. جگە لە ژنەکەی، کەس ئاگای لێی نەببوو. ژنەکەش، بە تەلیس سەر کەپرەکەی دادەپۆشی و بە بەزەییەوە سەیری مێردەکەی دەکرد. ئەگەر چووبایە و بن پیلی گرتبایە و هێنابایەوە ماڵێ، ئەو خەڵکە چییان پێ دەگوت؟ بە خۆی گوت با برێك تاریکی بکات، بزانم چیم پێ دەکرێ. ئەگەر تا ئەو کات توانیی بێتەوە باشتر، دەنا ناچارم بچم بیهێنمەوە.

بارانەکە لە پێشدا بە دەنکی درشت و گەورە دەستی پێ کردبوو و لە نەکاو دایدابوو. هەوا تاریك داهات و بارانێك دایکرد، دەتگوت ئاسمان دڕاوە.

ژنەکە هات و داهاتەوە و بن پیلی تاشباشی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ. لاقەکانی تاشباش لە عەرزەکە دەخشکان. تا گەیشتنەوە کەپرەکە خووسان. ژنەکەی دەمودەست جلوبەرگەکەی لەبەر داکەند و وشکی کردەوە و لە جێوبانەکەدا نواندی. تاشباش وەك نۆبەتێی گرتبێ، دەلەرزی.

گوتی:

ـ ژنەکە، ئەمن تەواو بووم. ئەو گوندییانە کوشتیانم. کوشتیانم. من مەمەدم. نەتناسیمەوە؟ هەر هەمووان دەزانن من کێم. چما سەفەریش نەیگوت؟ دەزانن، بەڵام شێت بوون. ناشزانم چ بکەم. لەو کارەی ئەمڕۆیان تێ نەگەیشتم. ئەتۆ بۆ خۆت دەزانی ئەمن هاوشێوەی تاشباش نیم. شکڵ و بیچمی کەس نیم. بنیادەمێکی غەریب و نامۆ نیم. هەر هەمووی درۆیە. ئەمن خۆم مەمەد تاشباشم. ئەگەر ئەو کات ژەندەرمەکان لەگەڵ خۆیان نەیاندەبردم و لێرە مابامەوە، دیسانیش هەر ئەو دەردەیان دەدامێ. ئەتۆش خۆ دەزانی خۆمم. چما وانییە کچێ؟

ژنەکەی جوابی نەدایەوە. تاشباش ویستی دەستی بگرێ، بەڵام ژنە دەستی کێشایە دواوە.

ـ کچێ ژنەکە، ئەوە شێت بووی؟ هەموو کلکتان لە یەکتری ئاڵاندووە و دەتانەوێ بمکوژن؟ خوایە ئاخۆ من چ خراپەیەکم لەگەڵ کردووی کە ژن و منداڵ و خزم و کەسەکەی خۆمت لێ کردوومەتە دوژمن. ریسوای دنیایە بووم. ئیتر بەسە. خوایەگیان لێم خۆش بە. خوایە ئەمن چ بکەم؟ چ بکەم؟

بریسکەیەك هەموو وڵاتی بۆ ساتێك روون کردەوە. ئاسمان گرماندی. بارانەکە توندتری کرد. بریسکەیەك لە نزیك ئەوان لە عەرزەکەی دا و کەپرەکەی لەرزاندن.

ژنەکە ترخێنە گەرمەکەی، کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، لە قاپێکی گەورەدا هێنا و لە سەر لێفەکەی تاشباشی دانا و کەوچە چێوییە گەورەکەشی کە نیوەی سوتابوو، دایە دەستی.

هەر سێ منداڵەکەی لە قوژبنێك کروشمەیان کردبوو و بە ترسەوە سەیری ئەویان دەکرد کە وەك گورگێکی برسی ترخێنەکەی دەخوارد... بارانەکە هەر وا دەباری...

فاتمۆکێ و حەسەن و مەمی دیك شەوێ تا بەیانی نانوون و هەر بیر لە تاشباش ئۆغلو دەکەنەوە. تاشباش ئۆغلوش نانوێ و بیر لە حالّ و وەزعی خۆی و دنیای دەوروبەری خۆی دەکاتەوە. هیچ رێگەیەکی بۆ دەربازبوون پێ شك نایە. لە مێژە لە تاریکستانێکی بێ سنوور و تاقەتبڕدا گیری کردووە. تاریکەسەلاتێك کە لە هەر چوار لاوە دەوری داوە. پەیتا پەیتا بە خۆی دەڵێ:"زەویم لێ بووەتە ئاسن و ئاسمانیش مس. زەوی ئاسن و ئاسمان و مس، ئاسمان مس." ناتوانێ لەو زەوی ئاسن و ئاسمان مسە خۆی قوتار بکا. پیاوێکی گرفتار و داماوە، کە سەری خۆی بە بەردی رەشی بێهیواییدا دەدات. قەت پێی وا نەبوو گوندییەکان ئاوای لەگەڵ بجووڵێنەوە. سەرسووڕماو و سەرلێشێواو، نوقمی کۆمەڵە خەیاڵێکە، کە هەرگیز بە مێشکیدا نەهاتوون. بیر و خەیاڵی شێتانە.

## ٣٢

فاتمۆکێ نیوە شەوێ، کچەکەی لە خەو هەستاند:

ـ هەستە کچۆڵە جوانەکەم. ئەمن لە شەوێکی پیرۆزدا نەتۆم بووە. بەخت و شانست بەرزە وا دیسان خودای میهرەبان و بە بەزەیی، تاشباشی مەزنمانی ناردووەتەوە بۆ ئێرە. کچە ئیفلیجەکەی نووزەیەکی لێوە هات و بەخەبەر هات. زۆر لە مێژ بوو دەستەکانی و لای چەپەی جەستەی لە جووڵە کەوتبوو.

ـ ساڵی پێشوو ئەو وەلییە نیوە گیانی کردم. خۆم لە دار و بەرد دا بۆ ئەوەی دەستێکت بە سەریدا بکێشێ و ئیتر دوایی چەندە ئاسوودە بووی... دیسان، ئەوە هاتووەتەوە.

کچەکەی گوتی:

ـ بەڵام دەڵێن ئەوە تاشباشی مەزن نییە. سەروەرمان هاوشێوەی خۆی ناردووەتەوە. ئەو بنیادەمە چ سوودێکی بۆ من هەیە. ئەتۆ بڕۆ بۆ خۆت تاشباشی مەزنمان بدۆزەوە و بیبە بۆ لای ئەو. مەمی دیك دەڵێ ئەو لە چیای چل وەلییەکەیە...

فاتمۆکێ تووڕە بوو و هاواری کرد:

ـ بێدەنگ بە.... گووی زیادی مەخۆ. یانی دوای ئەو هەمووە ساڵەی جیرانی بووین، ئەمن تاشباش ناناسمەوە؟ ئێمە لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە بووین. لە منداڵییەوە... ئەو قسانە سەفەر لە گیرفانی دەری هێناون. هاوشێوەی چی؟ ئەو کابرایە، تاشباش خۆیەتی، دەی هەستە با بتبەم بۆ لای بەشکم دەستێکت بە سەریدا بێنێ، جا ئەو جار دەزانی ئەو تاشباشە مەزنەکەی خۆمانە یان هاوشێوەکەی. چما ئەتدی چاوەکانی چۆن دەبریسکێنەوە. چما دەکرێ چاوی بنیادمێکی ئاسایی ئاوا بدرەوشێنەوە؟ جا هاوشێوەکەشی بێ... فەرقێکی نییە... ئەتۆ بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە نییەتی لێ بێنە، سەر بەقوڕ، ئەگینا چاك نابییەوە. ئەو کابرایە تاشباشە مەزنەکەی خۆمانە. دەی نییەت بێنە.

فاتمۆکێ پشتوێنەکەی توند لە قەدی ناڵاند و کچەکەی لە کۆڵ کرد و کەوتە ڕێ. باران وەك دوو سەعات بە غوڕەم باری بوو و خۆشیی کردبۆوە. شەوێکی پڕ لە ئەستێرەی درشت و پڕشنگدار و نوورانی بوو. ئاسمان ساو و بێ هەور بوو. شین دەچۆوە و هەموو وڵات کپ و بێدەنگ بوو. فاتمۆکێ بەرەو کەپرەکەی تاشباش دەچوو. هەوڵی دەدا بە سەر پەنجەی پێی بڕوات بۆ ئەوەی کەس پێی نەزانێ کە ئەو کچەکەی دەباتە لای تاشباش. کچەکە لە بەردەم کەپرەکە لە سەر عەرزی دانا و بە دەنگێکی کز گوتتی:

ـ لە سەرت گەڕێم. ئاغا و سەروەرەکەمان. ئەمن دەزانم تەنانەت خەویش چاوت پێ لێك نانێ و ئەتۆ بەخەبەری تاشباشەکەی من. ئاغا، خودای گەورە دیسان ناردووتییەوە بۆ لای ئێمە بەشکم دەرد و ئازارمان چار بکەی و ببیتە هیوامان.

لە سەر چۆکان لە بەردەم کەپرەکە و لە سەر قوڕەکە دانیشتبوو و خۆی رادەژاند و کە قسەی دەکرد دەتگوت شین دەگێڕێ. تاشباش لە کەپرەکەدا بە چێژەوە گوێی لە قسەکانی راگرتبوو و کەیفی دەهات و پێی خۆش بوو لە سەر قسەکانی بڕوات، بۆیە هیچی نەدەگوت.

فاتمۆکێ دەیگوت:

ـ بەر لەوەی ژەندەرمەکان لەگەڵ خۆیان بتبەن، دەستێکیت بە سەری کچەکەمدا هێنا، کە حەوت ساڵی رەبەق بوو، نیفلیج ببوو، دەستت بە سەریدا هێنا و شیفات دا و لە جێی خۆی

هەستایە سەر پێیان. ئێستا ئەوە خۆیشی لێرەیە. ئەو رۆژە ژەندەرمەکان ئەتۆیان برد، ئەو دیسان وەعەرزی کەوتەوە. کەراماتەکەت بەتاڵ بۆوە. خودا ئەو سەفەرە بە نەحلەت بکا. کەس نایدوێنێ. کەس چاویشی لێ ناکا. سەبارەت بە تۆش دەڵێن، ئەو پیاوە یان غەریبەیە یان ئەوەتا تاشباشی مەزنمان، بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە ناردوویەتی. چما دەکرێ ئەتۆ هاوشێوەی تاشباش بی؟ کورە یاخوا لە سەر سەرت گەرێم. ئەتۆ تاشباشە مەزنەکەی خۆمانی. کەس بڕوا ناکات کە خۆتی. دەی با بڕوا نەکەن. ئەتۆ خۆتی خۆت. لە سەرت گەرێم، ئەتۆ تاشباشە وەلییەکەی خۆمانی. وەك جاری پێشوو لاساریێ مەکە. وەرە دەرێ و دەستێك بە سەری کچەکەمدا بێنەوە...

چیی قسەی کرد و پاڕایەوە هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە. تووڕە بوو و گوڕاندی:

ـ هۆی تاشباش، دەی وەرە دەرێ دەی، ئەگینا لە بەر چاوی چاك و خراپ ریسوات دەکەم. بە هەمووان دەڵێم ئەو پیاوە، کابرایەکی درۆزنە. وەرە دەرێ وەلییە نەحلەتییەکە. چما بنیادەم ئەوەندە بەرچاوتەنگ دەبێ؟ ئەتۆ ئەگەر بنیادەم بوایەی، بەو وەلییایەتییەتەوە، ئەوەندە نەگبەتی و بەڵایەت تووش نەدەبوو. ئەمن لە منداڵیمەوە تۆ دەناسم و دەزانم چەندە کەللە رەق و لاساری و قسەت بە گوێدا ناچێ. ئەمن نازانم خودا بە چ پێوەدانگێك تۆی کردووەتە وەلیی خۆی. هەر چۆنێك بێ، ئێستا دێیە دەرێ و دەستێك بە سەری ئەو کچەمدا دێنی یان ئەوەی بەیانی لە بەر چاوی چاك و خراپی ئەو دنیایە حەیات دەبەم. دەی وەرە دەرێ. بچۆ شوکرانە بژێر بە کە نامەوێ بەو نیوەشەوە خەڵکت وەسەر بگێڕم، ئەگینا دەمکردە قەرەچی ئۆین و هەڵڵا و هەنگەمەیەك هەموو ئەو خەڵکم وەسەر دەگەڕاندی. وەرە دەرێ. ئەوەی تۆ دەیکەی لە وەلی و پیاوچاکان ناوەشێتەوە. پیاوچاکە بەرچاو تەنگەکە، سەیر کە، ئیتر تاقەتم نەماوە و دەمەوێ بقیژێنم، وەرە دەرێ...

تاشباش لە خۆشیان دڵی وەك باڵی چۆلەکە لە سینگیدا فڕەی دەهات. کەوابوو دیار بوو گوندییەکان ناسیبوویانەوە و هێشتاش ئیمانیان بە وەلییایەتییەکەی هەبوو. فاتمۆکێ باشترین نموونە بوو.

بە گاگۆڵکێ لە کەپرەکەی هاتە دەرێ و هەستایە سەر پێیان. تاوێك لە تاریکاییەکەدا هەر وا مایەوە و چاوی لە ئەستێرەکەی گەلاوێژ بڕی. ئەستێرەکە گەورەتر بېۆوە و وەك هەتاو دەدرەوشایەوە. چاوی دادەگرت و تریفەی دەباراند.

فاتمۆکی لە ژەنۆی تاشباش نووسا و ماوەیەك بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ لە جێی خۆی نەبزووت.

تاشباش له ناخی دڵییەوە، بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە دەستی کرد بە قسەکردن. گوتی:
ـ خوایە گیان. لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا گوێم لێ بگرە. ئەمن ئیمانم بە تۆ هەیە. بۆ ئەوەی دڵنیا بم وەلییم یان نا، زۆرم خۆ تاقی کردەوە و ئاخری تێگەیشتم وەلییم. ئەمن بوومە وەلیی تۆ بۆ ئەوەی نەخۆش و دەردەداران شیفا بدەم و چاریان بکەم و هیوا بخەمە دڵی هەژار و داماوانەوە و یارمەتیی لێقەوماوان بدەم. ئەتۆ ئەرکی زۆر قورس و گرنگت خستە ئەستۆی من و کە زانیت ئەرکەکانی خۆم رادەپەڕێنم، بەڵا ئەما بەسەرمی نەهێنی. کاری باشت کرد. ئاخرییەکەی ئاقڵم هاتەوە بەر خۆ، بەڵام زۆر درەنگ بووە. خەڵکی روویان لێ وەرگێرام. هەر ئەو فاتمۆکێیە ماوە کە هێشتا دەمناسێتەوە و دەزانێ ئەمن کێم.
فاتمۆکێ قسەکەی پێ بڕی و بە گریانەوە گوتی:
ـ وایە برالە، هەر من ماوم. هەر من ئێستاش ئیمان و متمانەم پێت ماوە. هەر من ئیمانم پێت ماوە.
ـ خودایە ئەتۆ ئەو خوشکە باش و دڵ پاک و بە ئیمانە....
فاتمۆکێ دیسانیش قسەی پێ بڕییەوە:
ـ زۆر، زۆر، زۆر بە ئیمانە...
ـ کچەکەی شیفا بدە. دە ساڵە لە پێ کەوتووە.
ـ هەشت ساڵ.
تاشباش قسەکەی خۆی راست کردەوە. هەشت ساڵە لە پێی کەوتووە، شیفای بدە. چما ئەمن هەر ئەو وەلییەی تۆ نیمە کە لە ئاسمانەوە نوورت بەسەردا باراند؟ هەر ئەو وەلییەی تۆ نیمە کە چووەتە ریزی چل وەلییەکەوە؟ لە بەرت دەپاڕێمەوە دڵم نەشکێنی و ئەو کچە شیفا بدەی و چاکی بکەیتەوە. ئەگەر تۆزێك متمانەت بە من ماوە، ئەو کچە چاك بکەرەوە ئەی چاو رەشە نوورانییەکەی من. ئەی ئەو کەسەی چیا و رەوەز و ئاسمان و زەوی و هەموو بوونەوەرەکانی دنیات خولقاندووە. ئامین، ئامین... ئامین...
فاتمۆکێش دووپاتی کردنەوە:
ـ ئامین، ئامین، ئامین...
تاشباش ماندوو بوو. خۆی بەسەر پێوە پێ نەدەگیرا. بەڵام نوقمی شادی و خۆشی بوو. دڵی خۆش و بەختەوەر بوو. بەسپایی شانی فاتمۆکێی گرت و هەڵیستاند و گوتی:
ـ کچەکەت چاك دەبێتەوە.

فاتمۆکێ بە تووڕەییەوە گوتی: نا، چاك نابێتەوە. کچی من ئاوا قەت قەت چاك نابێتەوە.
دەتگوت قاپێکیان ئاوی کوڵیو بەسەر تاشباشدا کرد.

- بۆ؟

- چونکە ئەتۆ دەستی پیرۆز و متفەڕکت بەسەر سەری کچە گوڵەکەمدا نەهێنا.

تاشباش دڵی خۆش بوو و پێکەنی:

- باش بوو وەبیرت هێنامەوە فاتمۆکێ. هەقتە.

داهاتەوە و دەستی بەسەری کچەدا هێنا و پشوویەکی قووڵی هەڵکێشا و بە هەموو توانایەوە فووی لێ کرد.

فاتمۆکێ کە کچەکەی بە کۆڵێدا دەدا گوتی:

- ها وەریگرە.

هێندەی سەرە پەنجەیەك خوێی لە لەپی دەستی تاشباش کرد و لە تاریکایی شەوەکەدا لە چاو ون بوو.

حەسەن فاتمۆکێی دی کە کچەکەی بەکۆڵی داداوە و بەرەوڕووی دێ. بۆ ئەوەی فاتمۆکێ نەیبینێ، خۆی لە پشت پنچکێك حەشار دا و لە دڵی خۆیدا گوتی:

- دیسانیش کچەکەی بردووەتەوە لای تاشباش بۆی ماریجە بکا. ئەویش خۆ تاشباش خۆی نییە. دیارە هاوشێوەی پیاو، هیچی لە دەست نایە. دەی خۆ فاتمۆکێ لە هەموو کەس باشتر ئەوە دەزانێ. خۆی ئاگری بن کایە. بەڵام دیسان کچەکەی بردووە. دەی خۆ ئەو کچەکەی دەباتە لای هەموو کەسێك. بە درێژایی ساڵ، کچەکەی بە کۆڵێدا دەدا و دێ بە دێ وەڕێ دەکەوێ و دەچێتە لای هەموو وەلی و نووشتەنووس و فالگرەوەیەك. مانگێ چوار پێنج جار دەچێتە لای "گۆك تفەنگی" بۆ ئەوەی دووعا لە سەر کچەکەی بخوێنێ و فووی لێ بکا. ئەو پیاوە ئەگەر هاوشێوەی تاشباشە مەزنەکەشمان نەبوایە، ئەو کچەکەی خۆی هەر دەبردە لای...

لە پشت پنچکەکە هاتە دەرێ و بەرەو کەپرەکەی تاشباش چوو و دووسێ هەنگاو لەولاترەوە راوەستا. نەیدەزانی چ بکا. دوو سێ جاران کۆخی. هیچ دیار نەبوو. دیسان کۆخی. هیچ جوابێك نەهات. دەستی کرد بە گۆرانیگوتن. رووی لە لای ئاناوەرزا کردبوو و سەری هەڵێنابوو و بە دەنگە تیژ و خۆشەکەی گۆرانیی دەگوت. تاوێك دواتر لێی بڕییەوە و سێ جاران ئەو دەنگە کەنارییەی دەرهێنا کە پەردەی گوێی دەدڕاند. ئەوەش کاری نەکرد. بە دڵێکی لەرزۆکەوە لە دەرگاکە چووە پێشێ و گوتی:

ـ تاشباش ئاغا، تاشباش ئاغـا، وەرە دەرێ. تاوێـك وەرە دەرێ چـەند قـسەیەکم پێتـه. هـاتووم برێك قسەت لەگەڵ بکەم. ئەگەر دەشتهەوێ بزانی کێم، ئەمن حەسەنی "عەلی"یە درێژم.

تاشباش هەر گوێی لە دەنگی حەسـەن بـوو، لـە قەرەوێڵەکـەی هاتـە خـوارێ و بـەرەو لای دەرگاکە غاری دا و هاتە دەرێ. حەسەن لە تاریکاییەکەدا لە تارماییەکی بچووك دەچوو.

بەسپایی پرسی:

ـ حەسەن ئەتۆی؟

حەسەن گوتی:

ـ ئەمنم تاشباش ئاغا.

تاشباش ئۆغڵو بە دەنگێکی شاد گوتی:

ـ بارانێکی سەیر باری ها. وا نییە حەسەن؟ لە کوێستانەکەی ئێمە بارانی ئاوا ناباری.

حەسەن دوو هەنگاوی لێ چووە پێشێ و گوتی:

ـ تاشباش ئاغا، چما ئەتۆ نازانی ئەو بارانانە تایبەتی چوکووراوان؟

کە حەسەن لە دڵەوە پێی دەگوت "تاشباش ئاغا" تاشباش بە زۆری پێـشی پێکەنینەکـەی خۆی دەگرت و هەستی دەکرد وەك باڵندەیەکی سووکباڵی لێ هاتووە.

گوتی:

ـ دەزانم حەسەن.

هەواکەی فێنك بوو. بۆنی گیای تەڕ و گوڵی لۆکەی تازە پشکووتوو، شەوەکەی پڕ کردبوو.

ـ دەی، قسە بکە بزانم حەسەن.

ـ زۆرم غەریبی کردبووی تاشباش ئاغا.

ـ ئەمنیش هەر وا حەسەن گیان رۆڵەم. دەی وەرە با بچینە ئەو خوارە، دەم ئاوەکە. لـە بـن دار چنارەکان دانیشین و قسان بکەین.

رووباری جەیحان، پاناوکێکی گەورەی هەتا بن چنارەکان پڕ کردبوو لـە وردکـە بـەرد وچـەو. هاتن و لەوێ لە سەر کۆگایەك وردکە بەرد دانیشتن.

لە پێشدا حەسەن قسەی کرد:

ـ تاشباش ئاغا لەبیرتە پێکەوە لە مەزراکە تەپکە و داومان نابۆوە و سێروو (ریشۆڵە)ـمان گرتبوو؟ هەر بە راستی چەند سێرووومان گرتبوو؟

تاشباش ئۆغڵو زانیی حەسەن بۆچی ژمارەی سێرووەکانی لێ دەپرسێ. لە بیری بوو.

- هەشت شێروو.
- راست دەکەی گەورەم. هەشت سێروو بوون ودواییش چوونە دۆڵی پەرییەکان...
- ئەتۆ ئاگرەکەت کردەوە حەسەن. ئەمنیش چووم کۆتەرەدارێکی گەورەم دۆزییەوە... خەرمانە ئاگرێکمان کردەوە و سێرووەکانمان لەسەر برژاند... چەور...
حەسەن دڵی ئاوی نەخواردەوە، لەوانەیە ئەوەی یەکەمی هەر زانیبێ. لە شیوەکەدا کەس نەبوو بەسەرهاتی هەشت سێرووەکە نەزانێ...
- جارێکیشیان بەسەر کۆمەڵێك کەودا کەوتین. کەوەکان بە لاقە خەنەییەکانیانەوە...
تاشباش ئۆغلۆ:
- هەر گەیشتینە نزیکیان، هەڵفڕین و لە قولکەیەکی پڕ لە بەفردا نیشتنەوە. تۆ ویستت زووتر خۆتیان بگەیەنێی و بەرەو لای ئەوان غارت دا، کەچی هەتا قورقوڕۆچکەت لە بەفرەکە هەڵچەقییت.
- ئەگەر نەگەیبایەی دەمردم. وردە وردە بە بەفرەکەدا رۆ دەچووم. قوولکەکە زۆر قووڵ بوو...
حەسەن کۆنجکۆڵییەکەی و تاشباشیش نییەتەکەی حەسەنی لە بیر چۆوە و هەر دووکیان خۆیان خستە نێو ئامێزی گەرم و نەرمی بیرەوەرییەکانیانەوە.
- کەوەکان دیسان فڕینەوە. تاوەکەی زۆر گەرم بوو، وەك تاوەکەی چوکووراوا چاوی لە بەر هەڵنەدەهات. بەفرەکە دەدرەوشایەوە.
- کەوەکان لەو قولکەیەی ئەتۆی تێدا چەقیبووی، هەڵفڕین. بەڵام ئەمجارەیان نەیانتوانی زۆر دوور بڕۆن. دیسان ئەتۆ پێش من خۆت گەیاندەوە نزیکیان.
- هەتا تۆ گەیشتێی، ئەمن بە سەر سەریانەوە چاوەڕێت بووم. ئەتۆ گەیشتێی و عاباکەی خۆتت بە سەردا دان. کە عاباکەمان هەڵگرت، سەیرمان کرد شەش کەوی لە بندا ماوە.
- ئەوجار لێرە و لەوێ کەوەکانمان کۆ کردنەوە. ئەو رۆژە رێك چل و سێ کەومان گرت.
نوقمی بیرەوەرییە دوورەکان بوون. جارێکیان هەر دووکیان پێکەوە دوو شەو و رۆژان بەبێ ئەوەی چاو لێك بنێن، لە بەردەم کونێکدا کە بێچووە سمۆرەیەك تێیدا خۆی حەشاردابوو، دانیشتبوون و ئێشکیان گرتبوو. بەڵام کاتێك بێچووە سمۆرەکەیان بینی، کە لە کونەکە هاتبووە دەرێ و راِی کردبوو. مانگە شەوێك بوو.
ئاخرییەکەی حەسەن ئیمانی هێنا و دڵنیابوو کە ئەو پیاوە تاشباش خۆیەتی. کەچی نەیدەزانی بۆچی ئەو پیاوە، ئەویش وەها بنیادەمێك ئاوای بەسەر هاتووە. نەشیتوانی بپرسێ. بۆ پرسیاریش نەدەبوو...

تاشباش بە تیر و تەسەلی چیی بەسەری هاتبوو، بۆ حەسەنی گێڕایەوە و لە بنی کوولەکەی دا کە چۆن لە بەفرەکەدا رەق هەڵاتووە و چۆن شوانێك و گوندییەکان وەشوێنی دەکەوتن. حەسەنیش دوای رۆیشتنی ئەو چیی لە ئاواییەکەدا رووی دابوو، یەك بە یەکی بۆ گێڕایەوە. کە چۆن ژەندەرمەکان تێهەڵدانێکی باشیان لە سەفەر هەڵدابوو و دوو مانگ نەیتوانیبوو لە جێ و بانەکەی بێتە دەرێ و چۆن هیچ کەس و تەنانەت پیاوەکانی حوکمەتیش قسەیان لەگەڵ نەدەکرد ، هەروەها گوتیشی کە ئۆنباشی جۆماڵی گوتبووی تاشباش بووەتە تۆپەڵە نوورێك و بەرەو بەرزترین لووتکەی چیاکان رۆیشت. باشی مەمی دیکیشی کرد کە چۆن هەتا ئێستا پێنج جاری دیتووە و گوندییەکانی ئاگادار کردۆتەوە. ئاخرییەکەی گەیشتە بەسەرهاتی تێهەڵدرانەکەی بابیشی کە بە دەنگێکی کز و گریاناوییەوە گێڕایەوە:

ـ گوندییەکان چاویان نەیدەدی کە بابم چۆن خێرا خێرا لۆکەی دەڕنییەوە. لە بەغیلییان چاویان دەرپەڕیبوو. پەماریان دا و هەموو گیانیان شکاند. بەیانی بچۆ و دەستێك بەسەر ئێسکەکانیدا بێنە، بەشکم خودا بەخاتری وەلییایەتییەکەت بابم چاك بکاتەوە. ئەتۆش وریای خۆت بە. گوندییەکان چاویان بەرایی نادا وەلییایەتییەکەی تۆش ببینن. هەر بۆیەشە ئەو قسە و قسەڵۆکەت وەدوو دەخەن. تەنانەت ئەمنیش بڕوام کردبوو کە ئەتۆ هاوشێوەی تاشباشی. کە قسەم لەگەڵ کردی جا زانیم ئەتۆ تاشباشە مەزنەکەی خۆمانی. لەوانەشە هاوشێوەکەی تۆ چووبێتە شوێنێکی دیکە. بە کورتی، زۆرت ئاگا لە خۆت بێ، گەورەم.

تاشباش لەوە زیاتر خۆی پێ نەگیرا و بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ کوڕە حەسەن، ئەتۆ لە سەر یەك بەمن دەڵێی تاشباش ئاغا و گەورەم، رۆڵە پیاو چۆن مامی خۆی ئاوا دەدوێنێ؟

حەسەن کەوتە هەڵپەهەڵپ و گوتی:

ـ ئەمنیش، ئەمنیش نەمدەویست وا بڵێم، هەر دەمگوت مامە، بەڵام پێیان گوتم گوناحبار دەبی. گوتیان پیاو نابێ بە پیاوچاك بڵێ مامە. ئێستاش هەر دەڵێی تۆ ناناسن. با نەتناسن. هەر شتێك بێ، ئەتۆ پیاوچاکی...

بوویەتە گەورەی چل وەلییەکە... ئەتۆ وەلیی، وایە مامە مەمەد؟

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ـ ئەمن وەلییم حەسەن.

ـ چوویەتە چیای چل وەلییەکە؟

- نەچووم، بەڵام دەچم.
- جلوبەرگی کەسکی هەریریت لەبەر کرد؟
- لە بەرم نەکرد، بەڵام لەبەرمی دەکەم.
- بوویە گەورەی چل پیاوچاکە وەلییەکە؟
- نەبووم، بەڵام دەبم.
- بەردەوام حەوت تۆپەڵە نوورت بە دواوەیە و بە دنیادا دەگەڕێی؟
- نەگەڕاوم، بەڵام دەگەڕێم.
- دەتوانی فەرمان بە سەر گورگ و باڵندە و مێروولە و ئاوی خوڕێن و با و بۆران و ماردا لێ بدەی؟
- فەرمانم نەداوە، بەڵام دەیدەم.
- ئەی زمانی هەموو مەخلووقاتی ئەو دنیایە دەزانی؟
- نازانم، بەڵام دەیزانم.
حەسەن ئاخێکی هەڵکێشا.
تاشباش ئۆغڵو گوتی:
- حەسەن ئەو ئاخەت بۆچی هەڵکێشا؟
حەسەن گوتی:
- شتێک نەبوو.
تاشباش پێی داگرت:
- بڵێ دەی براله. بڵێ، چما ئەمن مامە پیاوچاکەکەی تۆ نیم؟
حەسەن هاتە پێشێ و دەستی گرت و گوتی:
- بەر لەوەی ئەتۆ ئەو کارانە بکەی، گوندییەکان دەتکوژن. لەتوکوتت دەکەن.
جا بە گریانەوە گوتی:
- ئەمن دەزانم، بیستم، گوندییەکان زۆرت لێ دەترسن. لەو کاتەوە کە ژەندەرمەکان بردیانی، لەو دەمەوە کەس بە ئاسوودەیی نەنووستووە. هەتا بەیانی لە بەر ئاگردانەکانیان دادەنیشن و باسی تۆ دەکەن. هەمیشە چاوەڕێی گەڕانەوەت بوون. بابم دەڵێ ئۆنباشی (نایب عەریف) جۆماڵی هاتووە گوتوویەتی ئەتۆ بوویەتە تۆپەڵە نوورێک و هەڵکشای بەرەو ئاسمان. نەنە مرێمۆکم بە ئۆمەخانی گوتووە خودا بکا تاشباش نەگەڕێتەوە، ئەگەر بگەڕێتەوە دێهاتییەکان دەیکوژن. ئۆمەخان لە لێرەوارێ ئەوەی بۆ گێڕامەوە.

- باشە نەنە مریشکەکت نەیگوتووە بۆچی دەیانەوێ بمکوژن؟

حەسەن بیری کردەوە. تاشباش بە بێ ئۆقرەیی چاوەڕێی جواب بوو. ئاخری حەسەن ئەو شتەی دۆزییەوە کە لێی دەگەڕا و گوتی:

- گوتوویەتی ئەگەر گوندی ئەوەندە لە یەکێك بترسن با وەلییش بێ، ئاخرییەکەی دەیکوژن. گوندییەکانیش زۆر زۆر لە تۆ دەترسن.

تاشباش بە دەنگێکی کز گوتی:

- ئەرێ نەنە مریشکەکم نەدی. چیی لێ هاتووە؟ لە کوێیە؟

حەسەن سەری بردە بن گوێی و بە سرتە گوتی:

- بابم، نەنە مریشکەکمی کوشت. چونکە زۆر پیر ببوو و پەکی کەوتبوو. نەیدەتوانی بێتە چوکووراوا. بابیشم لە خەوێدا خنکاندی. ئەمن دیم. بەڵام ئەتۆ ئەوە بۆ کەس مەگێڕەوە. باشە؟ ئەوجار ئەتۆ وەلییش بی، هەر مامە تاشباشەکەی خۆمی، ئەوەشت لە بیر نەچێ باشە؟

تاشباش حەسەنی دڵنیا کردەوە و گوتی:

- بە کەس ناڵێم... ئای کە ژنێکی ئازا و بەجەرگ و بێوێنە بوو ئەو نەنە مریشکە. خوا لێی خۆش بێ.

حەسەنیش دووپاتەی کردەوە:

- خودا لێی خۆش بێ.

تاوێك بێدەنگ بوون. لووتکەی چیاکان رووناك بوونەوە. حەسەن بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی:

- ئەتۆ چەرمەسەری و کوێرەوەریت زۆر کێشاوە مامە مەمەد.

- زۆرم تاڵی و سوێری چێشت حەسەن.

- پێتەوە دیارە کە هیچ دراویشت نییە.

- دراوم هیچ نییە.

- دەی باشە، ئەگەر وایە ئەوانە بۆ تۆ. ئەو پرێسکەیە بیست قوتوو شقارتەی تێدایە. هەمووی دەدەمە تۆ. ئەتۆ دەتوانی بیانفرۆشی و جگەرەیان پێ بکڕی. ئەمن ئیتر شقارتەم بۆ چییە. زیاتر بە کاری تۆ دێن.

شقارتەکانی لە نێو پرێسکە نایلۆنییەکەدا بەرەو تاشباش راداشت. تاشباش دەستی بۆی نەدەچوو وەریگرێ. دەستی برد و پرێسکەکەی وەرگرت و گوتی:"سوپاس حەسەن گیان" و لەوە

پتر قسەی پێ نەکرا. گریانی ئەوکی گرت و نەیتوانی بە سەر خۆیدا زاڵ بێ و لە بانگی دا. حەسەنی لە باوەش گرت و بەخۆیەوە گوشی. خۆشەویستییەکی گەرم و قووڵ و نامۆ کە ساتێکی ببووە تەمەنێك، ناخی تەنییەوە.

حەسەن گوتی:

ـ مامە تاشباش تۆ خودا ئاگات لە خۆت بێ. لەو کاتەوە هاتووی کەس لە ترسان خەوی لێ نەکەوتووە. هەر هەموو چاویان بە سەر تۆوەیە. بەردەوام لە بنەوە چاوت لێ دەکەن. خەریکن لە ترسان شێت دەبن. ئاگات لە خۆت بێ باشە؟

تاشباش دیسان حەسەنی لە باوەش گرتەوە و گوتی:

ـ کوڕە شێتۆکەکەم، باشە، ئاگام لە خۆم دەبێ.

دەنگە دەنگ لە کەپرەکانەوە هەستا. لە بەردەم چەند کەپرێکدا ئاگر کرایەوە. لووتکەی شاخەکان خەریك بوو روون دەبوونەوە.

گوڵێکی گەورە پەلکە نارنجییەکانی خۆی بە دەوروبەرە پڕ لە گیا و چیمەنەکەی زەوییەکی زۆنگاودا بڵاو کردبۆوە و بۆنێکی نامۆی بڵاو دەکردەوە. گوڵەکە ئەوەندە گەورە بوو لە باوەشێکدا جێی نەدەبووەوە. دەتگوت ئارەقەی کردووە. مێشەنگوینێکی زەرد لە نێو گوڵەکە دەهاتە دەرێ، ساتێك جووڵەی لێ دەبڕا و سەیرێکی دەوروپشتی خۆی دەکرد و دوای ئەوە لە ناکاو باڵەکانی کە تاڵ تاڵی سووریان تێدابوو، لێك دەکردەوە و هەڵدەفڕییەوە. تۆزێك لەو لای گوڵەکەوە، عەرزەکە قەڵشت قەڵشت ببوو و لەو لاتریشەوە کانییەکی وەك چاوی قرژاڵ لە بن دار کاژێك هەڵدەقوڵی. وێنەی گوڵەکە کەوتبووە نێو ئاوە روونەکەی گۆلی کانییەکەوە و رەنگێکی نارنجیی گرتبوو. مێشوولە شینەکان لە سەر ئاوی کانییەکە وەك مردوو، بەبێ جووڵە راوەستابوونن. سێبەرەکانیان دەکەوتە سەر وردە بەرد و چەوەکان و بن ئاوەکەی خاڵ خاڵ دەکرد. دوای ئەوە مێشوولە شینەکە، کە مردووەکی بێجووڵە بوو، لە ناکاو بە خێراییەکی چاوەڕواننەکراو ئەمبەر و ئەوبەری ئاوەکەی دەکرد. لە دوای ئەوەوە یەکێکی دیکە، کە لاقەکانی خۆی بە سەر ئاوەکەدا درێژ کردبوو و نەدەجوولا، لە پڕ دەڕۆیشت و جێی خۆی دەگۆڕی و سێبەرەکانیان دەکەوتە سەر وردە بەردەکانی بنی کانییەکە و هەزاران هێڵی باریك و راستیان دەکێشا، وەك بە راستە کێشابێتن. مێشوولە شینەکان هەر وا هاتوچۆیان دەکرد.

هەر دەهات و وزە وزی دەوروبەری گوڵەکە پتر دەبوو. لە چاوترووکانێکا گوڵەکە سەدان مێشەنگوینی لە سەر دەنیشت کە باڵەکانیان دەلەرزین و دەبریسکانەوە... لە دوورەوە لەو

برنجەجاڕەکەوە هالاّوێکی کەسك هەڵدەستا. هەڵمی کەسك، هەڵمێك کە دەهات بتەقێتەوە.
دوای ئەوە تەپوتۆزێك هەڵدەستا و سەر هەڵمە سەوزەکەی دادەپۆشی. هەواکە لە بۆنی زەلکاو و عەتری گوڵێکی نامۆ و گیا و بەنزین و لاسکی سووتاوی گیا و پووش و ئارەقەی جەستە و تەپوتۆز و ئاوی راوەستاو، ئاخنرابوو. مەمی دیك سەری لە گێژەوە دەهات.

لەو بەری دەشتەکەوە سێبەری هەورێك لەسەرخۆ دەهاتە پێشەوە و سەر لۆکەجاڕەکە و پەرێزەکان و گوڵەبەڕۆژە و گەنمەشامییەکان و باغە پڕتەقاڵەکانی دادەپۆشی.

زۆر بە ئەسپایی بەرەو پێشەوە دەهات. قەراغ و لێوارەکانی هەورەکە بە ئاسمانەوە نوورانی بوو. هەورەکە خۆی نەدەجوولا، کەچی سێبەرەکەی بەسپایی بە سەر زەویدا دەبزووت. لەگ لەگە لۆق درێژەکان بە دەشتەکەدا بلاّو ببوونەوە و دەسووڕانەوە. مژێکی گەرم و روون بە سەر رەوەزەکانی ئاناوەرزا و زۆنگاوەکەی ئاقچاسازەوە نیشتبۆوە.

مەمی دیك هانکە هانکی بوو. شەلاّلی ئارەقە بوو:

- ئەکەی زولەیخا. ئەمن لە حاندی تۆ سەرم هەڵنایە. کێشەیەکی گەورەم هەیە. ئەوەندە پێ دامەگرە. تکات لێ دەکەم.

مەمی دیك نەیدەزانی ئاخۆ لێوەکانی دەجوولێن و دەنگ لە گەروویەوە دێتە دەرێ یان نا. لە بەرانبەر زولەیخادا نوقمی خەیاڵێکی سیحراوی ببوو. زولەیخای دی کە مەمکە خڕەکانی کەروێشکەیان دەکرد و چاوەکانی رەش و درشتن و مژۆڵەکانی سێبەریان خستووەتە سەر کولمە تاوبردووەکانی. تەم پێش چاوەکانی گرتبوو. کەڵەگەتە و وەك ئاسك بەرێدا دەڕوا. بەژن و بالاّیەکی رێك و لەبەردڵان و جوانی هەیە...

مەمی دیك وەخۆ هاتەوە. لە جێی خۆی هەستا و بەخێرایی کەوتە رێ. ئاوڕێکی دایەوە و سەیری کرد ئەوە زولەیخاش بە دوایدا دێ. لە لێڕەکەی قەرەبوجاغەوە چووە نێو قوروجەیحان (وشکە جەیحان). عەرزەکەی ئێرە بە هەزار جۆر قەڵشت قەڵشت ببوو. وشکە جەیحان قوولکەیەکی بەرین و قووڵ بوو. پێشتر جەیحان بەوێدا رۆیبوو. ئێستا هەر هەموو وشترالووی لێ شین ببۆوە. گوڵە شین و مۆرەکانی وشترالووەکان پشکووتبوون، نوقمی تیشك و تیرێژی تاوەکە و شین ومۆر... جۆگەلەیەکی لێڵ تەختی بنی وشکە جەیحاندا دەڕۆیشت. دەتگوت جۆگەیەکی پۆلاّی تواوەیە. مۆرێکی رەنگاورەنگ کە چاوی لە بەر هەڵنەدەهات. قەڵشتە وشکەکەی قوروجەیحان، پۆلاّی تواوەی پێدا دەڕوا. سێبەری بەکاوەخۆی هەورەکە هات و تاوێك لە سەر جۆگە پۆلاّکە راوەستا. گوڵەکان تاوێك دوور لە هەتاو و لە سێبەردا کاڵ بوونەوە. رەنگە

مۆرەکەیان نەرم و تار بوو و جۆگە مۆرەکەش راوەستا. کە سێبەری هەورەکە دوور کەوتەوە، جارێکی دیکەش، جۆگەلەی پۆلا تواوە و مۆرەکە، نوقمی تیشکی خۆر، ئەوەندە خێرا وەرێ کەوتەوە بڕوات نەدەکرد.

مەمی دیك پێخاوس بوو. نەیدەتوانی بە جوانی بەڕێیەدا بڕوات. پێی تەواو لە سەر عەرزەکە دانەدەنا، دەیخشکاند. عەرزەکە دەتگوت ئاگرە. هەر بۆیەش ڕێگا ڕۆیشتنەکەی مەمی دیك لە پێ پێدادانی هەڵپەڕکێی "هالای" دەچوو (دایدەنا و هەڵیدەگرتەوە). زولەیخاش کە بە شوێنییەوە بوو هەر وا دەڕۆیشت. هەموو پێخاوسەکانی چوکووراوا لە هاویناندا ئاوا بە ئاستەم پێیان لە عەرزی دادەنێن و دەڵێی سەما دەکەن.

مارێکی گەورە خوشییە بن وشتراڵووەکانەوە. مارێکی دیکەش کە بۆقێکی بە دەمەوە بوو، وەشوێنی کەوت. هەر دوو کیان پتر لە سێ مەتر بوون و ڕەش بوون و پشتیان دەبریسکایەوە.

مەمی دیك وەك بناڵێنێ:

ـ زولەیخا، وەشوێنم مەکەوە.

چووە نێو پنچکە وشتراڵووەکانەوە. کە لە دڕکەڵانەکە چووە دەرێ، لاقەکانی شەڵاڵی خوێن بوون.

ـ کێشەیەکم هەیە. لێم مەیە پێش. ڕۆژێك لە ڕۆژان دێمە شوێنت.

چاوەکانی قیچ کردبوونەوە و لێوەکانی خۆی دەگەست:

ـ کە دەتبینم وەختە ببمە تنۆکێك ئاو. هەموو ئێسك و پرووسکم دەزیرێنن. دەڵێی گۆشتم لە لەشی دەکەنەوە. خوێن دەمیزم. ناتوانم دەستت بۆ بێنم. شێتی تۆم زولەیخا. کێ ئەمن بە پیاو دەزانێ هەتا تۆ بە پیاوم دابنێی؟ کوێخا سەفەر، ئەمنی لە پیاوەتی خستووە. پیاوەتیمی لە دڵم دەرکێشاوە. هەتا لێی نەستێنمەوە، ناتوانم لێت بێمە پێشێ.

هەڵۆیەك لە ئەشقی ئاسمانێ وەك پەڵەیەکی ڕەش و بچووك دەبینرا.

ئەگەر بە وردی سەیری کردبایە، دەیدی کە هەڵۆکە دەجووڵێ. لە پێشدا لە ئاسمانێدا جەغزی بچووك و دواتر گەورە و بەرینتر دەکێشێ و بە سپایی و بە دەم خولانەوەوە دێتە خوارێ.

لەو بەری وشکە جەیحانەوە دار چنارێکی گەورە سەری لە ئاسمانێ دەسوی. مەمی دیك خۆی گەیاندە ئەوێ. زولەیخا هەر بە شوێنییەوە بوو. مەمی دیك خەریك بوو تۆزێك شەکەتیی لە لەشی دەردەکرد کە زولەیخا گەیشتێ و لە بەردەمی ڕاوەستا.

ڕۆژ، ئاوا بوو. مەمی دیك لەو دیو تەپۆلکەکەی کۆنە جەیجانەوە بوو. شۆڕە بییەکان لك و پرچیان شۆڕ کردبۆوە. لە خوار تەپۆلکەکەوە کانییەك هەڵدەقوڵی. وردە چەوی لووس لووس پاناوکێکی بەرینیان داگرتبوو. لە نێوەڕاستی وردە چەوە لووسەکان و دارە گەزەکاندا، بڕکەی بۆنخۆشی بیبار شین ببوونەوە. لەوێوە هەتا داوێنی گردەکەش بە پنگە داپۆشرابوو کە هێندەی باڵای مەمی دیك هەستابوون. پنگەکانی دەم کانییەکە لە بەژنی بنیادەمێك بەرزتر بوون. گوڵەکانیان شین و بۆنخۆش بوو. بۆنەکەیان سەری گێژ دەکرد و لەو کوێرە ڕێیەی کە پێنج مەتر لەولاترەوە بوو، شەپۆلی دەدا.

مەمی دیك لە ئاوە فێنکەکەی کانییەکەدا دەست و دەموچاوی شوشت و هەر لەوێ ڕاکشا. جا ئێستا هەموو شتێك نوقمی شینایییەکی دڵگر بوو. ئاسمان و پنگە و ڕودە چەوەکان، گردەکە و ئاو و خاك و دارەکان و گژ و گیا و ئەو هەورە تەپوتۆزەی لەو سەرەوە لە جووڵە کەوتبوو و هەورەکان هەر هەموو وەك مەخمەرێکی شین دڵ بلاوێن و دڵڕفێن بوون. زولەیخاش هات و دەست و دەموچاوی شوشت و لە تەنیشت مەمی دیکەوە ڕاکشا و دەستی مەمی دیکی گرت. لەشی مەمی دیك وردە وردە دەبووژایەوە و گڕی دەگرت. لەو ساتەدا ماندوویەتییەکەی لە بیر نەما. وەرسووڕایەوە و زولەیخای ماچ کرد و توند لە ئامێزی گرت... لە شێتیی ئەڤین و خۆشەویستیدا بوونە یەك و دواتر ماندوو و شەکەت ڕاکشان. بۆنی پنگەی شێلرا و پانەوە بوو، هەستا....

کە مەمی دیك وەخۆ هاتەوە، زۆر زۆر تەریق بۆوە و گوتی:

ـ ببوورە زولەیخا. ئەگەر ئەوەندەم خۆش نەویستبایەی، دەستم بۆ نەدێنای. ئەمن شیاوی تۆ نیمە. هەتا تۆڵەی خۆم لە سەفەر نەکەمەوە، شیاوی هیچ کەس نیمە.

زولەیخا گوتی:

ـ کەوابوو بچۆ و تۆڵەی خۆتی لێ بکەوە. ئەمن تا ئەو کات هەر لەسەرت ڕادەوەستم. تەنانەت ئەگەر کەزیی سپییش بهۆنمەوە...

ئێسك و پرووسکی مەمی دیك زیڕاندی. جێی برینەکانی برژانەوە. لە بەر ژان خۆی وێك هێنا.

ـ ئەو حاڵەتەم لە مەرگ تاڵترە. چیی نەمابوو تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە، یەکێکی دیکەم...

دەمودەست لە جێی خۆی دەرپەڕی و ڕای کرد. بە دەوری گردەکەدا سووڕایەوە و ماوەیەك بە دەم رووبارەکەدا ڕای کرد و ئەوجار ڕاوەستا و ئاوڕێکی دایەوە. زولەیخا دیار نەبوو. زولەیخا

لە نێو پنگەڵانەکەدا ڕاکشابوو. هانکە هانکی بوو. گیانی گڕی گرتبوو. چاوەڕێی مەمی دیك بوو. جومگە و ماسوولکەکانی چڵیان دەدا و دەیانزیڕاند.

بە دەم ناڵینەوە دەیگوت:

ـ مەمی دیك، منت خۆش بوێ، مەمی دیك، منت خۆش بوێ...

مەمی دیك لە ڕێچکەکەی کەندەڵانەکە وەسەر کەوت و گەیشتە ڕێگەکە. سێ سوار بەرەوڕووی دەهاتن. لە تاریکاییەکەدا ئەسپەکان و سوارەکان گەورەتر ببوونەوە. وەك دێو و درنج زەبەلاح و بە هەیبەت دیار بوون. کە سوارەکان لە مەمی دیك نزیك بوونەوە، ئەسپەکانیان ڕاگرت و دابەزین.

مەمی دیك بزەیەکی هاتێ:

ـ دۆزیتانەوە؟

سوارەکان وەڵامیان دایەوە:

ـ نەماندۆزییەوە بەڵام هەر دەیدۆزینەوە.

مەمی دیك گوتی:

ـ ئاوی چەمەکە بردی. لە نێو ئاوەکەدا، تەرمێکی بۆگەن و گەورە کە بیست و شەش مێشی کەسکی بریسکەداری لە گوێن پۆڵای لێ نیشتبوو.

سوارەکەی پێشەوە گوتی:

ـ دەبێ بیدۆزینەوە.

سێهەمیان گوتی:

ـ چوکووراوا ئاگری گرتووە.

یەکەمیان گوتی:

ـ ئەسپەکان پشوویان لێ بڕاوە. لغاوەکانیان نوقمی کەفی زاریانە.

سێهەمیان گوتی:

ـ دەبێ هەر بەو ئەسپانە بە غاردان لە چەمەکە بپەڕینەوە.

یەکەمیان گوتییەوە:

ـ دیسان باران دەبارێتەوە شەوکەت بەگیش هەر نەهاتەوە... خودا دەزانێ ئێستا لە کوێیە.

ڕووبارەکەی جەیحان لێڵ و قوڕاو دەڕۆیشت. بەیان ئەنگووت. بە درێژایی ڕووبارەکە هەورە سپییەکان بە ئاسمانەوە بەسپایی دەخوشین. هەورە لۆکەییەکان لە ئاسمانەوە بە سەر ڕووبارەکەدا

شۆڕ ببوونەوە و بەرەو دەریای سپی دەڕۆیشتن... لە سپیاییە خولیاییەکەی بەیانیاندا هەر وا دەخوشین و دەڕۆیشتن و کلکەیان دەبڕایەوە.

دووکەڵی ئاگری بەیانیانی کرێکارەکان، بەرز و باریك و بە جووڵە هەموو دەشتەکەی داگرتبوو و بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا.

قەڵافەتی ئاشقە کەچەڵ لە تاریکایی شەوەکەدا زلتر دیار بوو. وەك چیایەکی قایم و پتەو لە نێو تاریکایی شەوەکەدا دانیشتبوو. نەدەبزووت. دەموچاوەکەی درێژ و تێکسمڕاو و نوقمی پەژارە و پڕ لە چرچ و لۆچ بوو.

گوڵە گەورەکە دیسان درشتتر و نارنجیتر بۆوە.

شەوەکەی ئەستێرە باران بوو. هەر هەنگاوێکی هەڵتدەگرت، شوێن پێیەکەت دەبووە جۆگەلەیەك لە تریفە. باران دایکرد. دڵۆپ و تنۆکی باران نوور و تیشك بوون. تەڕی نەکرد. رووناکییەك هەستا و دەشتەکەی لە نێوەڕاستەوە دوولەت کرد. چیاکان و شەوەکەی لە نێوەڕاستەوە دوولەت کرد. نێوچاوانت چرچی تێکەوتبوو. خەیاڵ رفاندبووتی. گوندی هاتن و لە سەر سەرت کۆ بوونەوە و گوتیان رزگارمان کە و فریامان کەوە. ئێمە کۆیلەی هەزاران ساڵەین. دەست و پێمان بەستراوە... مەزراکانمان بڕی و لە باغەکانەوە گەیشتینە لێرەکان... هەزران تۆپەڵە نوور بە شوێنمانەوە بوون. هەزار رووناکایی کە چاویان لە بەر هەڵنەدەهات. هەر هەنگاوێکی دەمانا، دنیا نوقمی گوڵ دەبوو. دنیای کۆن نوێ دەبۆوە، دیسان لە دایك دەبۆوە و لەبەر تازەیی دەبریسکایەوە. ئەوەندە نوێ کە دەتگوت هەر ئەمڕۆ خولقێنراوە. مەزراکان بەریان گرتەوە. لاسك و قەسەڵە گەنمەکان، لە بەر گوڵەکانیان خۆیان نەگرت و نوشتانەوە. گوڵەکانی "قەرەقلیچ" هەر کامەیان هێندەی قولانجێك. پلوورەکان و قەڵشتی رەوەزەکان و کەلێنی پیرە دارەکان پڕ بوون لە هەنگوینی زەرد. هەر پلوورەیەك پێنج جاران پڕ و بەتاڵ بۆوە. بە هەزاران مێشەنگوین بە سەر هەر لقە دارێکەوە نیشتنەوە. هەنجیرەکان هەنگوینی بوون و هەنارە درشتەکان بە دەنکە سوورە بلوورینەکانیانەوە قەڵشین. خاك نەرم و نیان بۆوە. هەمووان شاد و شوکور بوون. خاکە بە پیتەکە ئارەقەی کردبوو و نووستبوو. کەس پێخاوس نەبوو. کەس نۆبەتێی نەبوو. کەس ناهەقیی لێ نەدەکرا. کەس نەیدەتوانی ئەوەندە لە بنیادەمێك بدا خوێن بمیزێ. کەس نەیدەتوانی سووکایەتی بە یەکێکی دیکە بکا و مرۆڤبوونەکەی لێ بستێنێتەوە. لە چیاکان تێپەڕین و لە ناومان بردن. لە بیابانە گەرمەکاندا پەڵە هەورێك سێبەری لێ کردین. هەر هەمووی ئەوانە لە خۆشەویستیی تۆ و لە بەر خاتری تۆ

بوو. ئەمن ئەتۆم ئاوا دی. بیابان نوقمی گوڵ و شیناوەرد بوو و ئاوەکان بە خورە خورە وەڕێ کەوتن.

ـ یەکەم کەسێکی هەوڵی دا من نەبووم. یەکەم کەس کە لە دایك بوو من نەبووم... ئەتۆ زۆر جاران منت دی... زۆر جاران...

بەیانییەك بە سەر ئاوی دەریای سپیدا رۆیشتی. بوویتە شنەی با و هەڵتکرد. بوویتە هەور و داتکردە باران. بەو دوو چاوەی خۆم دیتمی کە ئاسکێکی چاوڕەش سەری لە سەر رانت دانابوو و دەگریا. گوتت "ئەی مامزە چاو رەشەکە، هەستە و غار بدە."

دارەکانیان لە رەگەوە هەڵکەند. باڵندەیان بە سەر دار و بە ئاسمانەوە نەهێشت. ئاوەکانیان هەڵچۆڕاند. بنیادەمەکانیان نەخۆش خست... ئەتۆ هاتی و نوورێکی هێندەی منارەیەك بەرز بە شوێنتەوە...

ـ یەکەم کەسێك کە دەرکەوت من نیم و یەکەم کەسێك کە لە دایك بوو من نیم... ئەتۆ زۆر جاران منت دی.

چووینە نێو دارستانێکەوە. رێمان لێ هەتڵە بوو. گوندییەکان تۆیان کوشت. تۆزێك دواتر دیسان زیندوویان کردیتەوە. ئەمن بەو دوو چاوەی خۆم دیتم.

ـ ئەمن یەکەم کەسێك نیم کە مردم و یەکەم کەسیش نیم کە لە دایك بووم...

دەموچاوی ئاشقە کەچەڵ درێژتر بۆوە. چرچە درێژەکانی لە سەرەوە بۆ خوارێ، لەشیان داگرت.... زەوی نەبوو، ئاسمان نەبوو، خاك و ئاو نەبوو. بنیادەم و جروجانەوەر و مێروولە و خێو و فریشتەش نەبوون، هیچ کەس نەبوو. تۆ نەبووی، من نەبووم، شەو نەبوو، رۆژ نەبوو... هیچ شتێ نەبوو.

رەگ و بنەواشەی تاریکایی، رەگ و بنچینەی رووناکی.

هیچ شتێك، هیچ شتێك نەبوو.

لایەکی روخساری ئاشقە کەچەڵە تاریك داهات و لایەکەی دیکەی رووناك. شەپۆل شەپۆل دەنگی بە دەشتەکەدا گەڕا. بۆڕە و هۆڕەی سامناکی دێوەزمەیەك کە هەر دەهات و بەرزتر دەبۆوە. دەنگەکەش رەگی نەبوو. رەوەزەکانی ئاناوەرزا دەنگیان دایەوە. رەوەزەکانیش نەبوون.

ئەوەی هەبوو، تۆپەڵەیەك نوور بوو. ناتوانی سەیری بکەی. کوێر دەبی. دە ملیۆن ساڵ، سەد ملیۆن ساڵ، ملیۆن ملیۆن ساڵ ئەو تۆپەڵە نوورەی پڕ بە چنگێك دەبوو و ئەگەر سەیرت کردبایە کوێر دەبووی، لە بۆشاییدا سووڕایەوە. بۆشاییش نەبوو.

لە شەش تەلەکەی سازەکە، سی تەلی پسا. سازەکە کەوتە خواریّ. هەورەکان بەرەو زەوی خوشین.

ـ ئەمن تۆم دی. لە هەر دوو چاوان کوێرە بم ئەگەر درۆ بکەم. بەو دوو چاوەم.

ـ ئەتۆ گەلیّ جاران منت دی، برالە، گەلیّ جاران.

مەمی دیك دانیشت و گریا. برینەکانی برژانەوە. ئێسکەکانی زریکاندیان و هەموو گیان ژانی کرد.

دەستی تاشباش ئۆغلوی گرت و گوتی:

ـ ئەتۆ بووی. بەو دووو چاوەی خۆم دیتمی.

ئاشقە کەچەڵە جارێکی دیش گۆرانیی "دنیای بەتاڵ"ـی گوتەوە.

تاشباش ئۆغلو بە سەرسوورِمانەوە لە جێی خۆی وشك بوو.

مەمی دیك لە تەنیشت گوڵە گەورەکەوە بوو. گوڵەکە ئارەقەی دەکرد و دەدرەوشایەوە و نارنجیتر دەبوو.

تاشباش ئۆغلو پتر سەری سوورِ ما.

ـ ئەتۆ منت هەر نەدی؟ هیچ نەتدیم؟

باران وەك گۆزەی سەرەوژێر دەهاتە خوار. ئەتۆ بە بەر بارانەکەدا دەرِۆیشتی. تەنانەت دەنکە بارانێکیش چییە، وەتۆ نەدەکەوت. ئەو رێیەی پێیدا دەرِۆیشتی، وشك و پڕ لە خۆڵ و خاك بوو. بەو دوو چاوەی خۆم...

ـ یانی ئەتۆ منت هەر نەدی؟ هیچ نەتدیم؟...

رەوەیەك ئەسپی کێوی، زل زل بەو لاولادا غار غارێنیان دەکرد. شێت ببوون. کەس نەیدەتوانی لێیان بچێتە پێش. یەك بە یەك هاتن و لە بەردەمت راوەستان.

ـ ئەتۆ منت هەر نەدی؟ هیچ نەتدیم؟

پلتۆکێکت لە رەوەزێکی گەورە دا. ئاوێکی فێنك و روونی لیّ هەڵقوڵی. وەك سەهۆڵ. ئەو بەو دوو چاوەی خۆم...

ـ ئەتۆ منت هەر نەدی؟ هیچ نەتدیم؟

هەنارێکت لیّ کردەوە، قەڵشیو، هەنارەکەش لێك بۆوە. هەموو گوندەکە لێی خوارد و تەواو نەبوو.

ـ هەرگیز... هیچ؟

دانەوێڵەیەکمان چاند. کێڵگەکان پڕ بوون لە گوڵ و دەشتەکان لە لۆکەدا ون بوون. هەر بەو دوو چاوەی خۆم...

- هیچ و هیچ؟...

گوڵە گەورەکە ئارەقەی کرد و ڕەنگەکەی دیسان نارنجیتر بۆوە. سەدان مێشەنگوین لە کاکڵەکەیدا... بە باڵە درەوشاوەکانیانەوە....

شەو داهات، ڕۆژ، ئاوا بوو.

- ئەتۆ هیچ... هیچ..

ئاشقە کەچەڵە باسکەکانی وەك دوو باڵ لە تاریکاییەکەدا لێك کردەوە و لێکی نانەوە. دەستەکانی وەك مستێك کەوتنە سەر سینگی سازەکەی. مەمی دیك بەسپایی پەنجەکەی نێوەندیی ئەوی گرت و گوشیی و دەستی ماچ کرد و بەرزی کردەوە و لە سەر تەپڵی سەری خۆی دانا.

گوڵە گەورەکە دیسان نارنجیتر بۆوە و کەوتە بۆشاییەوە، بە تەنێ.

مریمۆك سەری بە ترس و ئەستێرەكانی و
ئەحـــە شــێتەوە خــافلاوە. جــاری واشــە
دەكەوێتــەوە بــیر یاغییــەی ســاڵی ســاڵان.
كەرەی بەیانی كەڵەبابەكە لە ســەر یــەك ســێ
جاران دەخوێنێ. لـە گوندەكـەی ئەوبـەرەوە
سێ كەڵەباب جوابی دەدەنەوە.

## ٣٣

شەو داهات. رۆژ، ئاوا بـوو. ئـان سـاجییەكی لـە تەبەكـە* نانەكـە دەرهێنـا و رشـاندی و لـە سـەر سفرەكە داینا. تەبەكە نانەكە نیوە ببوو. مریمۆك بیری كردەوە كە هەتا دێنەوە بەشم دەكا. ساوارەكەی لە سەر ئاگردانەكە دێمی كێشابوو. مریمۆك پیوازێكی بە مستەكۆڵە ورد كرد. پیـواز دەبـێ بـە مـست بیهاڕێ. ئەگەر بە چەقۆ بیبڕی تاڵ دەبێ. هاڕینی پیواز بە مست تاڵییەكەی دەبا.

مریمۆك نیوەڕۆیە هیچی نـەخواردبوو. هـەر لـە لێرەكـە تـۆزێكی یـالابووك مـژیبوو. هـەم یالابووكی دەمژت و تین و گۆڕێكی لەبەر دەگەڕا و هـەم ئەوەیكـە لـە دارستـانەكەدا دەگـەڕا و رایدەبوارد. بۆیە دیسان زۆری برسی بوو.

رۆنی لێ بڕابوو. ساوارەكەی بەبێ رۆن خوارد.

جێوبانەكەی لە بەر دەرگاكە رادەخـست و كـەلێنێكی دەدایـە دەرگاكـە و هـەر لـەوێ لێـی دەنووست. ئەمشەو دەترسا. چووە سەربانێ. سێبەرەكان درێژ ببوونەوە. دەشتەكە نیـوە تاریـك بوو. لەو خوارەوە دارەكان لە تاریكاییەكی ئەنگوستەچاودا نوقم ببوون و سـەری چڵووكەكانیان لە رووناكاییەكی درەوشاوەدا. شەوەكە بەبێ دەنگـی و بەسـپایی بەسـەردا دێ. سـێبەرەكان لـە چیاكانەوە بەرەو دەشتەكان دەكشێن. بێدەنگی... لە سەرەتای شەوێدا، مریمۆك لە چەقی ئـەو دنیایـەدا بەتـەنێ بـوو. خانووەكـان، دارەكـان، دارسـتان، ئاوەكـە.... خـوڕەی ئـاو، دەنگـی

---

* تەبەك: تەبەكی نان: ناندێن. شوێنی نان. بۆ ئەندازەی نانیش گوتراوە. تەبەكێك نانی برد. یان تەبەكە نانێك بە ژەمێك دەخوا.

باڵندەکان و ئەو خاکە بە پیت و وەبەرهاتووە بە هەزاران جۆرە گوڵ و گیا و مێروولە و مار و هەموو مەخلووقاتەکەی دنیاوە... دنیای بە جووڵە، دنیای بە جۆش و خرۆش و پڕ و پەیمان. دنیای هەزار رەنگ هەموو شتێکی هەیە. رەنگەکان، رووناکایی، شەو و دەنگەکان و ئەستێرە و هەموو شتێکی هەیە. دنیا بەو جۆراوجۆرییە بێ کۆتایی و بەجۆش و خرۆشەوە تەواو نابێ، بەڵام وەرە سەیر کە ئەو دنیایە چەندە چۆڵە. نە دەنگێك و نە رووناکاییەك و نە رەنگ و نە جووڵەیەك. هەر دەڵێی نە گوڵێکی تێدایە و نە گیانلەبەرێك، بێدەنگی و تەنیایی.

هەر ماڵەی کۆمەڵێك هێلانە پەڕەسێلکەی تێدایە... پەڕەسێلکە پۆل پۆل دێن و دەچنە نێو ماڵەکانەوە... پەڕەسێلکە دۆست و برادەرن، شوێنیان لە تەنیشت بنیادەمەکانەوەیە بەو باڵە تیژ و ناسکانەیانەوە هەوا دەبڕن. هیچ گیانلەبەرێك دیار نییە. نە جڕ و جانەوەرێك نە زەرگەتەیەك و نە بۆنێك... هەر هیچ شتێك نییە.

مرێمۆك لە ناخی خۆیدا هەستی بە تەنیاییەکە کرد. چۆڵ بوونی دنیاکە، ئەو دنیایەی هەموو شتێکی هەیە. دنیای پڕ و پەیمان، دنیای پڕ لە جۆش و خرۆش و جووڵە. ئێستا چۆڵ و هۆڵە. لە مردوو دەچێ. مرێمۆك زانی ئەو دنیا بێ بنیادەمەی وەك خەنجەرێکی رەش لە دڵیدا هەست پێ کرد. کەوابوو ئەوە بنیادەمەکان بوون دنیایان پڕ دەکرد، هەموو شتێك، هەموو دنیا واتە ئینسان. کوڕە خۆ ئینسان نەبێ، دنیاش نییە.

مرێمۆك لە سەربانەوە رووی بەرەو لای رۆژئاوا بەرەو خۆرە ئاوابووەکە وەرسووڕاند و بە دەنگێکی گەرمی ئینسانییەوە هەرای کرد:

ـ کوڕە بە قوربانی بۆنی جەستەت بم ئادەمیزاد. بە قوربانی بۆنی جەستەت بم ئادەمیزاد. بە قوربانی بۆنی جەستەت بم ئادەمیزاد.

دەنگی مرێمۆك وەك هەورە تریشقە دنیای داگرت و ماوەیەك زۆر لە لێڕەوار و دەشت و شی و دۆڵەکاندا دەنگی دایەوە.

ـ بە قوربانی بۆنی جەستەت بم ئادەمیزاد.

ئێستا ئەگەر منداڵە کەچەڵەیەکیش لای مرێمۆك بوایە، ئەو تەنیایی و بێدەنگییە دەمودەست نەدەما و دنیا پڕ و خۆش دەبۆوە. ئەگەر کورێژگەیەك بوایە، تەنانەت ئەگەر کوڕە کەچەڵەیەکی چڵمنیش بوایە...

ـ ئەگەر بەهەشتیش بنیادەمی تێدا نەبێ، نامەوێ. ببەنە جەحەندەمێ ئەگەر ئەوێ بنیادەمێ تێدایە بە قوربانی بم. هەی بە قوڕگیرێ ئەو دنیایەی بنیادەمی تێدا نییە.

ناهەقی دەکا، خراپە دەکا. سووکایەتی بە هاوڕەگەزەکەی خۆی دەکا، مافی خەڵك دەخوا، دەکوژێ و درۆیان دەکا. بە کورتی هەموو خراپەکان هەر ئەو دەیکا. هیچ مەخلووقێکی ئەو دنیایە هێندەی بنیادەم لەگەڵ هاوڕەگەزەکەی خۆی و یان لەگەڵ مەخلووقاتەکەی دیکەش، ئەوەندە زاڵم و هەر لەو کاتەشدا ئەوەندە بەبەزەیی و نەرم و نیان نییە. ئاشقە کەچەڵە دەڵێ:" دنیا نەبوو، هیچ شتێ نەبوو، هەوا و ئاو نەبوون، تەنانەت بۆشاییش نەبوو... هیچ شتێ نەبوو، لە هەموو کایناتدا تۆپەڵە نوورێکی پڕ بە چنگێك هەبوو کە هەموو ولاّتی رووناك کردبۆوە. ئەو نووره ئەوەندە درەوشاوە بوو کە چاوی لە بەر هەڵنەدەهات و ئەگەر چاوت لێ کردبایە کوێر دەبووی. ئەو نووره بنیادەم خۆی بوو، مرۆڤایەتی خۆی بوو. ئەو نووره لە ناخی هەموو بنیادەمێك دایە. بنیادەم لەو نووره خولّقاوە. خودا لە پێشدا حەزرەتی ئادەمی لە قوڕ بە شێوەی ئینسان دروست کرد و دوایی ئەو نوورەی لە ناخیدا دانا."

ـ هەی بە قوربانی بۆنی جەستەی بم.

مرێمۆك وەترس کەوت. دارستان و ئەشکەوت و پەرییەکان و رەوەزەکان و دەشتە چۆڵ و تەنیاکە هەر هەموو هەستابوون و وەڕێ کەوتبوون. سێبەرە زەبەلاحەکانیان و هەرا و هۆریاکانیان دەیانترساند. مرێمۆك لە سەربانێ راوەستابوو و سەیری ئەو دنیا چۆڵ و بێدەنگەی دەکرد. ئەو دنیایەی پڕ بوو لە هەرا و هۆریایەکی نادیار و لێڵ. ئەو دنیایەی وەڕێ کەوتبوو، هەڵدەفڕی و وەك رووبارێك دەڕۆیشت، دنیای چۆڵ و تەنیا.

گورگەکان، چەقەڵەکان و ئەو دەعبایانەی نەیدەناسین، دەیانئەڕاند و دەنگەکانیان تێکەڵ بە یەك دەبوو. دەنگی فیشکەی مارەکان و کوندەبوو... بۆ ساتێك دنیا پڕ دەبوو لە دەنگە دەنگی جۆراوجۆر و ساتێك دواتر، هەموو دەنگەکان لە پڕ دەبڕانەوە و هەموو بێدەنگییەك باڵی بە سەر هەموو ولاّتدا دەکێشا. مرێمۆك لەو ترس و خۆفە گەورەیەدا، بە تاقی تەنێ بوو. تەنیایی خەیاڵ و هەستێکی ئاڵۆز و نامۆی خستبووە دڵییەوە. شتی وای بە خەیاڵدا دەهات لە ژیانیدا بیری لێ نەکردبۆوە و ئێستاش نەیدەتوانی بە زمان بیانڵێ. وەبیر تاشباش ئۆغڵو کەوتەوە و بەخۆی گوت:"لەوانەیە ئەوەی لە تاشباش ئۆغڵویە لە منیش بێ."

خۆی پێ لە هەموو خولّقێنراوەکان گەورەتر بوو و هەستی دەکرد هێزێکی زۆر سەیری هەیە. لە دڵی خۆیدا گوتی:"لەوانەشە لەو تەنیاییەدا خەریکە تێك دەچم. حاشا، حاشا، خەریکم خۆم لە جێی ئەو دادەنێم.

ماوەیە لە نێو هەست و خەیاڵە دژ بە یەك و ناتەباکاندا پەلەقاژەی کرد:"ئەمشەو، ئەمسەو مرێمۆك نانوێ. مرێمۆك دەبێ بچێتە خوارێ و جێوبانەکەی بێنێتە ئێرە. چما وا نییە؟ وایە، بەلاّم خوشکە مرێمۆك، ئەتۆ دەتوانی بچیتە خوارێ."

خەریك بوو زراوی بچیّ. دەتگوت لەو خوارە سەدان هەژدیها چاویان داپچڕیوە و چاوەڕێین:"ئێستاش کە ئاوایە، مریّمۆك جا ئەمشەو بەبیّ جێوبان لە سەر بانیّ دەنویّ. خۆ ئەگەر مریّمۆك ئەمشەو لە سەربانێش نەنویّ زۆر گرنگ نییە."

کە رووی قسەی لەخۆی دەکردەوە، وای هەست دەکرد یەکێکی دیکەشی لە لایە. هەر بۆیە بەردەوام ناوی خۆی دووپاتە دەکردەوە.

یەك دوو جاران هەوڵی دا بچێتە خواریّ، بەڵام هەموو جاریّ دەتگوت پیّ لە سەر خەرمانێك ئاگر داناوە. لە پڕ کەوتەوە بیر لەو پەیژەیەی بە گوێسوانەکەیەوە ناوە و دەمودەست چوو و هەڵیکێشایەوە و گوتی:

"مریّمۆك ئەتۆ چەند کەری، مریّمۆك. مریّمۆك، ئەتۆ کەری. پێت وایە باڵندە و دەعبا و مەعبا و خێو و پەری ناتوانن بەبیّ پەیژە بێنە سەریّ؟"

لە ترسان چووە گۆشەیەکی سەربانەکە و کرووشمەی کرد. چیی پتر دەترسا، پتر خۆی گرمۆڵە دەکرد و چەندی گرمۆڵەتر دەبوو، ترسەکەی پتر دەبوو و ئاخرییەکەی ئەوەندەی خۆ گرمۆڵە کرد کە بوو بە تۆپەڵێك. ئەمشەو ئاسمان ساو و پڕ لە ئەستێرە بوو. پەیتا پەیتا لە راست و چەپەوە ئەستێرەکان دەخوشین و دەکەوتنە خوارەوە. هەر جارێکی ئەستێرەیەك دەخوشی، ئەو لە جێی خۆی دەردەپەڕیّ و دیسان بە دڵەکوتەیەکی زۆرەوە دادەنیشتەوە. ماوەیەك سەیری ئاسمانێی نەکرد. بەڵام خۆی پیّ نەگیرا. هەر ئەستێرەیەك بنیادەمێك بوو. هەر ئەستێرەیەکی دەخوشی، بنیادەمێك دەمرد. نەیدەتوانی سەیری ئاسمانیّ بکا، بەڵام هەموو ئەو ئەستێرانەی دەدی کە بەردەبوونەوە و لەگەڵ هەر ئەستێرەیەکی دەخوشی، ئەو لە جێی خۆی قیت دەبۆوە و کە ئەستێرەکە دەکەوتەوە، دیسان دادەنیشتەوە.

بەرەبەری بەیانی بوو خەو بردییەوە و زۆری پیّ نەچوو بە دەنگی کەڵەبابەکە وەخەبەر هات. کەڵەبابەکانی گوندەکەی بەرانبەریش وەڵامیان دایەوە. هەتا خۆر گەیشتە نێوەندی ئاسمانیّ، نەیتوانی لە سەربانیّ بێتە خواریّ و ئەوجار برسێتی هێرشی بۆ هێنا و چووە خواریّ و نانێکی هەڵگرت و پەنیری تیّ کرد و کردییە بابۆڵە و بەرەو لێڕەوارەکە وەڕیّ کەوت... سەیری حەزی چووبووە گۆشت. رانی چەور و سوورەوەکراوی کەڵەبابەکەی لە سەر پشکۆی ئاگرەکە دەهاتە پێش چاوی.

تیشکی تاوەکە لە کانییەکەی دابوو و تیشکی دابووەوە. بابۆڵەکەی تەواو کرد و نووشتایەوە و بینی بەو ئاوە زوڵاڵەوە نا کە تیشکی تاوەکە ئەوەندەی دیکەشی روونتر کردبۆوە. ئاوەکە بۆنی نەعنا کێویی لێوە دەهات. رۆژی پێشوو سنەوبەرێکی بەرز و باریکی دیبوو.

یالابووکی سنەوبەری باریك و بەرز خۆش و بەتام دەبێ. نەرم و بۆنخۆش. مریەمۆك ئیدی ئێستا فێر ببوو کە بە ئاسانی یالابووك دەربێنێ. لقەدارێکی هێندەی باسکێکی بڕیبوو و نووکەکەی تاشیبوو و پانی کردبۆوە. توێکڵی سنەوبەرەکەی لە خوار و ژوورەوە هێندەی دووقولانج و بە پانایی قولانجێك دەبڕی و دوایی نووکە پانەکەی لقەکەی لە شوێنە بڕاوەکە دادەنا و ئەوجار بە بەردێك ئەوەندەی لە سەرەکەی دەکوتا هەتا توێکڵی دارەکە هەڵدەقەنرا و ئەوجار بە چەقۆ ماراشەکەی خۆی توێژکاڵە ناسکەکەی ناوەوەی دەردێنا و ورد ورد دەکرد و لە زاری دەخست و دەجوی. ئەگەر بنیادەم چۆرە ئاوێکیشی بە دوودا کردبایە، قەت لە بۆن و بەرامەکەی تێر نەدەبوو. بۆن وبەرامەی یالابووك ماوەیەك زۆر لە زاردا هەر دەمایەوە.

هەتا نیوەڕۆ یالابووکی لێ کردەوە و خواردی. بۆن و بەرامەی تازەی لێرەوارەکە لە دەمارەکانی گەڕا. مریەمۆك کاتێ دوای خواردنی یالابووك چۆڕێ ئاوی دەخواردەوە وەك کچۆڵەیەکی پازدە ساڵانە دڵی خۆش دەبوو و وەیدەزانی بووەتە مەلێکی تیژ باڵ. بۆن و بەرامەی لێرەواری لە زارییەوە دەدایە دەرەوە... هەموو بۆن و بەرامەی دارستانەکە لە یالابووکدا کۆ ببۆوە.

مریەمۆك باوەشێك پنگەی گوڵ شین و نەعنای کێویی کۆ کردەوە. کە یالابووکی دەبڕی وەبیر قەرەجەکان کەوتەوە. قەرەجەکان و ئەو مامە خەلیلە نەحلەتییەی کە خودا هیچ بەندەیەکی لەو خراپتری نەخولقاندووە. قەرەجەکان و مام خەلیل چۆنیان مریشکەکان دەگرت؟ پەتێکی قایمیان هەڵدەگرت و دەنکە گەنمەشامییان وە تەسبێح پێوە دەکرد.

مریەمۆك بە باوەشێك پنگە و نەعناوە هاتەوە ماڵێ. شریتێکی پەیدا کرد و دەنکە گەنمەشامییەکانی پێوە کرد. کەڵە شێرەکە لە قەڵاغەکەی "عەلییە کوێر"دا لە سەر کۆگایەکی پەین و پاڵ قاچێکی هەڵێنابوو و بە بەر زگییەوە نووسانبدوو و قیت و قنج لە سەر لاقەکەی دیکەی راوەستابوو. دەتگوت ئەوە دەڵێ:ئەمن پادشای ئەو دنیایەم و مریەمۆکیش رەعیەتی منە...

مریەمۆك کە دیتی ئاوا لەخۆباییانە راوەستاوە، تووڕە بوو و گوتی:

ـ لاچۆ هەی کەڵەشێری گڵاو. ئێستا پێت دەڵێم. ئێستا پادشایەتیت پێ دەڵێم چییە. هەی گڵاو، ئێستا مریەمۆك پێت دەڵێ پووتێك چەند کیلۆیە. تێگەیشتی؟

بانگی کەڵەبابەکەی کرد:"وەرە، وەرە، وەرە." و گەنمەشامییە هۆنراوەکانی بۆ هاویشت. کەڵەبابەکە پەلاماری گەنمەشامییەکەی دا. یەکەم دەنکی قووت دا. مریەمۆك گوێی نەدایێ. کەڵەبابەکە یەك لە دوای یەك قووتی دەدان. مریەمۆك وەك فەنەرێکی گوشراو ئامادەی دەرپەڕین بوو. هەموو گیانی وەسەر ئارەقە کەوبتوو. لە نەکاو توند شریتەکەی گرت و کێشای.

کەڵەشێرەکە وەپەلەقاژە کەوت. کردییە هەڵلایەك هەر مەپرسە. بەڵام خۆی پـیّ رزگـار نـەکرا. پەڕ و پۆ و تەپوتۆز تێکەڵ بوون. کەڵەشێرەکە خۆی بە دەستەوە نـەدەدا. تەنانـەت بـە باوەشـی مرێمۆکیشەوە هەر باڵەپڕژەی بوو. کەڵەبابێکی بەقەوەت بوو. ساتێك دواتـر مرێمـۆك باسـکی شل بوون. کەبابەکە شـل نـەدەبوو، مرێمـۆك بـە سـەری دیکـەی ئـەو داوەی کەڵەبابەکـەی پـیّ گرتبوو، لاقەکانی توند شەتەك دا و بەرەڵلای کرد.

"مرێمۆك لاقەکانتی توند توند بەستووە. جا ئێستا چەند پێت خۆشـە هەڵبـەزە و پەلـەقاژە بکـە. مرێمۆك سەرت دەبڕیّ. ئەمڕۆ ئاگرێك دەکاتەوە، ئەویش چ ئاگرێك، و جا ئەتۆی لە سەر دەبرژێنیّ."

بۆنی بە هەواوە کرد. بۆنی کەبابی کەڵەبابی بۆ هات.

کەڵەبابی خوێڕی، هەر لە ئێستاوە بـۆنی کەبابەکـەتم بـۆ دیّ. گۆشـتی تـۆ بەشـی حەوتوویـەکی مرێمۆك دەکا. ناهێڵم بۆنگەن بی. وشکت دەکەمەوە. گویّ بگرە کەڵەبابی خوێڕی، دوای ئەوەی تـۆم خـوارد و تـەواوم کـردی، جـا دەچـم و ئـەو بـرادەرەی دیکـەت کـە هـەموو بـەیانیان لـەو گونـدەی تەنیشتمانەوە قسەت لەگەڵ دەکا، ئەویش دەگـرم... ئێـستا مرێمـۆك دەبـیّ چـرپی و پـووش و دارە وشکەی "عەلی"یە کوێر بسووتێنیّ. وا وشك بوونەتەوە هەر لە ئێستاوە دەڵێی ئاگرن."

ئاوردووەکەی بە باوەش هێنا و ئاگرەکەی کردەوە. دەمودەست گـڕی گـرت. مرێمـۆك دیـسان دار و چرپیی پتری دەخستە سەر ئاگرەکە. زۆری نەبرد هەموو گڕیان گرت و ئاگردانەکەی پڕ بـوو لـە بڵێـسەی سوور و درەوشاوە. چوو و هەسانەکەی هێنا و چەقۆیەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دەسـتی کـرد بـە تیـژ کردنی. چەقۆ وای لیّ هاتبوو مووی دەقەڵشتەوە. کەڵەشێرەکەی لە تەنیشت تاتە بەردەکە لە عـەرز دا. کەڵەشێرەکە بە نیگای پڕ لە سەرسووڕمان و پاڕانەوە سەیری دەکـرد. مرێمـۆك پێـی راسـتەی لـە سـەر لاقە بەستراوەکانی کەڵەشـێرەکە و پێـی چەپەشـی لـە سـەر باڵـەکانی دانـا. سـەری کەڵەبابەکەشـی بـە دەستی چەپەی گرت و کێشای. ملی کەڵەبابەکـە درێـژ بـۆوە. مرێمـۆك بـە پـشتی چـەقۆکەی تـووکی لاملی کەڵەبابەی لادا و ساتێك دواتر کە دەیویست چەقۆیەکەی بـە ملـی حەیوانەکـەدا بـێنیّ، دەسـتی راگرت. بەزەیی پێیدا هات. کەڵەبابەکەی بەردا. کەڵەبابەکـە خـۆی راپـسکاند و رای کـرد و برێـك لـەو لاترەوە چووە سەر دیوارەکە و بە هەموو تین و توانای خۆی خوێندی.

مرێمۆك سەیرێکی ئاگرەکەی نێو ئاگردانەکە و سەیرێکی کەڵەبابەکەشی کرد و گوتی:

ـ کەڵەبابەکە، تاقانە هاودەمی مرێمۆك لەو دنیایە... مرێمۆك ئەگـەر لـە برسـانیش بمـریّ نـاتوانیّ سەری تـۆ بـبڕیّ و بتخـوا. خـوای گـەورە ئـەو دەنگـە خۆشـەت لـە مرێمـۆك نەسـتێنیّ. کەڵەبابەکـە، کەڵەبابەکە، کەڵەبابە دەنگ خۆشە جوانەکە... هاوڕیّ گیانی گیانییەکەی مرێمۆك...

مەمی دیك لە داخان شێت دەبێ. خۆی پێ ناگیرێ. ئیتر ناتوانێ راوەستێ. بەردەوام بیر لە زولەیخا دەکاتەوە. هەتا سەفەر زیندوو بێ، زولەیخا بۆ ئەو نابێ. ئەوە باش دەزانێ. تاقە لەمپەری سەر رێگەی ژیانی ئەو، سەفەرە. ئەگەر سەفەر نەبێ، دنیا بۆ وی دەبێتە بەهەشت و ئارەزووی هەر شتێك بکا وەدی دێ. رۆژ بە رۆژ تووڕەییەکەی خەستتر دەبێتەوە و گیان و بیر و هزری پڕ دەبێ لە تووڕەیی. خەو و خۆراکی ئەو تووڕەییە.

## ٣٤

مەمی دیك بە هەموو هێز و تینی خۆیەوە، چەقۆکەی، کە دەمی لە گەڵای "بی" تەنکتر بوو، لە کالانێ دەرکێشا. چەقۆکە بە بریسکانەوەیەکی شین، جەغزێکی گەورەی لە هەوادا کێشا. مەمی دیك بە جومگە و ماسوولکە توندەکانییەوە چاوەڕێ ما. هەموو گیانی وەك لەتە ئاسنێك بێ جووڵە بوو. هیچ نەدەلەرزی. لە دڵیدا گوتی:"ئەوجار سەر دەکەوم. ئەوجار سەر دەگرێ.

مانگەشەوێکی یەکدەست لە ئاوەکەی دەدا و رووناکی دەکردەوە. سێبەری دارەکان کەوتبووە نێو ئاوەکەوە. لە بۆنی قوڕ و لیتەی لە برینجەجاڕە دوورەکانەوە بۆ دەهات. پاسەوانی برینجەجاڕەکە پەیتا پەیتا تەقەیان لە بەرازە کێوییەکان دەکرد. تەقەی فیشەك لە رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دەدایەوە. دارەکان، پنچکەکان و گژ و گیاکان زۆر هەستابوون. گوڵ ئەستێرەکان لە بن پنچکەکاندا وەك ئاگر دەدرەوشانەوە.

مەمی دیك سەیری ئاسمانی کرد. هەڵۆیەکی گەورە بە سەر سەریدا تێپەڕی. هەڵۆکە لە بن تریفەی مانگەکەدا لە تارمایی دەچوو. گەورە ببۆوە، سێ چوار هێندەی هەڵۆیەکی ئاسایی. هەڵۆکە بە رێی خۆیدا گەڕایەوە و بەرەو دۆملو قەڵا رۆیشت.

سەری سەفەر، لە قولکەیەکەوە هێندەی گوڵە مینایەك دەرکەوت. سەفەر بەرەو لای ئەو دەهات. نیوەی قەڵافەتی دەرکەوت، دوایی بە تەواوی دەرکەوت. زل و زەبەلاح بوو. ئەویش گەورە ببۆوە و قەڵافەتی وەك ئی دێوەزمەی لێ هاتبۆوە. مەمی دیك پێی وابوو هەر چاوی بەو بکەوێ دەست و پێی دەلەرزن. بەڵام وا نەبوو. هەر وەك خۆی گرژ مایەوە. قەڵافەتە زلەکەی سەفەر بەرەو وی دەهات. مەمی دیك هەتا ئەژنۆی ئەو دەهات. تفەنگەکەی بە دەستییەوە بوو. ترسێك لە دڵی مەمی دیکدا هێلانەی کرد. ئاخۆ ئەویش لە مەمی دیك دەگەڕا بیکوژێ؟ مەمی دیك دەستی راستەی بردە دواوە. دەیویست کاتێ سەفەر بە بەردەمیدا تێدەپەڕێ، بە هەموو هێزی خۆیەوە چەقۆیەکی لێ بدا. دیارە بەو مەرجەی تا ئەو کات هەموو گیانی شل نەبێتەوە و نەکەوێتە عەرزی.

سەفەر هات. هەنگاوێك بەولای مەمی دیکدا تێپەڕی. مەمی دیك شل نەبوو. بەڵام ئەو دەستەی وا چەقۆکەی دەگوشی، هەڵیهێنایەوە و نەیتوانی دایبێنێتەوە. دەتگوت رەق هەڵاتووە. سەفەر دوور کەوتەوە و رۆیشت. گەیشتە نێو مالّی چۆمە بچووکەکەوە. بە سەر بەرد و چەوەکاندا هەنگاوی گەورەی داویشت. بەرد و چەوەکەی بەر پێی خرمەیان دەهات. گەیشتە دەم ئاوەکە و لە سەر سەکۆیەك دانیشت. وردە بەردێکی هەڵدەگرت و لە ئاوەکەی داویشت. لە بەر تریفەی مانگەکە، سەر ئاوەکە دیار بوو، سێبەری سەفەر کەوتبووە ئاوەکەوە و گەیشتبووە ئەوبەری دیکەی چەمەکە. ماسێکی درشت سێ جاران لە ئاوەکە خۆی هەڵاویشتە دەرێ و هەموو جارێ شڵپەی کەوتنەوەکەی دەهات.

مەمی دیك بەخۆی گوت، باشە ئەو سەفەرە بۆچی هەموو شەوێ تا بەیانی بەو دەشت و بیابانەدا دەگەڕێ؟ شێت بووە یان من بەتاقی دەکاتەوە؟

لە نێو پنچکە بیبارەکە هاتە دەرێ. پنچکەکە لە بەر تریفەی مانگەکە بۆنێکی خۆشی لێ هەستا. خاك و گژ و گیاکان و دارەکان لەو شەوەدا بۆنی بیباریان لێ دەهات. هەموو گیانی مەمی دیك و چەقۆکەی دەستیشی هەر ئەو بۆنەی لێوە دەهات.

مەمی دیك بە خۆی گوت: "سیحرێك هەیە لە کاری ئەو پیاوەدا. دەیکوژم، نامرێ. خەریکە سوێم بێتەوە بۆ کوشتنەکەی، بەڵام سەر ناگرێ. بنیادەمێکی ترسنۆکم. هەموو کەس پیاو دەکوژێ. هەر من یان شل دەبم و دەلەرزم یان رەق هەڵدێم. چما لە سەر ئەو زەوییە، پێش من کەس بنیادەمی نەکوشتووە؟ دەترسم، دەترسم، دەترسم، دەترسم، دەترسم...

لە سەرووی چەمەکەوە راوەستا. ماسییەکە ئەمجارەیان زیاتری خۆ هەڵاویشت و لە دەنگی کەوتنەوەکەی هەموو گیانی لەرزی. دەست و پێی سڕ بوو. ئارەقەیەکی ساردی لە گیانی نیشت و

دانیشت. سەفەری پشتی لێی بوو. لە داخان شێت ببوو. باشە چ دەبوو، هەر ئێستا رابێ و گورج خۆ بە سەفەردا بدات؟ یەکجار، یەکجاری دیکە، جارێکی دیکە، چەقۆکەی لێ بدا و بیکوژێ، دیسانیش لێی بداتەوە و بیکوژێتەوە و ئیتر سەفەر نەتوانێ هەستێتەوە، خوێنەکەی خورِ خورِ برِژێ و جۆگەلەیەکی سوور بکێشیچ... سەفەر بکەوێتە ئاوەکەوە... بەیانی، گوندییەکان تەرمەکەی بدۆزنەوە. کەس نازانێ کێ کوشتوویەتی. هەموو شتێك جێبەجێ دەبێ. بەڵام ئەگەر کەس نەزانێ کێ کوشتوویەتی، مردنەکەی چ سوودێکی هەیە؟... دەبێ هەموویان بزانن کە مەرگی ئەو چەندە بە سوود بووە. هەمووان زانیبیان کێ لە مەمی دیکی دا، لاقەکانی سووتاند و بووە هۆی ئەوەی خوێن بمیزێ. دەبێ تۆڵەی ئەو کارانەش بە چاوی خۆیان ببینن.

"دەبێ دنیا بزانێ کێ کوشتوویەتی. هەموو دەبێ بیبینن. رۆژنامەکان بینووسن. بەڵام دیارە زیندانیشی لە دوایە. سێدارەی دەوڵەتیش هەیە." مەمی دیك هەستا. مشتووی چەقۆکەی لە دەستیدا گوشی. رێك لەو کاتەدا سەفەریش هەستا و بە لێژایی زووبارەکەدا ئاودیو بوو. مەمی دیکیش بە دوایدا رۆیشت. سێبەرەکەی درێژ بوو. گەیشتبووە ئەو بەری ئاوەکە. چووە نێو مێشەڵانە بییەکەی کەناری ئاوەکەوە. مەمی دیك ترسا و نەچوو. لە مار و دەعبا ترسا. بە دەوری مێشەڵانەکەدا سوورِایەوە و چووە پشتەوەی. سەفەر وەك پڵنگێك لە مێشەڵانەکە هاتە دەرێ. تێك ئاڵقان. سەفەر لەرزی. مەمی دیك بریسکەیەك بە موغەرەی پشتیدا هات. چەقۆکەی بە دەستییەوە بوو. بەڵام نەهاتە سەرێ. سەفەر پرسی:

- کێی کورِە؟

بەڵام دەمودەست ناسییەوە.

- ئەوە تۆی مەمی دیك، سەرۆکی راوچییەکان؟ چما شەوانە لە چوکووراوادا نێچیر هەیە؟

مەمی دیك وەخۆ هاتەوە و گوتی:

- منم ئاغا. گوتم بەشکم چەقەڵێك، بەرازێك، سمۆرەیەکی ئاوی بگرم، بەڵام نەکرا.

سەرفەر گوتی:

ئەو مێشەڵانە هێلانەی سمۆرەیە. بچۆ و لەوێ دا بۆسە بنێوە. نەکا لە مێشەڵانێ بترسی؟

لە پرِ خۆی کێشا و قورِگی مەمی دیکی گرت. بە هەر دوو دەستی گوشیی. گوشی و گوشی و گوشی. جگە لە نیوەنووزەیەك هیچ دەنگێك لە قورِگی مەمی دیکەوە نەدەهات. خۆرە پرِشنگدارەکان بە بەرچاویدا تێدەپەرِین.

ـ جارێکی دیکە ئاوا وەشوێن من بکەوی و سیخوڕیم بکەی، دەتتۆپێنم. تێگەیشتی؟

مەمی دیکی وەك کۆنەپەڕۆیەك ڕاوەشاند و فڕێی دا. مەمی دیك کەوت. سەری چووە نێو ئاوەکە. تۆزێك درەنگتر وەخۆ هاتباوە دەخنکا.

ماسێییە گەورەکە سێ جار لە ئاوەکەوە خۆی هەڵاویشت. بەرزگە ڕەنگاوڕەنگەکەی سێ جار وەك چرایەك لە شەوێدا شۆقی دایەوە.

مەمی دیك وەخەبەر هات. دیسان کەوتەوە شوێن سەفەر. پەنجا هەنگاوێك لە پشتییەوە چاوی بە سەرییەوە بوو. قۆنداغی تفەنگەکەی سەفەر رووکێشێکی زیوینی هەبوو و لە بەر تریفەی مانگەکەدا دەدرەوشایەوە. ماسییە درشتەکە لە تەنیشتییەوە سێ جاری دیکەش خۆی هەڵاویشتە دەرەوە. چەمەکە دەنگی هات. کە بە نێوان گابەردەکانیشدا دەڕۆیشت، بە شێوەی جۆراوجۆر دەبریسکایەوە.

سەفەر ئاوڕی دایەوە و سەیری ئەو ماسییەی کرد کە خۆی هەڵاویشتبوو و ڕۆیشت.

مەمی دیك بۆنی ئارەقەی لێوە دەهات. لە دوورەوە ئەو خەرمانەی دی کە ئاگری گرتبوو. سووتمانی خەرمانەکە ئاسمانی ڕووناك کردبۆوە. هەڵۆکە بە نێو ڕووناکاییەکەدا تێپەڕی. سێبەرەکەی کەوتە سەر بڵێسەکان.

دەستی ڕاستەی مەمی دیك، کە چەقۆکەی گرتبوو، سووك بوو. دڵی کرایەوە. دیتنی هەڵۆکە غیرەتی وەبەر نابوو. بەرەو سەفەر غاری دا. دەستی هەڵێنا. کە ویستی دایبێنێتەوە، دەستی جووڵەی لێ بڕا. ئاوڕی دایەوە و سەیری دواوەی کرد. سێ سوار بە سواری ئەسپی رووت، لە پشت سەرییەوە بوون ویەکێکیان دەستی گرتبوو. سەفەر خەریك بوو رایدەکرد و دەچووە نێو ئاوەکەوە. ئاخری خۆی لە کەندەی ڕووبارەکەوە هەڵدایە خوارێ و لە بن پنچکە دڕووەکدا خۆی مات دا. لە ترسان دەلەرزی. مەرگ بە بن گوێیدا تێپەڕیبوو.

ئەو سوارەی دەستی ئەوی گرتبوو، بەری دا و گوتی:

ـ بڵێ بزانم، شەوکەت بەگ لە کوێیە؟

ـ شەوکەت بەگ؟

تیشکی سووتمانەکە چاوی بە شەوارە خست.

ـ بەڵێ شەوکەت بەگ، ئێمە بە دوای ئەودا ئەو دەشتەی چوکووراوامان هەموو تەقاندووە.

تەپۆ وەك هەورێك دەوریان گرتن. دەیانویست لەتوپەتیان بکەن. وزەوزەکەیان وەك لووره لووری لێ هاتبوو. مەمی دیك نەیتوانی دەموچاویان ببینێ.

ـ شەوکەت بەگ؟ بۆ شەوکەت بەگ چیی لێ هاتووە؟
ـ هەتیو، بڕۆ قەشمەری بە خۆت بکە.
لە خەرمانە سووتاوەکەوە بڵێسەی گریان بۆ دەهات. سێبەری سوارەکان پان و درێژ دەبوونەوە و دوور دەڕۆیشتن.
ـ شەوکەت بەگ مردووە.
مەمی دیك ملی بە لارەوە نا و گوتی:
ـ ئەمن قەت نەمدیوە. سەیری نێو بیرەکە بکەن. بازدە ڕۆژی ڕەبەق هەرچی هەڵۆیە لە سەر ئەو بیرە دەسووڕانەوە. هەرچی هەڵۆی دنیایە.
ـ ئێمە هەڵۆکانمان دی، شەوکەت بەگ سۆراغی نەبوو. شەوکەت بەگ چووەتە کوێ؟
ـ بە ئاوەکەدا چووە دەریای سپی. هەڵۆیەك بە شوێن تەرمەکەدا.
مەمی دیك شەلاڵی ئارەقە بوو.
ـ شەوکەت بەگ لێرەیە درۆزن.
مەمی دیك دەستەکانی تەواو لێك کردەوە و خەرمانە سووتاوەکەی پێشان دان. گەرمای ئاگرەکە دەیانگەیشتێ.
ـ سەیر بکەن، هەڵۆکە ڕێك لە سەر ئاگرەکە دەسووڕێتەوە. هەر دوو قولانج لە بڵێسەکانەوە دوورە. بۆنی شەوکەت بەگ دێ. شەوکەت بەگ بۆگەن بووە. کەپۆتان بگرن ئەگینا لە هۆش دەچن.
کوێخا سەفەر لە بن پنچکە دڕووەکانەوە هاتە دەرێ و بە غاردان خۆی گەیاندە لایان و هەرای کرد و دەنگی لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دایەوە:
ـ بیگرن. ئەوەندەی تێهەڵدەن پشتی لە زگی نەرمتر بکەن. لەو دەشتە پان و بەرینەی چوکووراوادا هەر ئەوە دەزانێ شەوکەت بەگ لە کوێیە. ئێسکی بهاڕن. ئەوەندەی لێ بدەن خوێن بمیزێ. خوێن بمیزێ، خوێن بمیزێ.
سوارەکان قاقایان کێشا. ئەوەی لە پێش هەموانەوە بوو، دەستی مەمی دیکی بەردا. ئەسپەکان بە چوارناڵە لە ئاوەکە پەڕینەوە. ئاوەکە بە سەر و یاڵی ئەسپەکاندا پڕیشکا.
مەمی دیك سێ جار چەقۆکەی دەستی هەڵێنا. چەقۆکە سێ جار کەوانی بڵێسە و گڕی کێشا و هەر سێ کەوانەکەش لە بەر تریفەی مانگەکە شین بریسکانەوە. کوێخا سەفەر هەر سێ جاران وەك برووسکە داهاتەوە و هەر سێ جاران دەمی وەعەرزی کەوت و دیسان هەستایەوە. سێبەرەکەی ڕەش و گەورە بوو و دەگەیشتە ئەوبەری ئاوەکە.

دوای رۆژئاوابوونیّ، مەمی دیك جەواڵێك شووتیی بە كۆڵەوە دێتەوە كەپرەكان. خەلیل داهێزراو دەیبینیّ. شوێنی بێستانەكەی لیّ دەپرسیّ. دوای ئەو گۆملكسیز و بە شوێن ئەو دا سەفەر و ئاخریش حاجییە چڵمن و خواروخێچ و فاتمۆكیّ و هەر هەموو گوندەكە دەسبەجیّ ئاگادار دەبنەوە. هەر كەسە و جەواڵەكەی خۆی هەڵدەگریّ و بەرەو بێستانەكە وەڕیّ دەكەویّ. بێستانەوانەكە نوێنەكانی لە سەر دارێكی گەورە راخستووە. لەو خوارە ببێتە قیامەتیش ناوێریّ بێتە خواریّ. هەر لە سەر دارەكەوە دەنەڕێنیّ و تەقە دەكا. مەمی دیك دوای سیّ رۆژان لەوە تێدەگا و هەر بۆی روون دەبێتەوە ئیتر تەواو.

## ٣٥

چوونە نێو بێستانەكەوە. بێستانەكە لەو بەرەی مێشەلانی "قەرە بوجاغ" بوو. زۆر لەو مەزرایەوە دوور بوو كە گوندییەكان لۆكەیان لیّ دەرنییەوە جا ئەوەی مەمی دیك چۆن گەیشتبووە ئەویّ و ئەو بێستانەی دیتبۆوە، هەر خۆی دەیزانی. بێستانەوانەكە كە جێوبانەكەی لە سەر دارچنارێك راخستبوو، دەینەڕاند و دەیویست دنیا تیّ بگەیەنیّ. جار نە جارێكیش دوو فیشەكەكەی نێو لوولەی تفەنگەكەی بە هەواوە دەنا.

مەمی دیك كە لەگەڵیان هاتبوو، بەو چەند كەسەی وا دەترسان، دەیگوت:

ـ هیچ گوێی مەدەنیّ. ئەو هەر لەوێیە و دەگوڕێنیّ و ناشوێریّ بێتە خواریّ. ئەگەر دەشتانەویّ با بێدەنگی بكەم.

گڵمەتێكی هەڵگرت و لە چنارەكەی گرت. گڵمەتەكە وەلقێكی چنارەكە كەوت. دەتگوت ئەوەی وا چەند ساتێك لەوە پێش دەینەڕاند و دەیگوڕاند ورد و پرد بووە و بۆتە تۆزی بانان. ئیتر پشووی دەرنەدەهات. دیار بوو ئەگەر ئەوجارە دەنگی لێوە بیّ و تەقە بكاتەوە، گڵمەت بارانی دەكەن و دیسان بێدەنگ دەبێتەوە.

شووتی دزەکان تۆزێك دوایێ نیوەی شەوێ گەڕانەوە. جەواڵەکانیان پڕ بوو. ئەو شەوەش هێرشی تەپۆ و مێشوولەکان سامناك بوو. بە پۆل دەهاتن و دادڕ دادڕیان دەکردن، بەڵام کەس گوێی نەدەدانێ. هەموو پشوویان لە خۆیان بڕیبوو و بەبێ ئەوەی چاو لێك بنێن، چاوەڕێی شووتی دزەکان بوون. دوو بنەماڵە کەسیان نەچووبووە شووتی دزینێ: بنەماڵەی تاشباش ئۆغلو و ئۆککەش داغ قۆردو. ئۆککەش داغ قۆردوو دووگردە حەسیرییەکەی لە بەری راستی مەزراکەوە راخستبوو و پەیتا پەیتا نوێژی دەکرد و دەپاڕایەوە. تاشباش ئۆغلوش لە کەپرەکەیدا داڵغەی لێ دابوو خەیاڵ بردبوویەوە. ئاخۆ ئەویش دەبوو وەك ئەوانیتر بچێتە شووتی دزینێ؟

ئۆککەش داغ قۆردوو و ژن و منداڵەکەی ئەگەر ئەو شووتیانە بووبانە دەرمانی سەد دەردیش، دەمیان لێ نەدەدا. چونکە حەرام بوو و پیاوی موسوڵمان هەقی ئەوەی نەبوو دەست بۆ شتی دزێتی بەرێ.

تاشباش ئۆغلو دڵی خۆی پێ قایل نەدەبوو. وەلییەك چۆن دەبوو بچێتە شووتی دزینێ؟ کەسێك کە نوور بە سەر ماڵەکەیدا باریبوو...

ئەو نوورەش هەموو کەس دیتبووی. هەر لە منداڵی حەوت ساڵانەوە تا پیری حەفتا ساڵان. سەرانسەری تۆرووس دەنگی دابۆوە. ئەی ئەگەر لە بێستانەکەدا بە تۆمەتی دزی گرتیان؟ ئاخۆ نەیاندەکردە قیامەت و هەڵلا کە ئەوەتا وەلییەکەی گوندی یالاك کە نووری بە سەر ماڵەکەیدا باریبوو و خۆشی چووبووە لای چل سوارەی غەیبی، ئێستا لە چوکووراوا لە سەر شووتی دزینێ گیراوە. ئاخۆ لە حەوت دەوڵەتان ریسوایان نەدەکرد؟ ئەوە دامنا نەشمگرن، ئەی چۆن لای گوندییەکان سەرم هەڵێنم؟ ئەوە ئێستاش پێم دەڵێن ئەمن وەلی نیم، چ بگا بەوەی بچمە شووتی دزینێش.

هەموو ئەوانە رێی تێدەچوو. تاشباشی وەلی، کە حەوت منارە نووری بە دواوە بوو و شمەکی لە نووری کەسك پۆشیبوو، نەیدەتوانی بچێتە شووتی دزینێ. بەڵام هەر سێ منداڵەکەی و ژنەکەی چ تاوانێکیان هەبوو؟ کاتێ هەموو گوندەکە شووتییان دەخوارد دەبوو ئەوانیش هەر وا سەیری زاریان بکەن؟ باشە پیاو چۆن دڵی دەهات؟

تاشباش بیری دەکردەوە و ئارەقەی دەڕشت و بۆی نەدەچووەوە سەر یەك. لە عەزابێکی جەحەنددەمی دا بوو. لەوەتەی ببووە وەلی، بەڵا نەمابوو بەسەری نەهاتبێ. بەڵام ئەوەیانی لە هەمووان خراپتر بوو. دەست و پێی بەسترابوو.

لە پڕ دەنگە دەنگێکی زۆر هەستا و نیشتەوە. شووتی دز لە جەواڵی پڕەوە گەڕابوونەوە. دەنگەدەنگەکەش قریوەی خۆشیی چاوەڕوانەکان بوو. دەمودەست جەواڵەکانیان کردەوە و چەقۆیان دەست دایێ. دەنگی قاش کردن و خواردنی شووتی، بێدەنگیی شەوەکەی شکاند.

ئۆککەش داغ قۆردو لە تەنیشت مەزراکەوە نوێژەکەی دابەستبوو و نەیبڕیبۆوە. هەر سێ منداڵەکەی تاشباشیش بەخەبەر بوون... لە نزیك خۆیانەوە گوێیان دابووە مڵچەمڵی دەمی منداڵەکانی عوسمانە کەچەڵ کە شووتییان دەخوارد.

عوسمانە کەچەڵ گوتی:

ـ کوڕە ئەو چوکووراوایە شووتیی نەبێ، بنیادەم دەمرێ. ڕەحمەتی خوا لە دایی و بابی ئەوەی چاندوویەتی. گیانم نەرم بۆوە. وەك باڵندە سووك بووم... ئەی لەو بێستانە چەندە زۆر بوو. ئەو سەری دیار نەبوو. خودا چاکە بۆ مەمی دیکی برامان بکا. وەی کە شیرینە، دەڵێی هەنگوینە... ئۆخەیش.

ساتێك دواتر دەتگوت ژنەکەی بە سرتە شتێکی پێ گوتووە وازی لە ئۆخەیش وە وەی وەیەکەی هێنا و بە دەنگێکی تووڕەوە گوتی:

ــ کووزێکیشیان نادەمێ. قوزەڵقورت بخۆن. نایدەم گیانەکەم نا، ئەمن ڕۆژە ڕێیەك ئەو شووتیانەم بە شان وکۆڵ هێناوە، بۆ منداڵەکانی خۆم، بۆ خۆم... پشت دامالکاوە... لە جێی ئەوەی خۆیان لێ بکاتە وەلی و ئەدا و ئەتواری وەلییان دەربێنێ، با هەستێ و بچێ شووتی بۆ منداڵی خۆی بدزێ، با چیتر منداڵەکانی چاو لە دەستی خەڵکی نەبن. ئەو کاتی ئەو وەلی بوو...."

ژنەکەی گوتی:

ـ بیبڕەوە عوسمان، لە سەرت گەڕێم... بەشکم وەلییش بێ. بەڵایەکمان بە سەر دێ.

عوسمان گوتی:

ـ وەلیی چیی؟... ئەوە کوێی وەلییە؟ گوندیی کەر، هەر ئەوەندەی گووی لە قوونی بگیرێ... ئەوجار، ئەو دەمەی ئەو ببووە وەلی، سەیرێکی کردم. نەیدەویست لێی بچمە پێشێ. ئەی ئەی لەو شووتییە دەڵێی هەنگوینە. فێنك فێنك، دڵ و هەناو فێنك دەکاتەوە. کووزێکی بە کەس نادەم. نایدەم ژنەکە. وەلی سەهلە، خودا چاو ڕەشە جوانەکەش بێتە خوارێ کووزێکی نادەمێ. دوای ڕۆژە ڕێیەك، هەموو پشتم... وەی...

ژنەکەی تاشباش لە بەر کەپرەکەوە دانیشتبوو و هیچ نەدەبزووت. ئاخری وەزمان هات و بە دەنگێکی کز گوتی:

ـ ئێمە بێکەس و بێدەرین.

بەڵام تاشباش ئۆغڵو دەیبیست. ئەویش بۆیەی وا دەگوت کە هەر تاشباش گوێی لێ بێ. لە سەری ڕۆیشت:

ـ کەس نییە نەهێڵێ ئەو منداڵانە ئاوا چاو لە دەستی خەڵکی بن و ئاخ هەڵنەکێشن. منداڵەکانم لە حەژمەتان دەمرن. ئێمە بێ کەس و بێدەر کەوتینەوە. ئەو وەلییایەتییە سەری خواردین. ماڵوێران بووین. وەلییایەتی چیی بۆ ئێمە پێوە بوو خوایە گیان؟ جگە لە چارەڕەشی و سەرگەردانی... خوایە گیان...

ژنەکە هەر وا دەلالایەوە و دەیبۆلاند. تاشباش لە کەپرەکەدا وەخت بوو شێت بێ. گوتی:

ـ هەی گوو بەو وەلییایەتییە.

بەسپایی لە کەپرەکە هاتە دەرێ. ژنەکەی گوێی لە قسەکەی ببوو. جەواڵەکەی دایە دەستی تاشباش. تاشباش جەواڵەکەی لێ وەرگرت و وەڕێ کەوت.

بە شەرم و ترسێکەوە کە لە هەناویدا بوو و نەیتوانیبوو بەسەریدا زاڵ بێ گەیشتە بێستانەکە. پاسەوانەکە لە سەر دارەکەوە دیتبووی دێ، هەر دوو لوولەی تفەنگەکەی تێ کرد و تەقەی پێوەی نا. تاشباش ئۆغڵۆ بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ وەعەرزی کەوت و ماوەیەك ئاوا مایەوە. پاسەوانەکە بە هەموو تین و هێزی خۆی هاواری دەکرد. تاشباش کە دەست و پێی دەلەرزین، هەستا و دەستی کرد بە شووتی رنین. شووتی زۆر گەورە گەورە لە نزیك دار چنارەکە مابوونەوە. بەبێ ئەوەی لە فیشەکی بێستانەوانەکە بترسێ، چووە بن چنارەکە و نەوانیشی لێ کردەوە. جەواڵەکەی پڕ کرد و بە شانی دادا. یەك دوو تەقەی دیکەشی لە دواوەی هات. پەیتا پەیتا بەخۆی دەگوت:

ـ کوڕە با لێم بدا و نەجاتم بدا. خۆزگە لێمی بدا و رزگارم بکا. لە گیانی خۆم وەڕەزم. وەلییایەتی سەری خواردم. لە ژیان بووم. لە مرۆڤبوون کەوتم. حەیام چوو. خۆزگە بمەنگێوێ... ئاخ خۆزگە...

دوایی شتێکی هاتە بەر چاوی و وەپێکەنین کەوت. پێی وابوو ئەوە تەرمەکەی لە نێوەڕاستی بێستانەکە کەوتووە. گوندییەکانی یالاك و خەڵکی دێهاتەکانی دیکەی کوێستان و چوکووراواش کە هەواڵەکەیان بیستووەتەوە، هەموو قاقا دەکێشن و دەڵێن "وەلی"یەکەیان بە فیشەك پێکاوە. هەموو کەس رێزی گوندەکە دەگرێ و بەزەیی بە مردووەکەیدا دێتەوە، بەڵام هەمووان گاڵتە بەو مردووە دەکەن و دەڵێن، "وەلی"یەك کە هاتووەتە شووتی دزینێ و لە دزێتیدا گوللەی بەر کەوتووە. هەزاران قسەی بۆ هەڵدەبەستن. هەر وا کە لە بەر خۆیەوە پێدەکەنی و لە بن بارستایی کۆڵە شووتییەکەیدا چۆکی دەنووشتانەوە، لە بێستانەکە هاتە دەرێ. ئیتر لە تیرەنگێوی بێستانەوان دەرباز ببوو. بێستانەوان لە سەر دار چنارەکەوە هەر وا دەنگی گوڕە و هەرای دەهات. وەك شێتان دەینەڕاند.

تاشباش ئۆغلو هەتا دەم جەیحان رانەوەستا. بەلام پشووی لێ برابوو. لە دەم جەیحان کۆڵەکەی دانا. کە ئارەقەی لێ سارد بۆوە، گیانی شل بۆوە، تین و هێزی تێدا نەمابوو. پاڵی دابووە کۆڵەکەیەوە و هەر لە جێی خۆی بوو. کەچی دەشبوو زووتر هەستێ و کۆڵ بارەکەی هەڵگرێ و بەر لە تاوهەڵاتێ بگاتەوە کەپرەکان.

زۆری هەوڵ دا، کۆڵەکەی بە شانی خۆیدا بدات و بە ئەژنۆ بێهێزەکانییەوە کە دەنووشتانەوە بکەوێتەوە رێ. دوای ئەوەی مەودایەکی بڕی، دیسان ئارەقەی کردەوە و بەو ئارەقەیە تین و گوڕێکی تێ گەڕایەوە، بەلام لاقەکانی هەر وا دەنووشتانەوە و دەلەرزین. دیسان وەعەرزی کەوتەوە و شووتییەکانی لێ رژایە دەرەوە و لێی بلاو بوونەوە. تاشباش ئۆغلو بە هەزار زەحمەت شووتییەکانی کۆ کردنەوە و جەواڵەکەی بە کۆڵی دادا.

بەلام برستی لێ برابوو. هەر ئەوەندە بوو ددانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو و دەیویست بەر لەوەی خەڵکەکە لە خەوێ هەستن بگاتەوە کەپرەکان. هیچ دیار نەبوو ئاخۆ ئەو گوندییە چەپەڵ و گلاوانە ببینن کە لە شووتی دزینێ دێتەوە، چ دەکەن. لەوانەش بوو هەزار بەلای بەسەر بێنن.

بەڵام کە لە تین و گوڕ دەکەوت، کۆڵەکەی دانەدەنا و هەر وا لە بنیدا دادەنیشت و تۆزێک دەحەسایەوە و وەڕێ دەکەوتەوە.

کۆڵەکەی پێ هەڵنەدەگیرا. لە رێگایە، سێ شووتیی دەرهێنا و لە بن پنچکێک شاردییەوە. کۆڵەکەی تۆزێک سووکتر بوو.

کە بە دەم رووبارەکەدا دەڕۆیشت، لە ناکاو بە مێشکیدا هات و گوتی:

ـ ئەمن لەو بەلایە دەرناچم. لەو سووکایەتی و بوختانانە... هەموو رۆژێ دەمرم و دەژێیمەوە. خۆزگە خۆم بخەمە جەیحانەوە و لەو نەهامەتی و چارەڕەشییانە رزگارم بێت.

ناخ و دڵی وا سووک ببوو کە ساتێک راوەستا و سەیری ئاوەکەی کرد. ئاوەکە لێڵ و مەند بوو. خۆزگە لەو ساتەدا جەواڵەکەی فڕێ بدات و بەرەو ئاوەکە بڕوات و خۆی بخاتە نێو گۆمەکەیەوە. چیی فکر و خەیاڵی هەیبوو نەیما. بە تاقی تەنێ لە تاریکستانێکی سامناکدا مایەوە. ترسا. دڵەکوتەی لێ پەیدا بوو. دەتگوت دڵی دەیەوێ سینگی لێک بکاتەوە و بێتە دەرێ. لە ناکاو خۆی راپسکاند. رەشاییەکە رەوییەوە. وەڕێ کەوت.

سەیری لای رۆژهەلاتی کرد. لووتکەی چیاکان روون دەبوونەوە. شووتێکی دیکەشی لە بن پنچکێکدا شاردەوە. بارەکەی دیسان سووکتر بۆوە و هەنگاوەکانی خۆشتر بوون. هێندەی نەمابوو رووناکی بکاتەوە و ئیتر کرێکارەکان بەخەبەر دەهاتن... بۆ ئەوەی بگاتەوە، غاری دەدا.

تــاو هــەڵات و وەك زارکــی ســۆپەیەك بڵێــسەی دا. تاشــباش ئۆغڵــو ســەری هــەڵێنا و کرێکارەکــانی دی کــە بــە ریزێکــی دووروودرێــژ خــەریکی لۆکــە رنینــەوە بــوون. هــەر بیــست هەنگاوێکی لێوە دوور بوون. کە دیتیان هەموو قیت راوەستان.

گۆملکسیز ئۆغڵو لە ناکاو قاقای کێشا و گرماندی:

ـ کوڕە سەیری کاکی وەلی بکەن. لە شووتی دزینیێ دێتەوە. خەڵکی خودای بە شەو دەچنە دزی، وەلییەکەی ئێمە بە رۆژ... ئەوە بەخێر وەلییە... کوڕە! وەك رەژوو رەش هەڵگەڕاوی.... ئەولیای ئاخر زەمان ئەتۆی؟

قاقای خەڵکەکە وەك تۆپ دەنگی هات. تاشباش ئۆغڵو ئەوەندەی پێ سەیر بوو هەر چاوی دەپتاند.

گۆملکسیز ئۆغڵو خۆشحاڵ بوو:

ـ سەیری کەن خەڵکینە، ئەگەر گوتتان ئەوە کێیە؟

تۆفان قاقاکە ساتێك نیشتەوە:

ـ وەلییەك کە بە رۆژی رووناك دەچێتە شووتی دزینیێ.

رێژنەی قاقاکە هەستایەوە.

تاشباش ئۆغڵو لە کوندەبوویەك دەچوو کە کەوتبێتە بەر رووناکــایی. جەواڵەکــەی هــەر بــە کۆڵییەوە بوو. نەیدەتوانی نە هەنگاوێك بچێتە پێشێ و نە بۆ دواوە و نە بۆ راست و نە بۆ لای چەپیش. سەیری دەورووپشتی خۆی دەکرد، بەڵام هیچی نەدەدی.

ـ ئەوە کێیە کە هەموو شەوێ نوور لە سەر ماڵەکەی دەبارێ؟

بە دوای تریقەی تۆفانی قاقاکەدا، هەر کەسە و دەتگوت دەلوورێنێ.

ـ هەر ئەوەیە کە بە رۆژی رووناك دەچێتە شووتی دزینێ.

ـ کێیە ئەوەی حەوت تۆپەڵە نووری هەر یەکەی هێندەی حەوت منارە بە دوواوەیە؟

ـ هەر ئەو کەسەیە کە بە نوێژی نیوەڕۆیە لە چوکووراوا دەچێتە دزیێ.

تاشــباش ئۆغڵــو کــە لــە نێــو قاقــا و نەڕەنەڕەکانــدا واقــی وڕمــابوو و نەیــدەزانی چ بکــا، ئەژنۆکانی شل بوون و بەعەرزیــدا کــەوت، جەواڵــە شــووتییەکەی لــە دەســتی بــەربۆوە و چــەند شووتییەکیشی لێ بڵاو بۆوە.

رێك لەو ساتەدا سەفەر چاوێکی لە "خواروخێچ" هەڵتەکاند. خــواروخێچ وەك بریــسکە لــە نێو حەشیمەتەکە هاتە دەرێ و گورج خۆی گەیانــدە ســەر تاشــباش و بــە هــەموو هێــزی خــۆی شەقێکی لە کەلەکەی دا:

ـ هۆۆی، ئەگەر کەراماتت هەیە، ئەگەر سیحر دەزانی و وەلیی، ئەو لاقەم بشکێنە و وردی بکە، بمکە وشکەڵە دارێك... هۆی کابرا، وەلییە دزەکە. مردەلۆخەی گڵاو. چما دەزیش دەبێتە وەلی؟ ئەگەر بێناموسێکی هیچ و پووچی وەك تۆ ببێتە وەلی، دیارە دزەکانیش دەبنێ...

هەم بە شەق لێی دەدا و هەمیش گاڵتەی پێ دەکرد و پێی پێدەکەنی. ئەوانی دیکەش سەیریان دەکرد و پێی پێدەکەنین:

ـ ئەتۆ کە ناموس و شەرەفت نییە، ئابڕوو و حەیات نییە، هیچ شتێکت نییە، باشە ئەگەر لە سەر دزیێ گرتبایانی، گوندی یالاك حەیا و شەرەفی نەدەچوو؟ نەیاندەگوت: وەلییەکەی گوندی یالاك دزە؟ دەی بۆ وەڵام نادەیەوە پیسی گڵاو...

دێهاتییەکان لە ناخی دڵیانەوە بەو قسەیە پێ دەکەنین. ڕێك لەو کاتەدا حەسەن لە نێو خەڵکەکە دەرپەڕی و بەردێکی هەڵگرت و لە سەری "خواروخیچ"ی دا. سەری شکا و خوێنی لێ هات. گەڕاوە و شەقێکی لە زگی حەسەن دا. حەسەن لاقی گرت و خواروخێچ لاقی لە دەستی ڕاپسکاند و بەرەو لای تاشباش گەڕایەوە و دەستی کردەوە بە تێهەڵدانی و گوتی:

ـ وەلیی گوو، ئەی کوا کەراماتەکەت؟ گووم بەو زارەت.

وەرسووڕایەوە و قوونی لە سەر زاری تاشباش دانا:

ـ ئاوا، ئاوا لە زاری وەلی دەڕیم. جا غەززەبم لێ بگرە، دەی زوو بە و غەززەبم لێ بگرە هەی فێڵباز...

خەڵکەکە لە پێکەنین کەوتبوون. خەریك بوو بەزەییان پێیدا دەهاتەوە. ژنەکەی تاشباش بەسپایی دەگریا. منداڵەکانی کردبوویانە قیامەت. خزم و کەسەکەی بێدەنگ بوون. ورتە ورت پەیدا بوو.

گۆملکسیز ئۆغلو هەرای کرد:

ـ کوڕە ئیدی ئەوە بێ ویژدانییە. ئەو سەگبابە، ئەو داماوەی کوشت.

ورتە و بۆڵەی خەڵکەکە بەرز بۆوە:

ـ ئەو چارەڕەشەی کوشت.

ـ چما هەمووان نەچوونە شووتی دزینێ؟

دەنگی خەڵکەکە هەستا:

ـ کێ هەیە نەیدزیبێ؟

بۆڵە بۆڵەکە هەر دەهات و زیاتر دەبۆوە و بە هەموویان روویان لە خواروخێچە بوو کە ڕاوەستابوو و نەیدەزانی چ بکا. تاشباش لە بەر پێیانی بەبێ جووڵە ڕاوەستابوو...

ـ باشه گوناح نییه؟...
ـ چما خودا هەڵدەگرێ؟
ـ لێقەوماوە...
ـ ئەی تاشباشی داماو... ئەتۆ ئی وەی بووی ئاوات لێ بکەن؟
لە ناکاو سەفەر سینگی هێنایە پێشێ. پیلی خواروخێچی گرت و بە هەموو هێزی خۆیەوە فڕێیدایە نێو خەڵکەکەوە و هەرای کرد:
ـ سەگبابی بێ ویژدان، ئەو داماوەت کوشت. کوشتت. باشە ئەگەر هات و ئەو پیاوە وەلی بوو چ دەکەی؟ وەلییەکان دانبەخۆداگر دەبن. خۆ دەمودەست کەراماتی خۆیان نانوێنن.
ئەو دەڕۆیشت و خواروخێچی راو دەنا. بەو جۆرە سەفەر پیاوەکەی خۆی لە تووڕەیی خەڵکەکە دزییەوە و نەجاتی دا و سەبرێ پێی گوت:
ـ زوو بە را بکە. ئەگینا لەتوپەتت دەکەن.
پاش ئەوەی خواروخێچ هەڵات، سەفەر گەڕایەوە لای تاشباش. پیلی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ و بردییەوە کەپرەکەی خۆی. بە رق و قینەوە گوتی:
ـ ئەی... تاشباش زادەکەی من. باشە زستانی رابردوو پێم نەگوتی؟ نەمگوت ئەو گوندییانە چ بە سەر پیاو دێنن. کاتێ پێویستیان پێتە، لە سەر تەپڵی سەریانت دادەنێن و دەتکەنە وەلی و پیاوچاك و دەتگەیەننە ئاستی پێغەمبەریش. هەر ئەوەندەش کەریان لە قوڕێ هاتە دەرێ، شەقێکت لە قوونێ هەڵدەدەن و ئاوا سووك و ریسوات دەکەن. برا وەلییەکەی خۆم، ئەوە سەرەتای چارەڕەشی و نەهاتییەکانتە...
چەند ژنێك تاشباشیان بردەوە نێو کەپرەکەی و درێژیان کرد. حەسەن دەستی گرتبوو و وەك هەوری بەهاری دەگریا.

مەمی دیك زۆر بەوە تێك چووە كە بە سەر تاشباش هاتووە. لە لایەكیشەوە دەترسێ. بەخۆیدا شكاوەتەوە و پێشی قەبووڵ ناكرێ. بەو لێدانەی لە تاشباش دراوە، شتێك لە ناخی ئەو دا وێران دەبێ و دەشزانێ هەر هەمووئەو شتانە لە بن سەری سەفەر دایە. داوا لە تاشباش دەكا دووعا لە سەفەر بكا.

## ٣٦

لە بەر دەم ئەو كەپرانەی بە قامیش و چڵ و چێو دروست كرابوون و هێندەی دوو قەرەوێڵەی خەو بەرین و هێندەی مەترێكیش بەرز بوون، توێكڵە شووتی هەڵدرابوونەوە. مێشەكەرانە و مێشەنگوین و زەردەواڵە سەر كۆگا توێكڵە شووتییەكانیان داپۆشیبوو. زەردەواڵەكان وەك گەواڵە هەور لە سەر ئەو توێكڵە شووتیانەی بە ددان كرووسرابوونەوە، دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە. دەنگی وزە وزی مێشەكان ئەوەندە زۆر بوو، كە دەتگوت كەپرەكان پڕن لە پلوورەی مێشەنگوین. مێشەكەرانەكان زۆر گەورە بوون. باڵەكانیان بریقەدار و سوور بوو. وەك فرۆكە نەرم دەفڕین و بە هێوری لە سەر توێكڵەكان دەنیشتنەوە. خۆرەتاوەكە دیسان عەرزەكە كردبووە ئاسنی سوورەوەكراو. كرێكارەكان خۆیان خزاندبۆوە بن سێبەرەكان و بە شەكەتی و داهێزراوییەوە لۆكەی قۆزاخەكانیان دەردەكێشا. هەموو گیانی منداڵەكان برینداربوو و برینەكانیش گەورە ببوونەوە. چزووی تەپۆ و مێشولەكان گیانی گەورەكانیشی وەك ئی منداڵەكان لێ كردبوو. خوروویەك كەوتبووە گیانی منداڵەكانەوە هەر دەتگوت ئاگریان تێبەربووە. قۆزاخەیەكیان دەپشكنییەوە و جارێك خۆیان هەڵدەكڕاند. پشتیان وا دێشا دەتگوت شكاوە و تەنانەت هیچیان نەیاندەتوانی بە جوانی لە سەر قوون دانیشێ. جومگەكانیان وەهای

ژان دەکرد دەگوت وەبن بەرداش کەوتووە. زۆربەیان نووکی پەنجەیان راسابوو. واتە پێستەکەی ئەوەندە ناسك ببۆوە، دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دیکە خوێنەکەی فیچقە دەکا. لەو پیشەیەدا راوەستانی نووکی پەنجە لە هەموو شتێ مەترسیدارترە. چونکە هەر بە حاڵ وە شتێك بکەوێ، وەك گیانی بکێشن وایە، کابرا دڵی پێی دێ. لە مەرگ تاڵترە.

"عەلی"یە درێژ تازە لە خەوێ هەستابوو بەڵام پەنجەکانی راسابوون. هەر دایکیشی دەیزانی دەرمانی ئەو دەردە چییە، بەڵام خۆ دایکی لەوێ نەبوو... ئای لەو زوڵمەی... بەو حاڵەشەوە عەلی لە هەمووان پتر قۆزاخەی دەپشکنییەوە...

گەرمایەکی قورس و شێدار دەشتەکەی داگرتبوو. گەرماکە هەر دەهات و بەتەوژمتر دەبوو و وای دەکرد کەس پشووی نەیە. "عەلی"یە درێژ سەیرێکی ئاسمانی کرد. ئەو گەرمایە لە گەرمای باران دەچوو. گوتی:

ـ خوایە، مەهێڵە باران بباریێ. مەهێڵە، لانیکەم هەتا ئەو کێڵگەیە تەواو دەبێ. دوودڵ بوو. چ دەبوو ئەگەر بڵێ:"لە بەر خاتری تاشباش ئۆغلو."؟ بەڵام پەشیمان بۆوە. ئاگای لێ نەبوو چییان بە سەر تاشباش ئۆغلو هێناوە. جاری جاران هەر دووعایەکی دەیکرد، بە شانازییەوە ناوی برادەرە وەلییەکەی دەهێنا. بەردەوام دەیگوت:"بیکە بە خاتری تاشباشی مەزن" و ئیتر کاری بەوە نەبوو خۆی بڕوای پێیەتی یان نا؟

حەسەن هەموو شتێکی بۆ گێڕابۆوە:

ـ کوڕە بە خودا ئەوە مامە مەمەدەکەی خۆمە. تاشباش ئۆغڵووە. نە هاوشێوەیەتی و نە هیچ. نە روخساری ئەوە و نە وێنەی ئەو. ئەمن قسەم لەگەڵ کرد. کت و مت خۆیەتی. هەموو شتێك دەزانێ. ریشۆڵەگرتنەکەمان و یالابووك لێکردنەوەمان. باشە ئەگەر مامە تاشباشەکەی خۆم نییە، ئەوانەی چۆن دەزانی؟ جگە لەوەش، ئەو باشترین پیاوی دنیایە. کاتێ قسە دەکا، بنیادەم لە خۆشیان باڵ دەگرێ و حەز دەکا بفڕێ. چما جگە لە مامە تاشباشی خۆم، پیاو هەیە ئەوەندە خوێنگەرم و لە بەر دڵان بێ؟ نییە. کەسی دیکە لەو دنیایەدا هەیە هێندەی ئەو، قسەکانی دڵی بنیادەم خۆش بکا؟ ئەو هەموو شتێك دەزانێ. ئەوەش دەزانێ کە تووشی بەڵا و چەرمەسەری و گێچەڵ دێ. چما کەسێکی دیکە دەتوانێ ئەو شتانە بزانێ؟...

ـ بە تۆشی گوت کە وەلییە؟

ـ بەڵێ، گوتی... گوتی من وەلیم... وەلییەکیشم کەسم لە گوێن نییە...

- چیی دیکەی گوت؟

- گوتی، خواروخێچ بەکرێگیراوی سەفەرە و ئەو دنەی دەدا لە من بدا. لەوانەیە بشمکوژێ. گوتی ئەمن زۆر ماندووم، نەخۆشم، بابی تۆش نەخۆشە. دوایی پێکەنی و گوتی لێی گەڕێ با هەر لێم بدا.

عەلی ددانی چیڕ کردنەوە و گوتی:

- ئەو ڕۆژانەش رادەبرن. چیی دیکەش؟

- گوتی گوندی وەختێکی لە تەنگانەدا بوون، ئەمنیان کردە وەلی، بەڵام کە لۆکەیان بەرەکەتی تێکەوت و ئەوان زۆریان رنییەوە، ترسی عادیل ئەفەنی و برسێتییان لە بیر چۆوە...

- چیی دیکەش، چیی دیکەش؟ چیی دیکەشی گوت؟

- کە ترسەکەیان رەوییەوە، شەرمیان دەکرد لەوەیکە منیان کردبووە وەلی. لەوەی منیان پەرستبوو، شەرمیان دەکرد. ئێستاش پێیان وایە ئەمنیان وەك خۆیان لێ کردووە. کەچی نەیانتوانیوە. خۆ وەلی وەك خەڵکی دیکەی لێ نایەتەوە. ئەمن بە راستی وەلیم و ئەوان تێناگەن.

- چیی دیکەش؟

- گوتیشی "زۆریان بە لاوە شەرمە، ئاخرییەکەشی یان وەك جاری جاران دەمپەرستن، یان لە نێوم دەبەن. ئەمنیان پێ قەبوولْ ناکرێ." مامە باشباشم گوتی:"دەمکوژن. بە تایبەتی ئەگەر مەزراکەی دوای ئەوەش هەر وا بە پیت و بەرەکەت بێ...

عەلی گوتی:

- مامە تاشباشی تۆ هیچ نازانێ. کەس ناتوانێ ئەو تەختی وەلییایەتییەکەی بێنێتە خوارێ. ئەو تاشباشی وەلییە. بەڵام ئەوەی قسەی لەگەڵ تۆ کردووە، مامە تاشباشەکەی خۆتە و تاشباشی وەلی نییە. تاشباشی وەلی چووەتە چیای چل پیاوچاکەکە و لای ئەمرەکان. چیی دیکەش؟...

- زۆر نەخۆشە... خوێن دەمیزێ. زەرد هەڵگەڕاوە. دەست و پێی دەلەرزن.

- پێی بڵێ شەوێکیان، بەسپایی، بەبێ ئەوەی کەس بیبینێ، سەرێکم لێ هەڵێنێ.

گەرماکە زۆر بە تەوژم بوو. تەمەکەشی ئەوەندە خەست بوو دوو هەنگاو پێش خۆتت نەدەدی. گژ و گیاکان ئارەقەیان کرد. دارەکان، لاسکە لۆکەکان، بنیادەمەکان، لۆکە و باڵندە وجڕ و جانەوەر و پنچك و گوڵ و قەسەڵ، هەر هەمووی ئارەقەی کردبوو. بۆنێکی توند و تاڵ و بە تین و ترشی ئارەقە لە کەپرەکانەوە هەڵدەستا. سەری لە گێژەوە دێنا.

لە کەپرەکانی ئەو سەری مەزراکەوە دەنگی زیقەیەك هەستا. ژنێك هاواری دەکرد. گوتیان:

- ژنەکەی عوسمانە کەچەڵە. کوڕەکەی نۆبەتێی گرتووە.

ژن و منداڵ لە بەر دەم کەپرەکەی عوسمانە کەچەڵ کۆ بوونەوە. منداڵەکە حەوتساڵان بوو. لاقەکانی وەبن زگی دابوون و گرمۆڵە ببوو و هەڵدەلەرزی. شەقەی ددانی دەهات.

پیرە ژنێك گوتی:

- کورتانێك بێنن و منداڵەکی تێدا بنوێنن. بەشکم ببرێتەوە. نۆبەتێیە.

دەمودەست وایان کرد. منداڵەکەیان لە کورتانێکدا نواند.

عوسمانە کەچەڵ هاواری دەکرد:

- دوکتۆرێك... دوکتۆرێك..

هەر بە راستی ئەگەر دوکتۆرێك هەبوایە منداڵەکە رزگاری دەبوو. چەند ساڵ لەمەوبەر لە قارشی یەکە، نزکی ئەدەنە، لۆکەیان دەرنییەوە، چوارده منداڵ ئاوا نۆبەتێیان گرتبوو. دوکتۆرەکان بە دەرزی منداڵەکانیان ماریجە کردبوو و گوتبووشیان نەخۆشییەکەیان ناوی "مالاریای ژەهراوی"یە.

گوندییەکان هەموو دەستیان لە کار هەڵگرتبوو و هاتبوون لە دەوری منداڵەکە کۆ ببوونەوە. دەستەوستان و داماو لە بەر گەرماکە ئارەقەیان دەڕشت و چاوەڕوان بوون. منداڵەکە، لە نێو کورتانەکەدا هەتا نیوەڕۆیە هەڵلەرزی و دوایی خەوت و گیانی کەوتە لەرزینێکی توند. دیسان بڕێك لەرزی و پەلەقاژەی کردەوە. ئیتر جووڵەی لێ برا و گیانی دەرچوو.

ژنان لە تەرمی منداڵەکە کۆ بوونەوە و بە شین و گیان و لەخۆدان دەستیان کرد بە لاواندنەوە. دەدەمی ئێوارێ منداڵەکەیان شوشت. لە گوندەکەی نزیکیانەوە مەلایەکیان هێنا. لەو بەر گەرمایە نوێژی مردووانیان لەسەر کرد. منداڵەکەیان لە سەرچەفێکەوە پێچابوو.

لە سەر گردۆلکە خۆڵکەی نزیك جەیحانەوە ناشتیان. عوسمانە کەچەڵ کوچك و بەردی لە دەوری گۆڕە بچکۆلەکە چنی. نیوەی مردووەکانی گوندی یالاك ئاوا لە سەر تەپۆلکەکانی چوکووراوا نێژرابوو. لەگەڵی راهاتبوون. زۆر خەفەتبار نەبوون.

شەوگار شەق ببوو. تاشباش ئۆغلو، لە بەر کەپرەکەی، لە پەنا پنچکێکەوە گوێی دابووە قسەی مەمی دیك. مەمی دیك لە تەنیشتییەوە لە سەر چۆك دانیشتبوو و دەستی بە سینگییەوە نابوو. دەیگوت:

- سەروەر و وەلییە ئازیزەکەمان، ئامۆژگاریم بکە. "کەچەڵە" تەوس و تەوانجی تێگرتی، دیتمان چیی بە سەر هات. ئەو خواروخێچە گلاوەش دەبینینەوە لە سەر ئەو بێئەدەبییەی چیی بە سەر دێ. ئەمن ئیمانم پێ هێنای. کەسێك، کە دیتم حەوت تۆپەڵە نوور لە پشت سەرییەوە

دەرۆیشتن، بالای زۆر زۆر لە تۆ بەرزتر بوو. بەڵام هەر خۆت بووی. دەموچاویشی نوورانی بوو، بەڵام هەر خۆت بووی، باوەڕم کرد و ئیمانم هێنا.

تاشباش ئۆغلو هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە. بە سەر پێوە راوەستابوو و لە سەرەوە سەیری مەمی دیکی دەکرد.

"سەروەری ئێمە، چەقۆکەم هەڵدەگرم و لە سەر رێیەکەی رادەوەستم، سەفەر دێ و هەر دەگاتێ، هێزی دەست و پێیانم نامێنێ. تۆزە تینێکم لە گیانیدا نامێنێ و وەعەرزی دەکەوم. ئەوە دە جارانم تاقی کردەوە، هەر سەری نەگرت. یان دەست و پێم سڕ بوون، یان بەلادا هاتم. ئەگەر نەتوانم ئەو کابرا بکوژم، ئەو دنیایەم لێ حەرامە. ناتوانم بژیێم. هەر کات دەیبینم هەر دەڵێی ژەهر دەخۆمەوە. دەزانی ئەو کابرایە ئێسك و پرووسکمی هاڕی بۆ ئەوەی ناچارم بکا نکوڵی لە تۆ بکەم؟ ئەمن دەبێ بیکوژم، ئەی وەلیی وەلییەکان، ئەی سەروەری ئێمە.

ئەژنۆکانی لە باوەشی گرت و ماچی کردن:"چاری ئەو دەردەم بکە، دووعایەکم بەسەردا بخوێنە با لە کوشتنێیدا دەست و پێم نەلەرزن."

تاشباش ئۆغلو دەستی گرت و هەڵیستاند. دەستی راستەی لە سەر سەری دانا و ماوەیەك رایگرت. ئەوجار گەڕایەوە و بەرەو لای "عەلی"یە درێژ کە چاوەڕێی بوو، رۆیشت. عەلی لە سەر کۆگایەکی لۆکە دانیشتبوو و چاوەڕوانی بوو. کە دیتی بەرەو لای دێ، هەستایە سەر پێ. سەری سوور مابوو. تاشباش لەڕ و لاواز ببوو و هێندەی منداڵێکی لێ مابۆوە. تەنانەت لە تاریکایی شەوێشدا هەستت پێ دەکرد. دەستی گرت و گوتی:

- با بچینە دەم رووبارەکە. لەوێ ئاسوودەتر قسە دەکەین.

بە لێژاییەکەی جەیحانێدا چوونە خوارێ و لە تەنیشت پنچکێك دانیشتن. عەلی گوتی:

- بەخێرهاتییەوە براله.

- چاو و دڵم پێت روون بۆوە.

- دوایی بەسەرهاتی خۆتم بۆ بگێڕەوە. ئێستا بە مردنی ئەو منداڵە ئەوانە پتر لە تۆ دەترسن. تۆقیون. ناوێرن ئاوڕیش بدەنەوە و سەیری کەپرەکەت بکەن. ئەوجار ناوێرن لە قسەکانیشیان پاشگەز ببنەوە و بڵێن ئەتۆ هەر وەلییەکەی جارانی. خۆ ئەتۆ وەلیی راستەقینەکەش نیی، سێبەرەکەی.

تاشباش بە تووڕەییەوە گوتی:

- وەلییە راستەقینەکە خۆمم. درۆیین نیم. زۆر جارانیش تاقیم کردەوە، ئاخری لێم سوور بوو خۆمم.

ـ حەسەنی خۆمان وای گوت، بەس بڕوام پێی نەکرد. کەوابوو براله مەمەد، ئەتۆ هەر بە راستی بوویتە وەلی؟

ـ بووم عەلی.

عەلی گوتی:

ـ دەی باشە، باشە، بەڵام ئەجارەیان گوندییەکان وەلییایەتیەکەت قەبووڵ ناکەن. تاشباش ئۆغلۆویان قەبووڵە، بەڵام تۆیان قەبووڵ نییە. خۆزگە نەگەڕابایەوە. ئێستا چیت پێ دەکرێ؟ وەزعت زۆر خراپە.

ـ بەڵێ، خراپە.

ـ دەبێ لێرە بڕۆی. گوندی تووشی کێشەت دەکەن. هار بوون و چاویان سوور بووە.

تاشباش ناڵاندی:

ـ ناتوانم بچمە هیچ کوێ. زۆر شپرزەم. تینی ئەژنۆم نییە. ماوەیەکی زۆر نەخۆش بووم. ئەگینا خواروخێچ دەیتوانی لێم بێتە پێشێ؟

ـ براله، لێت تۆقیون. ئەو ترسە وا دەکا ئەوان هەموو شتێك بکەن.

تاشباش گوتی:

ـ دەزانم.

ـ خۆ بتکوژن باشە. بەڵام سووکایەتیت پێ دەکەن. ئەوەت پێ قەبووڵ ناکرێ.

تاشباش گوتی:

ـ پێم قەبووڵ ناکرێ.

دوای ئەوەی خواروخیچ، لە تاشباش دا، کوێخا سەفەر پێی وابوو سیحرەکە بەتاڵ بووەتەوە. بەخۆی دەگوت، کە گوندییەکان لەمەودوا دەمدوێنن. مەمی دیکیشی خەڵەتاندبوو وهێندێ قسەی لە بن زمانی دەرکێشابوو.ئەگەر قەرار بوایە بیدوێنن، ئیتر ئێستا هەلی بوو. ئەگەر ئەفسانەی وەلییایەتیی تاشباش دەبوو بەتاڵ ببێتەوە، ئێستا کاتی خۆی بوو. پەیتا پەیتا دووپاتەی دەکردەوە:"نابێ هەلەکە لە کیس دەم. تاشباشیش پیاوێکی بە هۆش و گۆشە. دیار نییە دەیەوێ چ بکا."

## ٣٧

کوێخا سەفەر دیسان جلوبەرگە جوانەکانی لەبەر کردبوو و دەموچاویشی تیفەتیفە دابوو. سمێڵەکانی بە دۆشاو بادابوون و وەك دروێشەی پێنەچیی لێ کردبوون. ئەو رۆژە کرێکارەکان دوو ریزی درێژیان بەستبوو کە دەکرێ بڵێی هەر کامەیان هەزار مەتر دەبوو. دەستەکانیان بە حاڵ دەجوولایەوە.

هەواکە راوەستابوو و گەڵایەکیش چییە بە حاڵ نەدەلەرییەوە. تۆزێکی هەڵماوی سەرانسەری دەشتەکەی داپۆشیبوو. گەرماکە هالاوی هەڵدەستاند. گەرمایەك بوو چاوی لەبەر هەڵنەدەهات. موجووك وەك خیز و خۆڵ بوو و دەست و دەموچاوی گوندیی رەش رەش داپۆشیبوو. دەستێکێ زل بەرز دەبۆوە و موجووکەکانی لە سەر و رووی دەردەکرد و دەیتەکاندن و هەتا دەستەکە دەهاتەوە خوارێ، پۆلە مێتوولکە(مێشوولەی ورد)یەکی دیکە دەهاتن و دیسان دەموچاویان دادەپۆشییەوە. ئەو رۆژە "عەلی"یە درێژیش لۆکەی دەرنییەوە. قاوەڵتوونێ بوو. ئەو لۆکانەیان کۆ دەکردەوە کە کەوتبوونە عەرزێ. دەیانتەکاندن و فوویان لێ دەکردن و

خێرا خێرا لە قەرتاڵە و سەوەتەکانیان دەخستن. لەو کاتەوەی بارانەکە باریبوو، ئیتر وەك پێشوو هەر قۆزاخەیان لێ نەدەکردەوە. ئێستا ئەو لۆکەیەشیان هەڵدەگرتەوە کە بارانەکە بە گۆڕێی وەرکردبوو. هەڵیاندەگرتەوە و دەیانتەکاند. کارێکی مەترسیدار بوو. چونکە ئەگەر خاوەنی کێڵگەکە پێی زانیبایەن، بیانووی پێ دەگرتن کە بەڵێ لووکە خۆڵاوییە و هەقەکەی لێ دەشکاندن و زەحمەتەکەیان بەفیڕۆ دەچوو. هەر بۆیە لۆکەی پاش بارانیان بە جوێ دادەنا. لۆکەی سەر لق و لاسکەکان سپی سپیی بوون و لۆکەی سەر عەرزی لە زیوێکی چڵکن دەچوو و کرێکارەکان دڵیان نەدەهات ئەو دووانە تێکەڵ بکەن. ریزە درێژەکان لە سێبەرە گەرمەکەدا بەسپایی و بەحاڵ دەبزووت. بەو لە سەرەخۆییە بنیادەم، رۆژێ هەر پێنج کیلۆیەکی بۆ دەرنرایەوە. بەو جۆرەش رۆیبایە، کێڵگەیەکیشیان پێ تەواو نەدەبوو. کەسیش هیچی دەست نەدەکەوت. بەڵام ئەوان ماوەیەکی زۆر بە خێرایی کاریان کردبوو. دەستەکانیان بە جەمام کەوتبوو و پشتیان خەریك بوو بشکێ. لەو کاتانەدا چەند رۆژێك بە کاوەخۆ کاریان دەکرد هەتا وەخۆ بێنەوە و دیسان خێرا ببنەوە.

دەستەکانی مەمی دیك هیچ نەدەجووڵان. هۆشی لە لای خۆی نەبوو. چاوی لە سەر تاشباش ئۆغلو هەڵنەدەگرت کە دەتگوت بە قوونەخشکێ دەڕوا و هەوڵ دەدا پتر لەوانی دی لۆکە بڕنێتەوە. تاشباش ئۆغلو دەتگوت چاوی نابینێ و بە کوێرە کوێر لۆکەی کۆ دەکردەوە. هیچ کاری بە دەوروبەری خۆی نەبوو. لە پشتیلەیەکی پشت شکاو دەچوو کە لاقەکانی بە دووی خۆیدا رادەکێشێ و دەڕوا. نەتدەتوانی لە بن برۆ کولکنەکانییەوە چاوەکانی ببینی. سەیری هیچ کەس و هیچ شوێنێکی نەدەکرد. هەر دەتگوت لەو دنیایەش نییە وسیحری لێ کراوە. مەمی دیك قەرتاڵەکەی خۆی هەڵگرت و چوو لە تەنیشتی راوەستا. ئەو هەر ئاگاشی لێی نەبوو. دەموچاوی درێژووکە و پڕ لە چرچ و لۆچە بوو و رەنگێکی زەردی مەیلەو رەشی لێ نیشتبوو کە سەوز دەچۆوە. سمێڵەکانی شۆڕ ببوونەوە و ئاڵۆزکابوون. مەمی دیك لە نزیکەوە سەیری دەکرد. تاشباش خۆی بوو. بەڵام ئیدی قەد و قەڵافەتی بچووك ببۆوە. تاشباش ئۆغلو خۆی بەخۆوە و بەقەد و باڵا بوو. بەژنی دوومەتر دەبوو. دەدرەوشایەوە. ئای کە چاوەکانی چ بریسکەیەکیان تێدابوو. لەوانەشە هەر بۆ تاقیکردنەوەی ئەو خەڵکە هاتبێتەوە. ئەوا بێ هێز و مردەلۆخە. ئەگەر وا بێ، قوڕ بە سەری گوندییەکان. خۆڵ بەسەری هەمووان. "خواروخێچ" ئیتر لە جەحەندەمیشا جێی نابێتەوە.

لە پڕ دەنگی کوێخا سەفەر لە نێو گەرماکەدا وەك تۆپ گرمەی هات:

ـ براله "خواروخێچ" وەرە ئێرە. وەرە ئێرە دوو قسەم پێتە. کرێکار دەستیان لە کار وەستا. هەموو گوێیان هەڵخست. خواروخێچ دەسبەجێ لە ریزەکە هاتە دەرێ و لە تەنیشت چووە لای سەفەر راوەستا. تاشباش وەك گوێی لە هیچ نەبووبێ، هەر خۆی تێك نەدا. دەستەکانی بەسپایی دەجوولاندەوە. ئاگای لە هەموو دنیا و تەنانەت لە لۆکەیەش براببوو کە دەیڕنییەوە. ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو.

ـ ئەو کابرایە هەر مەمەد تاشباشەکەی گوندی خۆمان بوو؟ یان هەو نییە؟

گوندی پشووی دەرنەدەهات. ئاخۆ خواروخێچ گوێی نەدەدایە راسپاردەی وەلییەکە، یان قسەی لەگەڵ کوێخا دەکرد.

خواروخێچ لەو شوێنەی راوەستابوو، وەك بەردێك بێ جووڵە مایەوە.

ـ هۆی کوڕە، لەتۆ دەپرسم، سەگباب، ئەو پیاوە تاشباشە یان نا؟ دەی قسە بکە دەی، ئەو بنیادەمە هەر تاشباشە وەلییەکە نییە؟ چما دوێنێ تیر و پرت تێ هەڵنەدا؟ چما لە زاری نەڕیای؟ چما ئەو پیاوە هەر تاشباشە کەچەڵەکەی گوندی خۆمان نییە؟ دەست و پێ و سمێڵ و قژی سەری و دەنگیشی! چما دەکرێ وێنە و شێوەی کەسێکی زیندوو بێ؟ وێنە و شێوەی سەر کاغەز بێ؟ دەی بڵێ بزانم، ئەو تاشباشە هیچ و پووچە ئەوەیە؟ لە شێتخانە رای کردووە و هاتۆتەوە ئێرە؟ وەك سەی گرێی لێ هاتووە. دەی خۆ ئەگەر پیاوچاك و وەلی بوایە، چما دەستی تۆی وەك بەرد رەق نەدەکرد؟ رەق نەبوو؟ ئەگەر رەق نەبووە، کەوابوو ئەو تاشباشەش وەلی نییە. بنیادەمێکە وەك خۆم و خۆت. کەوابوو ئەی بۆچی قسە لەگەڵ من ناکەن؟ لە بەر چی؟ ئەگەر وەلی بوایە دەمزانی بۆ. وەلی، وەلییە. دیارە دەبێ بە قسەی بکرێ. بەڵام ئەو تاشباشە سووك و چرووکەی وەك سەگی پشت شکاو لە بەر پێیانی خۆی راکێش دەکا، خۆ ئەگەر کەراماتێکی هەبوایە بۆخۆی دەکار دێنا. تۆ هەر ئەوەندەم پێ بڵێ ئەوە تاشباشە یان نا؟ ئەگەر قسەش ناکەی، بە سەر تێم گەیەنە.

قسەی کرد و هەڵچوو و شێت بوو، هەڕەشەی کرد. خواروخێچ وەك بەردی لێ هاتبوو. نە دەنگ و نە جووڵەیەك؟ ئەو چاوەڕوانییەی لە خواروخێچ نەبوو. پێی وابوو ئەو قسە دەکا و دەڵێ ئەو پیاوەی تێی هەڵدراو، تاشباش خۆیەتی. ئیتر بە دوای ئەو دا گوندییەکانیش قسەیان دەکرد. بەڵام نەخشەکەی سەری نەگرت.

سەفەر داهاتەوە و لە بن گوێی خواروخێچ گوتی:

ـ سەگی سەگباب.

ددانی لێ چیڕ کردەوە و ئەوجار گوتی:

- وەڵڵاهی بۆ ئەو تێهەڵدانی لەوت دا دینارێکت نادەمێ. ژنیشت بۆ ناهێنم. بڕۆ ملت بشکێنە.

خواروخێچ گەڕایەوە جێیەکەی خۆی.

کوێخا، بەبێهیوایی بانگی مەمی دیکی کرد. مەمی دیك لە هەر شوێنێك گەیشتبووە هەر کەسێك گوتبووی ئەوە هاوشێوەی تاشباشە. ئەو هەتیوە کەللە ڕەقە قەت قسەی خۆی نەدەگۆڕی، خۆزگە ئێستاش هەر وا بڵێ.

بە نەرم و نیانی گوتی:

- برالە مەمی دیك... ئەو پیاوە تاشباش ئۆغڵوە یان ن؟ ئەتۆ بۆخۆت پێت گوتووم کە خۆیەتی...

هەر قسەی کرد و چەنەی لێ دا، بەڵام مەمی دیك متەقی لێوە نەهات. کوێخا لەویش بێ هیوا بوو.

دوای ئەو لە ژن و منداڵەکەی تاشباشی پرسی. تووشی هەر کەس دەبوو لێی دەپرسی، کەس نەیدواند، چوو و لە سەر سەری تاشباش ڕاوەستا و گوتی:

- هۆ تاشباش ئەفەنی، گووت لە ژیانی من کرد و لە ژیانی خۆیشت... ئیتر هەتا مردنێ کەس نامدوێنێ. تەنانەت ژن و منداڵیشم. قەشمەری بە تۆش دەکەن. سووك و ڕیسواتْ دەکەن. ئاخرییەکەی دەتکوژن. لەمەودوا ئەتۆ هەر قەشمەرییەکی تاشباش. قەشمەریی دەستی دێهاتییەکان. ئەمڕۆ گووت لە زاری دەکەن سێ ڕۆژی دیکە هەر کێشەیەك پەیدا بێ، دیسان دەتکەنەوە وەلی و دەتپەرستنەوە و دیسان کە دەستیان گەیشتەوە دەمی خۆیان، دەستت بۆ دێنن و بزت پێوە دەکەن، لە بەر ئەوەی بەلایانەوە گران بووە تۆ بپەرستن... ئەتۆ قەشمەرێکی بێ مەرگی. تف لەو ڕوویەت، تف لە تۆ... ئەتۆ مەرگی مەرگ.... وەك مەرگ... سەی گڕوێ... تف...

تفێکی گەورەی لە پێش تاشباش ڕۆ کرد و ڕۆیشت. نێوچاوانی لە داخان گرژ ببوو. دەتگوت دەگری. سەەری بەردایەوە و بە دەم جەیحاندا ڕۆیشتە خوارێ. ئاوەکە ڕوونتر ببۆوە و هێمن بوو.

هێوای بڕا بوو. هەموو ڕیسەکەی لێ ببۆوە خوری. دەتگوت لە تاریکاییەکدا نوقم بووە. ڕۆژ ئاوا بوو، شەو داهات. تەپۆ بە وزە وز هاتنەوە و پەلاماری گوندییەکانیان دا. برینە

قەتماغە بەستووەکەی گیانی گوندییەکان ئەوەندەیان هەڵکڕاندبوو، دیسان وەخورروو هاتنەوە و خوێنیان لێهاتەوە.

تاوێك دوای کاتی خەوێ، بای ڕۆژئاوا هەڵی کرد. کرێکارەکان کە هەتا پێش نووستنێ، خەریك بوون لە هرووژمی تەپۆ و گەرمادا بخنکێن، تۆزێك بووژانەوە و خەویان لێ کەوت. بایەکە زۆر توند بوو و تەپۆکانی ڕادابوو. هەموو نووستن. تەنیا دوو کەس نەخەوتبوون. یەکێکیان تاشباش ئۆغڵو بوو و ئەویتریش سەفەر. سێ چوار ڕۆژ بوو تاشباش خەوی نەچووبووە چاوەکانی. حاڵەتێکی سەیری هەبوو. سەری لە گێژەوە دەهات و بە تاریکیدا ڕۆدەچوو و دەهاتەوە دەرێ، هەستی دەکرد ئیتر تا مردن خەوی لێ ناکەوێ.

کوێخا سەفەر دەترسا. گوندی بێ و نەبێ ئەوجارەش تاشباشیان بە وەلی دەزانییەوە. ئەوجارە ئیتر لە چنگی تاشباش ڕەزگاریی نەدەبو. بە تایبەتی دوای ئەوەی تێهەڵدانێکی لە خواروخێچ خواردبوو ئیتر لێی خۆش نەدەبوو و کارێکی وای دەکرد گوندی لەتوپەتی بکەن. هەر بریسکەیەکی بچووك بەس بوو بۆ ئەوەی گوندی خۆ بە سەر پێڵاوەکانی تاشباشدا بدەنەوە. عومەریش هیچ دیار نەبوو. عومەر دەبوو زۆر لەمێژ بوو گەڕابایەوە. نەکا ئەویش؟... ئارەقەیەکی ساردی لە گیانی نیشت.

مەمی دیك لە ناکاو لە خەو ڕاپەڕی و هەستا و بەبێ ئەوەی بزانێ بۆ؟ دەستی بۆ چەقۆکەی برد. دەنگی خشەخشێکی لە ئاسمانەوە بیست و سەیری کرد. هەڵۆکە لەو سەرەوە وەك گوللە تۆپێکی ڕەش لوور ببوو و بە سەر بەرەو زەوی دەهات. کە هێندەی دارێکی بەرز لە زەوی نزیك بۆوە، باڵەکانی لێك کردەوە و هاوتەریبی دەشتە ڕێکەکە، لە بەر تریفەی مانگ بەرەو دەریای سپی فڕی. بەرەو هەورە سپی و ڕوونەکانی دەریا.

لەو ڕۆژەوە کە مام خەلیل ڕۆیبوو، ئیتر کەس باسی نەکردەوە. هیچ کەس و تەنانەت کوڕەکەشی و "عەلی"یە درێژیش هەر بۆ چرکەیەکیش چییە بیریان لێ نەکردەوە و نەیانپرسی ئەو کابرایە چیی بە سەر هات. هەر دەتگوت پیاوێکی ئاوا لە دایکیش نەبووە. خۆ بێت و مام خەلیل ئەوەی زانیبایەوە، لە داخان دیقی دەکرد.

## ٣٨

سەگێکی زلی مەڕی، وەشوێن مام خەلیل کەوتبوو. لە سەگی چوکووراوا لە هەر ڕەگەز و جۆرێك بن، ئەوەندە گەورە نابن و ئەوانیش وەك خەڵکەکە وردیلەن. لە چوکووراوا هەر گیای بێ کەڵك و مێشوولە و تەپۆی لە ڕادەبەدەر گەورە دەبوون. تەپۆ دەتگوت لە ئێسك دروستکراون و چزووشیان لە ئاسن. خەڵکەکەی کوێستانی تۆرووس هەر بە چوکووراوا دەمردن. سەگەکە زەردە و سووورباوە بوو. هێڵێکی سوور لە کلکییەوە هەتا سەری، جوانی کردبوو. زمانە زلەکەی دەرکێشابوو. مام خەلیل هەر منداڵییەوە ڕقی لە سەگ بوو و لێیان دەترسا. پێی وا بوو سەگ شوومی باش نییە. هەر بۆیەش قەت ڕاینەدەگرت. چەند جارێك سەگە زەردەکەی ڕەپاڵ نا. سەگەر زەردە ڕاوەستا و بە گرژییەوە سەیری کرد و لە جێی خۆی نەبزووت. دوای ئەوەی مام خەلیل ڕۆیشت، ئەگەکەش وەشوێنی کەوتەوە. مام خەلیل بە خۆی گوت:

ـ ئەو سەگە شتێکی بە دەمەوەیە. خودا بەخێری بگێڕێ.

گژ و گیاە زەرد و سووتاوەکان کە لە بەر تاوەکە هەڵبرینگابوون و ڕەنگیان گۆڕیبوو. گوڵی سەر گژ و گیاە بەرزەکانیش کە دەتگوت دارن، وشك ببوون. چوکووراوا وەك ئاگر دەگڕی. هەر شقارتەیەکت پێوەنابایە، هەموو دەشتەکە لە چاوترووکانێکا گڕی دەگرت.

باڵندەیەکی زیوین بە باڵە زلەکانییەوە کە ملێکی درێژیشی هەبوو، نزم هێندەی باڵای بنیادەمێك هەڵدەفڕی و بەرەو چیاکانی تۆرووس کە دەتگوت هەڵمێکی شینیان لێوە هەڵدەستێ بەڕێوە بوو. مام خەلیل لەو باڵندەیەش دەترسا کە دەتگوت لە سەر عەرزەکە لە شتێك دەگەڕێ. ئەو باڵندانە، هەر وا بە نزمی لە لێوارەکانی دەریای سپییەوە هەڵدەفڕن و دەچنە چیای تۆرووس و دوایی دیسان دەگەڕێنەوە دەریا. بڕێکیش بە سەر دەریاکەدا دەڕۆن، دەریاش وەك چوکووراوا ساف و ڕێکە. دەیا و دەشت هیچ جیاوازییەکیان نییە. کە دەبینن لەوێش هیچ گژ و گیا و دارێکی لێ نییە، بە سەرسووڕمانەوە دەگەڕێنەوە. مام خەلیل پێی وایە ئەو مەلەش بێفەڕ و بەدشوومە.

خۆر ئاوا دەبوو. ئەمڕۆ ئەو چوکووراوا کاولبووە جۆرێکی دیکە بوو. بۆ ساتێك هەر هەموو شتێك، بەرد و خاك و ئاو و دار و ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا و کۆگا لۆکەکان و خەرمانەکان و ڕەوە ئەسپ و مانگا و کامیۆن و تراکتۆر و ئەو هەورە سپییانەی لە سەر دەریای سپیی کۆ ببوونەوە، هەموو دنیا ڕەنگێکی سووری درەوشاوەی بەخۆوە گرت. سوور وەك دوخی شمشێر. مام خەلیل لەو سوورییەش دەترسا. دوای ئەوە هەموو وڵات شین داگەڕا. شینێکی بلوورین کە ناخی بنیادەمی کەیلی خۆشی دەکرد. چیاکانی تۆروسیش نزیك بوونەوە، دەتگوت ئەگەر دەستیان بۆ بەری دەتوانی لکی دارێکی بشکێنییەوە. چیکانی تۆرووسیش نوقمی ئەو شینە زوڵاڵە، ماوەیەك هەڵمی لێ هەستا. مام خەلیل لەوەش ترسا. ئەو سەگەی بە شوێنیشییەوە بوو شین هەڵگەڕابوو و هێڵێکی شینی تۆخ و بریقەداری کەوتبووە سەر پشتی. وەك دۆخی شمشێر. مام خەلیل پتر ترسا. ڕاوەستا. سەیەکەش ڕاوەستا. مام خەلیل بە نەڕەنەڕ چەند گلمەتێکی هەڵگرت و لە سەگەکەی گرت. سەگەکە لە جێی خۆی نەبزووت. وەك پەیکەرە سەگێکی لێ هاتبوو. مام خەلیل لە نەڕاندن و بەرد هاویشتنێ ماندوو بوو. دەترسا لە سەگەکەش بچێتە پێشێ. گەڕایەوە و کەوتە ڕێ. سەگەکەش وەك نە بای دیتبێ و نە بۆران، شەش هەنگاو لە دواوەی وەشوێنی کەوتەوە.

مام خەلیل سەری هەڵێنا. دوایین ڕووناکاییەکان لە سەر ڕەوەز و کاولاشەکانی ئاناوەرزا تیشکیان دەدایەوە. ئاناوەرزا لە نێوەڕاستی دەشتە کاکی بە کاکییەکەدا کە تاریك ببو و لێرە و لەوێ هالاوی لێ هەڵدەستا، دەتگوت دوورگەیەکی ڕووناکە . شارێکی کۆن و دیارە لە سەر ئاسەوار و دارپەردووی کاولاشەکان بوو، بە ئاودڕ و میچ و تاق و پاشماوەی شووراکانییەوە. شەوەکەش بە تایبەتی لە بن تریفەی مانگە شەوەکەدا، ئاناوەرزای وەك کەشتییەکی گەورە لێ

کردبوو که له دەریادا بایەوانەکانی هەلکردووە و بایەوانی پڕ بوون لە با و بە ئەوەندە خێرا دەڕوات سەر لە گێژەوە دێنێ... ئاناوەرزا ماری زۆر بوو. دەتگوت ئاسنێکی ژەنگگرتوون و پەڵەی بۆریان بە پشتییەوەیە. مارەکان لە نێوەڕاستی رەوەزەکاندا جموجۆڵیان بوو. چاوە زیندووەکانیان دەتگوت جووتێ ئەستێرەن. چاوی هیچ بوونەوەرێك هێندەی چاوی مار جوان نییە. دەڵێی ئەستێرەکانی ئاسمانی چوکووراوان.

مام خەلیل پاڵی بە دارێکەوە دا و دانیشت. ئارەقەی کردبوو. کۆگایەکی لۆکە لەبەر دەم بوو. سەگەکەش هات، لە بەردەمی سەری وەسەر دوو دەستەکەی کرد و خەوت. مام خەلیل ئەمجارەیان پەلاماری سەیەکەی نەدا. بەخۆی گوت، بەشکم بەخت و شانسی پێوە بێ. لێ گەڕێ با کرێکار بنوون. بەشکم پاسەوانەکەش بنوێ. ئەو کۆگا گەورە لۆکانە، ئەگەر ئەگەر لە نێوەڕاستی مەزرایەك لە سەر یەك کەڵەکە دەکران، نیشانەی ئەوە بوون کە خاوەن کێڵگەکە پارەی کرێکارەکانی داوە و لێی وەرگرتوون. مام خەلیل لە ژیانیدا هەر لەو جۆرە کۆگایانەی دزیبوو. قەت لۆکەیەکی نەدزیبوو کە کرێکارەکان بە حاڵی سەگ و لە بەر قرچەی گەرمایە کۆیان کردبۆوە. شانازییشی بەوەوە دەکرد. هەقی کرێکاران، تەنانەت ئەگەر قرۆشێکیش بوایە، بە گەروویدا نەدەچووە خوارێ. مام خەلیل پەنجا ساڵ بوو دزیی دەکرد و هەر لۆکەشی دەدزی. شەش ساڵێك دەبوو وازی لێ هێنابوو. خۆ ئەگەر وەزعی "عەلی"یە درێژ ئاوا شپرز نەبوایە و مریشکۆك لە چیا بە تەنێ بەجێ نەمابایە، دیسان کاری وای نەدەکردەوە. پارەی جەواڵە لۆکەیەك گیانی مریشکۆکی رزگار دەکرد.

رۆژ ئاوا بوو. مام خەلیل هەستا. سەگەکەش بە شوێنیدا. هەر دووکیان بەبێ ئەوەی سریوەیان لێوە بێ، لە کۆگا گەورەکە نزیك بوونەوە. مام خەلیل جەواڵەکەی دانا و دەستی کرد بە لۆکە ئاخنینەوە. بەبێ هیچ هەڵپەیەك. هەر دەتگوت ماڵی بابی خۆی هەڵدەگرێ. دەشتەوانی مەزراکە برێك لەولاترەوە لە بن دارێك دانیشتبوو و گۆشتاوەکەی دەخوارد. مام خەلیل بە جووڵەی باسکی کابرا لەوە تێگەیبوو.

مام خەلیل ئەوەندەی یەك و دوو جەواڵەکەی پڕ کرد و بە کۆڵی دادا و لە مەزراکە چووە دەرێ. گەیشتبووە قەراغ مەزراکە، دەشتەوانەکە زانیی. مام خەلیل خۆی خستە نێو کۆگایەکی پنچکە گەزەوە. سەگەکەش هات و لە تەنیشتی وەرکەوت. دەشتەوانەکە بە سێ کەسەوە هاتبوون و لێی دەگەڕان. چەند جارێك بە تەنیشتیدا رابردن و نەیاندی. مام خەلیل دەستی بە سەری سەگەکەدا دێنا. سەگەکە خۆی مەلاس دابوو هەناسەی لەخۆی بڕیبوو. مام خەلیل بە خۆی گوت، بێ و نەبێ ئەوە سەگی دزێك بووە و زۆر گۆنگەڵ و بەڵای بەسەر هاتووە.

هەر دەگەڕان. مام خەلیل زانیی دەیدۆزنەوە. بۆیە بەسپایی بەرەو لای ڕێگەکە خوشی. سەگەکەش بە شوێنیدا. جەواڵە لۆکەکەش لەوێ لە نێو پنچکەکاندا بەجێ ما.
دەشتەوانەکە گوتی:
- کاتێ جەواڵەکەی پڕ دەکرد دیتم. گوتم لێی گەڕێ با پڕ بکا و ئەمنیش گۆشتاوەکەم بخۆم، دوایی دەیگرم. نازانم بەکوێدا جەواڵەکەی پڕ کرد و ڕای کرد. ئەوە بنیادەمە یان جنۆکە؟ لە ژیانما شتی وام نەدیوە. چل ساڵە لێرە دەشتەوانم.
گەڕانەوە و چوونەوە خێوەتەکانیان. مام خەلیل لە شیوەکە وەسەر کەوت و چۆوە نێوەڕاستی پنچکەکان. ئەو شوێنەی وا جەواڵەکەی لێ دانابوو. سەیری کرد جەواڵەکەی نەماوە. چیی لێی گەڕا نەیدۆزییەوە. مام خەلیل لە ژیانیدا شتی وای نەدیبوو. لەگەڵ سەیەکەی دەستی کرد بە ملۆمۆ و بۆنکردنی ڕەگی پنچکەکان. بۆنکردنی زۆر بەهێز بوو. بە بۆنکردن دەیزانی چ شتێکیان لە کوێ داناوە. ڕەگی پنچکەکان بۆنێکی توندی تاوەسوتی لێ دەهات. لە هیچ کوێوە نە بۆنی لۆکە دەهات و نە بۆنی جەواڵەکە. سەگەکەش بە بۆن جەواڵەکەی پێ نەدۆزرایەوە.
مام خەلیل لەوانە بوو شێت بێ. بەرەبەری بەیانی دەبوو لێرە دوور بکەوێتەوە و بەرەو شار وەڕێ بکەوێ. خۆ ئەگەر لەو دەشتە ڕێکەدا، بە جەواڵە لۆکەوە گیرابایە، تەواو لێی دەقەوما... هەتا ئێستا قەت نەگیرابوو. گیرانی چی؟ ئەوە مام خەلیلە. تیشکی چرای کامیۆنەکە هات و لە سەری ڕاوەستا. مام خەلیل خۆی بە عەرزییەوە مەلاس کرد. سەگەکەش هەروا. تیشکی چراکە لە سەری لانەچوو. تیشکەکە وەك قورقوشم قورسایی خستبووە سەری. مام خەلیل لە بن ئەو تیشکەدا پشووی لە خۆی بڕیبوو.
لە پڕ چەند کەسێك وێکڕا قاقایان کێشا. دەنگی پێکەنینەکە لە ڕەوەزەکانی ئاناوەرزا هالاً و دەنگی دایەوە. تەپەی پێی چەند کەسێکی لە تەنیشت خۆیەوە بیست. خۆی پتر بە عەرزەکەوە نووساند. دەستێکی وەك ئاسن مچەکی گرت و هەڵیستاند. نوورەکە چاوی بە شەواره خست و نەیتوانی ئەو کەسە ببینێ وا باسکی گرتبوو. دوای ئەوەی چەند جاران چاوی تروکاند، ئاخرییەکەی دیتی. پیاوێکی گەنج و بەخۆوە بوو. پێنج کەسەکەی دیکەش لە دواوەی بوون. ئەوی لە هەموان بەتەمەنتر، پێدەکەنی و قسەشی دەکرد:
ـ کوڕە خۆ وەك جنۆکە غەیب ببوو. بە سێ کەسان ئەو هەمووەی لێ گەڕاین نەماندۆزییەوە. ئێستاش چرای ئەو کامیۆنە نەبوایە نەماندەدۆزییەوە. چۆن بەو عەرزەوە خۆی مەلاس دابوو. تێکەڵی خۆڵەکە ببوو.

پیاوە گەنجەکە بەبێ ئەوەی مەچەکی مام خەلیل بەر بدا گوتی:
- چەندیش پیرە؟ ئەمن لۆکە دزم زۆر دیون، بەڵام لە ژیانمدا دزی ئاوا پیرم نەدیوە. ئەوە سەد ساڵ دەبێ.
مام خەلیل گوتی:
- بەرم دەن، منداڵینە.
ردێنە سپی و درێژەکەی لە بەر تیشکی چراکە، بە شەرمەزارییەوە بە سینگییەوە نووسا:
- شەش ساڵ بوو دەزیم نەدەکرد. لە پێناوی کارێکی خێردا دەمویست ئەو کارە بکەمەوە.
- دەتویست ژن بۆ کوڕەکەت بێنی؟...
یەك پشوو گاڵتە و قەشمەرییان پێ دەکرد. هەتا بەیانی مام خەلیل لە بەریان پاڕایەوە کە بەری بدەن و ئەوان هەر قەشمەرییان پێ کرد. دەیانگوتی:
- چوکووراوا زۆر باش بە تۆوە دەخافڵێ و خۆش رادەبوێرێ. دزی لۆکەی زۆر بەخۆوە دیوە، بەڵام دزی لەو تەمەنەیدا هەر نەدیوە.
بە پێکەنین و سیخورمە تێکوتانەوە دەست و پێیەکانیان بەست و بردیان و خستیانە سەر کۆگایەکی لۆکە و جەواڵەکەشیان لە تەنیشتی دانا.
مام خەلیل یەك پشوو وا دەپاڕایەوە کافر بەزەیی پێیدا دەهاتەوە. گوتیان:
- بێدەنگ بە پیرە سە. بخەوە. بخەوە چونکە بەیانی کارمان زۆر پێتە. ماندوو دەبی.
سەگەکەش هات و لە تەنیشتی وەرکەوت. ئەو هەستە تاڵەی تا ئەو کات نەیدەزانی چییە، لە دڵی گەڕا.
لەگەڵ تاوهەڵاتێ، سۆڵلوو ئەو گەنجە چاو کەسکەی سەری لووتی تیژ و دەموچاوێکی شلە (خاڵخاڵ)ی هەبوو و قژە قرژبووەکانی لە بەر خۆر کاڵ ببوونەوە و سەری چلی مووەکانی سپی هەڵگەڕابوون، شانی مام خەلیلی گرت و هەڵیستاند و لەو سەرەوە بەری دایەوە. مام خەلیل ئەژنۆی نوشتانەوە بەڵام بەو پیرییەشییەوە نەکەوت. گەنجەکە دەستەکانی کردەوە و رێشمەیەکی توند لە ملی کرد. جەواڵە لۆکەکەشی بە کۆڵیدا دا و وەڕێ کەوتن.
کە گەیشتنە یەکەم ئاوایی، خۆر بە قەدرایی رمبێك هەستابوو و دووکەڵ لە سەربانی ماڵە قوڕینەکانی گوندەکەوە هەڵدەستا بەرەو ئاسمانێ.
گەنجەکە هەوسارەکەی ملی مام خەلیلی گرتبوو و دەیکێشا. مام خەلیل لە بن بارەکەیدا نووشتابۆوە. سەگەکەش لە دوورەوە بە شوێنیاندا دەهات و سەری بەردابۆوە. هەر ئەوان

دەرکەوتن، گوندەکە بوو بە هەڵڵا و هەنگەمە. ئەوەندەی یەك و دوو، منداڵە وردکەی ئاوایی بە هاوار و قیژە لە دەوری مام خەلیل کۆ بوونەوە و بەرد و تەپاڵە و سواڵتە شکاویان تێگرت. ئەوجار یەك یەك و دوو دوو هاتن و تفیان لە رووی کرد. لە نێو ئەو هەڵڵا و هەنگەمەیەدا، سۆللو هەوسارەکەی مام خەلیلی کێشا و بردییە بن ئەو دارە توورەی کە گەڵاکانی لە تۆزدا سپی دەچوونەوە و چەند قەرەوێڵەیەکی چێویی لە بن دانرابوو. پیرە پیاوەکان و گوندییەکانی دیکەش لە سەر قەرەوێڵەکانی دانیشتبوون و چایان دەخواردەوە. هەر مام خەلیلیان دی، هەستان و یەك بە یەك تفێکیان لە نێوچاوانی کرد. ژنانی ماڵانیش هاتنە دەرێ و پیرەژن و گەورە کچان و نەخۆش و ئیفلیج، هەر هەمووی لە بن دارە توورەکە کۆ بوونەوە و هەر کامەیان یەك دوو جاران تفیان لە نێوچاوانی کرد. لەگەڵ هەر تفێکی پێیاندا دەدا، مام خەلیل وێك دەهات و چیرِ دەبۆوە و سەر رووومەتی راستی دەلەرزییەوە. دەموچاوە زەرد و درێژەکەی دەمودەست بە تفی سپی سواخ درا. روخساری مام خەلیل لە منداڵێکی دەستەوستان و سەرلێشێواو دەچوو کە ئازار دەچێژێ. لە بن برۆ کولکنە سپییەکاییەوە چاوەکانی دەتگوت لە شوێنێکی برِیون، بەردەوام دەیترووکاندن.

جنێو و قسەی ساردوو سووك وەك بارانە بۆی دەباری. گوندەکە دەتگوت جێژنەیانە. جار جار کەسانێك دەیانگوت:"وا مەکەن بابە، پیرە. گوناحە." بەڵام کەس گوێی نەدەدانێ.

سۆللو کە مام خەلیلی بە دەستەوە بوو و تێکرای منداڵی ئاواییەکەش بە هات و هاوارەوە بە شوێنیاندا دەهاتن، هەموو کۆڵانەکانی دێیەکەی گێرِا و سۆللو کە پێکەنینێکی سەرکەوتوانەی لە لێوەکانی نیشتبوو، لە ئاواییەکە چووە دەرێ. منداڵەکان هەتا نزیك دارە نارەوەنەکانی دەرەوە دێ بەرِێیان کردن. سۆللو، مام خەلیل و بە دوای ئەوانیشدا سەگە زەردە گەورە و بێتاقەتەکە وەرِێ کەوتن.

مام خەلیل پێخاوس بوو وخۆڵ و خاکی سەر عەرزی کە وەك ئاگر سوور ببۆوە، لاقەکانی دەسووتاند. هەر جارێکی پێی لە سەر عەرزی دادەنا، دەتگوت پێی لە سەر ئاسنێکی داغ داناوە هەڵدەبەزییەوە. ئەژنۆشی دەلەرزین.

گەرماکەی زۆر بەتین بوو. ئەو رۆژە ئاگرباران بوو. ئەو بارە قورسەش کە بە کۆڵی مام خەلیلەوە بوو، جار بە جار قورستر دەبوو.

هەر گەیشتنە دووەمین ئاوایی، سۆللو بانگی کرد:

ـ ئای وەرن لۆکە دز، لۆکە دز...

کۆلانەکان چۆڵ بوون. هەمووان لە بەر گەرما پەنایان بردبۆوە بەر ماڵەکانیان. بە بیستنی دەنگەکە، گەورە و بچووک، پیر و لاو لە ماڵەکانەوە هاتنە دەرێ. مام خەلیل ساتێك لە نێو تەپوتۆز و خاك خۆڵدا لە چاوان ون بوو. هات و هاوار و جنێو و قسەی سارد و سووك. دەنگەدەنگ و هات و هاوارەکە لە پڕ نیشتەوە. تف لێکردن و جموجۆڵەکانیش راوەستان. تەپوتۆزەکە نیشتەوەو مام خەلیل وردە وردە وەدیار کەوت. وەك کەسێکی خەریکی نوێژکردنێ بێ، لە سەر چۆك بوو. جەواڵە لۆکەکەی بەلایەکدا کەوتبوو و زارکەکەی کرابۆوە. بەڵام لۆکەکەی نەرژابووە دەرەوە. جلوبەرگەکانی مام خەلیل تیتۆڵ تیتۆڵ ببوون و نوقمی خۆڵ و خاك و شیاکە و ریخ و تف بوون. مام خەلیل ئیتر لە بنیادەم نەدەچوو، بەڵك دەتگوت بوونەوەرێکی سەیر و سەرسەرەیە کە تا ئێستا دنیا بە خۆیەوە نەدیوە و لە بەر زبڵ و زاڵ و پیسایی و تف دیار نەبوو. چاوەکانی کە تف و پیساییان لە سەر نیشتبوو، پەیتا پەیتا دەترووکان. ئەگەر ئەو تۆزە جووڵەیەش نەبوایە، نەتدەزانی گیانی لەبەردا ماوە.

چەند پیرەمێر و پیرەژن گوتیان:

ـ کورە کاکە ئەوەش بنیادەمە. بەسییەتی.

منداڵێك کە هەر وا تەمەنی حەوت ساڵان دەبوو، یەك پشوو دەگریا و دەیگوت:

ـ باپیرەم، باپیرەمیان کوشت. وەڵلاهی بابم بێتەوە پێی دەڵێم.

سۆللو گورجێ هەوسارەکەی کێشا. مام خەلیل بەرەودەم کەوت و ردێنە درێژ و خۆڵاوییەکەی بە عەرزەکەوە نووسا.

گەرماکەی زۆر بەتین بوو، ئاسمان ئاگربارانی بوو.

سۆللو مام خەلیلی هەستاندەوە. مام خەلیل خۆی بە سەر پێیانەوە رانەدەگرت و ئەژنۆکانی دەلەرزین. بەڵام هەوڵێشی دەدا خۆی بە سەر پێوە رابگرێ و لەوە پتر لە بەر چاوی خەڵکەکەی چوکووراوا نەشکێتەوە. دەیزانی بێت وەعەرزی بکەوێ، وەك کەلاکە سەگێك بە سەر عەرزەکەدا رایدەکێشن. زۆربەی لۆکەدزەکانی پێشووی دیتبوو کە وەهایان بەسەر هاتبوو و ئەم پێیان پێکەنیبوو.

سوللو و دوو گەنجی دیکە، جەواڵە لۆکەکەیان بەرز کردەوە و بە کۆڵی مام خەلیلیان دادایەوە. مام خەلیل بەلادا هات و بە کۆڵەکەیەوە کەوتە عەرزی. لەگەڵ کەوتنەکەیا، خەڵکەکە قاقایان کێشا. سۆللو گوتی:

ـ هەستە بزانم دەی، پیرە سەگ. پێت وایە لۆکە دزین لە چوکووراوا هەر وا سووك و ئاسانە؟ ئێمە خوێنی دڵمان دەخۆینەوە تا قۆزاخە لۆکەیەك پێ دەگا، ئەتۆش لە کوێستانە کانییە ساردەکانەوە دێ و بەرهەمی خوێنی دڵمان دەدزی؟... هەستە بزانم مردەلۆخە...

پیلی گرت و هەڵیستاندەوە. جەواڵە لۆکەکەی بە پشتیدا دا و هەوسارەکەی کێشا.

گوندییەکان گوتیان:
- ئەو پیرە پیاوە ناگەیەنیتە سێ گوندی دیکە. پشووی لێ دەبڕێ. سۆللو گوتی:
چەندی تاقەتی بوو دەیبەم. دوای ئەوەش بە دووی خۆمدا رایدەکێشم.
منداڵەکان بە دوایاندا ماڵە قوڕینەکان و هەوا گەرمەکەی ئاواییەکەیان بەجێ هێشت. مام خەلیل خۆی شل کردبوو. ئیتر کاتێ لاقەکانی لە سەر خاکە سوورەوەبووەکە دادەنا، ئیتر هەڵنەدەبەزییەوە.
گەیشنە گوندێکی دیکەش. مام خەلیل ئیتر چاویشی نەدەترووکاند. کە دەشکەوتە سەر زەوییەکە، ئیتر نەیدەتوانی هەستێتەوە. سۆللو هەڵدەستاندەوە و دیسان ئەو دەکەوتەوە.
ئاغای گوندەکەی سۆللو پرسی:
- تۆ دەزانی ئەو پیرە گلاوە خەڵکی کوێیە؟
سۆللو گوتی:
- دەزانم. لێم پرسی و فێر بووم.
- ئەو کابرایە پشووی لێ بڕاوە. ئەگەر بکەوێ و بمرێ، کێشەت تووش دەبێ ها. هەڵیگرە و بیبەوە لای گوندییەکانی. بە عارەبانەکەی ئێمە بیبەوە.
سۆللو گوتی:
ـ کوڕە حەزم لێ بوو دە گوندی دیکەشی بگێڕم... خۆزگە دەتدی چۆن چاوی دەترووکێنێ...
مام خەلیلیان سواری عارەبانەیەك کرد. وا کەوتبوو نووزەی نەدەهات.
بە خێرایی گەیشتنەوە ئەو مەزرایەی وا خەڵکەکەی یالاك لەوێ لۆکەیان کۆ دەکردەوە. رۆژ لە ئاوابوون بوو و گەرماکەی شکابوو.
سۆلوو مام خەلیلی فڕێ دایە خوارێ. مام خەلیل لە سەر عەرزەکە تخێڵ بوو. سەگەکە هات و بۆنی پێوە کرد و ئەوجار تۆزێك لەولاترەوە وەرکەوت. زۆر بە تووڕەییەوە کلکی رادەوەشاند.
سۆللو گوتی:
- ئەوە ناوی مام خەلیلە. لە سەر لۆکەدزینێ گرتمان. وەرن وەریگرنەوە بۆ خۆتان.
ئیتر قەمچییەکی لە ئەسپەکەی دا و لە نێو تەپوتۆزدا لەوێ دوور کەوتەوە.
هەمووان بە دەوری مام خەلیلەوە کۆ بوونەوە. دڵیان بۆی بوو بە کەباب. لە ئامێزیان گرت و گریان. جوان و زەریف شوشتیانەوە. تۆزێك دواتر مام خەلیل چاوەکانی هەڵێنان. کە "عەلی"یە درێژی لە ژوور سەری خۆی دی، بزەیەکی هاتێ و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ ئەمجارە سەرنەکەوتین کورِم. نەبوو. پێوە بووین.

ئیتر روخساری گرژ بوو و گوتی:

ـ گوێ بدەیە عەلی، بەڵێنم بدەیە ئەوەی بە سەرم هات، بۆ مرێمۆکی ناگێڕیتەوە. مەڵێ لە بەر خاتری ئەو گیانی خۆمم خستە مەترسییەوە. بەڵێنم پێ دەدەی؟

ـ بەڵێن بێ.

ـ تا زووە هەستە و برِۆ خۆت بگەیەنەوە لای ئەو مرێمۆکە نازەنینە. بەڵێن دەدەی؟

ـ شەرت بێ بە شەرتی پیاوان.

ترس و شەکەتی بە سەر مریەمۆکدا زاڵ ببوو. نە تاش باش دیار بوو و نە ئەحە شێت. پەرییەکانیش نەدەهاتنە لای. تەنانەت چەتە و دزیش رێیان نەدەکەوتە ئەو گوندە تووک-لێکراوە. لە مێژ بوو هەموو بەیانیان لەگەڵ تاوهەڵاتنێ، مریەمۆك دەچووە لێڕەوارەکە و کارگ و میوەی نەستەرەن و سێوکە کێویی لێ دەکردەوە و بۆنی بە سوورە گوڵەوە دەکرد.

## ٣٩

نێو دارستانەکە سێبەر و شێدار بوو. رووناکاییەکی هێندەی داوێك، کە هەورەکانی بڕیبوو، بە لای رۆژئاوادا کشابوو. هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو. مریەمۆك لە دارستانەکەدا کارگی کۆ دەکردەوە. کارگی دارستان زۆر بەتام بوو. بە تایبەتی برژاوەکەی. مریەمۆك دوو سەعات دوای تاوهەڵاتنێش هەروا کارگی کۆ دەکردەوە و فەرتاڵەکەی پڕ ببوو لە کارگی گەورە گەورە. پشتی وەژان کەوتبوو، ئازاری پشتی خستییەوە بیر چوکووراوا و هەستی کرد بریسکەیەکی تازەی لە پشتی وەستاوە. ئێستا پاڵەی لۆکەڕنینەوە لە چوکووراوا هیچیان ناتوانن پشتیان راست بکەنەوە. وەك پشیلەی پشت شکاو لاقەکانیان بە دووی خۆیاندا رادەکێشا. تەپۆش هەموو گیانیان ئەنجنیبوون. راسانی سەری پەنجەکانیشیان لە هەموو شتێ خراپتر بوو. نەیاندەتوانی دەست بۆ هیچ شتێك بەرن. خۆ گەرماکەشی دەردی سەرباری دەردەکانی دیکە بوو. حەسەن و ئۆمەخانی هاتنە پێش چاوی. ئاگری لە هەناوی بەربوو و ئارەزوویەك ئاخی تەنی. دوو منداڵ هاتن و بەرانبەری راوەستان...

کە گەڕایەوە ئاوایی هێشتا نیوەڕۆ نەببوو. کە سەری هەڵێنا، پێی بە عەرزییەوە وشك بوو. قەرتاڵەکەی لە دەستی بەربۆوە و کارگەکانی لێ بڵاو بوونەوە. پێی وابوو خراپ دەبینێ.

چاوەکانی هەڵگڵۆفین. ئاخۆ خەیاڵ بوو یان خەون؟ دیسان سەیری کردەوە؟ نە خەیاڵ بوو و نە خەونیش... هەر بە راستی پیاوێك هاتبووە گوندەکە.

لە پێشدا بە خۆی گوت ئەوە تاشباش ئۆغڵووە و زۆریش دڵی خۆش بوو. دوایی بیری کردەوە کە نەخێر ئەحە شێتە، بەڵام دەسبەجێ زانیی هیچیان نییە. لەوانەیە دز و چەتە بێ، یان دز یان قاچاغچی. لەوانەبوو دۆست بێ یان دوژمن. هەر شتێك بێ بنیادەمێك بوو و دەهات. مرێمۆك داهاتەوە و کارگەکانی لە عەرزەکە کۆ کردەوە و لە قەرتاڵەکەی خستنەوە. چووە پێشتر و قەرتاڵەکەی دانا. نەچۆوە ماڵێ. تێر نەدەبوو لە سەیرکردنی ئەو پیاوە لە دوورەوە دەهات. لە خۆشییان نەیدەزانی چ بکا. لە پێشدا قاقایەکی کێشا، ئەوجار چەقەنە و چەپڵەی لێ دا و سێ جاران خۆی بادا. هەر نەیدەتوانی چاو لەو کابرایە بترووکێنێ کە هاتبوو. دنیا چۆڵەکەی دەوروبەری لە چاوترووکانێکا ئاوەدان ببۆوە. دارەکان و باڵندە و ئەو کەلاوە کۆنانە و ... هەمووی لە بەر چاوی گۆڕابوون. هەموو شتێك بە روویەوە پێ دەکەنین. تەنانەت کەڵەشێرەکەش کە چووبووە سەر پنچکێك و رووی لە کابرای رێبوار کردبوو، لە خۆشیان سێ جاران خوێندی. ئەویش دەیزانی دنیاکە ئاوەدان بۆتەوە، بە هاتنی بنیادەمێك دنیاکە ئاوەدان بۆتەوە. هەموو خۆشەویستی و سۆزی خۆی لە چاوەکانیدا کۆ کردبۆوە و بە نیگاکانی سێبەری ئەو رێبوارەی دەلاواندەوە کە دەهات.

مرێمۆك بە پێکەنینەوە گوتی:"وەرە، هەر کەسێك هەی وەرە. دز بە، کافر بە، پیاوکوژێکی خوێنمژ بە، هەر کەسێك هەی، هەر وەرە. ئەی خوایە گیان، خودا چاوڕەشەکەی خۆم، ئەتۆ هیچ بەندەیەك بە بێکەسی و تەنیایی تەمبێ مەکە. ئەو بەڵایەی بە سەر منت هێنا، بەسەر هیچ کەسی دیکەی مەهێنە. بێکەسی بە نەسیبی دوژمنەکەشم مەکە. ... وەرە، لە دەورت گەڕێم، خێراتر وەرە. کێ چووزانێ لە کوێوە و لە چ رێگەیەکی دوورەوە دێی، کێ چووزانێ ئەندە ماندووی، وەرە لە بەر ئەو لاقانەت بمرم، خێراتر وەرە."

مرێمۆك لە پڕ کەوتە جموجۆڵ، چاوی لەو رێیە هەڵگرت کە بە خۆشییەوە لێی دەڕوانی و گوتی:"مرێمۆك، مرێمۆکی سەر بە هەش، هەر وا راوەستاوی و سەیری دەکەی، پاڵەوانە جوامێرەکەت وا دێ و ئەتۆش هەر وا راوەستاوی و سەیری دەکەی و نابزووی. کەرە ژن."

خێرا چۆوە ژوورێ، جلوبەرگی جێژنێی لەبەر کرد کە قوماشێکی کولکنی کەسك بوو لە سندووقەکە دەرێنا و لە بەری کردن. ئەوە سێهەمین جاری بوو ئەو شمەکانەی لەبەر دەکرد. لە بنی سندووقەکەیدا گوارەکانی و بازنە زیوەکەی و ملوانکە مەرجانییەکەی هێنایە دەرێ و خۆی

رازاندەوە. لەچکە هەریرە کەسکەکەشی لە سەر کرد. گۆرەوەییە سپیەکانیشی لە پێ کردن. دەترسا ئەو پێڵاوانە لە پێی بکا کە تەختی بنی سندووقەکەی دابوون و چەند ساڵێك لەمەوبەر خوشکەکەی دابوویێ، هەموو جارێك کە لە پێی کردبوون لاقەکانی بریندار ببوون. بەڵام چ دەبێ با ببێ، دەبوو لە پێیان بکا. لەو خوارەوە کوڕە خۆشەویستەکەی دەهات بۆ لای مرێمۆك.

کە هاتە دەرێ، سەیری کرد ڕێبوارەکە زۆر نزیك بۆتەو. لە خۆشیان خۆی پێ نەگیرا و نەیتوانی چاوەڕێی بێ. وەرێ کەوت و بە غاردان بە ڕێگەکەدا بەرەو خوار بۆوە. باوەشی کردبۆوە و وەك شەپۆلێکی خۆشی و شادی بەرەو ڕێبوارەکە بەڕێوە بوو. پەیتا پەیتا لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

- خوایە گیان، خودا باشەکەی خۆم، کەس بە بێکەسی سزا مەدە. ئەو دنیایە بێ تام دەبێ. چێژی نامێنێ.

مرێمۆك کە نزیك بۆوە، زانیی ڕێبوارەکە ناسیارە. بەڵام کێ بوو؟ ئەو گەنجە کەڵەگەت و چوارشانەیە کێیە؟ بەڵام زوو ناسییەوە و دەستی لە ئەستۆی کرد. پەیتا پەیتا دەیگوت:

- کوڕە نازاکەم، عومەر گیان... کوڕی خۆم، عومەری من، جوامێرەکەم، بەخێر هاتییەوە بۆ لای نەنە مرێمۆکت. بەخێر هاتییەوە، خێر و بەرەکەتت هێنا. سەر تەپڵی سەرم هاتی، پێڵاوت لە سەر چاوەکانم.

نەیدەزانی چیی دیکە بڵێ و چ بکا. عومەریش لە بەرانبەر ئەو هەمووە سۆز و خۆشەویستییەدا پێی بە عەرزەوە وشك ببوو و نەیدەزانی چ بڵێ. لە حاندی مرێمۆك سەری هەڵنەدەهات. لەو کاتەوە خۆی ناسیبوو کەس ئاوای بۆ نەکردبوو. کەس ئاوا بە خۆشەویستییەکی پڕ لە جۆش و خرۆشەوە بەپیرییەوە نەچووبوو و نەیلاواندبۆوە. کەس ئاوا بە خۆشەویستییەوە ماچی نەکردبوو. ئەویش حەزی لێ بوو مرێمۆك ماچ بکا و دەستی لە ئەستۆی بکا، بەڵام نە دەیتوانی سەیری بکا و نە دابێتەوە و دەستەکانی ماچ بکا. نەیدەزانی چ هەستێکە لە ناخیدا بووژاوەتەوە. دەتگوت پەنجەیەك گەرووی ڕێك دەگوشێ. تەنانەت نەیدەتوانی بشگریێ.

مرێمۆك لێی تێنەگەیبوو کە ئاوایە. لە خۆشیان شاگەشکە ببوو. دەستی گرت و بردییە نێو ئاوایی. چوونە ژوورێ و بەڕە و دۆشەگ و بالیفێکی بۆ هێنا و بۆی ڕاخست و گوتی:

- دانیشە کوڕی خۆم، دانیشە گیانی من، ئازیزی من، عومەری من. تاقانە کوڕەکەی ئایشێ گیان. دانیشە جوامێرەکەم، لە ڕێگەی دوورەوە هاتووی.

لەسەر دۆشەگەکەی دانا. خۆی رای کرد و مەسینە و تەشت و سابوون و خاولیی هێنا و گوتی:
ـ پێڵاوەکانت داکەنە. لە رێی دوورەوە هاتووی. دایانکەنە با لاقت بشۆم.
عومەر بەبێ ئەوەی لە جێی خۆی هەستێ، پێڵاوی داکەندن و لاقی لە تەشتەکە نا. مریەمۆك پاك و خاوێن بۆی شوشت و دەستێکی سابوون بۆ لێدا و بۆی وشك کردەوە. دوای ئەوە ئاوی بە دەستیدا کرد و عومەریش جوان و زەریف دەست و دەموچاوی خۆی شوشت.
عومەر بە خۆی گوت:"ئەو ئەنە مریەمۆکە هەمیشە ئاوا خوێنگەرم و دەست و دلاوا و بە سۆزە. ئەو لەگەڵ هەموو کەس ئاوایە. بەڵام ئەمنیش لە خەڵکی دی خۆشتر دەوێ... زۆری جامینی دایکم دەویست و خۆشی دەویست. وەك کچی خۆی...
مریەمۆك گوتی:
ـ ئەتۆ تۆزێك لێرە راکشێ، با بحەسێیەوە. دیارە برسیشتە، با ئەمن بچم ئاگرێك بکەمەوە.
دار و چرپیی لە ئاگردانەکە کرد و ئاگرەکەی کردەوە. کە ئاگرەکە جوان گرتی، چوو و گەنمەشامییە هۆنراوەکەی هەڵگرت و چووە لای کەڵەبابەکە. مریەمۆك دەنکە گەنمەشامییەکانی بۆ هاویشت و کەڵبابەکە دەسبەجێ هەڵیگرتنەوە.
مریەمۆك گوتی:
ـ هەی کەرە، چ زوو لە بیرت چۆوە، چما جاری پێشووش هەر ئاوا نەمگرتی؟
کەڵەبابەکە وەپەلەقاژە کەوت. تەپوتۆزی هەستاند. ئاخرییەکەی مریەمۆك گرتی و گوتی:
ـ عومەر گیان سەری ئەوە بڕە لە سەرت گەڕێم با بۆتی لێ بنێم. لە دوورەوە هاتووی و برسیتە. لەڕ و لاواز بووی.
عومەر هەستا و کەڵەبابەکەی لێ ئەستاند. خەنجەرە چەرکەزییەکەی لە قەدی دەرکێشا. پێی راستەی لە سەر لاقەکانی و پێی چەپەی لە سەر باڵەکانی کەڵەبابەکە دانا. خەنجەرە تیژەکە لە چاوترووکانێکدا سەری کەڵەشێرەی پەڕاند. کەڵەبابی سەر بڕاو لە سەر عەرزەکە برێك هەڵەبەز و دابەزی کرد، تەنانەت رۆیشتیش... ئیتر کەوت.
کەڵەبابەکەی هەڵگرت. ئەوەندەی یەك و دوو دایماڵی و خوێی پێوە کرد. دەیگوت:
ـ کەس ناتوانێ رسقی کەس بخوا. ئەمڕۆ بەیانی لە لێرەکە قەرتاڵەیەك کارگی گەورەم هێناوە. خوا داینازە بۆ تۆ.
پووشکەکان وەك خەرمانێکی گڕیان لێ هاتبوو. مریەمۆك ئاگرەکەی پان کردەوە. خوێی لە کارگەکانیشەوە کرد. کەڵەبابەکەی لە لایەك و کارگەکانی لە لایەکەی دیکەوە دانا. چزە چزی گۆشتە چەورەکە هەستا.

عومەر بۆ یەکەم جار سەری هەڵێنا و سەیری مریەمۆکی کرد. تیشکی ئاوری نێو کوانووەکە تێکەڵی رووناکایی تاوەکەی زەردەپەڕ ببوو و شێوەیەکی دیکەی بە روخساری دابوو. مریەمۆك ئاگای لێ نەبوو کە عومەر لێی ورد بۆتەوە. ملی مریەمۆك باریك و پڕ لە چرچ ولۆچ بوو. پرت پێدا کردبا هەڵدەکەنرا. عومەر بۆ یەکەمجار بە مێشکیدا هات کە شەوێ دەبێ گەرووی بگرێ و بیخنکێنێ.

ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"نەنە مریەمۆك منی زۆر خۆش دەوێ. دایکیشمی زۆر خۆش دەویست." و چەند جاران ئەوەی دووپاتە کردەوە.

دووکەڵی سووتانی چەوریی کەڵەبابەکە لە ئاگرەکە هەڵدەستا و بۆنێکی خۆشی دەهات. عومەر برسیتر بوو.

**گوندی دڵیان خۆش بوو. یەکەم گوڵی[*] کێڵگەك بڕنەوە. ئەو مەزرایەش لەو کێڵگە باشانە بوو، کە هەمووان توانیبوویان بە کەیفی دڵیان لۆکە بڕنەوە و هەر لە ئێستاوە توانیبوویان بەشی قەرزەکانی عادیل پارە کۆ بکەنەوە.**

## ٤٠

هەر بە گشتی، قۆزاخە، چوار یان پێنج کەلووە[**]. قۆزاخەش هەن کە شەش یان حەوت بەشن. سێ کەلووشیان هەن. ئەوەی دەگمەنە، قۆزاخەی دوو کەلوویە. ئەو قۆزاخە دوو بەشییە پێی دەڵێن "کەر". هەر کرێکارێك "کەر"ێك بدۆزێتەوە، لۆکەکەی لێ دەرناکێشێ، بەڵکو قۆزاخەکەی رادەگرێ، دواتر بە دامودەستوور و تەدارەکێکەوە ئەو "کەر"ە دەدەن بە خاوەن کێڵگەکە. خاوەنی کێڵگەکە یان چەند دیارییەك بەو گوندییە دەدات کە "کەر"ەکەی دۆزیوەتەوە، یان خوانێك بۆ هەموو گوندییەکان دەڕازێنێتەوە. دیارە دەست و دڵاوایییەکەی خاوەنی کێڵگەکە دیاریی دەکا دیارییەکەی چ بێ.

"زەڵەجە" سێ رۆژ دوای ئەوەی چووبوونە مەزراکەوە، کەرێکی دۆزیبۆوە و بێدەنگەی لێ کردبوو. کەرەکەی لە گوێی لەچکەکەی پێچابوو و چاوەڕێ مابوو خاوەن کێڵگەکە بێ. دیارە هەموو گوندییش دەیانزانی زەڵەجە کەرێکی دۆزیوەتەوە و لە گوێی لەچکەکەیدا رایگرتووە.

شەوی پێشوو، مەزراکە تەواو ببوو. بەیانیی ئەو رۆژە دیسان زوو بەخەبەر هاتن. جلوبەرگە چڵکنەکانیان داکەند و هەر کەس جلوبەرگێکی تازەی ئەگەر هەبوو، لەبەری کرد. ژنەکان چیی خشڵ و بەرمووری هەیانبوو بە خۆیاندا کرد.

---

[*] یەکەم گوڵ: ئەوە دەستەواژەیەکی کشتوکاڵییە. باغ و بێستان و هەر شتێکی دووجاران بەر بگرێ یان بەرەکەی وردە وردە پێ بگا، بە نۆبەرەکەی دەڵێن "یەکەم گوڵ".

[**] کەلوو: ئەو توێکڵە ناسکەی دانەوێڵەی تێدایە.

کچ و کوڕە گەنجەکان، بە دڵێکی خۆشەوە، بە ماندوویێتیی دوای کارەوە، لە خۆباییانە بە نێو کۆگا لۆکەکاندا پیاسەیان دەکرد و باسی ئەوەیان دەکرد ئاخۆ کێ لۆکەی پتر لە هەمووان رنیوەتەوە و پارەی دەرهێناوە. کۆگای "عەلی"یە درێژ لە کۆگای هەمووان گەورەتر بوو. سەریان لە تەردەستییەکەی عەلی سوور مابوو. چوکووراوا هەتا ئێستا گورجوگۆڵی و تەردەستیی ئاوای بەخۆوە نەدیتبوو. تاوێکی دیکە تەرازوویان دێنا و دەیانکێشا و قەپاندارەکان بڕوایان نەدەکرد یەکێك بە تەنیایی ئەوەندەی لۆکە رنیبێتەوە.

خۆ ئەگەر لە خۆشیی تەواوکردنی بەری مەزراکە نەبوایە، ئەو کرێکارانەی پشتیان لە بەر ئازار دەتگوت شکاوە، سێ شەو و رۆژان لە گۆشەیەك دەکەوتن و لە جێی خۆیان نەدەبزووتن. سەری پەنجەی هەمووان راسابوو و بەحاڵ دەستیان بۆ شتێك دەبرد، جەرگ و دڵیان پێوەی دێشا و دەهات لە خۆ بچن. ئەو شوێنانەی جەستەیان کە تەپۆ پێوەی دابوون و هەڵیانکڕاندبوون، برینەکانیان هەر دەهات و گەورەتر بوونەوە و توێژی هەڵدابوو. گیانیان وا دێشا و دەبرژایەوە دەتگوت بە ئاگر سووتاوە.

بەڵام لۆکە رنینەوەیان تەواو کردبوو و ئیتر گوێیان نەدەدایێ. تەنانەت هەستیان بە برژانەوە و کزانەوەشی نەدەکرد.

لە پێشدا ترۆمبێلێکی مێرسدێسی تۆزاویی گەیشتێ و رایگرت. ئاخرین مۆدێل بوو و تازە مانگێك بوو لە ئەڵمانیاوە هێنابوویان. لە پێشدا پیاوێکی ورگ زل و کورتەباڵا و ئەسمەری لێ دابەزی کە بن چاوەکانی هەڵمسابوو و رەش داگەڕابوو. قات و پانتۆڵێکی سپیی کەتانیی لە بەردا بوو، کڵاوێکی حەسیریی بە دەستەوە و بەندی کاتژمێرە زێڕینەکەی کەوتبووە سەر سینگی. بە دوای ئەودا گەنجێکی چاو رەش دابەزی. گەنجەکە لە بەرانبەر کابرا ورگنەکەدا دەستەونەزەر راوەستابوو و چاوەڕێ بوو ئەمرێکی پێ بکات و ئەمیش دەمودەست رایپەڕێنێ.

کوێخا سەفەر چوو و لە بەر دەم خاوەنی مەزراکە کڕنۆشی برد و خۆی ناساند. کابرا هەر کوێخا سەفەری ناسی، قاقایەکی کێشا. سەفەریش دەستەکانی لە پێش خۆیەوە گرتبوو و بە رێزەوە راوەستابوو و بە شەرمەوە و دەستەوستان دەیویست وەڵامی پێکەنینەکەی بداتەوە.

- ئەرێ بیستوومە کەس ناتدوێنێ، وایە؟ کوڕە خۆ ئەگەر وابێ پیاو فججە دەکا و دەمرێ. باشە ئێستا کە ئەمن قسەم لەگەڵ کردی کافر بووم؟ بەڵام بەسەر دێ؟ بیستوومە ژن و منداڵ و خزم و کەسەکەشت ناتدوێنن. وایە؟

- نامدوێنن. ئەوە ساڵێکە کەس لەبزی دە لەبزم نەگەڕاوە.

ـ دەڵێن وەلییەکەشتان هاتۆتەوە. هەر ئەوەی قسەکردن لەگەڵ تۆی حەرام کردبوو. کەس نییە لەو چوکووراوایەدا ئەو نەقڵەی وەلییەکەتان نەزانێ.

دەست بە زگییەوە گرتبوو و چاوەکانی دەبریسکانەوە و قاقا پێدەکەنی. گوندییەکان دەوریان دابوون و لە دوورەوە بەبێ ئەوەی خۆیان تێك بدەن و بجوولێن، سەیریان دەکردن و بڕێك خۆشحاڵ بوون.

سەفەر گوتی:

ـ موتەلیب بەگ، خاوەنی هەموو ئەو کێڵگانە و هەموو چوکووراوا و هەروەها ئاغای گەورە... و هەروەها ئەی ئەو نیعمەت و بەرەکەتەی خودا بە ئێمەی داوی.

موتەلیب بەگ گوتی:

ـ هۆی هۆی گوندیی، ئەوە بۆ قسە لەگەڵ ئەو داماوە ناکەن ها؟ وەلییەکە حەرامی کردووە؟ کوڕە هۆی دێهاتییەکان، چما لەم دەوروزەمانەشدا وەلیی پەیدا دەبن؟ هۆی دێهاتییەکان، چما ئەو جێت و فڕۆکانە نابینن کە لە ئینجیرلیکەوە هەڵدەستن و بە سەر سەرتاندا دەفڕن؟ هۆی دێهاتییەکان، بنیادەم گەیشتووەتە گەردوون و مەریخ، چما وەلیی پەیدا بێ؟ کوڕە هۆی گوندیی...

دوای ئەوەی بە تێر و تەسەلی باسی شارستانییەتی بۆ گوندییەکان کرد گوتی:

ـ بیستوومە وەلییەکەتان لە چیای چل پیاوچاکەکە هاتووەتە خوارێ لۆکەتان لەگەڵ بڕنێتەوە. کێهەتانن؟ هۆی دێهاتی، بانگی بکەن با ئەو وەلییەتان بێ و بچمە خزمەتی.

سەفەر بە دەشتەوانەکەی گوت:

ـ بچۆ ئەو وەلییە بێنە. پێی بڵێ قانوون بانگی کردووە. موتەلیب بەگ هاتووە. سەرۆکی حیزب.

لەو کاتەدا زەڵەجە، کرووشمەی کردبوو و خۆی وێك هێنابوو. لە موتەلیب بەگ نزیك بۆوە و بە پەنجە لەرزۆکەکانی گرێیەکەی گۆیی لەچکەکەی کردەوە و قۆزاخەکەی بۆ موتەلیب بەگ راداشت.

موتەلیب بەگ گوتی:

ـ هەی رووت سپی بێ خاتوون. سوپاس. خودا راوەستاوت بکا.

کەرەکەی لە دەستی زەڵەجە وەرگرت.

زەڵەجە دەستی برد و دەستی موتەلیب بەگی گرت و گوتی:

ـ خەونم پێوە دیتی. نوورت لێ دەباری. چوار هەلۆی سەوز، باڵەکانیان لە نووری سەوز... لە دەوری سەرت دەگەڕان. یەکیان دەهات و باڵێکی لە سەرت دەخشاند و دەڕۆیی. ئەویتر دەهات، بلێسەی کەسکی بە چوار دەورتدا دەپژاند و دەڕۆیی. بەو جۆرە گەیشتیتە شارێکی گەورە. ئەو هەلۆیەی لە هەمووان گەورەتر بوو هات و لە سەر سەرت نیشتەوە و باڵەکانی کە بلێسە و پزیسکی کەسکیان لی هەڵدەستا، لێك دا. ئای چ قەرەباڵغییەك بوو، لە دەوروبەرت چ قەرەباڵغییەك... خۆت بووی... خەڵکەکە زۆر دڵیان خۆش بوو و چەپڵەیان لێ دەدا. لە باڵەکانی هەلۆکەوە بلێسەی کەسك بە سەر خەڵکەکەدا دەباری.

موتەلیب بەگ، بە بزەیەکی نادڵنیا و گاڵتەجاڕانەوە، قیت ڕاوەستابوو و وای دەنواند هەم کەیفی بەو خەونە هاتووە و هەم بڕواشی پێی نییە.

دوای ئەوەی گوێی لە هەموو قسەکانی زەڵەجە ڕاگرت، گوتی:

ـ خەوت بەخێر بگەڕێ.

زەڵەجەش وەڵامی دایەوە.

ـ هاتییە خەونم و گوتم خێر دەبێ ئیشەڵا.

موتەلیب بەگ بەسپایی و وردە وردە جزدانی دراوەکەی دەرهێنا. کردییەوە. بە دوو قامك دراوێکی پەنجا لیرەیی دەرکێشا و دای بە زەڵەجە. جا ڕووی لە گەنجە چاو ڕەشەکە کرد و گوتی:

ـ خێرا بچۆ شاری و حەوت سندووقترێی تازە بکڕە و بۆ ئەو گوندییانەمانی بێنە و بە سەریانیدا دابەش بکە.

گۆملکسیز ئۆغلو کە دارەوە پەنجا لیرەییەکەی بە دەست زەڵەجەوە دی گوتی:

ـ بەگ، ئەوکارەت هیچ باش نەبوو.

ـ کام کار؟

ـ ئەو پەنجا لیرەیەت بە زەڵەجە دا. ئیتر لەمەودوا بیست و چوار سەعاتە هەر خەون دەبینێ. تا ئێستا بەس بە شەوانە خەونی دەدی، ئیتر لەمەودوا بە ڕۆژیش دەیبینێ.

هەمووان وێکڕا پێکەنین.

لەو جەنگەیەدا، دەشتەوانەکە تاشباشی دابووەوە پێش خۆی و دەیهێنا. تاشباش وەك کەسێکی لە بەر ژانە زگ خۆی وێك بێنێ، نوشتابۆوە و ڕوخساری گرژ ببوو. هەر هێندەی منداڵێکی لێ هاتبۆوە و چاوەکانی بە قووڵدا چووبوون و وەك تاوانباران سەری بەردایەوە و لە بەرانبەر موتەلیب بەگ ڕاوەستا.

موتەلیب بەگ بە پێکەنینەوە لە تاشباش چووە پێشێ و گوتی:
- هۆی، سەرۆکی ئەولیا، ئەوە بۆ وای؟ نەخۆشی؟
- تاشباش ئۆغلو سەری هەڵنەهێنا و وەڵامی نەدایەوە.
- کوڕە هۆی پادشای وەلییەکان، هاوڕێی چل سوارەی غەیبی... دەڵێن قسەکردنت لەگەڵ سەفەر بەگدا لە خەڵك حەرام کردووە؟... باشە بۆ؟
تاشباش دیسان سەری هەڵنەهێنا.
- هۆی سەرۆکی وەلییەکان، ناو و ناوبانگت لە چوکووراواش بەولاترەوە رۆیوە و گەیوەتە ئەوسەری تورکیا. دەڵێن هەموو شەوێ دارێکی گەورەی نوور دەهاتە سەر ماڵەکەت و رادەوەستا و دەوروبەری رووناك دەکردەوە.... وایە؟
تاشباش ئۆغلو پتر کرووشمەی دەکرد و رەنگی دێنا و دەبرد. لاقی راستەی دەلەرزی.
- هۆی ی ی سەرۆکی وەلییەکان، ئەوە زمانت لە زاریدا نییە؟ چما زمانت پشیلە بردوویەتی؟
سەیری کرد تاشباش ئۆغلو قسە ناکا. بە تووڕەییەوە قاقایەکی کێشا و گوتی:
- ئەو ئەولیا و وەلییانە و ئەو هاوڕێی چل سوارەی غەیبیانە، قسە لەگەڵ ئێمەومانانی "فانی" ناکەن.
ئیتر پشتی تێ کرد.
لەو کاتەدا کامیۆن و تراکتۆرەکان، بە ترێلە پلاستیکییەکانی پشتیانەوە گەیشتنێ. کامیۆن و تراکتۆری شین و کەسك و سوور و نارنجی و زەرد. تەپوتۆز داپۆشیبوون و رەنگە بریقەدارەکانیان لە بن تەپوتۆزەکەدا دیار نەبوو و مەیلەو خۆڵەمێشیی ببوون.
سێ دەزگای قەپانیان لە کامیۆنێك دابەزاند و لە سێ جێگەی جیاوازیان دانان. سێ قەپانداری گەنج دەستیان کرد بە کێشان و سەنگوسووك کردنی لۆکەکە. لۆکە کێشراوەکەیان دەمودەست لە تەلیسی گەورە گەورە دەکرد و دەیانخستنە سەر کامیۆنەکان یان ترێلییە پلاستیکییەکانی تراکتۆرەکان.
موتەلیب بەگ لەگەڵ کوێخا سەفەر چوبووە دەم کانییە فێنکەکەی بن دارە چنارەکە. موتەلیب بەگ دەیویست بزانێ ئەو مەسەلەی "وەلی"سیایەتییە چییە؟ دەیویست بزانێ ئەو کابرایە چۆن بووەتە وەلی و چ کەراماتێکی نواندووە و چۆن ئاوای بەسەر هاتووە؟ ئەوە چۆنە ئەوەندە قسەی رۆیوە کە توانیبووی هەموو گوندییەکان ناچار بکا کەسێك

ئەویش کوێخای گوندەکەیان ئەدوێنن؟ بە تایبەتی حەزی لێ بوو بزانێ ئەو وەلییە لایەنگری کامە حیزبە؟ وردە وردە ئەو وەلییە دەیتوانی کاریگەریی لە سەر هەموو چوکووراواش دابنێ. ئەو چڵمنە، ئەو بەدبەختە دەستەوستانە لارەمل و نیوەگیانە، چۆن ببووە وەلی؟ دەبێ بزانێ و بە ناوەندی حیزبەکەی رابگەیێنێ. نەکا ئەو وەلییە لایەنگری حیزبە بەرهەڵستکارەکەی بێ؟...

لە دەم کانییەکە ئەو پرسیی و کوێخا سەفەر وەڵامی دایەوە. سەفەر لە قسەکانی موتەلیب بەگەوە تێگەیبوو کە سەر بە کامە حیزبە و بۆ تاشباشی تێچاندبوو کە سەر بە حیزبە دژبەرەکەیە...

دەمە دەمی ئێواریێ کە گەڕانەوە مەزراکە، سەنگ و سووککردنی لۆکەکە تەواو ببوو و ژمێریارێك بە دەموچاو و بۆینباخێکی سوورەوە ناوی یەك بە یەك کرێکارەکانی دێنا و پارەکەی دەدانێ.

کە موتەلیب بەگ هاتەوە ژمێریارەکە گوتی:

ـ ئەو درێژە لە هەمووانی پتر رنیوەتەوە. تا ئێستا کەس شتی وای نەدیوە. بڕوام نەکرد و لە هەمووانم پرسی. دەرکەوت هەر هەمووی کاری خۆیەتی. شەوانەش نەچۆتە دزیێ. جارێکیان ویستوویەتی بچێ، هەر ئەو رۆژە گوندی بەرۆکیان گرتووە و پشتیان لە زگی نەرمتر کردووە. ئەو وەلییەش لە هەمووان پتری کار کردووە. تەنانەت منداڵەکانیش لەویان پتر کۆ کردووەتەوە.

موتەلیب بەگ گوت:

ـ کوڕە هۆی درێژ، وەرە پێشێ بزانم.

جا دەستی بۆ جزدانەکەی برد. دیسانیش دراوێکی پەنجا لیرەیی بە سەری پەنجەکانی گرت و دەریکێشا و بۆی راداشت. عەلی لە بەردەمیا دەستەونەزەر راوەستابوو. بەبێ ئەوەی خۆی خوار بکاتەوە، دەستی راستەی برد و دراوەکەی لێ وەرگرت و سەربازانە سڵاوی کرد و گوتی:

ـ هەر بژییت فەرماندە. خوا هەزار هێندەی بەرەکەت تێ بخا. بەرەکەتی برایمی خەلیل. لۆکە لە کێڵگەکانتا شەپۆل بدا.

سڵاوێکی سەربازانەی دیکەی بەجێ هێنا. بە هەنگاوی رێك لە هەنتەشی دوور کەوتەوە.

ـ ئەی کوا وەلییەکە؟

تاشباشیان کە تۆزێك لەولاوەتر لە قوولکاییەکدا دانیشتبوو، پێشان دا.

ـ هەستە وەرە ئێرە وەلی.

تاشباش ئۆغڵو بە ناقایلی هەستا. بە ترسەوە و هەر وا کە لاقەکانی تێك دەئاڵان، هات و لە بەردەم موتەلیب بەگدا راوەستا. موتەلیب بەگ دیسان دراوێکی بە سەری پەنجەی دەرکێشا و گوتی:

ـ هۆی وەلیی وەلییەکان، ئەتۆ لۆکەت هیچ نەڕنیوەتەوە، تەنانەت هێندەی منداڵێکیش، ئەوە بۆ؟ نەکا وەلییەکان لۆکە نەڕننەوە؟ باشە نەدەکرا کەراماتێك بنوێنی و سیحرێك بکەی و لە چاوترووکانێکدا هەموو لۆکەی مەزراکە خڕ بکەیتەوە؟

پێکەنی. گوندییەکانیش لەگەڵی پێکەنین.

ـ وەلی دەبێ لە سەعاتێکدا چیی لۆکەی مەزراکەیە، هەمووی خڕ بکاتەوە. خۆ بە درۆ و خەڵك خەڵەتاندن نابێ.

دیسان پێکەنییەوە. گوندییەکانیش لەگەڵیدا پێکەنینەوە. تاشباش ئۆغڵو دەموچاوەکەی چرچتر بۆوە و رەش داگەڕا. سەری دیسان بەردایەوە. بە دەستی راستەی، دەستی چەپەی دەگوشی.

ـ دەی کاکی وەلی، ئێستا کە تۆ وەلییەکی گەورەی، دەبوو پیاوە نەبەدی(نادیار)ە جامانە سەوزەکانت بانگ بکەی و لە چاوترووکانێکدا هەموو مەزراکە کۆ بکەنەوە. خۆ بنیادەم بە درۆ و دەلەسە نابێتە وەلی.

ئەوجار لە قووڵایی دڵەوە پێکەنی. گوندییش سەد هێندە پتر لە قووڵایی دڵەوە پێکەنین.

ئەو پەنجا لیرەیەی ماوەیەك بوو هەر وا بە دەستییەوە بوو و بە سەری پەنجەی گرتبووی، بۆ تاشباش راداشت. تاشباش ئۆغڵو دراوەکەی دی. دەستی بۆ نەبرد. پشتی تێ کرد و بەدووی خۆیدا لاقەکانی راکێش کردن و دوور کەوتەوە.

موتەلیب بەگ راچڵەکی. تەریق بۆوە. بەخۆیدا شکایەوە. نەیدەزانی چ بکا. کە چاوی بە مام خەلیل کەوت، بۆ ئەوەی خۆی لەو وەزعە بێنێتە دەرێ، بانگی ئەوی کرد و گوتی:

ـ ئەتۆ، هۆی پیرە، ناوت چییە؟

ـ مام خەلیلم پێ دەڵێن.

ـ دەی ها، حەڵاڵت بێ.

مام خەلیل لە حەوا قۆزتییەوە. لە خۆشییان شاگەشکە ببوو. گوتی:

ـ خوا راوەستاوت بکا. بێ وەی بی.

ئینجا بە شەلەشەل بەرەو لای "عەلی"یە درێژ غاری دا. لەو رۆژەوە ئەو بەڵایەی بە سەر هاتبوو، دەشەلی. پەنجا لیرەییەکەی دایە عەلی و گوتی:

ـ هانێ ئەوەش. خۆت بگەیەنەوە مرێمۆك. مرێمۆك نەمردووە. ئەو پارەیەت بەسە... بەڵام لە بیرت نەچێ بەڵێنت بەمن داوە نەچی بە مرێمۆك بڵێی ئەمن بەبیستنی هەواڵی مردنی ئەو گریاوم. ئەوەشی پێ مەڵێ کە لەبەر ئەو دزیم کردووە یان ئەو پەنجا لیرەیەم داوەتێی. بەڵێن بدە.

موتەلیب بەگ کە چەند سات دواتر هاتبۆوە سەر خۆ، پێکەنی و گوتی:

ـ فێڵبازەکانیش بوونەتە وەلی. وەلییە فێڵبازەکان... نووری لە سەر ماڵی باریوە... ئەو نوورە سەرت بخوا ئەرێوەڵڵا چڵمن، کوڕە تەماشا ئەو پیاوە گڕوێیە.

کۆمەڵێك لە گوندییەکان دووپاتەیان کردەوە:

ـ کوڕە تەماشای ئەو پیاوە گڕوێیە...

دەنگی قاقایان بەرز بۆوە.

ـ وەلییە گڕەکە. سەگی گڕوێی وەلی...

موتەلیب بە پێکەنینەوە سەیری رۆیشتنەکەی تاشباشی دەکرد و لە قووڵایی دڵییەوە گاڵتەی پێ دەکرد.

تاشباش بە دەم رێگەوە سەری لە گێژەوە دەهات. چیی نەمابوو وەعەرزی بکەوێ. بەڵام دەیویست لە بەر چاوی ئەو هەمووە خەڵکە، ئەو هەمووە خەڵکە هیچ و پووچە نەکەوێ. هەر زایەڵەیەکی پێکەنین و دەنگی هەر قسەیەکی لە دواوەی دەهات، دەتگوت کوتکێکە و لە تەپڵی سەری ئەوی رادەکێشن. بەڵام دانی بە جەرگیدا دەگرت و خۆی رادەگرت و نەدەکەوت. خۆی راگرت تا گەیشتەوە بەردەم کەپرەکەی. لەوێ ئیتر تینی تێدا نەما و لە سەر عەرزەکە تخێڵ بوو.

گەرماکەی زۆر بەتین بوو. ئاسمان ئاگربارانی بوو.

کچ و کوڕ تێکڕا، گەنج و پیر رووت ببوونەوە و خۆیان بە جەیحانێدا دابوو. گیانە برینـدار و قەتماغەبەستوو و تاوبردووەکانیان، دەست و پێی رەقەڵەکانیان و زگە پڕ لە چرچ ولۆچەکانیان و سینگە شل و شۆڕەکانیان کە دەگەیشتەوە سەر نێوکیان و جەستە پڕ و سپی بەڵام پڕ لە برینەکانی کچە گەنج و جوانەکان و جەستە تاوەسووت و پتەوەکانی کوڕە لاوەکان... بریندار...

بەرەبەری ئێوارە بوو، بایەوانی سپیی هەورەکان لە سەر دەریای سپییەوە هەستا. بای رۆژئاوا هەڵی کرد. گەردەلوولی هەستان و سووڕاندی.

ناشقە کەچەڵە سازەکەی دەست دایێ و هەوایەکی گشتی لێدا. گەنجەکان دەستیان دایە دەستی یەکتری و کردیانە هەڵپەڕکێ. تاوێك دواتر کامیۆنێکی پڕ لە ترێ هات. موتەلیب بەگ لە کاتی وەرگرتنی لۆکەکەیدا هیچی لە هەقدەستەکانیان نەشکاندبوو. وەك جاری جاران کیلۆی

پێنج قرۆشی بۆ حیساب کردبوون. ئەوەش دڵخۆشتری کردن. لە پەرێزەکەی تەنیشتیاندا ئاگرێکیان کردەوە بۆ ئەوەی لە دەوری هەڵپەڕن.

لە گوندەکەدا هەر دوو کەس کۆلکە خوێنەوارییەکیان هەبوو. یەکێکیان "عەلی"یە درێژ بوو و ئەویتر مەمی دیك. عەلی لە سەربازی فێری ببوو. هەر نامەیەکی بۆ ئاوابییەکە دەهات، ئەو دەیخوێندەوە و هەموو ئەو نامانەی لەوێشەوە بەرێ دەکران، هەر ئەو دەینووسینەوە. بەڵام مەمی دیك گەلێك هەوڵی دابوو و زۆریی لەخۆی کردبوو و تەنیا توانیبووی سێ پیتی A B C فێر ببوو. ئەو پیتانەشی پەیتا پەیتا لەسەرخۆڵ و خاکی ئەو کامیۆنانە دەنووسییەوە کە چاوەڕێ بوون لۆکەیان لێ بار بکرێ و پیتە سوور و شین و کەسك و زەردەکان لە سەر کامیۆنە تۆزاوییەکان دەدرەوشانەوە.

گەرماکەی زۆر بەتین بوو، ئاسمان ئاگربارانی بوو.

تاشباش ئۆغلو کە لە کەپرەکەیدا هەڵدەلەرزی، لە بەر هەڵلەرزینەکەی ددانی یەکیان نەدەگرت. مەمی دیکیش ئارەقەی دەکرد و گیانی لە ئارەقەدا خووسابوو.

مەمی دیك یەك پارچە تووڕەییە. وەك تـەلێکی پـۆلایینی لەبەریـەك کێشراو دەلەرێتەوە. هەمووان تێی گەیون کە بێ ئۆقرەیە. مەمی دیك بە نێو کێلگەکاندا دەسووڕێتەوە.

## ٤١

مەمی دیك کێردەکەی، کە هێندەی گەڵا بییەك تەنك بوو، گورج لە کێلان دەرکێشا. سێ جاران لە حەوادا سووڕاندی و سێ جەغزی گەورەی رووناکی، شین وەك پۆڵای کێشا. جەغزەکان درەوشانەوە و کوژانەوە و دیسان درەوشانەوە و کوژانەوە.

بە سەدان مێشی لە رەنگی پۆڵای کەسك، رووناکاییەکەیان وەك داوی جاڵجاڵۆکە تەنی. باڵی مێشەکەرانە و مێشەنگوینە زێڕینەکان لە سەر توێکڵە شووتییەکە دەبریسکانەوە. فڕۆکەکان بەرەو دەریای سپیی دەڕۆیشتن و لە دوای خۆیانەوە هێندێ نیشانەی وەك زیوی تواوەیان بەجێ دەهێشت. ئەو نیشانانەش هەتا ئێوارێ هێڵ هێڵ بە ئاسماندا دەکێشران و تێك دەچڕژان.

قوڕ و لیتەی پاش بارانەکە وشك ببۆوە و شەقار شەقار ببوون دەتگوت داوی جاڵجاڵۆکەن. مەمی دیك کە پێی لە سەر عەرزەکە دادەنا، هەڵدەبەزییەوە. دەسرۆکەکەی نێوچاوانی بەستبوو، تیشکی تاوەکە سێبەرەکەی ئەوی وەك بازنەیەکی رەش خستبووە بەر پێی. هەر هەنگاوێکی هەڵیدەگرت و دایدەنایەوە، توێژە گڵە رەقبووەکەی بن پێی دەشکاند و قرچەی لێ هەڵدەستا. چاوی لە بەر تیشك و بریقانەوەی دەشتەکە هەڵنەدەهات. تاوە بەتینەکە و قەسەڵ و کای وەك هەزاران وردە شووشە، تیشکی هەتاوەکەیان دەبریسکاندەوە....

بە پەلە هەنگاوی دەنا. شەلاڵی ئارەقە بوو. ئەو تۆز و خۆڵەی لە سەروچاوی دەنیشت، دەمودەست دەبووە قوڕ. لێوەکانی لە تینوێتیان شەقار شەقار ببوون کەچی بە مێشکیدا نەدەهات لە جێیەك راوەستێ و ئاوێك بخواتەوە.

تاقە هەڵۆیەکی کە بە ئاسمانەوە بوو، لە نێو گەرماکەدا رەشتر دەچۆوە و لە بن ئاسمانی وەك زیوی تواوەدا، دەتگوت شێت بووە و بە خێرایی بەولا و لادا دەرۆیشت. باڵەکانی پتر لە بەر یەك کێشابۆوە و بەرزتر هەڵکشابوو. لە پڕێك هەر بەو خێراییەوە، بە سوورە سوورِ بەسەرو سەرتر چوو، لە ئاسمانەکەدا دوور کەوتەوە هەتا وەك خاڵێك بینرا و ئیتر خۆی کۆ کردەوە و وەك تۆپەڵەیەکی لێ هات و بە خێراییەکی سامناك بەرەو زەوی لوور بوو. مەمی دیك خشەخشێکی وەك لوورەی لە ئاسمانێدا بیست و سەری هەڵێنا و تۆپێکی رەشی دی کە بە خێراییەوە دێتە خوارێ. هەڵۆکە لەو ساتەدا کە هەر هێندەی سپیدارێکی مابوو بگاتە عەرزی، باڵەکانی لێك کردنەوە و بەرەو دۆملوقەڵا رۆیشت. مەمی دیك هەتا هەڵۆکە لەو دیو رەوەزەکانی ئاناوەرزاوە لە چاوان ون نەبوو، چاوی لێ نەترووکاند.

مەمی دیك سەر لێشێواو دەرۆیشت. گەیشتە قامیشەڵانەکە و دەستی کرد بە گەڕان. بەرەو زۆنگاوەکە چوو. زۆنگاوەکە هەستابوو. گەڕایەوە. لە قووڵایی کۆنە ئاوەڕۆکەی جەیحانەوە تەقەی تفەنگ هات. مەمی دیك لە ئاوەدرِە وشکەکە چووە خوارێ و لە نێو پنچکە وشترالوویەکدا خۆی مات دا. کابرای تفەنگچی بە بەردەمیدا تێپەڕی. باڵندەیەکی مل درێژی کوشتبوو و بە قەدییەوە بەستبوو. سەری باڵندەکە زۆر بە گوناحی دەجووڵایەوە. دەنگی تەقەیەکی دیکەش هات، دیسان چەکدارێکی دیکەش بە بەردەمیدا رابرد. باڵندە شینە مەیلەو سەوزەکانی کوشتبوو. پەڕوپۆیان دەبریسکانەوە. بە پەتێك لاقەکانیانی بەستبوو و سەریان شۆڕ ببۆوە.

جار بە جار دەنگی تەقەیەك دەهات.

چاوەکانی قیچ کردبوونەوە و دەموچاوی بچووکتر و رەشتر ببوو. تۆز وخۆڵی سەر گنجەکانی نێوچاوانی ببووە قورِ.

لە پنچکە وشترالووەکە هاتە دەرێ و بە غاردان خۆی گەیاندە دەم جەیحان. هەڵۆکە لەو دیو ئاناوەرزاوە گەڕابۆوە و بەسپایی و بەبێ ئەوەی باڵەکانی بجووڵێنێ، وردە وردە هەڵدەکشا. مەمی دیك لە دەم جەیحانەوە بەرەو لێرە چڕەکە رۆیشت. لاقێکی کەوتە نێو قوولکەیەکەوە و وەرگەڕا. تەنانەت هەستی بە ژانەکەشی نەکرد. تاوەکە گۆشتی گیانی وەك ئاسن سوور کردبۆوە.

پشووی سوار دەبوو. ماندوو شەکەت پاڵی بە دارێکەوە دا و دانیشت. شنەیەکی فێنك هات. چەند باڵندەیەك لە سەر دارەکە دەیانجیکاند.

کە چاوی هەڵێنا، رۆژ، ئاوا ببوو. هەستا. ساتێك دواتر چاوی بە مانگ کەوت. سێبەرەکان گەورەتر بوونەوە. قەڵافەتی هەڵۆکە لە ئاسمانەکەدا چەند هێندە گەورە ببۆوە. هاتە تەنیشت

جۆگەلەیەك و چووە نێو پنچکێك و دانیشت. هیچ جموجۆلێك نەبوو و هەموو وڵات بێدەنگ و کپ بوو. بەڵام رێك لەو کاتەدا لە دارستانە تووەکەوە دەنگی سیسرەکان هەستا. دەهات و دەبڕایەوە، دیسان هەڵدەستا و کپ دەبۆوە.

مەمی دیك نەیزانی دەنگی سیسرەکان کەی براوەتەوە. دەنگە دەنگی کزی جڕ و جانەوەری شەو دەبیسران. لە سەرووی گردۆلکەکەوە سێ کەس بە سێبەرە درێژەکانیانەوە دەهاتە خوارێ. سێ سەگی گەورەشیان بە شوێنەوە بوو. رادەوەستان و قسەیان دەکرد، دیسان وەڕێ دەکەوتنەوە و قسەیان دەکردەوە. کە ئەوان رادەوەستان، سەگەکانیش رادەوەستان و کە وەڕێ دەکەوتنەوە، چوارپێیەکانیش پێیان لە سەر سێبەرەکانی ئەوان دادەنا و دەهاتن. مەمی دیك ژماردنی، هەشت سەقر بە سەر سەریاندا تێپەڕین و لە مەودایەك دوورەوە لە دڵی تاریکاییەکەدا چرای فڕۆکەیەك هەڵدەبوو و دەکوژایەوە. ئەودار دەنگی ماتۆڕەکەی بیسرا. فڕۆکەکان بە ئاسمانەوە و لە بەر تریفەی مانگەکە، هێڵی سووریان کێشا و دوور کەوتنەوە و رۆیشتن.

رێوییەك گەورە، کلکە درێژ و سوورەکەی رادەوەشاند هات و بە بەردەمی مەمی دیکدا رابرد. ئەگەر مەمی دیك دەستی بۆ بردبا دەیتوانی بیگرێ. رێوییەکە دوو جاران بۆنی بە عەرزەکەوە کرد. دەتگوت هەستی پێ کردبوو، تێی تەقاند و رایکرد.

مەل و باڵندەکان بە قیژ و قاژ بە سەر سەریدا تێپەڕین. ساتێك دواتر داوە تیشکەکان وەك کولووی بەفر بەسەریدا بارین. هەورەکان ئاسمانیان دەبڕی. ساتێك هەموو دنیا رووناك بۆوە. تیشکی چرای کامیۆنێکی بەسەر کشا و تێپەڕی. لە داوێنی چیای حەمیدەوە، هەورێکی روون بەرەو زەوی دادەکشا.

ئەو سێ پیاوەی دەهاتن، بە سەیەکانیانەوە لە بنیاری گردەکە لە چاوان ون بوون. رێگە راست و سپییەکە چۆڵ بۆوە. مەمی دیك دڵی بەو تەنیایی و چاوەڕوانییە توند بوو. بە دەم رووبارەکەدا رووە و خوار داکشا. لە سەر لمەکە، پێی بە لمە فێنك و نەرمەکەدا رۆ چوو. ئەوەندەی یەك و دوو قوولکەیەکی هەڵقەند. بنی قوولکەکە پاوی لێ هەڵقوڵی و تێیدا کۆ بۆوە. وەك سەهۆڵ سارد بوو. خواردییەوە و فێنکاییەکی هاتەوە. گەرمای شەوەکە شێدار و پشووبڕ و خنکێنەر بوو. مانگەشەوێکە دەتگوت ژەنگاوییە.

مەمی دیك سێ جاران پێی راستەی بە عەرزیدا کێشا. تاشباش ئۆغلوی وەبیر هاتەوە و حەزرەتی ئەیوبیش کە هەموو گیانی بریندار و کرمەڕێز ببوو: "حەزرەتی ئەیوب کاتێ کرمەکان لە برینەکانی لەشی بەردەبوونەوە سەر عەرزەکە، هەڵیدەگرتنەوە و دیسان لە سەر برینەکەی

دادەناوە. نەکا خودا تاشباشیش وەك حەزرەتی ئەیوب تاقی بکاتەوە. دەیەوێ بزانێ ئاخۆ دەنگی لێوە دێ یان نا؟...

"تاشباشیش لە بەر خاتری خودا، دەنگێ ناکا. قەشمەریی پێ دەکەن و لێی دەدەن و پێی پێ دەکەنن و ئەو هیچ بە رووی خۆی ناهێنێ. ئەگەر تاشباشەکەی جاران بوایە و ئاوایان لێ کردبایە، هەموو ئەو گوندەی ئاگر دەدا و دەیکردە خەڵووز. ئەو کابرایە هەر تاشباشەکەی نێو کۆی نوورەکەیە. خۆی گۆڕیوە. جا بزانە ئەو گوندییانە چییان بەسەر دێ. ئێستا کەوتوونە دوای ئەو سەیە، ئەو سەیە، ئەو سەگە گلاوە..."

دەسکی کێردەکەی وا گوشی لەپی دەستی خوێنی تێگەڕا. لە قەراغ چەمەکە هاتە سەرێ و سەیرێکی هەر چوار دەوری خۆی کرد. گیانلەبەر دیار نەبوو. دیسان بەخێرایی چۆوە خوارێ. لاقەکانی ئێشان. لەوێش خۆی رانەگرت و چووە نێو لێڕەکەوە.

هەڵۆکە دیسان گەورەتر بۆوە و قەڵافەتە رەشەکەی لە بەر تریفەی مانگەکەدا دەخولایەوە. تیشکێکی سوور کەوتە سەر ئاوەکە. بڵێسەیەکی گەورە سەر ئاوەکەی ماڵی و تێپەڕی.

مەمی دیك بە خۆی گوت:

"دوای "عەلی"یە درێژ من لە هەمووان پتر لۆکە کۆ کردەوە. بەڵام چ فایدەیەکی هەیە بۆ من کە وەك مردووان بە دەوری خۆمدا دەخولێمەوە؟ مەمی دیك، ئەتۆ مردووی، مردووی، مردوو... هەتا ئەو پیاوە بە سەر پێوە بێ و پشوو بکێشێ و بۆ هەموو لایەك بچێ، ئەتۆ مردووی...

ئەی مەمی دیکی ترسنۆك کە لە سێبەری خۆشت دەسڵەمێیەوە و دەترسی و ئیزن دەدەی جنێو بە وەلییەکەت بدەن و لەو خۆشەویستەی خودا هەڵبدەن...."

گەردەلوولێکی رەش هات و بە تەنیشتیدا تێپەڕی. مانگەشەوەکە ساتێك تۆزاوی بوو. تۆزەکە لە سەر ئاوەکە دەروشایەوە. پووش بەقوونەکان بە سەر ئاوە مەندەکەدا و لە بن دارە بییەکان دەسووڕانەوە...

لەگ لەگێ ملی کێشا و بۆقێکی گرت و بە سێ قورتم قووتی دا. شتێك کەوتە ئاوەکەوە و شڵپەی هات. سیسرەکان سێرەیان هات و دەسبەجێ کپ بوونەوە.

بۆ ساتێك هەموو وڵات رەش بوو و بە تاریکاییدا رۆژوو و لوورەیەك لە دوورەوە هات. مەمی دیك بە سەر وردکە بەردەکاندات بە غار خۆی گەیاندە سەر تەپۆلکە پڕ لە پنگەکە. هەناسە بڕکێی بوو. بە دڵنیاییەوە ئەمشەو ئەو پیاوە هەر دەهات. دیارە دەهات. نەدەکرا نەیە. مانگ بەرەو رۆژئاوا داگەڕابوو کە ماندو و شەکەت هات و لە سەر وردکە بەردەکان

دانیشت. ماسییەك سێ جاران لە ئاوەکە خۆی هاویشتە دەرێ. وردە بەردە قەوزە گرتووەکانی بن ئاوەکە وەك زیو درەوشانەوە. زگە زیوینەکەی ماسییەکە هەموو دەرەوشانەوەی خۆی لە ئاوەکەدا بریسکاندەوە.

مەمی دیك وەك فەنەرێکی گوشراو وێك هات. لە تووڕەییان شێت ببوو. دڵی وا لێی دەدا دەتگوت دەیەوێ لە سینگی بێتە دەرێ.

کە ئاوڕی دایەوە سەفەر بەرانبەری راوەستابوو. سەفەر دوو هێندە، سێ ئەوەندە گەورە ببۆوە. مەمی دیك رقەکەی نیشتەوە. رێك لەو کاتەدا رقەکەی لێ بوو بە ترس. دەست و پێی شل بوونەوە و نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. سەفەر لە خۆباییانە سەیرێکی کرد و ئەو جار بزەیەکی هاتێ و ئاخرییەکەی جوان پێکەنی. وەك چۆن بە تاشباش پێکەنیبوو. لووتبەرز و کەللەڕەق و چاوقایم چووە پێشێ و گەیشتە دەم ئاوەکە. لاقەکانی لە ئاوەکە نا و دانیشت. چەرخەکەی لێ دا. دەنگی چەرخەکەی لە بێدەنگییەکەدا دەنگی دایەوە. بڵێسەیەك بینرا و دوای ئەوە سەری جگەرەکەی درەوشایەوە و کوژایەوە، درەوشایەوە و کوژایەوە.

ئەژنۆی چەپی مەمی دیك لە سەر عەرزەکە بوو. ماسییەکە بە زگە زیوینەکەیەوە سێ جاری دیکەش لە ئاوەکەدا خۆی هەڵاویشتەوە و سێ جاری دیکەش سێ پارچە تیشك لە سەر ئاوەکە درەوشانەوە.

سەفەر هەستا. پشتی وەك دیوارێکی پان بوو. بە هەنگاوی گەورە گەورە بەرەو دارە بییە تەڕەکان کە رەش دەچوونەوە رۆیشت و لە بن دارەکان لە سەر گازەرای پشت راکشا.

مەمی دیك کێردەکەی بە دەستەوە ئامادەبوو کە وەخۆ بێتەوە و خۆی پێدا بدا. دەیویست لە ناکاو وەك برووسکەیەك دەرپەڕێ و بەر لەوەی مەجالی سڕبوون و شلبوونەوە بە دەست و پێیەکانی بدا، کارەکەی بکا.

سەفەر لە بن بییەکان هەستا، بەڵام رێك رووبەڕووی مەمی دیك لە سەر کۆلکەدارێك دانیشت و لاقەکانی لە ئاوەکە رۆکرد. لاقەکانی لە ئاوەکەدا گەورە و بچووك دەبوونەوە. دەشکانەوە لەگەڵ ئاوەکە دەڕۆیشتن و دیسان دەبوونە لاقە گەورەکان.

مەمی دیك دەرپەڕی، بەڵام رێك لەو ساتەدا سێ سوار بە سەر سێ ئەسپی رووتەوە، کڵاوی حەسیری لەسەر هات و لە بەرانبەری راوەستان.

یەکەمیان کە سواری ئەسپێکی سپی ببوو، گوتی:

ـ شەوکەت بەگمان نەدۆزییەوە.

ئەوەی ئەسپێکی حودوودی لە بندا بوو:

- له كەناری دەریای سپییش نەماندۆزییەوە.
ئەوەش كە سواری ئەسپێكی رەش ببوو و دەنگێكی گڕی هەبوو:
- له بیرەكەشدا نییە.
سوارە ئەسپ سپییەكە گوڕاندی:
- تۆ نەبێ كەس بە شوێن و سۆراغی شەوكەت بەگ نازانێ.
دەنگی له رەوەزەكانی ئاناوەرزا هالاّ و دەنگی دایەوە:
- كەس نازانێ. كەس نازانێ.
سواری ئەسپە حودوودەكە:
- هەموو كەناری حەیحان و گۆمـەكانی هـەتا دەگاتـە دەریـای سـپی، گـەڕاین. بـێ سـەر و شوێنە. پێمان بڵێ شەوكەت بەگ له كوێیە؟
مەمی دیك لەسەرخۆ گوتی:
- شەوكەت بەگ مردووە. بەدبەختی چارەڕەش.
سواری ئەسپە سپییەكە، له سەر باڵی ئەسپەكەوە كەلەپچەیەكی هەڵگرت و گوتی:
- دەستەكانت بێنە پێش. ئێمە لێت تێنەگەیشتین. ئەتۆ بچۆ ئەو قسانەت بە دەوڵەت بڵـێ. بە مانگ و ئەستێرەدارەكان.
مەمی دیك دەستەكانی درێژ كرد. زرینگەی كەلەپچەكە هات.
سواری ئەسپە سپییەكە گوتی:
- وازی لێ بێنە. خوا بیباتەوە. خۆ ئەوە بنیادەم نییە. ئەو چڵمنە ترسنۆكە مردەلۆخەیـە. تـۆ خـوا كەلەپچەكە حەیف نییە. وەرە با بڕۆین. بچین له قامیشەڵانەكەدا له شەوكەت بەگ بگەڕێین.
بە سواری و بە دەنگی جرینگەی كەلەپـچەكەوە دوور كەوتنـەوە. ئەسـپەكان هـەر سـیانیان رووت بوون. باریك و درێژ و كەفەڵیان له بەر تریفەی مانگەكە بریقەی دەهات.
سەفەر دەرپەڕی. ئاوەكە قوڕاو بوو. ماسییەكان خۆیان هەڵاویشت. بەرزگە زیوینـەكانیان لـە چـاوی مەمی دیكی دا و كزاندییەوە. ئەستێرەیەك له ئاوەكە كەوت و له تەنیشت بەردێكەوە مایەوە.
گەرماكە شێدار و خنكێنەر بوو.
مەمی دیك كێردە دم گەڵا بییەكەی له كێلانێ دەركێـشا و بـە هـەموو تـین و هێـزی خـۆی دایهێنا. كێردەكە سێ بازنەی سووری دەوری زیوینی له حەوادا كێـشا. سـێ بازنـەی وەك سـێ هێڵێ پۆلایی لەبەر تریفەی مانگەكەدا درەوشانەوە.

**دەچنە کێڵگەیەکی دی. ئەوەشیان مەزرای موتەلیب بەگە. لە مەزراکەی پێشوو بە پیتترە. قۆزاخەی هەی یەکەی پڕ بە چنگێك و لۆکە لە نێویان هەڵتۆقیوەتە دەرێ. ئاشقە کەچەڵە بە دیتنی ئەو مەزرایە گۆرانییەکی شادی زۆر کۆن چڕێ کە هەتا ئێستا کەس نەیبیستووە و هەمووان وەکول دێنێ. تاشباش ئۆغڵو بێتاقەتتر و لاوازتر بووە و کەوتووەتە ئاویلکەدان. تاشباش ئۆغڵو کەسێکی وا نییە تا ئاخری ملی بۆ ئەو لاوازبوونەی راکێشێ.**

## ٤٢

ئەوەندەی یەك و دوو، هەوەرە چڕە سپییەکان وەك بایەوانی کەشتی، لە سەر دەریای سپی کز بوونەوە. لە راست و چەپەوە با هەڵی کرد، هەورە زیوینەکان لە سەر تۆرووسەوە هەڵقوڵین و هەستان. گەردەلوولی گەورە و بچووك هەستان و بەرەو ئاسمان کشان. درەوشانەوە. لە سەر "یۆمورتالیق"ـەوە لە دۆملووەوە و لە شاری جەیحانەوە و لە قەلای کوێستانەوە و لە دەوروبەری بۆردوومەوە، گەردەلوول کۆڵەکەی رەنگاورەنگی هەڵدەستان و لە سەر چیای حەمیدەوە بەرەو ئاسمان دەکشان. ئەو بایەی هەڵیکردبوو، لۆکەکانی تێك دەئالاند و چڵزچێوی لۆکەی دەشکاندەوە. ئاوەکەی جەیحان بەرەو ئاسمان هەڵدەچوو و دیسان دەڕژایەوە شوێنی خۆی. چوکووراوا، گژوگیا و دار و خەزەڵە گوڵ و چووزەرە و چرۆی پارا و و کەسکی گەنمەجار، تراکتۆر و کامیۆن و ئەسپ و گوێدرێژ و جڕ و جانەوەر و زەردەواڵە و تۆز و خۆڵ هەر هەمووی تێکچڕژابوون. قەسەڵ (کلۆش) و وشکەقۆزاخە بە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە. تەپوتۆز سەرانسەری چوکووراوای داپۆشیبوو. تۆز و خۆڵ لەچکی سەری ژنان و کلاوە چەور و

چلکن و پواوەکانی سەری پیاوانی هەڵدەگرت و دەیبرد. هەوری تۆز و خۆڵێکی خەست بە دەشتەکەدا دەسووڕایەوە.

تاشباش ئۆغڵو ماندوو و شەکەت، بە زەحمەت لە جێی خۆی هەستا. بە خۆ ڕاکێشکردن لە کەپرەکە هاتە دەرێ. زاری ئەوەندە تاڵ بوو دەتگوت ژەهری خواردووە. لە کرێکارەکان نزیک بۆوە. هەر دوو دەستی لە کەلەکەی نا، پەنجا هەنگاو لەو لای کرێکارەکانەوە ڕاوەستا. کرێکار دەستیان لە کار هەڵگرت و چاویان تێوەبڕی. وەك ئەو ڕۆژانە دەچوو کە لە ئاوایی تووڕە دەبوو. زلتر و بە هەیبەتتر ببوو. گوندییەکان زۆربەیان ترسیان لێ نیشت. هێندێکیان کە هەر وا پانزە بیست کەسێك دەبوون، گومان و دوودڵییەکەیان وەلاوە نا و گوتیان:

- کوڕە بە ڕاستی ئەوە تاشباشە مەزنەکەمانە. پیاوچاکەکە، لە ئاواییش هەر ئاوا دەستی لە کەلەکەی دەنا و بە تووڕەییەوە ڕادەوەستا.

تاشباش ئۆغڵو لە تووڕەییان چاوی چوبووە پشتە سەری. لاقی ڕاستەی هێنایە پێشەوە، دەیویست قسان بکا، یەك دوو جاران تفی نێو زاری قووت دایەوە و دواتر پاشگەز بۆوە.

کرێکارەکان گوێیان ڕاگرتبوو و متەقیان نەدەهات و چاوەڕێ بوون گوێیان لە قسەکانی بێ. چاوە پڕ لە ترس و قەشمەری و پەشیمانی و کونجکۆڵییەکانیان لەو بڕیبوو. بەڵام ئەو قسەی نەکرد، تاوێك هەر ئاوا ڕاوەستا و دوای ئەوە چاوێکی بە سەر هەموو خەڵکەکەدا گێڕا و سارد لێی ڕوانین. نیگاکانی چاکەکاری و تەنانەت تۆزێکیش خەفەتیان پێوە دیار بوو، خەفەت و پەژارەیەك کە لە ناخی گیانییەوە هەڵدەقوڵی. نیگاکانی پتر لە هەمووان لە سەر ژن و منداڵەکەی ڕاوەستان. کە گەیشتە حەسەن، نەرمە بزەیەکی لە لێوی نیشت. حەسەنیش بە ڕوویەوە پێکەنی.

تاشباش ئۆغڵو تاوێکیش چاوی لە عەرزی بڕی و بێجووڵە ڕاوەستا و ئیتر پشتی تێ کردن و وردە وردە و بە شەلەشەل لێیان دوور کەوتەوە. کرێکارەکان ماوەیەك هەر وا لە دواوە سەیریان کرد، دوایی وەك هیچ شتێك نەقەومابێ، دەستیان کردەوە بە کار.

حەسەن بە دوایدا ڕای کرد و کاتێ لە مەزراکە دەچووە دەرێ، خۆی گەیاندێ. دەستی گرت و گوتی:

- مەڕۆ مامە مەمەد. بە خوای گەورە بم تۆڵەت لەو خواروخێچە و لە هەموو گوندییەکان دەکەمەوە. مەڕۆ و لە لامان بمێنەوە.

تاشباش ئۆغڵو پڕی بە حەسەن داکرد و هەڵیهێنا و لە باوەشی گرت و ماچی کرد و داینایەوە و بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، ملی ڕێیەی گرت و ڕۆیی.

مەمی دیك لە نێو با و تۆفاندا، هەلۆکەی دی کە لە ئاسمانێ باڵەکانی بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ گژەبایەکە لێك کردووەتەوە و بەبێ ئەوەی گوێی پێی ببزوێ، بە هێمنی دەفڕێ. تاشباش ئۆغلۆش سەیری هەلۆکەی کرد. یان مەمی دی پێی وابوو سەیری کردووە. ژان و تووڕەییەکی هەتا ئەو رۆژە هەستی پێ نەکردبوو، هات و وەك ژەهرێك لە سەر دڵی نیشت.

تاشباش ئۆغلۆ ئەو شەقارتانەی حەسەن پێی دابوو لە توورەکە لایلۆنێکی پێچابوون و توند لە دەستیدا گرتبووی. توورەکە لایلۆنییەکەی هەر وا بە دەستییەوە بوو و بە دەم جەیحاندا بەرەو خوار رۆیشت و لە چاوان ون بوو.

گژەبایەکە، زەوی و دار و ئاو و زەلکاو و قامیشەڵان و ئاسمانیشی وەك بێشکەیەك رادەژاند. شەپۆلی دەدا و هەڵدەستا و وەك دەریا لە ناخەوە دەیحیلاند.

تاشباش ئۆغلۆ پێی نایە نێو ئاوەکەوە. بۆنێکی توند و سەرخۆشکەر و هۆشبەر، بۆنێکی خۆشی کە تا ئەورۆژە لە ژیانیدا نەیکردبوو، بەر لووتی کەوت. لە حاڵەتێکدا بوو لە نێوان خەون و راستیدا. هەموو تین و هێزی خۆی کۆ کردبۆوە و دابوویە ئەژنۆکانی و بەرەو پێشەوە دەچوو. کۆمەڵێك رووناکایی جۆراوجۆر دەهاتنە پێش چاوی و تێدەپەڕین. رەش و سپی و رەنگاڵە. ئاوەکە، هەڵدەچوو و بەرەو وی دەهات. هەورەکان و گژ و گیا و دارەکان و لاسکەگەنم و قەسەڵ، دەچوون لە بەر یەکەوە و ئاڵۆزکابوون. باڵندەکان لە ترسان لە هێلانەکانیان هاتبوونە دەرێ و گیانلەبەرەکانی دیکە و زەردەواڵە و جڕ و جانەوەر لە کونێ هاتبوونە دەر.

ئاسمانیش گەچلا بوو. مانگ، ئەستێرە، شینایی ئاسمان و نووره زەردەکەی تێکچڕژابوون. دەتگوت ئەستێرەکان لەو گۆشە و قوژبنەوە دەچنە ئەویتر.

تاشباش ئۆغلۆ هەتا نێوقەدی چووبووە نێو ئاوەکەوە. ئاوەکە، کە هرووژمی بۆ دێنا، فێنکی دەکردەوە. ئاوڕێکی لە دواوەی دایەوە. سەیری کرد سەگێکی گەورەی بە شوێنەوەیە. بزەیەکی هاتێ.

ئاوەکە لە بەر چاوی لەرزی، دارەکانی کەنار و کەنارەکەش لەرزینەوە. عەرزەکە بن پێیەکانی هولۆڵ دەکرد. لە خولیا و خەونێکی کەسك و خزۆکدا، داوە جاڵجاڵۆکە پساوەکان، بە رەنگێکی پۆلایین دەدرەوشانەوە. رووناکایی و هەموو شتەکان لەرزینەوە، گوڵ و گەڵا کەسکەکان لە جوولەیەکی بێ کۆتاییدا جێگۆڕکێیان دەکرد. ئەستێرەکان لە جموجۆڵدا بوون و بێ پسانەوە لە جێگۆڕکێدا بوون. تاشباش ئۆغلۆ سەرە ماندووەکەی بە پنچکێکەوە نا. پنچکەکە گوڵی دابوو. بۆنێکی توندی لێ هەستا. خولیایەکی سەیر... ئاوەکە پێیەکانی دەلاواندەوە. فێنکایی...

**چاوەڕوانیی ئەوەیان نەبوو تاشبباش ئاوا بڕوات. لە پێشدا هەوڵ دەدەن هیچ باسی مەسەلەکەی تاشبباش نەکەن. دواتر وردە وردە قوفڵی زمانیان دەکرێتەوە. دوودڵن.**

## ٤٣

ئەگەر لە دەم مەزرایەکی باشی لۆکە راوەستی و سەیر بکەی، تا چاو هەتەر دەکا گەڵای کەسك دەبینی و سەیر دەکەی لە نێو ئەو گەڵایانەدا لۆکەی سپی و پشکووتوو لە قۆزاخە هاتوونە دەرێ. لە وەها کێڵگەیەکدا لۆکە دەگاتە نێوقەدی بنیادەم. لە نێو ئەو چڵ و لاسکە کەسکانەشدا، قۆزاخەی پشکووتوو یەکی پڕ بە چنگێك. لە مەزرایەکدا کە بەری کەم بێ یان زۆر باش نەبێ، گەڵای لاسکە لۆکەکان وەریوە و هەر لۆکەکەیان پێوە ماوە. مەزراکە لە زەوییەك دەچێ کە بەفر داپیۆشیبێ و پەڵە و رەشایی نەهێشتبێ. مەزرا بە پیتەکەی لۆکە لە گوڵستانێکی گەورە دەچێ بە هەزاران گوڵی رەنگاڵەوە. جا مەزرای ئاوا تۆزێك تینی گەرماکە دەشکێنێ.

ئاوەکان شلەتێنن وەك خوێن و ناخورێنەوە. قوڕاو و لیێڵن. ئاوی ئەو جۆرە مەزرایانە تۆزێك فێنکترن. ئەو کرێکارە شەکەتانەی وەها مەزرایەکیان دەست بکەوێ، برێك وەخۆ دێنەوە. خۆ ئەگەر مەزرایەکی لەو چەشنەیان بە نەسیب نەبوایە، بە دڵنیاییەوە رۆیشتنەکەی تاشبباش پتر کاری تێ دەکردن و شێتی دەکرن و لەشە ماندووەکەیان شەکەتتر دەبوو.

گوڵە پشکووتووە رەنگاورەنگەکان زۆری پێناچێ هەڵدەوەرن و میوەیەکی وەك سێو لە پاش خۆیان بەجێ دێڵن. سێوەکان دەتەقنەوە و هەر سێوەی لۆکەیەکی سپیی وەك هەوری لێ دێتە دەرێ. کرێکارەکان دیسان کۆیان دەکەنەوە و دڵیان خۆش دەبێ و دەڵێن:"دووەم گوڵەکەشی هێندەی یەکەم گوڵەکەی، لۆکەی داوەتەوە، سێهەم گوڵیشی بە دڵنیاییەوە هەر وا دەبێ.

کرێکارەکان لە وەها مەزرایەکدا شەکەتییان لە بیر دەچێتەوە و دوعای خێر بۆ موتەلیب بەگ دەکەن.

موتەلیب بەگ بەیانی زوو بە مێرسدێس بێنزە خۆڵاوییەکەیەوە هاتە مەزراکە. ئەو شەوە خەوی لێنەکەوتبوو و دیار بوو بیری لە وەلییەکەی کێڵگەی لۆکەکە کردبۆوە. لە پێش چاوی لانەدەچوو کە چۆن سووربۆوە و بە کۆمەکۆم و لارە لار دوور کەوتبوو. بە تایبەتی کە دراوەکەشی لێ وەرنەگرتبوو.... ئەو جۆرە بنیادەمانە سەیر بوون. پەشیمان بوو ئاوا بە گرژی لەگەڵی جووڵابۆوە. بنیادەم چما ئاوا لەگەڵ یەکێك دەجووڵێتەوە کە وەك وەلی ناوبانگی رۆیوە؟ وەك چۆن لەگەڵ گوندییەکی نەزان یان دز و خراپەکارێك دەجووڵێنەوە؟...

هەر لە ترۆمبێلەکەی دابەزی، بانگی سەفەری کرد:

ـ بمبە بۆ لای ئەو وەلییە. دەبێ زوو بیبینم.

سەفەر ساتێك وەڵامی نەدایەوە. گوندییەکانیش دیکەش بێدەنگ بوون. موتەلیب بەگ هەڵچوو. سێبەری ترسێك لە روخساری نیشت. پرسی:

ـ کوا وەلییەکە؟

حەسەنە چکۆڵ گوتی:

ـ رۆیشت. توورە بوو و رۆیشت. دەنگی لە هەموومان گۆڕی. چۆوە بۆ چیاچی چل پیاوچاکەکە. بە منی گوت دەچمەوە بۆ ئەوێ. با نەترسن. خراپەیان دەرهەق ناکەم. ئەو خراپەیەی لەگەڵ منیان کرد بۆ خۆیان. بەڵام ئیتر دەستیان ناگرم. ئەوەی گوت و رۆیشت.

ـ چووە کوێ؟

حەسەن بە دەست ئاماژەی بەرەو کەناری جەیحان کرد.

ـ بۆ ئەوێ... هەر ئاوڕێکیشی نەدایەوە.

موتەلیب بەگ بێدەنگ بوو. رەنگی بە روخسارییەوە نەما. مەمی دیك بە پەلەپەل لە سەر تەپوتۆز و خۆڵەکەی پشتی ترۆمبێلەکە و بە قامك نووسیبووی ABC.

موتەلیب بەگ بە داخ بوو بەڵام پێشدەکەنی:

ـ وەلییەکەمان لە کیس چوو. خۆمان لە کیس خۆمانمان دا. جا ئێستا لە کوێ بیدۆزینەوە؟ بیدۆزینەوە و کەراماتەکانی ببینین.

دوای رۆیشتنەکەی موتەلیب بەگ بە سپایی لە یەکتریان پرسی:

ـ موتەلیب بەگ چیی گوت؟

ـ گوتی زۆر بە داخم کە لە کیسم چوو. وەلییەکەی ئاخر زەمانم لە کیس خۆم دا.
ـ موتەلیب بەگ چیی گوت، چیی گوتی؟
ـ گوتی داخێك و هەزار مخابن، بە دەستی خۆم خۆمم مالوێران کرد، وام کرد وەلییەکەی ئاخر زەمان را بکا، لای خودای گەورە رووڕەش و ریسوا بووم.
ـ موتەلیب بەگ چیی گوت، چیی گوت؟
ـ گوتی ئەمن بنیادەمێکی چارەڕەشم کە وەلییەکەم دۆزییەوە بە کەرێتیی خۆم لە دەستم دا.
ـ چیی گوت، چیی گوت؟
ـ گوتتی لەوە پێش ئەو مەزرایانەی من، قەت قەت ئاوا بەپیت نەبوون و نیوەی ئەوەشیان بەرهەم نەبووە و تەنانەت یەك لە سەر دەی ئەوەش. ئەمسالّ مەزرای من لۆکەیان لێ هەڵدەقولّی، لە سایەی سەری وەلییەکەی ئاخرزەمانەوە. ئەمن بەو دەستانەی خۆم، چاوی خۆمم کوێر کرد.
ـ چیی گوت؟
ـ موتەلیب بەگ گوت، ئەگەر جارێکی دیکە، دەستم بگاتەوە داوێنی تاشباشی مەزن، ئەگەر تاقە یەك جاری دیکە مانگی روخساری ببینمەوە، لە سەر سەرمی دادەنێم و قەت داینانێم.
هەتا بای رۆژاوایە هەڵی کرد، هەر باسی موتەلیب بەگیان کرد. لەو ماوەیەدا موتەلیب بەگ سێ جاری دیکەش هاتەوە و بە ترۆمبێلەکەیەوە لە دەم مەزراکە راوەستا. بە بەردەمی کرێکارەکاندا تێپەڕی. نێوچاوانی تێك نابوو و قسەی نەدەکرد.
گۆملکسیز ئۆغلۆ بە قەلافەتە زل و چوارشانەکەیەوە، جار نە جارێك هەڵدەستا و دەیگوت:
ـ دیسان دێتەوە. وەلییەکان قەت لە مرڤی فانی ناتۆرێن، ئەوان زویر نابن و ناتۆرێن. گوێ مەدەنە قسەی حەسەن کە دەڵێ تۆراوە. لەو دنیایەدا کەس هێندەی منداڵ درۆ ناکا. منداڵ بەردەوام درۆ دەکەن. وەلییەکەمان لێمان نەتۆراوە.
سەفەر خۆی تێنەدەگەیاندن و هیچ قسەی نەدەکرد. خواروخێچ پەیتا پەیتا جنێوی دەدا. زۆر ترسابوو و بۆ ئەوەی بە سەر ترسەکەیدا زاڵ بێ، پەیتاپەیتا جنێوی دەدا بە تاشباش و بە هەموو وەلی و پیاوچاکێك و بە سەفەر و بە دار و بەرد و باڵندە و هەور:
ـ با بمکوژن، بێن و بمکوژن. لە نێوم بەرن. گیانم بستێنن. ئەو خوایە کە دەستی دەڕوا، بۆچی راوەستاوە؟ خۆ ئەمن ئەوەتا لێرەم بۆ راوەستاوە؟...
بێ ئۆقرە بوو. جینگڵی دەدا و شێت دەبوو و کەفی هەڵدەخڕاند. روخساری زەرد هەڵگەڕابوو و شلەژابوو.

زەڵەجە ویستی هەڵداتێ:
ـ سەروەرمانم لە خەودا دی...
ـ نەیانهێشت لە سەری بڕوات و گوتیان:
ـ ئەو خەونەت سەرت بخوا.
مام خەلیل دەینالاند و فرمێسکی دەباراند:
ـ ئەو هیچ و پووچانە تا ئێستا قەدری کەسیان نەگرتووە تا قەدری تۆ بزانن، پاڵەوانەکەم، کوڕم تاشباش تۆغلو، مەمەدە وەلییەکەی من...
دەلینگی پانتۆڵەکەی کە دافەتابوون و تیتۆڵ تیتۆڵ ببوون، هەتا ئەژنۆی هەڵیکردبوون و دەچووە لای یەك بە یەکی گوندییەکان و دەیپرسی:"قەدری کێیان؟"
تۆککەش داغ قۆردوو کە کۆشکەکەی خۆی لە بەهەشتێدا لە بیر نەدەچۆوە، دەستی بە ردێنە ماش و برینجییەکەیدا دێنا و دووعای دەکرد و فووی بەسەر خەلکەکەدا دەکرد و دەیگوت:
ـ ئەستەغفیروڵڵا، دینی ئێمە سیحر و کەراماتی تێدا نییە. مەمەد تاشباش پیاوێکی باش بوو. ئەو داماوەیان لە دین وەرگێڕا، دواییش هەرچی بەڵا بوو بە سەریان هێنا. ئاخرییەکەشی سەرگەردان و سەرلێشێواوی چۆڵ و بیابانیان کرد. ئەستەغفیرۆڵڵا...
"عەلی"یە درێژ هیچ قسەی نەدەکرد و بەسپایی دەگریا.
حەسەن دەیگوت:
ـ ئەمن دەچمە لای. بۆ سەر ئەو چیای دولدولە.
جا چیای دولدول لە چوکووراواوە دیار بوو، لووتکەکەی تیژ و بەفری لێ کەوتبوو. جوان و فێنك کەرەوە و وەك پاچەیەکی سپی بە ئاسمانە شینەکەوە نووسابوو.
ئاشقە کەچەڵ لە بەیانییەوە یەك پشوو قسەی دەکرد و لێی نەدەبڕییەوە و هەر جارە و لە سەر هەوایەك بوو:
ـ ئەو داماوەتان لە دین وەرگێرا. وەرتانگێڕا، شێتتان کرد. ئەگەر وەلیش بووبێ شێتتان کرد، ئەگەر وەلیش نەبووبێ، نەخۆش و چارەڕەشتان کرد. لە سەر پێیان خۆی نەدەگرت. تینی ئەژنۆی نەبوو هەنگاو بنێ. بەشکم وەلییش بووبێ. بەشکم بنیادەمێك بووبێ وەك خۆمان. نەیدەتوانی پێ هەڵێنێتەوە. بڕۆن ئەو لێقەوماوە بدۆزنەوە. هەر ئێستا بچن سۆراغی بکەن. دیارە زۆر دوور نەچووە. لە بن پنچکێك کەوتووە و دەناڵێنێ. دەی بچن ئەو لێقەوماوە بدۆزنەوە و فریای کەون. ئەوەی لەگەڵ تاشباش کردتان باش نەبوو. ئەگەر وەلی بێ، لەو جێیەی

کەوتووە، ئەوا نوورێك هەڵدەستێ، بەرەو لای نوورەکە بچن و بیدۆزنەوە. کورە ئاخر نیوەتان خزمین. خۆ جاری جاران قسەتان لە قسەیدا نەدەکردەوە. بچن و لێی بگەڕێن. نیوەی خەڵکی گوندی خزمی ئەون.

ژنەکان و کچە گەنجەکان دەوری ژنەکەی تاشباش ئۆغڵویان گرتبوو. ژنەکەی بەکرە شێت دەپیرسی:

ـ باشە تاشباشی سەروەرمان دەستی بۆ هێنای؟ هیچ سەرجێیی کردی؟ ...

ژنە هیچ جوابی نەدەدایەوە. کە وەڵامێکیان وەرنەدەگرتەوە، لەگەڵ یەکتری قسەیان دەکرد. زەڵەجە دەیگوت:

ـ تاشباش وەك گا وایە. دەستی بگاتە هەر ژنێك، هی خۆی بێ یان نەبێ، هەتا پشووی لێ نەبڕی بەری نادا.

ـ وەك گا....

ـ گای چیی باوکە رۆ، خۆ داماوە خۆی بە سەر پێوە رانەدەگرت...

ـ کچێ بەقەستی وای دەکرد...

ـ کێ چووزانێ وەلییەکان چۆن ئەشقبازیێ دەکەن؟

ژنەکەی بەکرە شێت دەیگوت:

ـ وەلییەکان وەك ئاگر وان. هەر دەستیان بتگاتێ، شێت دەبی. تاشباشم زۆر دیوە.

بە خۆشییەوە تریقایەوە.

"هەواگۆڕ" دەیناڵاند و بە لەرزینێکی توندەوە لە سەر عەرزەکە، خۆ دەگەوزاند. وشك و رق هەڵاتبوو. پەیتا پەیتا دەیگوتەوە:

ـ ئەویش رۆیشت. ئەویشمان چوو.

فاتمۆکێ دەیگوت:

ـ لە دەوری ئەو نینۆکەی گەڕێم کە دەیبا و فڕێی دەدا. هەموو ئاوەدانی، هەموو خەڵکی کوێستانێ و هەموو خەڵکی چوکووراوا و هەموو دنیای بە قوربانی سەری ئەو نینۆکەی دەکەم. سەیر کەن، چۆن کچەکەی منی چاك کردەوە کە حەوت ساڵ بوو بەجێ و بان کەوتبوو...

ـ دەی قسە بکە ژنەتیوە بەڵا لێدراوە دەی. چما زمانت پشیلە بردوویە؟ تاشباش لەگەڵت نووست یان نا؟ ئەگەر نووست، چۆن نووست و ئەگەر نەنووست چۆن نەنووست؟ بڵێ کچەتیو، دەی بۆمانی بگێڕەوە.

ژنەکەی کوێخا، کچەکەی قیرسمایل، پەیتا پەیتا پرسیاری دەکرد. ئاخرییەکەی کە دیتی لە چنگیان رزگاری نابێ، گوتی:

- بەرۆکم بەردە خوشکێ، دەستم لێ هەڵگرە. دەرد و قوڕبەسەرییەکەی خۆمم بەسە. خۆ هەر دێ و پتریش دەبێ. چما بنیادەم سەرجێیی وەلییان دەکا؟... وەلی یەکپارچە تووڕەییە. ترسێك دەخاتە دڵی بنیادەمەوە خەوتن سەهلە، دەست و پێیانت سڕ دەبن.

- داوای لێ کردی دەستی لەگەڵ تێکەڵ بکەی؟

- بڕۆ خوشکێ، بڕۆ، قوڕەبەسەرییەکەی خۆم بەسمە.

- هار بوو؟ شێت بوو؟

کچەکەی قیرسمایل دەلەرزی:

- دەستتی گرت؟

باسکی لێك کردەوە و باوێشکێکی دا:

- لە باوەشی گرتی؟ لە باوەشی گرتی؟ لە باوەشی گرتی؟

لوێچێ خۆڵی هەڵگرت و لە مستیدا گوشیی. خۆڵەکە وەك ئاگر وابوو.

- ئێسك و پرووسکی تێك نەشکاندی؟

روخساری سوور هەڵگەڕابوو و وەك ئاگر نێڵەی دەهات. لە سەر عەرزەکە دانیشتبوو و لەشە رووتەکەی بە خۆڵە داغەکەوە نووسابوو. چاوەکانی خومار ببوون و ساتێك لەخۆ چوو.

- یانی هەر دەستیشی وێت نەکەوت؟

- بڕۆ خوشکێ، ئەمن قوڕبەسەرییەکەی خۆمم بەسە.

لە دوورەوە دەنگێکی هەستا. خەڵکێك تێك بەربوون و بە دار و بەرد لێکیان دەدا. شەڕەکە سەعاتێکی خایاند و جگە لە ئۆککەش داغ قۆردوو و هەواگۆڕ و سەفەر و ژنەکەی تاشباش و ئاشقە کەچەڵە هەمووان تێیدا بوون.

بۆنی ئارەقە بە شەپۆل هەڵدەستا. هەموو وڵات تەپوتۆز بوو.

شوانەکە تێلا گەورەکەی هەڵێنا. پیاوێکی زلە بوو. لەخۆباییانە سەری هەڵێنا و گوتی:

- تاقە یەك سەر چییە، لە مانگا و مەڕ و بزن و ئەسپ و گوێدرێژتان کەم نەبۆتەوە و بزر نەبووە. هەموو ئەوە لەو خوارەن. لە دەم ئاوەکە مۆڵم داون ئاو بخۆنەوە. ئەی ئەو شەڕەتان لە چییە؟ وەرنە ئێرە بزانم.

گوندی دڵیان خۆش بوو کە ران و گاڕانیان لێی کەم نەبۆتەوە. بۆ ساتێك تاشباشیان لە بیر چۆوە و شەڕەکەشیان.

شوانە گوتی:

- بیستوومە پارووتان لە رۆنێ دایە. مەزرایەکی باشتان بە نەسیب بووە و لۆکەی باشتان رنیوەتەوە. پارەی باشتان پێ براوە. وەزعی مانگا و مەڕ و ماڵاتیشتان باشە. لەوەڕگەیەکی باشم دۆزییەوە. وا قەڵەو بوون دووگیان لەسەر پشتیانە. وەرن بزانم.

- هەمووان دەیانزانی "وەرن بزانم" یانی چی. هەر کەسە و لە گیرفانی یان لە لۆی دەسرۆکە یان لەچکەکەیدا لیرەیەکی دەرهێنا و یەك بە یەك چوون و هەر کامەیان لیرەیەکیان لە سەر لەپی دەستی دانا.

ئەو شەوە گەرماکەی زۆر توند و بەتین بوو و تەپۆش زۆر بوو. هەتا بەیانی ئەو قەسەڵە کوشجییەی هێنابوویان ئاگریان دا. مەزراکە هەتا بەیانی ئەستێرەباران بوو.

عومـەر دەمێکـە لەگـەڵ مرێمـۆك دەژیـێ. دەخـۆن و دەخۆنەوە، لە دارستانەکەدا دەگەڕێن و کارگ کۆ دەکەنـەوە. عومـەر دەچـێتە راوێ و مـەل و کەروێـشك دەگـرێ. هـەموو شـەوێش دەیـەوێ مرێمـۆك بکـوژێ، بـەڵام رێـك ئـەو دەمـەی دەیەوێ بیخنکێنێ دەڵێ:"لێی گەڕێ نەنە مرێمۆك بـا شـەوێکی دیکـەش بـژیێ. چـەند بێخـەم خـەوتووە. " دەسـت و پێـی دەلـەرزێ، دەشـڵەژێ و پـشووی دەرنایـە. هـەموو شـەوێ بـە هەژاوی و حەزی کوشتنێکی سەیرەوە، دەژی.:"ئەمـشەوە نـا، شەوێکی دی. سبەی شەو بێ ئەملا و ئەولا داپیرە دەخنکێنم.

## ٤٤

نەنە مرێمۆك کرووشمەی کردبوو و خەوی لـێ کـەوتبوو. لێـوە رەش و تەنکـەکانی وەك منداڵێك کۆ دەکردنەوە. هەوا رووناکی کردبۆوە بەڵام هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو. روخـسارە چرچەکەی مرێمۆك نوقمی بەختەوەری بوو. دەتگوت لە خەوێدا پێدەکەنێ. رێك وەك چـۆن منداڵی ساوا لە خەودا بزەیان دێتێ، ئەویش بزەی دەهاتێ. هەر بە راستی ژنێکی بـاش و دلۆڤان بوو. عومەر لەو کاتەوەی خۆی ناسـیبوو، کەسـی نـەدیبوو هێنـدە گـەرم و گـوڕ و لەبەر دڵان، میهرەبانی و خۆشەویستی لە سەر و روخسار و قسە و هەڵـسوکەوتی ببـارێ. دایك و باب و خوشك و برا و تەنانەت گراوی (خۆشەویـستی)یـش هـیچ کـات، بنیـادەمی ئەوەندەی مرێمۆك خۆش نەدەویشت.

عومەر فرمێسکی هات. لاقەکانی نەنە مرێمۆك لە بن لێفەکە دەرکەوتبوون. پاژنێی شەقار شەقار ببوون. عومەر لاقەکانی داپۆشییەوە.

"دایکە گیان، ئەمشەو، هەر ئەمشەو دەتخنکێنم. چ بکەم چارم نییە. چیی لە دەستم هات کردم. چەندی توانیم گنخاندم، ئەویش هەر لە بەر خاتری تۆ. ئەمرۆ سێ کەو دەگرم دایە گیان. دنیایەك کارگ کۆ دەکەمەوە و یالابووك دەردێنم بۆ ئەوەی کاتێك دەمری، تێر و پڕ بمری دایە گیان. بە دڵێکی خۆش ئەم دنیایە جێ بێڵی. زۆر جوان و باش میوانداریت کردم، خۆ دایکیشم مابایە، ئاوا بە دڵ و بە گیان خۆشی نەدەویستم

دایە گیان، ئەی خوات لێ رازی بێ دایە گیان. ئەمشەو ئاخر شەوە. بمبوورە. ئەمڕ و ئا سبەی لۆکەڕنینەوەی چوکوور تەواو دەبێ و گوندی دێنەوە کوێستان. ئەو کات سەفەر پارەم ناداتێ. ئەمشەو دوایین شەوە. قورم بە سەری. چیی دیکەم لە دەست دێ؟ ئای هەژاری و نەبوونی خوا بتبڕێ. ئەگەر ئاوا دەستکورت و هەژار نەدەبووم، ئەگەر جووتە گایەکەم هەبوایە، ئەگەر "بەدری"یەش ژنی خۆم بوایە، چما ئەتۆم دەکوشت نەنە گوڵەکەم؟ چما دڵم دەها؟ دەمبردییە ماڵی خۆم، نەمدەهێشت دەست لە رەش و سپی بدەی. چ بکەم هیچ چارم نییە. ئیتر کاتیشم نییە."

دوو دڵۆپە فرمێسکی درشت لە چاوەکانی رژان و گەیشتنە سەر گەردنی. فرمێسکی دیکەش بە شوێنیاندا.

عومەر لە سەیر کردنی مرێمۆك تێر نەدەبوو. بەخۆی دەگوت:"بەیانی، بەیانی ئیتر نەنە مرێمۆك زیندوو نییە. ئیتر ئاوا وەك منداڵی ساوا لە خەوێدا فریشتەکان ناخاتە پێکەنین."

لەو ساتەدا مرێمۆك لە خەو هەستا و هەر بەخەبەر هات و چاوی پێی کەوت، دەستی لە ئەستۆی کرد و گوتی:

ـ عومەر گیان، کوڕم، پاڵەوانەکەم، ئەوە چتە کوڕم؟ نەنە مرێمۆکت بە قوربانی بێ. چ بەڵایەکت لێیە و بە منت نەگوتووە؟ بە نەنکی خۆتی بڵێ. نەنکی خۆت چاری دەکا. چ بووە بەو کەرەی بەیانییە دەگریێی؟ پێم بڵێ لە دەورت گەرێم. بە نەنکی خۆتی بڵێ. ئەمن چاری هەموو دەردێکت بۆ پەیدا دەکەم. پەیدای دەکەم کوڕی خۆم. دەردەکەتم پێ بڵێ.

عومەر هەم دەگریا و هەمیش نەیدەزانی چ بکا. خێرا بەسەر خۆیدا زاڵ بوو. بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ هیچم نییە دایکە جوانەکەم. هەر دڵم لە خۆڕا توند بوو...

بە پێکەنینەوە فرمێسکەکانی سڕییەوە.

مرێکۆ گورج و گۆڵ لە سەربانەکە چووە خوارێ. زۆر شێلگیر و توند بوو. لە خوارێ دەموچاوی شوشت و سەر و قژی داهێنا.

بەپیر عومەرەوە چوو کە لە سەربانێ دەهاتە خوارێ. دەستی برد و قامکەتووتەی عومەری گرت و گوتی:

- بەرۆکت بەر نادەم. دەبێ دەردەکەتم پێ بڵێ و دوو بە دوو مشوورێکی لێ بخۆین. هەتا پێمی نەڵێی بەرۆکت بەر نادەم. دنیات لێ دەکەمە زیندان. بڵێ با نەنەکی خۆت بزانێ و ئەو دەردە زاڵمەی وا تۆی وەگریان خستووە، چارەسەر بکا. یان بمکوژە یان بیڵێ.

عومەر پێکەنی و گوتی

- دایە ئەمشەو پێتی دەڵێم. ئێستا دەچمە راوێ. جارێ بەرۆکم بەردە. نیوەشەوێ بۆت روون دەبێتەوە.

قامکی لە دەستی دەرهێنا و خێرا بەرەو لێرەوارەکە رۆیشت و گوتی:

- ئەتۆ لە ماڵەوە بێنەوە نەنە گیان، ئاگرێکی باش بکەوە. دەمەوێ سێ کەو و قەرتاڵەیەك کارگ بێنمەوە. برێکیش یالابووك. ئەمشەو هەموو شتێکت بۆ روون دەبێتەوە.

مرێمۆك لە دوای عومەرەوە کە لێی دوور کەوتبۆوە، هەرای کرد:

- باشە برۆ. خودا ئاگای لێت بێ کورم. نێچیری باش راو بکەی، بە بەخت و شانس بی.

بۆ یەکەم جار، بیری لە عومەر کردەوە. هەتا ئێستا لە خۆشیی عومەر و ئەوەندەی خۆشویستبوو، هەر بیری لەوە نەکردبۆوە کە بۆچی هاتۆتەوە ئاوایی. نە لە خۆی پرسیبوو و نە لە عومەریش.

ئەو کورە بۆچی لە باشترین رۆژەکانی لۆکە رنینەوەدا هاتۆتەوە ئاوایی؟ چ دردێتی؟ ئاخۆ بەڵایەکی گەورەی بەسەر هاتووە؟ شتێکی لێ قەوماوە؟ لە شتێك هەڵاتووە؟ خۆی لە حوکمەت شاردۆتەوە؟

بە خۆی دەگوت:"ئاخ، ئاخ، ژنەتیوە شێتە، هەر جارێك لە کورەکەتت نەپرسی چ دەردێکتە؟ کورەکەشت نەیگوت. ئێستاش لێت تۆراوە، چون هیچت لێ نەپرسیوە تۆراوە و هەقیشێتی. ئەو دێتەوە ئێرە و ئەتۆ هیچی لێ ناپرسی و هەر ناڵێی دەرد و مەرگت چییە؟ ئەویش نایڵێ ئیتر. هەر کەسی دیش لە جێی وی بوایە نەیدەگوت. هەی ژنەتیوە کەرە، مرێمۆکە بێ ئەقڵەکە.

مرێمۆك ماوەیەك هەر وا خۆی سەرکۆنە کرد. لە تووڕەییان چیی وای نەمابوو سەر و قژی خۆی هەموو دەربێنێ و یەخەی خۆی بدرێ. هاواری کرد:"مرێمۆکی دلڕەق، ژنەتیوە دلڕەقە."

ئەوجار لاسارانە بریاری دا:"وای لێ دەکەم بیدرکێنێ. چەندی لاسارییش بکا، ناچاری هەر دەکەم. دەبمە دەرمانی دەردی. کورە ئەگەر پێویست بێ، ئەو گیانەشم بە قوربانی عومەری خۆم دەکەم. بە قوربانی دەکەم.

عومەر دەسبەجێ سێ کەوی گرتبوو وگەڕایەوە. قەرتاڵەیەکی پڕ لە کارگی گەورە گەورەشی بە دەستەکەی دیکەیەوە بوو. زاری داپچڕیبوو و پێدەکەنی.

ـ داوم بۆ کەوەکان نایەوە، پێوە بوون. کارگەکانیش گەورە و درشتن. کارگی بن ڕنەو ڕەوەزە زۆر درشتن. دەی باشە دایە کیان، ئەوانە داماڵە و خاوێنیان بکەوە. برێکیشم یالابووك هێناوە. ئاگرەکەشت نەکردووەتەوە ننە گیان. ئەمن دەیکەمەوە.

مرێمۆك توند و قایم وەك بەرد بەرانبەری ڕاوەستابوو. گوتی:

ـ هەتا دەردی خۆتم پێ نەڵێی، لە جێی خۆم نابزووم.

دوو هەنگاوی لێ چووە پێشێ و بەرۆکی گرت و گوتی:

ـ پێم بڵێ چیتە، ئەمن دەبمە شیفای دەردەکەت. خۆ ئەگەر پێویستیش بێ، لە پێناوتدا دەمرم. ئەو گیانە شیرینەم بە قوربانی عومەری خۆم دەکەم. هەتا پێم نەڵێی دەردت چییە، دەست لەو کەوانە نادەم کە گرتووتن. لە برسان دەمرم و پاروویەکیان لێ ناخۆم. ئەمنی بێ ئەقڵ، ئەمنی کەر، باشە چۆن بە مێشکمدا نەهات... چۆن بیرم بۆ ئەوە نەچوو کە تۆ کێشە و تێگیراوییەکی گەورەت هەیە.

مرێمۆك پێی داگرتەوە، پاڕایەوە و قسەی کرد. کەوەکانیش هەر وا لە سەر عەرزەکە مانەوە و کارگەکان لە قەرتاڵەکەدا و یالابووکەکانیش هەر بە توێژکاڵەکانیانەوە.

عومەر هیچ ڕێیەکی پێ شك نەدەهات کە لە چنگی مرێمۆك رزگاریی بێ. مرێمۆکیش هەر دەهات و پێداگرتر دەبوو و بەرۆکیی بەرنەدەدا.

ئەو کێشمەکێشە تا شەوێی کێشا. عومەر کە دیتی چاری ناچارە گوتی:

ـ ڕاوەستە دایە. با دەرد و تێگیراویی خۆمت پێ بڵێم. بەڵام ئەتۆ هیچت لە دەست نایە.

مرێمۆك گوتی:

ـ لە دەستم دێ.

ـ دایە. خۆ بەدرییە دەناسی. ئەمن دڵم لێی چووە. لە سوێیانی شێت بووم. دایك و بابی نەیاندامێ. ئەمنیش هۆشم نەما. وەکێوان کەوتم. کە سەرم هەڵێنا، سەیرم کرد گەیشتوومەتە گوندێك و لە پڕ لەو گوندەدا چاوم بە تۆ کەوت. ئێمە لەو خوارە پێمان وابوو ئەتۆ مردووی. دیتنی ئەتۆ نەجاتی دام. ئەوە دەردی من بوو. ئەمڕۆ بەیانی کەوتمەوە بیر بەدرییە و پێم وابوو ئیتر قەت ناتوانم بیهێنم و دەستم کرد بە گریان. کێ کچی خۆی دەداتە کوڕێکی هەتیو؟..

مرێمۆك بە دڵخۆشی و لەسەرخۆ گوتی:

ـ هەتا ئەو نەنە مریمۆکەت مابێ خەمت نەبێ و بەدرییە ئیی خۆتە. ئەگەر بابی داوای ماڵی دنیایەی کرد، دەیدەمێ، پارەی بوێ دەیدەمێ. بەوەش قایل نەبوو، بە زۆری کچەی لێ دەستێنم. ئەتۆش هەتیو نی، ئەتۆ بە هەق کوڕی مریمۆکی. هەر بیریشی لێ مەکەوە. هەر گوندی بگەڕێنەوە، بەدرییەت لێ مارە دەکەم و دەبێتە ژنی خۆت.

عومەر دڵی خۆش بوو و گوتی:

ـ هەر بە راستتە دایە؟...

ئاگرێکی گەورەی کردەوە. تۆزێك دواتر ئاگرەکە لە کوانووەکەدا بوو بە سکڵ و پشکۆ. مریمۆکیش پەڕ و پۆی کەوەکانی داماڵی و شوشتییەوە و خوێی پێوە کردن. دەیگوت:

ـ جا تۆ خوا ئەوە کێشەیە؟ خۆزگە هەموو دەرد و بەڵاکان وەك دەردی تۆ بوایەن کوڕم، عومەر گیان. نەنە مریمۆکی خۆت وەك ئاو خواردنەوە کاری بەدرییەت بۆ جێبەجێ دەکا.

دانیشتن و کەوەکان و کارگەکانیان جوان و زەریف خوارد و تێر بوون. چووەنە سەربانێ و لە سەر جێوبانەکانیان دانیشتن. عومەر لە زۆر کەسان و بە شێوەی جۆراوجۆر بەسەرهاتی دایك و بابی خۆی بیستبۆوە. زۆر کەس بۆیان گێڕابۆوە. ئەو گۆرانییەی بۆ دایك و بابی ئەویان هۆنیبۆوە، لە زمانی گەلێ کەس و زۆر جاریش لە زاری ئاشقەی بیستبۆوە.

مریمۆك دەستی پێ کرد:

ـ کوڕم، دایکت، لە گوندی "قیر قیسراق" بوو لە کوێستانی "بیر بۆغالار"، کە ئەسپی رەسەنی دەحاملاند و بەخێوی دەکردن. ماسیی سپیی رووبارەکانی بین بۆغالار دەرمانی سەد دەردن. هەنگوینەکەی بۆنی گوڵی لێ دێ و شیفا بەخش و دەرمانی هەزار نەخۆشینە. بین بۆغالار وڵاتێکی پڕ لە گوڵە و بۆنی گوڵەکەی لە هەوادا شەپۆل دەدا. خاك و عەرزەکەی ئەوێ لایی لایی بۆ بنیادەم دەڵێ. خەڵکی هیچ کوێ هێندەی خەڵکی بین بۆغالار جوان نین. ژن و پیاویان جوانترین ژن و پیاوی ئەم دنیایەن. بابت خەڵکی ئەو گوندەی خۆمان بوو. چووبووە بین بۆغالار و دایکتی دیبوو. بابت مەیتەری ئەسپە رەسەنەکان بوو. دایکت کچی بەگێکی تورکمان بووە. بەگە تورکمانەکە ئەسپی زۆر جوانی دەبێ. بابت کە مەیتەرێکی لێهاتوو دەبێ، ئەوەندە جوان بە ئەسپەکانی بەگە تورکمانەکە رادەگا کە ئەوان زۆر لەوەی بوون جوانتر دەبن. بەگە تورکمانەکە بابتی زۆر زۆر خۆش دەوێ و دەکەوێتە بەر دڵی. بەڵام زۆر نابا بابت دڵی دەچێتە سەر کچی بەگەکە واتە دایکی تۆ. بەگە تورکمانەکە سۆسەی دەکا و بابت وەدەر دەنێ. بابت ناتوانێ لەو گوندە دوور بکەوێتەوە و برسی و تینوو و سەر لێ شێواو لە دەوری گوندەکە

دەسووڕێتەوە. کچە شەوێك لە شەوان دەچێتە لای بابت و پێی دەڵێ:"هەڵمگرە، ئەگەر هەڵمگری، بابم هەر دووکمان دەکوژێ. با لێرە را بکەین. چ بمێنینەوە و چ را بکەین، هەر دەکوژرێین. لانیکەم وا باشترە دوای ئەوەی بۆ یەکتری بووین، دەستمان لە دەستی یەکتری و لە باوەشی یەکتریدا بکوژرێین". باوکیشت دەڵێ: وەڵڵاهی راست دەکەی. ئیتر دەستی دەگرێ و دەیهێنێتەوە گوندەکەی ئێمە. سێ ساڵ دوای لە دایکبوونەکەی تۆ، رۆژێکیان کەرەی بەیانی گوندەکە دەشڵەژێ. هەموو رادەکەن و بە هاوار بەرەو ماڵی ئێوە دەچن. ئەمنیش رامکرد. کە دەرگاکەم کردەوە و وەژوور کەوتم، چ ببینم! سەری دایکت و بابتیان گۆشاوگۆش بڕیبوو. دیتم ئەتۆ لە نێوان دەست و پێ خوێناوییەکەی ئەواندا دانیشتووی و یاری بە سەلکە بڕاوەکانیان دەکەی. نیتر دوای ئەوە گوندییەکان ئەتۆیان بەخێو کرد. ئەتۆ رۆژی خۆشت لە ژیانتدا نەدی کوڕی خۆم. زۆر گۆرانییان لە سەر دایکت و بەگە زاڵمە تورکمانەکە هۆنییەوە...

ئەستێرەکان لە ئاسمانێدا پەیتا پەیتا دەخوشین. لە بن ئەستێرەکانیشەوە، گورانییەکی خەمگین، بە دەنگێکی خۆشی پیاوانە لە ناخی شەوەکەدا، بە بیابانەکەدا بڵاو بۆوە: گۆرانییەکە دەیگوت:"

"لە سەر خاکی بەهارێکی هەزار ساڵە دانیشتین. خۆمان دایە دەستی ئەڤینێکی هەزار ساڵە. ئەڤینێکی هێندەی خاك پیر. لە ئەشقدا پێك گەیشتین، لە مەرگدا پێك گەیشتین. لە سەر خاکی بەهارێکی هەزار ساڵە دانیشتین. خۆمان دایە دەستی ئەشق بۆ ئەوەی خوێنی سوورمان تێکەڵاو بێ و تێکەڵاو بوو."

گۆرانییەکە هەر نەبڕایەوە و وردە وردە دوور دەکەوتەوە.

مرێمۆك خەوت. گۆرانییەکە دوور دوور کەوتەوە. مرێمۆك هێور هێور هەناسەی دەدا.

عومەر دیسان گوتی:"دایە، دایە". مرێمۆك خرپ لێی خەوتبوو و هیچ نەجولاّ...

عومەر دەستی مرێمۆکی گرت. گەرم بوو. بیری کردەوە:"گەردنی چەنێ باریکە؟ هەر رێکی بگوشم گیانی دەردەچێ." دەستەکانی بەسپایی بەرەو ملی دەبرد. شڵەژابوو. دەستی گەیشتە گەردنی مرێمۆك، گەردنی گەرم و نەرم و پڕ لە چرچ و لۆچ بوو. لە پڕ ئارەقەیەکی ساردی کرد. دەستەکانی بێهێز بوون، دڵی وا لێی دەدا دەتگوت دەیەوێ لە سینگی بێتە دەرێ. دەستەکانی بە گەردنە گەرمەکەی مرێمۆکەوە بوون. دەنگێك لە ناخییەوە دەیگوت:"دەی بۆ ماتڵی، رێکی بگوشە، دەی رێکی بگوشە، رێکی بگوشە با تەواو بێ... بیگوشە... بیگوشە..." و دیسان پتر ئارەقەی دەکرد.

دەستەکانی لە گەردن و گەرمای گیانی مرێمۆك دوور کردەوە. ئاسوودە بوو. بەلادا هات. چوو و لە سەر جێوبانەکەی دانیشت. هەموو گیانی وا دێشا، دەتگوت کوتاویانە. بەخۆی گوت:

ـ ئەمرۆش، ئەمشەویش نەکرا. سبەی شەو، بێ ئەملا و ئەولا گەرووی دەگوشم. سەفەریش کە ئێستا چاوەڕێمە خەریکە شێت دەبێ. لای ئەویش ئابڕووم چوو. چم بەسەر دێ."

ئەوجار بە دەنگێکی بەرز کە دەبیسرا قسەی کرد:"کوڕە لێ گەڕێ با نەنە مرێمۆك ڕۆژێکی دیکەش بژیێ، ڕۆژێکی دیکەش. دایکی باشەکەم. دەی چ دەبێ ڕۆژێکی دیکەش بژیێ. ڕۆژێکی دیکەش ئەم دنیا جوانە ببینێ... سبەی سێ کەوی دیکەی بۆ دەگرم، با ئەوانیش بخوا. تێر و ڕازی بچێتە ئەو دنیا."

عومەر وردە وردە وەخۆ هاتەوە. لە زیندەخەودا بوو... دەتگوت خەون دەبینێ....

رووداوێکی چاوەڕواننەکراوە، گوندییەکان تەواو
دەگۆڕێ و دەیانتۆقێنێ. لە پاشان وەك ئاگرێکی بن
خۆڵەمێش خۆی ون دەکا.

## ٤٥

لە لای خوارەوە، لە چڕایی دارە بییەکاندا، ژنێك زریکاندی. دەنگێکی بەرز و ناسك و کاریگەر هەموو دەشتەکەی تەنییوە و لە رەوەزە تەمگرتووەکانی ئاناوەرزادا کە کە نێوەڕاستی دەشتەکە لە دوورگەیەك دەچوون، دەنگی دایەوە. قیژە و زریکەکە هەموو کرێکارەکانی دەشتێی راچڵەکاند. دەنگێکی نامۆ و نەبیسراو و درێژ بوو.

تیشکی خۆرەکە بن بییەکانی رووناك کردبۆوە. دەلینگی پانتۆڵ و قەیتانی پێڵاوی مردووەکە لە لکە بییەکان هاڵابوو. باسکێکی وەك باڵی شکاوی باڵندەیەك دەتگوت سەرەو خوار بەدەم ئاوەکەدا دەڕوا. دەستەکەی دیکەشی لە سەر سینگی بوو و ئەو توورەکە لایلۆنییەی حەسەن پێی دابوو، توند بە سینگییەوە دەگوشی. قژی لە ئاوەکەدا شەپۆلی دەدا. چاوە رەش و درشتەکانی زەق زەق بوون و دەتگوت زیندوون. لە بن ئاوەکەدا هەر دەتگوت دەیانترووکێنێ. مردووەکە تۆزێکیش بزەی دەهاتێ و بڕێکیش دەتگوت خەون دەبینێ یان خەیاڵ بردوویەتی. سێبەرە زۆر درێژەکەی لە تەختی بنی ئاوەکەدا کەوتبووە سەر چەو و وردە بەردەکان و سێبەرەکەش لە بن تیشکی تاوەکەی بەیانیدا لە بن ئاوەکەوە دەلەرییەوە. پووشکە بەقوونەکان لە دەم چەمەکەوە دەهاتنە سەر مردووەکە و لە سەر مردووەکەوە دەچوونەوە کەنارەکە. مێشکێکی زلی سەوزیش بە سەر مردووەکەوە کە لە بن ئاوەکەدا بوو دەسووڕایەوە و ناشارەزایانە لە ئاوەکە نزیك دەبۆوە و بریسکانەوەی باڵەکانی دەکەوتە سەر ئاوەکە و دەسرایەوە و وزە وزی دەکرد، بە سەرەوە خۆی بە ئاوەکەدا دەدا و هەر پێی وە ئاوێ دەکەوت، شێتانە و بەوپەڕی خێراییەوە هەڵدەفڕییەوە. پانتۆڵی مردووەکە لە ئەژنۆی بەرەو خوار داڕابوو،

ئاوەکە تیتۆڵی لا دراوەکەی لەگەڵ خۆی دەبرد. پۆلە ماسییەك بە سەر سێبەرەکەدا کە لە سەر چەوە سپییەکانەوە دەجوولایەوە، تێپەڕین. ماسییەکان هاتنەوە و تاوێك وەك زەروو بە گوێچکەی و قژ و دەموچاوی مردووەکەوە نووسان، لە پاشان لە بەر جووڵەیەکی بچووك خێرا پەرش و بڵاو بوون. دیسان پۆل پۆل هاتنەوە و دیسان بڵاو بوونەوە.

دەنگە بەرز و تیژ و کاریگەرەکە سێ جاران دەشتەکەی تەنییەوە و سێ جاری دیکەش لە زەرد و ماە و رەوەزەکانی ئاناوەرزادا دەنگی دایەوە.

گۆملکسیز ئۆغلو، پیلی ژنەکەی تاشباشی کە هۆشی بەخۆیەوە نەمابوو و پەیتا پەیتا هاواری دەکرد، گرتبوو و نەیدەهێشت خۆی باوێتە نێو ئاوەکەوە و خۆی بە سەر تەرمەکەی تاشباشدا بکێشێ. دەیگوت:

ـ خۆڕاگر بە خوشکم، خۆڕاگر بە. خودا ساردتری نەکا. ئەدی لەوەش خراپتر هەیە. ئەو داماوە ئاخری مرد. وەلییەکەی زەوی و ئاسمان، تاشباشی مەزنمان مرد. خودا سێبووریت بدا خوشکم. ئەگەر راستیت دەوێ تاشباشەکەمان، هەر لەو رۆژەوە کە بوو بە وەلی، مردبوو. ئێستا کە ئەوە لە کیسمان چوو.

ـ ژنەکە سێ جار پەیتا پەیتا زریکاندی. زریکەی پیاوی کەڕ دەکرد. هەوڵی دا خۆی لە چنگی گۆملکسیز راپسکێنێ، بەڵام کابرا بە شان و باهۆ بەهێزەکەی توند باوەشی پێداکرد و بەری نەدا.

ژنە بە هانکە هانك قسەی دەکرد و دەگریا:

ـ وەلییەکەی من. ئەولیاکەی خۆم، هاوڕێیەکەی چل سوارەکەم. وەلییایەتییەکەتیان پێ قەبووڵ نەکرا. ئاوایان بەسەر هێنای.

جار نە جارێك زریکە و قیژەکەی، هەموو دەشتەکەی چوکووراوای دادەگرت.

خەڵکی یالاك بە پانەوە، لە دەم رووبارەکە بە ریز راوەستابوون و جووڵەیان نەدەکرد و چاویان بڕیبووە مردووەکە و سێبەرە درێژەکەی، کە هەر وا لە بن ئاوەکەدا دەجوولایەوە. هەموو لە جێی خۆیان وشك ببوون. سێ سەد مەترێك لە خوارتریانەوە لە دەم ئاوەکە، سەفەر لە سەر لەکە راوەستابوو. پتشی لە خۆرەتاوەکە بوو. خۆر هێندەی سپیدارێك بەرز ببۆوە. سەفەر رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو و لێوەکانیشی زەرد هەڵگەڕابوون. بیری دەکردەوە. وردە وردە جۆرە بێهیوایی و تاریکاییەك ناخی دەتەنییەوە و سەیری چاوە کراوە و درشتەکانی تاشباش ئۆغلوی دەکرد. سەیری دەکرد و نەیدەزانی لەو ساتەدا دەبێ چ بکا. گوندییەکانیش

بێجوولـە راوەسـتابوون و نەیانـدەزانی دەبـێ چ بکـەن. دۆش دامـابوون و وردە وردە تـرس بەسەریاندا زاڵ دەبوو. یەك دوو سەعاتێك هەر وا دەستەوستان راوەستان.

ئاخرییەکەی مام خەلیل پیلی دۆرمووشی گرت و گوتی:

ـ وەرە، لەگەڵ من وەرە با تەرمی ئەو لێقەوماوە لەو ئاوە دەرکێشینە دەرێ. هـەتا زینـدوو بوو، ماڵوێرانتان کرد، ئێستاش لە مردووەکـەی دەترسـن. دەشـبێ هـەر بترسـن. دەتانـەوێ بـە مردووییش ئازاری بدەن؟... دەی بجوولێن هەی سەگینە... مەمی دیك، ئەتۆش وەپێشم کەوە.

گەنجەکان نەیانوێرا و ترسان. بەڵام نەشیاندەوێرا جوابەجەنگێی مام خەلیل بکەن. لە شیوی کەنارەکە بەرەو مێشەڵانە بییەکە چوونە خوارێ. مام خەلیل دەلینگـی پانتۆڵەکـەی هـەڵکرد و پێش هەمووان چووە نێو ئاوەکە. قـەیتانی پێڵاوەکـی تاشـباش ئۆغلـوی کـە لـە لکـە لییەکـە هاڵابوو، کردەوە. ئەوجار پانتۆڵەکەشی کە لە لکێکی دیکە گیر بوو، جوێ کردەوە. تەرمەکـە، کاتێ بەر بوو، بەدەم ئاوەکەدا رۆیی. مام خەلیل بە پەلەپرووزێ هەرای کرد:

ـ کورِە دە بیگرنەوە. بە هیچ کوێوە نەبەستراوە، ئاوەکە دەیبا. بیگرن دەی.

مەمی دیك هەتا نێوقـەدی خۆی لـە ئاوەکـە خـست و باسـکی تاشـباش ئۆغلـوی گـرت و کێشایە دەرێ و لە سەر لمەکە درێژی کرد. لەو ساتەدا ژنەکـەی تاشباشـیش خـۆی لـەو چـنگی گۆملکـسیز راپـسکاند و خـۆی بـە سـەر تەرمەکـە کێـشا. مردووەکـەی لـە بـاوەش گـرت و لاواندییەوە:

ـ مەمەد گیان، تاشباشەکەم، پاڵەوانەکەم، تۆیان کوشت.

گوندییەکانیش جووڵان، لە لێژی کەنارەکەوە داگەڕان و بە دەوری تەرمەکـەدا کۆزیلەکـەیان بەست. گۆملکسیز ئۆغلو هات و ژنەکەی لە سەر تەرمی مێردەکەی هەستاند و گوتی:

ـ لەسەرخۆ بە خوشکم، لەسەرخۆ بە، خۆ ناکرێ لەگەڵ مردووان بمری.

دیسان ئامۆژگاریی ژنەکەی کردەوە.

ئاشقە کەچەڵە دڕی بە حەشیمەتەکە دا و بە سپایی لە مردووەکە نزیـك بـۆوە و بـە دەنگـە بەرزەکەی گرماندی:

ـ جەسـتەی لێرەیـە و خـۆی لـە چیاچـی چـل پیاوچـاکەکە. دەبـێ ئـەوەتان لـێ سـوور بـێ برادەرینە.

چوو و لە بەر پێی تەرمەکە راوەستا. سێبەری کەوتە سەر مردووەکە.

توورەکە لایلۆنییە پڕ لە شقارتەکە لە سەر سینگی تاشباش بوو و ئاوی تێنەچووبوو.

حەسەنیش لە نێو خەڵکەکە هاتە دەرێ. هات و لە تەنیشت مردووەکەوە راوەستا. چاوەکانی نوقمی فرمێسك بوون. جارێك داهاتەوە و بە جوانی سەیری دەموچاوی مردووەکەی کرد و دەستێکی بە دەستیدا کە لە تەنیشتییەوە درێژ ببوو، کێشا.

تاوەکە وردە وردە بەتینتر بوو و تەرمەکە وشك بۆوە. تاشباش ئۆغڵو لە بەر تاوەکە زۆر تەنیا و بێکەس بوو.

ژنەکەی سێ جاری دیکەش پەیتا پەیتا زریکاندییەوە. ویستی بەرەو مێردەکەی غار بدات و نەیانهێشت. ئاخرییەکەی لە سەر سەکۆکە دانیشت و بە دەنگە بلاوێن و بەسۆز و ژاناوییەکەیەوە دەستی کرد بە لاواندنەوە و پێدا هەڵگوتنی:

"ئازیزەکەم، بۆ لە بەر ئەو تاوە نووستووی؟ دە هەستەوە چاوەڕێتم، بگەڕێوە و وەرەوە... ئازیزەکەم لەو گەرمای بەیانییەدا نووستووە، نوور بەسەر گۆڕەکەیدا دەبارێ و نوورانییە، هەستە ئازیزەکەم، دە هەستەوە و سواری ئەسپە سپیەکەت بەوە."

چەند ژنی دیکەش هاتن و بوونە هاودەنگی ژنە شینگێڕەکە. یەکێك بێدەنگ دەبوو ئەوی دیکە تێی هەڵدەکرد و بەو جۆرە بۆ یەکتریان دەستاندەوە.

هەڵۆکە لە سەر ئالاداغەوە هات، لە بازنەیەکی بەریندا بەسەر دەشتەکەدا سووڕایەو و بەرەو خوارووی رووبارەکە خوشی. سێبەرەکەی کەوتە سەر قووڵایی ئاوە زوڵاڵ و روونەکە. دوای ئەوە گەڕایەوە و بەرەو ژووررووی رووبارەکە هات. باڵە گەورەکانی لە بەر تاوەکە تەواو کردەوە و لە سەر حەشیمەتەکە لەنگەری گرت و لە بن میچی ئاسمانە شین و تەماوییەکەدا بەبێجووڵە مایەوە.

تەرمی مردووەکە هەر لەوێ لە سەر عەرزەکە مابۆوە.

ئاشقە کەچەڵە بە رواڵەتێکی ژیرانەوە گوتی:

ـ ئەو مردووە غوسڵ و شۆردنی ناوێ، چون لە ئاو هاتۆتە دەرێ.

دیسان هەر وا زانایانە هەر دوو دەستی لە سەر سینگی دانا و لە سەری رۆیشت:

ـ ئەو مردووە کفنیشی ناوێ، جلوبەرگی خۆی لەبەر دایە. ئێمەش کفنمان نییە. ئەمن دووعاکەی لە سەر دەکەم و هەر ئێستا و ئەلێرەش نوێژەکەی لە سەر دەکەین. ئەگەر راستیتان دەوێ، تاشباش ئۆغڵو لە گۆڕدا نامێنێتەوە. هەر ئەمشەو دێتەوە دەرێ و دەچێتە چیای چڵ وەلییەکە. ئەم مردووە پێویستیی بە هیچ دامودەستوورێك نییە.

دەسبەجێ خۆی بۆ پێشنوێژیی راوەستا و گوندییەکانیش لە پشت سەرییەوە ریزیان بەست و نوێژیان کرد.

ـ دەی گەنجەکان مردووەکە هەڵگرن، لە سەر شانتانی دانێن دەی. ورە مەمی دیك، دەی.
مەمی دیك لە جێی خۆی نەبزووتبوو و بە روخسارێکی هەڵبزرکاوەوە لە جێی خۆی چەقیبوو.
بە چوار گەنج تەرمی مردووەکەمیان هەڵگرت و لە سەر شانیان دانا و هەر وەك دارەمەتێکیان هەڵگرتبێ، بردیانە تۆزێك ئەولاترەوە بۆ سەر تەپۆلکێك کە قەدپاڵەکەی بۆنی پنگەی لێ دێ. گوندی هەموو لەگەڵ تەرمەکە هاتنە سەر گردەکە. بەسپایی و بە ترسەوە و خەفتبار.
ئەوەندەی یەك و دوو قەبرەکەی هەڵکەنرا. گوندی لە سەر رێیەکەی خۆیان یەکی باوەشێك پنگەیان کۆ کردبۆوە. پنگە گوڵی شین و وردیان کردبوو. پنگەکانیان لە تەختی بنی قەبرەکە راخست و تاشباشیان لە سەر درێژ کرد.
هەتا ئەو کاتە کەس متەقی لێوە نەهاتبوو. سەفەر هەر وا لە دەم رووبارەکە مابۆوە و نەجووڵابوو.
ئەو رۆژە کرێکار لۆکەیان نەڕنییەوە. ژنەکان شیویان لێ نا. ترخێنە و ساواری بە تەماتە و.... ژنەکان لە بێستانێك بامیە و باینجان و تەماتەیان رنیبوو. مەمی دیکیش دوو سوێسکە و سێ کۆترە کێویی گرتبوو.
هەموو چێشتیان بردە کەپرەکەی تاشباش. سەر لە ئەنگۆرەی سفرەیان راخست. ژن و پیاو هەر کام لە سەر سفرەی جیا جیا چوار مەشقی دانیشتن.
جارێك بەر لەوەی دەست بۆ خواردن بەرن و جارێکیش پێش کشانەوەیان، ئاشقە کەچەڵە پاڕایەوە کە خوا لە تاشباش خۆش بێ و رۆحی شاد بکا. کاتی نوێژی خەوتنانیش دووعایەکی دیکەی کرد. هەموو گوندی گوتیان ئامین.
بە ژنەکەی تاشباشیشیان گوت:"خوا سێبووریت بدا خوشکێ. خۆ ناکرێ لەگەڵ مردووان بمری. خوا لێی خۆش بێ، پیاوێکی باش بوو، زەڕی بۆ هیچ کەس نەبوو."
یەك یەك ئەو قسانەیان کرد و هاتنە دەرێ و بەجێیان هێشت.
سەفەر کە ماندوو و شەکەت و بێ تاقەت لە رێوڕەسمی سفرەکە گەڕابۆوە، هەتا بەیانی خەوی لێ نەکەوت. ترس و دڵەکوتەیەکی سەیر لە دڵیدا هێلانەی کردبوو کە نەیدەزانی چییە.
بەیانی هێشتا تاو هەڵنەهاتبوو کە بە دەنگی ئاشقە کەچەڵ وەخەبەر هاتن. هەستان و لە سەر جێوبانەکەیان دانیشتن. ئاشقە کەچەڵ سازی لێ دەدا و بە دەنگە خۆشەکەی تێی چریکاندبوو. دەیگوت:
ـ ئاوی چەم و رووباران لە رۆیشتنێ وێستان. وەك بە شمشێرێك لەتت کردبێن لە جێی خۆیان چەقین. ئاوەکان راوەستان و بەستیان. کانیاوەکان وشك بوون، لەو کاتەدا بایەکان هەڵیان نەکرد

و گەڵاکان نەلەرینەوە. باڵندەکانیش نەفرین و باڵەکانیان نەجووڵا. گژ و گیا هەڵیان نەدا. گوڵەکان نەپشکووتن. دەریا و گۆلەکان لە شەپۆل کەوتن. نوورەکان تیشکیان نەما و رووناکاییش نەما. شەو لانەچوو، شەو نەهات. تاریکاییش وێستا. ئەستێرەکان چەقیان بەست و ئیتر لە جریوە کەوتن و نەلەرزینەوە و نەدرەوشانەوە. ئەستێرەکان راوەستان. دارستانەکان خشەیان نەهات، مێرووڵەکان لە جووڵە کەوتن. دڵی بنیادەمەکانیش لەو ساتەدا لە ترپە کەوت. هەرچی لە بن ئاسمان لە سەر زەوی بوو، راوەستا. هیچ شتێك جووڵەی نەکرد. خونچەکان نەپشکووتن، ئاگرەکان گڕیان نەگرت و مژ و تەمیش بە دەشتەکاندا بڵاو نەبۆوە. لەو ساتەدا کە تاشباشی سەروەرمان مرد، لەو ساتەدا کە گیانی شیرینی دەرچوو، دنیا بەحورمەتی ئەو کپ و بێدەنگ راوەستا، هیچ شتێك لە جێی خۆی نەجووڵا. سریوەی هیچ شتێك نەدەهات.

شەو بوو و شەوێکی ئەگوستە چاو. شەوێك بوو شیر نەیدەبری. چاو چاوی نەدەدی. لە دوورەوە مەل و باڵندەکان بە جریوەو قاو و قیژ هاتن. باڵندەی بچووك بچووك، هەر کامە هێندەی برگە پەنجەیەك. بە ملوێنان و ملوێنان باڵندەی نوور. بە جریوە و قاو و قیژ هاتن و بەری ئاسمانێیان گرت و شەویان پر کرد. تۆز و گەردی زیوینی نوور هاتن و لەسەر گۆڕەکەی تاشباش لە گردەکە نیشتنەوە. لە ئەنگوستەچاوی شەوەکەدا تا بەیانی لە ئاسمانێ درەوشانەوە، لافاوی نوور لە ئاسمانەوە تاکو بەیانی باری.

لەگەڵ تاوکەوتنان، سازەکە لە باوەشی ئاشقەکە کەچەڵە بەربۆوە سەر خۆڵە گەرمەکە و کەوتە نێو چڵە لۆکەکان.

ئاشقە کەچەڵ تا قاوەڵتوونێ لە جێی خۆی نەبزووت و هەر وا لە جێیەکەی خۆی دانیشتبوو. لە جێی خۆی وشك هەڵاتبوو. هەر کەس بەو شێوە ترسناکەی دیتبایەی، لێی دەتۆقی.

ئاخرییەکەی دوای یەك دوو سەعات هەستا. سازەکەی هەڵگرت و بردییە نێو کەپرەکەوە. ئەوجار چوو و کەوتە گەڵ کرێکارەکان و هەر یەکەم لۆکەی لە قوزاخە دەرکێشا، شادی و خۆشیی لە دڵی گەڕا.

ملوێنان و ملوێنان گەردی نوور بەرەو ئاسۆی زردەپەڕ رۆیشتن. شەو لە جووڵە کەوت، نوور جووڵەی لێ برا، رووناکایی و تاریکایی راوەستان، گەردە تیشکییەکان بە زیقە زیق رۆیشتن.

ئارەقەی سەر روخساری ئاشقەکەچەڵەش لە جووڵە وێستان. روخساری وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕابوو.

هەڵۆ گەورەکە سێ جاران لە ئاسمانێدا
خولایەوە. خۆی خستبووە سەر باڵی چەپی
و قیلەوقانج دەڕۆیشت.

## ٤٦

گەرماکەی زۆر بەتین بوو. باڵندەکان لە ئاسمانەوە وەك بەرد بەردەبوونەوە و دەمردن. گەرماکە پیاوی کوێر دەکرد. قاوەڵتوون (نێوان بەیانی و نیوەڕۆ) بوو. کرێکار شەکەت و ماندوو وردە وردە و بەکاوەخۆ لۆکەیان دەڕنییەوە. سەفەر هات و بەرانبەریان راوەستا. تفەنگەکەی بە شانییەوە بوو. جلوبەرگە هەر جوانەکانی لە بەر کردبوو. چەکمە نەرمەکانی و پانتۆڵەکەی ئەسپ سواری و چاکەتە رەشەکەی و کراسە سپییەکەی و بۆنیباغە سوورەکە و کڵاوە گەڕگەڕییەکەی. قەمچییەکی بە دەستییەوە بوو و دەستی قەمچییەکەی لە کەلەکەی نابوو. بەرانبەر گوندییەکان راوەستابوو و هەوڵی دەدا کەیفخۆش و بەدەماخ بنوێنێ. دەموچاوی درێژ ببۆوە و زەرد هەڵگەڕابوو. گەردنی چرچ و لۆچی تێکەوتبوو و ئەوەش روخساری لێ تاڵتر کردبوو. چاوەکانی لە گلێنەیدا هەڵدەخولان و ترسیان لێوە دەڕژا. لێوەکانی سپی ببوون و رەنگیان پەڕیبوو و برۆکانیشی تۆزاوی بوون. وەك پەیکەرێك راوەستابوو. سێبەرە درێژەکەی بەرەو رۆژئاوا راکشابوو. سات بە سات حاڵەتی روخساری دەگۆڕدرا. خەفەتبار، مردوو، ساردوسڕ، وەحشی، دڕندە، منداڵانە، شەکەت، ترسنۆك، ئازا. بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتانەی بشارێتەوە، هەوڵی دەدا بەردەوام بزەیەکی لە سەر لێوی بێ. لاقی راستەی هێنابووە پێشەوە، دەتگوت شەڕ دەفرۆشێ.

دەستەکانی مەمی دیك لە کار کەوتن. لە نەکاو وەك برووسکە دەرپەڕی. ئەوەندە گورج و خێرا دەرپەڕی، کەس نەیدی. لە چاوترووکانێکدا خۆی گەیاندە سەفەر. دەستی راستەی لە بەر تیشکی تاوەکە سێ جار بریسکایەوە، داهاتەوە و هەستایەوە و دەهاتەوە و هەستایەوە.

سەفەر وەك گا بۆڕاندی:

- وەی باوکەڕۆ سووتام.

لە سەر عەرزەکە تەخت کەوت. چەند جار ئەژنۆکانی تا بن زگی خڕ بوونەوە، لەرزی و دوای لینگەفرتەیەك لینگی راکێشا.

گوندی لە جێی خۆیان نەبزووتن. ماوەیەك هەر وا راوەستان. مەمی دیکیش بە سەر مردووەکەوە بێ جووڵە راوەستابوو. کێردە خوێناوییەکەی هەر بە دەستییەوە بوو. خوێنەکەی دەستی بەسەر سەفەردا تەکاند. کێردەکە لە دەستییەوە بەربۆوە تەنیشت و سەفەر و لە پەنا لاسکە لۆکە گۆڵ شینەکە کەوتە سەر خۆڵە نەرمەکە. رەنگی بە رووەوە نەمابوو. پشتی لە گوندییەکان کرد و وردە وردە بەرەو رەوەزەکانی ئاناوەرزا وەرێ کەوت. لە لێژاییەکەی قۆروخیچان ناودیو بوو و لە نێو پنچکە مۆرەکانی وشترالوودا لە چاوان ون بوو.

سەفەر هەر وا خوێنی لەبەر دەڕۆییشت. خوێنەکە لە بەر تاوەکە مەیی. سێ مێشی وەك پۆلا کەسك، سێ جاران هاتنە سەر خوێنە مەیوەکە و هەڵفڕینەوە.

تازە، دوای دیارنەمانی مەمی دیك بوو کە گوندی نوتقیان کرایەوە و وەقسە هاتن:

- مەمی دیك سەفەری بۆ کوشت؟

- مەمی دیك بۆ...

- بۆ؟...

مەمی دیك سەفەری کوشت. خوێنی سەفەر لە سەر عەرزەکە گۆمیلکەی بەست. خوێنەکە لە بەر گەرماکە کوڵی، رەش هەڵگەڕا و مەیی. تەرمەکە دوو رۆژان لەوێ لەو بەر تاوە کەوت. مێشە سەوزەکان، با درەوشانەوەیەکی پۆلایین لە گەرماکەدا بە سەر تەرمەکەی سەفەرەوە دەسووڕانەوە.

**خەڵکەکەی یالاك، جگە لە کێڵگەکانی موتەلیب بەگ لۆکەی پێنج کێڵگەی "کزیر عەلی ئاغا"شیان رنییەوە. لە سەر یەك چوارده کێڵگەیان رنیبۆوە و مەزراکان لە دووەم گوڵ وسێهەم گوڵیشیاندا بەرێکی باشیان دابۆوە. دووەم گوڵ و سێهەم گوڵیشیان وەك یەکەم گوڵ بەری گرتبۆوە. لەو نێوەدا، دوو جاران باران دایکرد. مەمی دیکیان لە زیندانێ توند کرد. ژنە چکۆلەکەی سەفەر، کچەکەی قیرسمایل، سێ رۆژ پاش مەرگی مێردەکەی مێردی بە دورمووش کردەوە. گوندییەکان دوو جاران چوونە دادگا و شایەتییان بۆ مەمی دیك دا. زولەیخا سێ جار چووە سەردانی مەمی دیك لە بەندیخانەدا و پێنج پاکەتی جگەرە و دەسرەیەکی پڕ لە ترێ تازەشی بۆ برد.**

## ٤٧

باران دەباری. بارانی پاییزانی چوکووراوا خۆشکردنەوەی نەبوو. دیسان دەستی پێ کردبۆوە و دەریای ئاو بوو کە لە ئاسمانەوە بە سەر زەویدا هەڵدەڕژا.

کرێکارەکانی لۆکە و کرێکاری برینج، رێگا قوڕ و لیتەکانی چوکووراوایان پڕ کردبوو و وەك قەتاری مێرووله بەرەو کوێستانێ دەڕۆیشتنەوە. ئەمساڵ گیرفانیان وا پڕ کردبوو لە پارە، خۆشیان بڕوایان نەدەکرد. ساڵێکی خۆش بوو.

لاق زل و قەڵشیو و شەقاربووەکان، بە رووتی لە سەر کۆڵانە بەردەچنکراوەکانی شار، بە جلوبەرگی خووساوی بە باران، لە دووکانێکەوە دەچوونە دووکانێکی دیکە و شت و مەکیان دەکڕی. لاقی ژن و پیاو هەتا ئەژنۆیان قوڕاوی بوون.

ئەو ریزە بنیادەمانەی دەتگوت قەتارە مێروون، نەخۆش و نۆبەتێدار و پشت چەماوە لە بەر ژانی مێعدە، لە بەر رێژنەی باراندا، بەو جلوبەرگانەیانەوە کە هەر تاویان وێدەکەوت هەڵمیان

لێ هەڵدەستا، دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی ڕێگەکانی کوێستانێ پڕ بکەن و بگەنەوە تۆرووس. بەڵام دڵخۆش و بە کەیف بوون. پارەیان پەیدا کردبوو، ئەمساڵ ترسی عادیل ئەفەنییان نەبوو. لە لای سەروو، لە کوێستانێ زەماوەند دەستی پێ دەکرد و ئەوان لە زەماوەند و جێژنەکانیاندا، ئەو شمەکە هەرزانانەیان لەبەر دەکرد کە لە دووکانەکانی شاری کڕیبوویانن و ئیتر تەپۆ و ئاوی شلەتێنی وەك خوێنیان لە بیر دەچۆوە. هەتا ساڵی داهاتوو.

"عەلی"یە درێژ بەبێ ئەوەی ساتێك لە ئاوایی بمێنێتەوە، بەبێ ئەوەی سەیری دەوروپشتی خۆی بکا، بە لاقە قوڕاوییەکانی و هەر بەو جلوبەرگە تەڕانەیەوە کە بە گیانییەوە نووسابوون، وەك با بەرەو ئاوایی دەفڕی. بەخۆی دەگوت:

ـ دایکەکەم، مرێمۆکەکەم... هەر جارێکی دیکە بە سلامەتی بتبینمەوە... ئیتر بۆ ساتێکیش لێت دوور ناکەومەوە.

جا دایکیی دەهێنایە پێش چاوی خۆی کە لە بەر دەرگای ماڵێ و لە بەر تاوەکەی پاییزێ خەوتووە و بێچووە پشیلەیەکی لە باوەشی دایە:"دایە، دایە، هاتینەوە." مرێمۆك دەستی لە ئەستۆی دەکرد. دڵخۆش...

"دایە ، دایە، هاتینەوە."

مرێمۆك دڵی خۆش دەبێ، پێدەکەنێ. بەڵام ئیتر لەبزی دە لەبزیان ناگەڕێ.

دیسان دایکی دێنایەوە پێش چاوی خۆی. دەرگای ماڵێ دەکاتەوە. وەی لەو بۆنە...

مرێمۆك گرمۆڵە بووە. بای کردووە، مرێمۆك رزیوە. بۆگەنەکەی هەموو گوندەکەی داگرتووە و مێشکی سەوز سەوز لە سەری نیشتوون... مێروولەی زەرد چاوەکانیان کۆڵیوە و لووت و لێوەکانیان خواردووە.

"عەلی"یە درێژ هۆشی نامێنێ و بەبێ ئیختیار لووتی خۆی دەگرێ.

مرێمۆك کە نووستووە، لە جێی بێچووە پشیلە، جووچکە کەوێکی لە باوەش دایە دەندووك و لاقەکانی تازە سوور دادەگەڕێن.

"عەلی"یە درێژ بە هانکە هانك غار دەدا...

زولەیخا دوای ئەوەی لە شاری شتی کڕی، چووە سەردانی مەمی دیك. دەسرۆکەیەکی هەوریشمینی سپیی پێ دا. دە لیرەیەکی سەوزیشی دایێ. ئەویش تەڕ بوو. مەمی دیك دراوەکەی لێ وەرنەگرت. خۆی کێشا و دەستی زولەیخای گرت و لە سەر دڵی خۆی کە بە پەرژینە ئاسنەکانەوەی نووساندبوو، دانا. دڵی توندتر لێی دەدا و دەستی گەرم بوو. هیچ

قسەیان نەکرد. زولەیخا چاوی پڕ بوون لە ئاو و ئەوجار سەیرێکی مەمی دیکی کرد و بە دڵێکی خۆشەوە پێکەنی.

کە زولەیخا گەڕایەوە بڕوات، حەسەنە چکۆل هات. جلوبەرگەکانی زولەیخا بە لەشە شووش و کەڵەگەتەکەیەوە نووسابوو. خەیاڵی ژنێکی شووش و باریك و کەڵەگەت لە زەینی مەمی دیکدا مایەوە.

حەسەن بزەی هاتێ. سێ قوتووی شقارتەی لە توورەکەیەکی لایلۆنییەوە پێچابوو و دایێ مەمی دیك. مەمی دیك ئەو دیارییەی لە هەمووان پێ خۆشتر بوو و بەخۆی گوت حەسەن وەك تاشباش ئۆغلۆم سەیر دەکا.

حەسەن بە لەبزی بنیادەمێکی گەورەوە گوتی:

- خودا وەخێری بگێڕێ مەمی دیك.

مەمی دیك گوتی:

- هەر بژی براله.

حەسەن گوتی:

- دیسان دێمەوە و شقارتەت بۆ دێنمەوە. ناهێڵم لەو نێوەدا بێ شقارتە بی.

مەمی دیك دڵی خۆش بوو و گوتی:

- هەر بژی براکەم. بێ وەی بی.

ئەوجار دەتگوت نهێنییەکی گەورەی لێ دەپرسێ. گوتی:

- پرسیارێکم هەیە حەسەن. دوای ئەوەی من ڕۆیشتم، تاشباشی مەزنمان چیی کرد. چیی بەسەر هات؟

هەتا ئێستا ئەو پرسیارەی لە کەس نەکردبوو. حەسەن نەیزانی بڵێ چی و بە لالەپەتەیی وەڵامی دایەوە:

- باشە. باش. لەوێ، لە سەر گردەکە نووستووە.

مەمی دیك ویستی دیسان هێندێ لە بارەی تاشباش ئۆغلۆوەوە پرسیاری لێ بکا، بەڵام پاشگەز بۆوە.

دوای حەسەن مام خەلیل بە شەلەشەل هات و گوتی:

- خودا بەخێری بگێڕێ هەتیوە شێتە. دەستت خۆش بێ.

مەمی دیك گوتی:

- خودا راوەستاوت بکا مامە.

لە پاشان مام خەلیل ئاسمانی پێشان مەمی دیک دا و گوتی:

- بڕوانە مەمی دیک، بڕوانە.

مەمی دیک سەیری کرد و بە دڵخۆشییەوە پێکەنی.

گوندی وەك ئەو مێرووڵانەی لە هێلانە دێنە دەرێ، بە پانتۆڵی دێهاتییانەوە کە هەتا ئەژنۆ هەڵیانکردبوو، بەو جلوبەرگانەوە کە بە گیانیانەوە نووسابوو و هاڵاویان لێ هەڵدەستا، لە بەر ئەو بارانەی وەك گۆزەی سەروبن لە ئاسمانەوە هەڵدەڕژا، ڕێگەکانیان پڕ کردبوو و بەرەو کوێستان دەچوونەوە.

مام خەلیل گوتی:

- بڕوانە مەمی دیک، بڕوانە.

دیسان ئاسمانەکەی پێشان دایەوە.

مەمی دیک سەیری کرد و بزەی هاتێ.

هەڵۆ گەورەکە بە باڵە تەڕ و قورسەکانییەوە لە بەر باران، بڕك گرمۆڵە ببو و دەتگوت بەمیچی ئاسمانەوە نووساوە، بەرەو کوێستانە دوورەکە دەفڕی. لەو سەری چوکووراواوە سێ جار خولایەوە. ئەوجار بەرەو ئالاداغ گەڕایەوە و دوور کەوتەوە و ڕۆیشت.

کۆتایی



ڕۆمانی ئەوبەری کوێستان، یەکێکە لە بەرهەمە بە ترخەکانی یەشار کەمال. نووسەر لەو ڕۆمانەدا بە وردی پەردەی لەسەر لایەنە دەروونی و نهێنییەکانی ناخی مرۆڤ هەڵداوەتەوە. بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە جوان و زەریفە ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە وەچەی ئادەمیزاد چۆن دەست دەکات بە دروستکردنی پیرۆزییەتییەکان و جۆناوجۆن پیرۆزایەتی بە شتەکان و کەسەکان دەبەخشێت و دواتریش هەر کەسە و لەبەر خۆیەوە چیرۆکێکی خەیاڵیی لەبارەیانەوە هەڵدەبەستێت و پەرجۆ و موعجیزەیەکیان بۆ ساز دەکات. ئەو ڕۆمانە جیا لە زۆربەی ڕۆمانەکانی دیکەی یەشار کەمال، ڕۆمانێکی تەواو فەلسەفییە و ئاوڕی لە مەسەلەی "پەرستن" داوەتەوە. یاشار کەمال لە ئاوێنەی ژیانی خەڵکە ساویلکەکەی گوندی "یالاك"دا دەچێتەوە بنج و بناوانی مێژووی ژیانی ئادەمیزاد و خەون و خەیاڵ و ئارەزووەکانیانەوە...





وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری